بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

* ناوی کتێب: «قامووسی رستە»

* دانراوی: مەلا مەحموودی گەڵاڵەیی

* تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی ( ٦٢٨ ) ساڵی ( ٢٠٠٨ )ی دراوەتێ.

* تایپ و دیزاینی: ( ڕویار حسین / کۆمپیوتەری شانیا )

* ساڵی چاپ: ١٤٢٩ ك - ٢٠٠٨ ز

# پێشەکی

**بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان**

کاری لەبەرچاوو ئاشکرایە کە گرنگی فەرهەنگ بۆ نەمریی گەلو نەتەوە، بۆ پێشکەوتنی وڵات، لەپلەی یەکەم دایە، زمانە زیندووەکانی جیهان وەك عەرەبیو ئینگلیزیو فارسیو فەرەنسیو .... تاد، مانو نەمانیان بەسراوە بە فەرهەنگو قامووسەوە، فەرهەنگ پاراستونی لەفەوتانو پەرتبوونو لەتلەت بوون هەرچۆن (نەحو) زمان دەپارێزێ لەهەڵەی زمانەوانیی، فەرهەنگیش زمان دەپارێزێ لەفەوتانو پاشا گەردانی.

جا لەم روانگەیەوە رۆشنبیرانی هەموو میللەتێك لەپلەی یەکەم دا هەوڵیان داوە کە فەرهەنگی شایان بۆ زمانی نەتەوەکەیان بەقەڵەمێکی پاراو بنووسن، لەم رێگەوە گەورەترین خزمەتیان بەگەلو نیشتمانی خۆیان کردووە. بەوێنە شێخ مارفی نۆدیو مەلا عەبدوڵڵای زێوەر سەردەقشکێنی فەرهەنگی عەرەبی - کوردینو شێخی خاڵو زەبیحیو هەژارو جگەرخوێن رەچەشکێنی فەرهەنگی کورد - کوردینو خزمەتێکی شایانیان بەگەلی کوردی خۆیان کردووە.

بەڵام رەورەوەی پێشکەوتنو بزاڤی گەشەکردن کاری وایان کردووە دەڵێی هەمیشە مرۆڤ لەگەڵ رۆژگاردا لە موسابەقەو کێ برکێو پێشبرکێ دایە.

لەلایەکی ترەوە بواری فەرهەنگ فرەلقو پۆپە، گەلە خودا پێداوەکان لەهەموو بوارەکان دا ئەسپی خۆیان تاوداوەو قۆناغی باشیان بریوەو پێشکەوتنی بەرچاویان بەدەست هێناوە.

جا لەگەڵ رەچاوکردنی ئەم خاڵانەو تێڕوانینێکی سەرپێیی بەناو رۆشنبیری کوردی دا بۆمان دەردەکەوێ کە کتێبخانەی کوردی لەبواری فەرهەنگ دا زۆر هەژارە چ لەڕوی چەندییەتەوە، چ لە ڕوی چۆنیەتەوە! چونکە وێڕای ئەوەی نوسەرانمان کەمیان خۆیان لەم بوارەدا خەریك کردووەو بەرهەمیان کەمە، ئەوەی نووسیویشمانە زۆرکەمو کوڕی تێدایە! ئەوەی من بزانم تائێستا بەشێوەی لێبڕانو خۆتەرخانکردن کەسانێکی پسپۆڕو شارەزا خۆیان بەدانانی قاموسی (عەرەبی – کوردی)یەوە خەریك نەکردووە، ئەو بەرهەمانەی لەبەردەست دان تا بڵێی کاڵو کرچنو کەمو کورتییان تێدایە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە دانانی قاموسو فەرهەنگ کاری تاکەکەسی نییەو پێویستە

لیژنــەی پســپۆڕ بــەم جــۆرە کارانــە هەڵســیٚ و چــەند جــارێکیش لەلایــەن پســپۆڕانەوە بەرهەمەکە لەکەوو بێــژنگ بــدریٚ. هەڵبەتــە تــا ئێســتا ئــەم هــەڵ و مەرجــە بــۆ قاموســی (عەرەبی – کوردی) نەڕەخساوە، هەتا ئەم بوارەش نەڕەخسیٚ و بیرێك لەوکەلەبەرە زەقە نەکرێتــەوەو هــەوڵی جیــددی بــۆ نــەدریٚ، ئەوکەلێنــەی کتێبخانــەی کــوردی پڕنابێتــەوە. وەکــی تــریش رون و ئاشکرایە کــە زمــانی عــەرەبی لەبــەر چــەند هۆیــەك کــەلای هــەموان زانــراون، دادەنــریٚ بەباشــترین کــەناڵی پاریــدەدەری کاریگــەر، بــۆ زمــانی شــیرینی کــوردی، کەلەڕێگــەی تەرجەمــەو وەرگێڕانــەوە بیکــەین بــەبوارو پــردیٚ بــۆ چــوونە نــاو زۆرینــەی زانیارییەکانی جیهان و بۆ گەڕان بــەناو هــەموو کتێبخانــەکانی جیهــان دا، چونکە زانینــی زمــانی هەرگەلــیٚ، کلیلــە بــۆ فێربــوونی هــەموو بەرهەمــە جــۆراو جۆرەکــانی ئــەو گەلــە، لەئەدەبی و پیشەیی و، زانستی و فەرهەنگی و، ....تاد.

جا بەندە پاش ئەوەی بەچاوی رەخنەی دۆستانەوە ئــەو فەرهەنگانــەم هەڵســەنگاند کەلەم بوارەی من دا دانراون هاتم وەك تەواو کردنی کاری پیرۆزی ئــەوان لــەپاش هــەوڵ و تێکۆشانی بیٚ وچان تــوانیم دەســتە ســواڵەی خــۆم بخەمــە ســەر شاراو خــەرمانی هــەزاری بواری فەرهەنگی (عەرەبی – کوردی)، ئەم بەرهەمەم ئامادەکردو نــاوم لــیٚ نــا (قاموســی ڕســتە) لــەم رووەوە کــە زوربــەی کــات وشــەکان خراونەتــە نــاو رســتەوە هیــوادارم ســودم لەهەڵەو کەم و کورتی قاموســە دانراوەکــانی پێش خــۆم وەرگرتبیٚ، بەقــەدەر توانــا خــۆم لەهەنــدیٚ هەڵــەو کــەم و کــوڕی پاراســتبیٚ! خــۆ هەڵنانــەوە نییــە گــەر بڵــێم: هــەوڵم داوە کــوردی رۆشــنبیر شــارەزا بکــەم بــەزمانی عــەرەبی، بەشــێوەی گشــتی، بەشــێوەیەکی وا کەلەهەر بوارێك دا پێویستی بەزانینی زمــانی عــەرەبی هــەبیٚ ئــەم فەرهەنگــە بــۆی ببــیٚ بەفێرکارو مامۆستا.

ئەوەشمان لەبیر نەچیٚ ئێمەی کورد، پێویســتی زۆرمــان بــەزمانی عــەرەبی و فارســی و تورکی هەیە کە گەلی کورد دابەشکراوە بەسەر ئەم سیٚ نەتەوەیەدا.

هەڵبەتە زمانی عەرەبی زمانێکی (اشتقاقی)یە، ئەمەش کاری ڕێك خستنی وشــەکان لەناو قاموس دا بەشێوەی ئەلف بیٚ ئەستەم دەکا، هەر لەکۆنەوە زانایانی عەرەب لەبواری قاموس دا زۆر خۆیان ماندو کردووە زۆر ڕێبازیــان پــەیرەو کــردون بــۆ تــەرتیب کردنــی وشە گەلی ناو قاموسەکانیان، بەناو بانگترینی ئەو ڕێبازانە دوو ڕێبازن:

(١) ڕێــازی یەکــەم: ئەوەیــە موجــەڕەدو مەزیــد بەرچــاو نــەگیریٚ و وشــەگەلەکە بــەگوێرەی (تلفظ)و دەنگ ریزبەند بکرێن ئەوکاتە ئیسم و فیعل بــە موجــەڕەدو مەزیــدەوە تێکــەڵاو دەکرێن و ڕیز بەند دەکرێن.

(٢) ڕێبازی دووەم: ئەوەیە کە پیتی زیادە بەرچاو نەگیرێ‌و بەگوێرەی پیتە ئەصلییەکان وشە گەلەکە ریز بەند بکرێ‌و وشە زیادەکان ناواخن بکرێن.

من بۆ خۆم ڕێبازی دووەمم پەسەند کردوەو بەوگوێرەیە وشەکانم ڕێك خستون لەبەر چەند هۆیەك کە لێرەدا جێگای ئاماژە بۆ کردنیانم نیە.

- ⇦ شایەنی باسە من لەم نووسینەدا هاتوم کتێبی (المعجم الوسیط) لە دانانی کۆمەڵێ لە زاناو پایەبەرزانی وەکوو دوکتۆر (أحمد حسن الزیاد)و دکتۆر (إبراهیم مصطفی)و (حامد عبد القادر)و (محمد علی النجار)م کردوە بەسەر چاوەی سەرەکی‌و زۆربەی قاموسەکەم لەو ڕاگواستووە، وە سودیشم لە کتێبی (قاموس المحیط)ی (فەیروز ئابادی)و کتێبی (المنجد)و کتێبی (المنجد في اللغة العربیة المعاصرة)و (قامووسی دەریا) بینیوە.
- ⇦ هەوڵم داوە زۆربەی وشەکان بخەمە ڕستەوە بۆ ئەوەی خوێنەر بتوانێ مانای مەبەست لەو وشەیەی گەرەکیەتی بەئاسانی بدۆزێتەوە.
- ⇦ ئەو وشەیەی زیاد لەیەك مانای هەیە، ماناکان ریزکراون‌و نێوان ماناکانیش بەهێمای (٥) دیاری کراوە، هەر کاتێ ئەو هێمایە دانرا ئەوە یەکێك لەماناکانی وشەکە تەواو بووە.
- ⇦ زوربەی جار بەدوا وشەکەدا چاوگی ئەو وشەیە یەك بێ یا زیاتر دیاریم کردوە بەبێ ئەوەی مانام کردبێ، ئەوەم هێشتۆتەوە بۆ خوێنەر خۆی بەگوێرەی شوێن مانای چاوگەکە بزانێ.
- ⇦ زۆرجار صیغەی (افعل فعلی)و (فعلان فعلاء)م بۆ وشەکان لەکەوانەدا دیاری کردووە، وەکوو (اهیف هیفاء)و (ندمان ندماء).
- ⇦ هەروەها بەگوێرەی پێویست کۆی ئیسمەکانم دیاری کردوە بەم جۆرە لەدوا مانا کردنی ئیسمەکە پیتی (ك) دانراوە لەجیاتی کۆ ئەمجار دوخاڵ دانراوە لەسەریەك‌و صیغەی جەمعەکەم نووسیوە.

هیوادارم خودا پشتیوانم بێ بۆ تەواوکردنی کارەکەم‌و بەرهەمەکە جێگای خۆی لەدڵی‌خوێنەران دا بکاتەوەو لە کتێبخانەی کوردی دا شوێنی خۆی بگرێ.

محمود أحمد

٢٠٠٨/٣/١

**أ:** یەکـەم پیتـی (ئـەلفو بـێ یـە) پێـی دەگـوترێ: (هــەمزە)و بــۆ چــەند مانایەك بەکار دێ.

- بـۆ پرسـیار کـردن (أتسـافر غـداً؟) بەیانی سەفەر دەکەی؟
- بـۆ بـانگکردن (أ محمـدُ انظـر) ئـەی موحەممەد بڕوانە.
- بۆ چونیەکی و یەکسانی ﴿وَسَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ﴾. چـونیەکە لای ئـەو بـێ بڕوایانـە بیانترسـێنێ یـان نەیانترسـێنێ ٥ (لا یهمـني أقـرأت أم لم تقـرأ) بخوێنیو نەخوێنی بەلامەوە گرنگ نییە.

**آبَ:** بڕوانە مادەی (أوَبَ).

**آب:** مـانگی یـانزەی سـاڵی سـوڕە یـانیو مانگی هەشتی زایینی یە.

**الأب:** نوقنـــــومی یەکەمــــــە لای مەسیحییەکان.

**الأبَنُوس:** درەختێکــە لــە وڵاتــی حەبەشـــەو هیندوســـتان دەڕوێ دارەکـەی ڕەشو پتـەوە، هەنـدێ پێویستیاتی نـاو مـاڵی لـێ دروسـت دەکـرێ، بـە کـوردی پێـی دەگـوترێ ئەبەنوس، عەبەنوس.

**الأبَنُوسِيَة:** مادەیـەکی ڕەشـی ڕەقـە، پێکدێ لەخڵتەی گۆگردو مـەطاطی پاڵفتە کراو، کارەبا ناگەیەنێ.

**الآجُـر:** خشـتی سـورکراوە بـۆ کـاری بیناسازی.

**آدم:** بڕوانە مادەی (أدَمَ).

**آذار:** مانگی شەشەمی ساڵی سوڕەیانیو مانگی سێیەمی ساڵی زایینی یە.

**الآذريــون:** ڕوەکێکــی گوڵــە پایزەیــە، گوڵەکانی زەردو سورو ئـاڵتونی یـە لـە ناوەڕاستی دا خاڵێکی ڕەش هەیە.

**الآس:** درەختێکـــە هەمیشـــە ســـەوزە گەڵاکەی هێلکەییەو گوڵەکەی سپی یە، بـۆنی خۆشـە، بەرەکـەی ڕەشـە، بـــە تـــەڕی دەخـــورێو وشـــکیش دەکرێتەوە دەخورێ.

**آمین:** وشـەیەکە دوای دوعـاو پاڕانـەوە دەگوترێ، واتە: خودایە داواکەم جێ بەجێ بکە.

**الآنِسُون:** ڕوەکێکـە وەرزییـە گوڵەکـەی سپیو بچوکە.

**الآنُك:** ڕەصاصی ڕەشە.

**الآيينُ:** دابو نەریتی کۆمەڵێك یان هـی دەڤەرێك.

**أَبَأَهُ:** (أَبَأَهُ بسهم) تیرێکی تێگرت.

**الأبَاءُ:** قەصەب.

**الأبـــاءَة:** بێشـــەڵانی قەصـــەب، (ك: الأبَاءُ)ە.

**أبَّ:** (أبَّ للسير أبّاً، أباباً): خۆی بۆ سەفەر ئامادە کرد، (أبَّ اليه) حەزی لێ کرد، (أبَّ على أعدائه) هەڵمەتی مەردانەی بردەسەر دوژمنەکانی ٥ دەگوترێ:(أبّتْ أبابَةُ الشيء) ڕێگای خۆی کردەوە دامەزرا ٥ (أبَّ الشَيْءَ) قەصدی کرد، دەگوترێ: (ابَّ أبَهُ) هەڵوێستی ئەوی نواند ٥ (إستَأبَّ فلاناً) فلانکەسی کردە باوکی خۆی ٥ (تأبَّبَ بە) شانازی پێوەکرد.

**الأُبابُ:** ئاوی زۆر

**الأبابَة:** دەردێکە توشی ئادەمیزادی دوورە ولات دەبێ.. واتە: کورکاندن و ناڵین بۆ نیشتمان ٥ (جۆرە نەخۆشییەکی دەروونییە).

**الأبُّ:** گژوگیا، لە قورئان دا دەفەرموێ: ﴿وَفَاكِهَةً وَأَبًّا﴾.

**أبِتَ** (أبِتَ اليوم أبْتاً): ڕۆژەکە گەرم بوو.

**أبْجَدُ:** یەکەم وشەی ئەو شەش وشانەیە کە پیتەکانی هیجای تێدا کۆکراوەتەوە لای سامییەکان، کە ئەمانەن (أبجد، هوز، حطي، كلمن، سعفص، قرشت) پیتەکانی هەردوو وشەی (ثخذ، ضظغ) کە خراونە پاڵ ئەو شەش وشانە هی زمانی عەرەبین ٥ پیتەکانی (ابجد) لە حیسابی (جُمَل) دا بەم شێوە بەکاردێن، یەکان، دەیان، سەدان، هەزاران.

| أ | ب | ج | د | هـ | و | ز |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ |
| ح | ط | ي | ك | ل | م | ن |
| ٨ | ٩ | ١٠ | ٢٠ | ٣٠ | ٤٠ | ٥٠ |
| س | ع | ف | ص | ق | ر | ش |
| ٦٠ | ٧٠ | ٨٠ | ٩٠ | ١٠٠ | ٢٠٠ | ٣٠٠ |
| ت | ث | خ | ذ | ض | ظ | غ |
| ٤٠٠ | ٥٠٠ | ٦٠٠ | ٧٠٠ | ٨٠٠ | ٩٠٠ | ١٠٠٠ |

**أبَدَ:** (أبَدَ أُبوداً) لە ئادەمیزادان دابڕا، گۆشەگیر بوو (أبَدَ الشاعِرُ) مانای قوڵی خستە نێو شیعرەکانی ٥ (أبَدَ فلانٌ بالمكان) فلانکەس لەوشوێنە مایەوەو بەجێی نەهێشت.

**أبِدَ** (أبِدَ أبَداً): لە خەڵکی دابڕا، گۆشە گیر بوو (أبِدَ عليه) رقی لێ هەڵسا.

**أبَّدَ:** (أبَّدَ الشيء) شتەکەی نەمرکرد (تأبَّدَ) بەمانا (أبَدَ) یە ٥ (تأبد المكانُ) ئەو شوێنە بوو بەچۆڵەوانی کەسی تێدانەما ٥ (تَأبَّدَ الرَّجُلُ) پیاوەکە کوڕێتییەتەکەی درێژەی کێشاو ژنی نەهێنا.

**الآبِدَة:** کاری سەرنج ڕاکێش و سەیرو سەمەرە ٥ بەڵای گەورەو لەبیر نەچووەوە! وەکوو ئەنفالکردنی کورد، کیمیابارانی هەڵەبجە، (ك: أوابِدُ).. دەگوترێ:(أوابد الكلام) قسەی سەرنج ڕاکێش ٥ (أوابِدُ الطير) ئەو باڵندانەی زستان و هاوین لەیەك شوێن بمێننەوە گەرمێن و کوێستان و جێ گۆڕکێ نەکەن.

أَوَابِدُ الْوَحْش: گیانلەبەری کێوی، ئەو حەیوانانەی لەگەڵ ئادەمیزاد هەڵنەکەن ٥ ماڵی کردنیان ئاسان نەبێ.

الأَبَدُ: زەمانە، رۆژگار، (ك: آباد وأُبود)ە دەگوترێ: (لا أفعلُ ذلك أبَدَ الآبادِ) یان (ابَدَ الآبدین) هەرگیزاو هەرگیزو هەتا هەتایە ئەو کارە ناکەم.

أَبداً: زەرفی زەمانی داهاتووە، بۆ کردن و نەکردن بەکار دەهێنرێ، هەمیشەیی دەگەیەنێ، بەهۆی نیشانێکەوە مانای هەمیشەیی لێ دادەڕنرێ، وەکوو لەقورئان دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا أَبَدًا مَّا دَامُواْ فِيهَا﴾.

الأَبَدِيّ: ئەوەیە کۆتایی نەبێ.

الأَبَدِيَّة: چاوگێکی دروست کراوە (مصدر صناعي) لەوشەی (الأَبَدَ) دەردەهێندرێ.

المؤبد: (الحكم المؤبد) سەپاندنی سزا بەسەر تاوانباردا بە درێژایی ژیانی.. وادەبێ ئەو سزایە سوك دەكرێ بۆ بیست ساڵ.

أَبَرَ: (أبَرَ النَّخْلَ) دار خورماکەی تەلقیح کرد، موتوربەی کرد تۆوی نێرەکەی بەسەردا پرژاندن ٥ (أَبَرَ الزَّرْعَ) کشتو کاڵەکەی پێك هێنا، چاکی کرد (أَبَرَ العَقْرَبُ والنحلة فلاناً) دوپشك پێوەی دا، هەنگ پێوەی دا ٥ (أَبَرَ الحَيَوانَ) لەگەڵ خۆراکدا دەرزی دەرخواردی ئاژەڵەکان دا بۆ ئەوەی بمرن (أَبَرَ فُلَاناً) زیانی بەفلان گەیاند پاشە ملە غەیبەتی کرد.

أَبِرَ الزَّرْعُ: کشتو کاڵەکە باش بوو پێگەیی.

أَبَّرَ النَّخْلَ – الزَّرْعَ: باخە خورماکە، یان کشتوکاڵەکەی باش بەخێو کردو رەدامی هێنا.

إِئْتَبَرَ فلاناً: داوای لە فلان کرد خورماکانی بۆ تەلقیح و موتوربە بکا ٥ بۆی بەخێو بکا.

تَأَبَّرَ: کارلێکراو (مطاوع)ی (أَبَّرَ)ە یە واتە بەخێو کردنەکەی پێکەوت ٥ (تَأَبَّرَ صغار النخل) واتە: نەمامە خورماکان گەورە بوونو پێگەیینو کاتی موتوربەکردنیان هات.

الإِبَارَة: وەستایی کارامایی موتوربەکردنی خورمایە، یان وەستاییو لێزانی کشتیاری یە.

الإِبَارَة: وەستاییو کارامایی موتوربەکردنی خورمایە، یان وەستاییو لێزانی کشتیاری یە.

الأَبَّارُ: دروستکەری دەرزی یە.

الإِبْرَة: دەرزی یە، ئامێرێکە سەرێکی تیژەو سەرێکی کونە، دوورومانی پێ دەکرێت، (إِبْرَةُ العقرب) چزوی دوپشك، (إِبْرَةُ النحلة) چزوی هەنگ ٥ (إِبْرَةُ المرفق) سەری ئێسقانی ئەنیشك ٥ (بيت الإِبْرَةُ): عولبەیەکی بچکۆلەیە دەرزییەکی موغناتیسی

پێومیه سەرەکەی هەمیشه ڕووەو شیماله جیهاتەکانی پێ دەزاندرێ.

**الأَبـور:** ئـەو تۆومیه خورمـای پـێ موتوربه دەکرێ.

**اَلمـأبَرُ:** تـوێکڵی تـۆوێ موتوربـەکردنی خورمایه.

**اَلمِئبَرُ:** دەرزی ئەستوران، دەرزی گەورە، هـەروا نێرکـی ڕووەکـی نێـر، (ك: مَآبِرَ).

**اَلمِئبَـرَةُ:** فیتنـەیی‌و دوو زمـانی، (ك: مَآبِرَ)، دەگوترێ: (فشت بینهم المـآبِرُ) فیتنـەیی‌و ئاشوب لـەناویان دا بڵاو بۆتەوە.

**الأُبرا:** شانۆنامەیەکی شیعرییه لەگەڵ مۆسیقادا ئەنجام دەدرێ (ئۆپێرا).

**الأَبْرَشـیه:** ناوچـەیەکه لـەوڵات کـە پابەنـدی دەسـەڵاتی ئـاپینی ئوسقوفێکه.

**الإِبریـزُ:** زێـڕی ساغلەمو بـێ غـەل‌و غەش.

**الإِبْرِیسـیمُ:** باشـترین جـۆری حـەریر (ئاوریشم).

**الإِبْرِیـقُ:** مەسـینه ○ حـەوجۆش، حاجەتێکه قلفەو لولەیـەکی هەیـه شلەمەنی لێوە دەکرێتـه دەرەوە، (ك: أَبارِیقَ)ە.

**إبریل:** مانگی چواری زابینی (نیسان).

**أَبَـزَ أَبْـزاً، و أُبـوزاً:** قەڵـەمبازی بـوو، لەڕاکردن دا بازی دا.

**الأَبْـزَنُ:** حـەوزێکی مەعدەنییـه خـۆی تێدا دەشۆرێت، وەکوو سوێنه وایـە، (ك: أَبازِنَ)ە.

**الإِبْـزیمُ:** قوڵفـەی قـاییش پشـتێنه (قوڵفەیـەکی مەعـدەنی یـه سـەرێکی زمانەیـەکی هەیـه سـەرەکەی تـری قایشەکه پێکەوە دەبەستێتەوە بۆئـەوەی سەرەکەی لەسەر ناوك بوەستێ).

**أَبَسَـهُ:** ڕقـی لـێ هەڵـگرت ○ ڕەخنـەی لـێ‌گرت.

**أَبِـیسُ:** گـوێلکێکی تایبـەتی‌و خـاوەن ڕەوشـتی تایبـەتی بـووە، میسـرییه کۆنەکان کردویانه بە ڕەمزی هێـزی ئاژەڵ‌و ڕێزیان بۆداناوە.

**أَبَّـشَ:** (أَبَّـشَ لأهلـه) تێکۆشـا بـۆ دابینکردنـی بـژێوی مـاڵ‌و خێزانـی، (أَبَّشَ كلاماً) قسەی بێ سـەرو بـەری کرد ○ (تَأَبَّشَ) کۆبوونەوە.

**الأُباشَـةُ:** خەڵـکی تێکـەڵ‌و هەمـەجۆر (کۆمەڵگای هەمە جۆر).

**أَبَـصَ أَبْصـاً:** گورج‌وگـۆڵ بـوو، نیشـاتی پەیداکرد.

**أَبَـضَ أَبْضـاً:** وەزع‌و حـاڵ شـێوا، بـاری ژیانی تێکچوو، (أَبَضَ البَعِیرُ) قاچـی پێشـەوەی حوشترەکەی نوشتاندەوە و بـەگوریس بەسـتی (قاچـی هەڵبەست) بۆ ئـەوەی نـەڕوا، (أَبَضَ الإِنسَانَ) ئەژنۆی نوشتاندەوە، قاچی بەڕانیەوە جوت کرد، بەلەکە قاچـی

نوساند بەرەفیسکیەوە.

**الأُبَاضِيّة**: تاقمێکی خەواریجن، لەئاخرو ئـۆخری خەلافـەی ئەمـەوی دا سـەریان هەڵـدا، دامەزرێنەرەکـەیان عەبدوڵلای کوڕی ئوباضی تـەمیمی بوو.

**الأَبْـــوض**: ئەسـپی تیـز ڕەو، ولاخەبەرزەی خۆش ڕۆ، (ك: أُبُض)ە ٥ (الَمأْبِض) ڕەفیسك، دیوی ناوەوەی کەژکەئەژنۆو ئانیشك.

**الإِبِط**: بـن هـەنگڵ، دیـوی ناوەوەی شانو باڵ ٥ لمبەلانی نەرم ٥ دامێنی چیا ٥ (تَأَبَّط الشيء): شـتەکەی خستە بـن باڵیـەوە (تـأَبَّطَ الثـوْبَ) کراسـەکەی لـەژێر بـاڵی ڕاسـتیەوە هێنـاو بەسەرشانی چەپی دا دا ٥ (تأَبَّطَـتِ المرأة الطفل) ئافرەتەکە منداڵەکەی لـەخۆگرتو سەرپەرشـتی کـرد ٥ (تَأَبَّط شراً) نازناوی (ثابت)ی کوڕی جـابیرە کـە پیـاوێکی عـەرەبی سـەردەمی نـەزانی بـووە، ئەگـەر (ئیسـمی منسـوب)ی لـێ دروسـت بکەین دەڵێین: (تَأَبَطِيّ).

**إِبط الزَّهْرَةِ**: ئەو تۆوە وردەیە کە لەنێوان لاسکی ڕوەکەو پەلکە گـەڵاکانی دا دەردەکـەوێ ٥ لەپەنـدی پێشـینانـدا دەگـوترێ:(ضـرب آبــاط الأمـوُرِ) نهێنی کارەکانی زانیو مەبەستەکان حاڵی بوو.

**أَبَقَ أَبْقاً، إِبَاقاً**: هەڵات، یاخی بوو، (تَـأَبَّقَ) هـەر بـەمانا (أَبَـقَ) هـاتووە، (....الشـيءَ) دزی وەستا، ڕقـی لـێ بووەوە، خۆی لـێ بێ بەری کرد.

**أَبَلَتِ الإبِلُ أَبْلاً وأُبولاً**: حوشـترەکان زۆر بـون، کێـوی بـوون، بـەهۆی خـواردنی گیـاو گـژی تـەڕو تـازەوە، پێویسـتی بـەئاو نـەبوو، (أَبَـلَ فـلان) فلانکـەس حوشتری زۆری بـوو (أَبَـلَ فـلان إِبالَـةِ) فلانکـەس جـوان سەرپەرشـتی حوشـترەکانی کـرد ٥ (أَبَلَ فلاناً أَبْلاً) حوشـتری دا بـە فـلان کـەس کـردی بەخاوەن حوشتر ٥ (أَبَلَت الرجـل أبـلاً وأبالة) کابرا چاودێری کرد.

**آبَلَ إِيبالاً**: حوشترەکانی زۆر بوو.

**أَبـل الإِبْـلَ**: حوشـتری ڕاگـرت (إِتَبَـلَ) حوشـتری بـەخێو کـردو قەڵـەوی کردن ٥ (تأبلت الإبلُ) بە مانـا (أبَلَت الابـلُ)وە ٥ (الْمأبَلَـة) زەوییـەك حوشتری زۆر بێ.

**الإِبَالَـةُ**: کۆمـەڵو تـاقم ٥ بـاش بـەڕێوە بردنی ماڵو سسیاسەت.

**الأبابيـلُ**: دەسـتەو کۆمـەڵی زۆرو یـەك لـەدوای یـەك ٥ بـۆ کۆمـەڵی زۆرو سەرنج ڕاکێش بەکار دەهێندرێ، لە قورئانـدا هـاتووە ﴿وَأَرْسَـلَ عَلَـيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ﴾.

**الإِبَّالةُ**: باوەشێك چیلکەو چەوێڵ ٥ لە پەنـدی پێشـینانی عـەرەب دا

هاتووه (ضغث على إبالة) چیلکەو چەوێڵ لەسەر چیلکەو چەوێڵ.
الأُبْلَـةُ: هـۆزو خـێڵ ٥ (أُبْلَـةُ الرَّجُـلِ) دۆسـتو هـاوەڵانی پیـاو، (الأُبُلَّـة) شارۆچکەیەکە نزیك بەصرە.
الأبیـــلُ: گۆچـان، دار عەصـا ٥ بـه کەشیشی مەسیحانیش دەگوترێ ٥ (الأَبیلَةُ): باوەشە دارو چیلکە.
الإِبْلِیزُ: ئەو قورو لیتەیەی چۆمی نیل لەدوای خۆی جیّ دێڵێ.
إِبْلِـیسُ: مامۆسـتاو ڕابـەری شـەیاتینی، (ك: أبالس وأبالسة)یە.
أبَنَ: (أبن الـدمُ في الجـرح): خوێنەکە لە برینەکە دا ڕەش بووە ٥ (أَبَنَ فلانـاً) ڕەخنـــەی لــە فلانکـــەس گـــرت. ڕەوشـــتی ناشـــیرینی پـــاڵ دا ٥ گوتراویشە (أَبَنَهُ بخير) واتە: ڕەوشتی چاكو باشی پاڵ فلانکەس دا ٥ (أَبَنَ الشَّـيءَ) شـوێنی فـلان شـت کـەوت (أَبَنَ الميـت) مردووەکـەی لاوانـدەوە ٥ (تَأَبَّنَ الأثرَ) شوێن پیّ‌ی هەڵگرت.
إِبَـانُ الشَّـيْءِ: کـاتو وەرزی شـت ٥ سـەرەتای شـت ٥ (إِبَانَــةُ الرجـــل): هاوەڵانی پیاو.
الإِبْنُ: کوڕ
الإِبْنَةُ: کچ.
الأُبْنَـةُ: گرێـی قـامکی قـاچ، گرێـی دارو شـتی تـر، پێشـی دەگـوترێ بزمـارە گۆشتینە ٥ عەیبو عار ٥ کینەو ڕق.
المَأْبونُ: تۆمەتبار

أَبَهَ: (أَبَـهَ لـە و بـە): لێـی حـاڵی بـوو بـۆی دەرکەوت، دەگوترێ: (هـذا شـيء لا يُؤبَـهُ بـه أو لـه) واتـە: ئـەوە شـتێکە گرنگی پیّ نـادرێ، هـەوڵی بۆنـادرێ لەبەرئەوەی هیچو پوچە.
أبَّهَ فلاناً لكذا: فلانکەسی ئاگادار کـردو سەرنجی ڕاکێشا بـۆ ئەوشـتە ٥ (تَأَبَّـهَ عليه) خۆی بەسەردا ڕانواند.
الأُبَهَةُ: شکۆمەندیو نرخداری.
أَبَا وابارة و أَبْوَةً: بوو بەباوك
أَبَـاهُ: پـیّ گـوت بـە بـاوك و دایکـەوە بەقوربانت بم.
تَـأَبَّى: بـاوکی بۆخـۆی پەیـدا کـرد ٥ (إستأبى) بەمانا (تَأَبَّى) یە.
الأَبُ: بـاوك، بـاپیر، جـاری وا دەبـیّ بـە مـامیش دەگـوترێ ٥ بـۆ خـاوەنی ئـیشو پـرۆژەو بـەدیهێنانی شـتیش بـەکاردەهێنرێت، وشـەی (الـــأب) بـەلای مەسـیحییەکانەوە ئوقنـومی یەکەمە لەسێ ئەقنومـەکانی (ثالوث المقدس).
أبـى إبـاءً و ابـاءةً: دژی ئـەو شـتە وەسـتا پیّ‌ی رازی نەبوو.
أبى الشيء: شتەکەی لیّ قەدەغەکرد.
الـأَبِيُّ: جوانمـەردو دلێـر، بـەو کەسـە دەگوترێ خـۆی لەشتی پـرو پـوچ و شـــەرم ئـــاوەڕ دوور بخاتـــەوە، دەگـوترێ: (نفـسٌ أبیَّـةٌ) نەفسـێکی بـــەرزو شـــکۆمەند خـــواز، ژێـــر دەستەیی‌و چەوسانەوە قبوڵ ناکا.

**أَتَبَ**، ئأتبَ، وَالتَنَبَ: كراسی بیٚ قۆڵی لەبەرکرد.

**الأتَابِكُ**: فەرمانڕەوا، گەورە، لەبنەڕەتدا بەو کەسە گوتراوە کە سەرپەرشتی بەخێو کردنی منداڵی پاشاو خەلیفەی کردوە، وشەیەکی تورکی یە.

**أتَدَ**: مانگاکەی بەستەوە بۆ دوشین (الإئَادُ) بەو گوریسە دەگوترێ کە قاچی مانگای پێ دەبەسترێتەوە لەکاتی دۆشینی دا.

**الأُتْرُجُ**: لیمۆ، (الأُتْرُنْجُ، الأترجَة) هەر بەمانا لیمۆیە.

**أتَلَ**: چاوگەکەی (أتْلاً و إتْلاناً و إتْلاَلاً) بەمانا هەنگاو هەڵێنانەوەی خێرا خێرایە بەڕق هەڵساوی، هەروا بەمانا ڕۆیشتنی تەمبەڵانەیە کە بەهۆی زۆر خواردنو زۆر خواردنەوەوە نەتوانێ بەخێرایی بڕوا.

**أتَمَ** أتْماً: کردنی دو مادە بەیەك، کۆکردنەوەی دوو شت تاوایان لێ بێ ببنە یەك، (أَتَمَ فلان بالمکان) فلانکەس لەو شوێنە مایەوەو جێگیر بوو، (أَتِمَ في سیره أتْماً) بەهێواشی ڕۆیشت.

**الأُتْمُ**: درەختێکە لە توێژی درەختی زەیتون، لەکێوو کەژ دەڕوێ پێی دەگوترێ زەیتونە کێویلکە، زۆر خۆڕاگرو تەمەن درێژە، (الْمَأتَمُ) کۆبونەوەی کۆمەڵێك ئادەمیزاد بەبۆنەی ناخۆشیو بۆ تازیەباری ٥ بۆ شایی‌و گۆوەندیش بەکاردەهێندرێ، بەڵام بەزۆری بۆ بۆنەی ناخۆش بەکاردەهێندرێ.

**أتَنَ** بالمکان أتناً وأتوناً: بە مانا (أَتَمَ بالمکان) هاتووە.

**أتَنَ** فلان أتاناً: بەمانا (أَتِمَ) هاتووە واتە: تەمبەڵانە جوڵایەوە ٥ (آتَنَتِ الوالدةُ) دایکەکە منداڵەکەی بە شێوەی ئاسایی نەبوو، لەپێش دا قاچی هاتن ئەمجار دەستو سەرو ملی هاتنە دەر (إسْتأتَنَ) فلانکەس ماکەری ڕاگرت.

**الأتَانُ**: دێڵەکەر، ماکەر، (ك: آتُنٌ) و (أُتُنٌ)٥.

**الأُتونُ**: ئاگردانی گەورە، جەهەندەمی حەمام، جەهەندەمی کورەی قسڵو گەچ.

**أتَا**، أتَا الشجر أتواً أتاءً و إتاءً: درەختەکە میوەکەی دەرکەوت، بەرەکەی زۆر بوو قورسایی خستە سەر قەدو لقو پۆپی درەختەکە ٥ (أتا الماشیَةُ) ئاژەڵەکە گەشەی کرد زاوزێیان کرد زۆر بون. (أتَا الحیوانُ أتواً) حەیوانەکان خۆشڕەوبونو خێرا ڕۆیشتن (أتَا فلاناً أتواً) بەرتیلی دایە.

**آتی** الشجرُ إیتاءً: درەختەکە میوەکەی دەرکەوتو بەرەکەی زۆر بوو.

**الإيتاء**: بەروبوم و دانەوێڵە ٥ (لَبَنٌ ذو إتاءٍ) شیری چەور.

**الإتَاوَةُ**: سەرانەو مەڕانە، خەرجیو باج، بەرتیل ٥ دەگوترێ: (فلان ضرب على فلان إتاوة) فلانکەس سەرانەی خستە سەر فلانکەس ٥ (شَكَمَ فاه بالإتَاوَة) بە بەرتیل دەمی ها خنی، بەرتیلی دایەو بێ دەنگی کرد، (ك: أتاوى) یە.

**الأتْوُ**: یارمەتیو بەخشش، ڕێبازو بیرو بۆچون.

**أتى أتياً و إتْيَاناً و مَأتىً و مأتاةً**: واتە: هات بە هاتن، دەگوترێ:(أتيتُ الأمْرَ من مأتاه و مَأتاتِهِ) لە ڕێگای خۆیەوە بۆ ئەوکارە چوم، بارەکەیم دۆزییەوەو کارەکەم ئەنجام دا ٥ (أتى) نزیك بووە ٥ (أتى عليه) بەسەری دا ڕۆیشت ٥ کارەکەی ئەنجام دا ٥ (أتى عليه الدهر) زەمانە تێکیەوە پێچاو فەوتاندی ٥ (أتى المكانَ) هاتە ئەو شوێنە (أتى الرَّجُلَ) هاتە لای پیاوەکە (أتى الأمْرَ) کارەکەی ئەنجام دا ٥ (أتى المرأة) چووە لای ئافرەتەکە لاقەی کرد ٥ (أتى القَوْمَ) خۆی پاڵ ئەو هۆزو خێڵە داو لەوانیش نیە ٥ غەوارەیە.

**آتى فلانٌ الشَيْءَ**: فلانکەس ئەو شتەی هێنا ئامادەی کرد ٥ لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءَنَا﴾ بەمانای تریش هاتووە یەکێ لەوانە بەخشینە (آتى المال) ماڵەکەی بەخشی، (آتى الزكاة) زەکاتی دا ٥ (آتى فلانا على كذا) رایان یەکدیگیر بوو لەسەر فلاّن شت.

**آتى الشَيْءَ**: ئەو شتەی ئاسان کرد، (آتى الماءَ و للماءِ) دەراوی بۆ ئاوەکە ئاسان کردو ڕێی بۆ کردەوە بڕوا.

**آتى اليه الأمْرُ**: ئەو کارەی بەبیردا هاتو وای بەباش زانی بەوجۆرەی بکا ٥ (تَأتى للأمْرِ) لەڕێی خۆیەوە بۆ ئیشەکە چوو (آتِيَةُ الجُرْحِ) پاشماوەی برینەکەو ئەو خوێنو زوخاوەی لێی دێ.

**الإتَاءُ**: ئەو دارو چیلکەو چەوێڵەیە کە لە دەراوی کانیاوو جۆگای ئاودا دەبێتە بەربەستو ناهێڵێ ئاوەکە باش بڕوا.

**الأتِيُّ**: کاری جێ بەجێ کراوو ئەنجامدراو.

**الأتِيُّ**: بێگانەی خۆ هەڵواسەرو بێ ئەصڵو بنیچە ٥ لافاوی هاتوو لەدوور.

**الأثْأبُ**: درەختی گەورەی توت کە زۆر لقو پۆپی هەبن ٥ (الأثْبُ) بەمانا (الأثْأبَ)دێ.

**أث، أثاً وأثاثاً وأثاثةً**: زۆر بوو، گەورە بوو (أث النَّبَاتُ) گژوگیا کە تێك چڕژاو گەشەی کرد (أث الشَعْرُ) قژەکانی

پڕ بونو درێژ بوون. (الشَعْرُ أث و أثيث) قژەكان پڕو درێژن.

أثَّثَهُ: نەرمی كردو ڕێی بۆخۆش كرد، (أثث البيت) خانوەكەی بەناومالْ ڕازاندەوە.

تَأثَّث فلان: فلانكەس خێرو خۆشی تووش هات ◦ (تَأثّث البَيْتَ): خانوەكەی بەفەڕشو قالی ڕاخست.

الأثاث: كەلو پەلی ناو مالْ وەكوو قالیو قەنەفەو شتومەكی تر، (ك: أثث)ه.

أثَرَهُ أثراً وإثارَةً وأثرَةً: شوێن پێی هەلْگرت ◦ (أثَرَ الحديث) فەرمودەكەی گێڕایەوە، لەهی ترەوە ڕیوایەتی كرد ◦ (أثَرَ السَّيْفَ) نیشانەیەكی لە شمشێرەكە داكرد بۆ ئەوەی لەگەلْ شمشێری تر لێی نەگۆڕێ.

أثَرَ علیه أثراً و أثرَةً و أثْرى: بەرژەوەندی خۆی پێش خست، لە دابەشكردن دا زۆرینەی بۆ خۆی دانا.

آثَرَهُ إيثاراً: هەلی بژاردو ڕێزی دایە ◦ دەگوترێ: (آثَرَهُ علی نفسه) بەرژەوەندییەكانی پێش بەرژەوەندییەكانی خۆی خست.

تَأثَّرَ الشَّيءُ: شتەكە نیشانەی تێدا دەركەوت ◦ (تَأثَّرَ بالشيء) ئەوشتەكاری تێكرد (إئْتَرَهُ) شوێن پێی هەلْگرت.

اسْتَأثَرَ بە: ئەو شتەی تایبەت بە خۆی كرد (استأثرَ الله فلاناً) خودا فلانكەسی مراند.

الآثارُ: زانیاری دەربارەی شوێنەوار، زاراوەیەكە بەمانا زانین دەربارەی كۆنو ڕابردوی لەمێژینەیە.

الإثار: تورەكەی مەمك (مەمكدان) جۆرە تورەكەیەكە ئافرەت لەمەمكی دەكا بۆئەوەی شۆڕ نەبنەوەو قیت بنوێنن ◦ هەروا بەو تورەكەیەش دەگوترێ كە دەكرێتە هێشووی ترێو میوەی لەو جۆرە بۆ پارێزگاری كردنی.

الأثارَةُ: نیشانە، پاشماوەی شت.

الإثْرُ: بریسكەو بریقەی شمشێر، تەڕو تازەیی دەمو چاو ◦ شوێن پێو بەدوا دا هاتن، دەگوترێ:(جاء في إثرِهِ) بەشوێن ئەوداهات.

الأثْرُ، الأثُرُ: بریسكەی شمشێر (أثرُ الشيء) پاشماوەی شت ◦ شوێنەوار و نیشانەی شت ◦ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەلْێ: (لا تطلب أثراً بعد عين) ئەم پەندە دەهێندرێتەوە بۆ كەسێك بگەڕێ بۆ شوێنەواری شتی فەوتاو ◦ بەجێماوی ڕابردوان ◦ فەرمودەی ڕیوایەتكراو، حەدیثی پێغەمبەر (د.خ)، (ك: آثار، أثور)ه.

الأثر الرجعي: ئاڕاستە بوونی قانونی تازە دەرچوو بەسەر ماوەی پێش دەرچوونی قانوونەكە.

**الأثرُ:** ئەو پیاوەی خۆی پێش کەسانی تر دەخا ٥ لەفەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە (ستَرون بعدی أثرَةً) لەوە بەولاوە دەبینن فەرمانڕەوا ستەمکارەکان شت بۆ خۆیان قۆرغ دەکەن.

**الأثرَة:** پلەو پایە ٥ دەگوترێ: (لفلان عندي أثرةٌ) فلانکەس لای من پلەو پایەی تایبەتی هەیە ٥ ئەوکەسە ی خۆی پێ لەکەسانی دیکە باشترە.

**الأُثرَة:** شوێنەوارو شوێندەست لەسەر زەوی، رەوشتی بەرزو بۆماوە لەبنەماڵەکەی دا ٥ دەگوترێ: (هو ذو أثرَةٍ عندي) ئەو ئادەمیزادە جێگای رێزو نرخە لام.

**الأثریُ:** شتی کۆنینە ٥ توێژەرو لێکۆڵەرەوە لەبواری شوێنەوار دا.

**الأثیر:** بریسکەی شمشێر ٥ بەلای زانایانی سروشتەوە (أثیر) ناوە بۆ شلەمەنی یەك کە بۆشایی پڕدەکاتەوە ٥ لەلای کیمیا گەران شلەمەنی یەکی بێ ڕەنگە ٥ مادە چەورایی یەکان دەتوێنێتەوە، لەبواری پزیشکی دا بەکار دێ.

**الإیثار:** ئەوەیە ئادەمیزاد بەرژەوەندی کەسانی دیکە پێش هی خۆی بخا.

**الایثاریة:** لەلای زانایانی ڕەوشتو ئەخلاق رێبازو بیروکەیەکە دژی خۆپەرستیو پێش خستنی بەرژەوەندی خۆت بەسەر هی کەسانی دیکەدا ٥ بانگەوازی بۆ ئەوە دەکا کە بەرژەوەندی کەسانی دیکە پێش بەرژەوەندی و دەستکەوتی خۆی بخا ٥ بەلای زانایانی دەروون ناسییەوە گرنگی پێدانی ئادەمیزادە بە کەسانی دیکە، بەرژەوەندی ئەوان پێش هی خۆی بخا جا ئەم ڕەوشتە سروشتی بێ یان بەکەسبو خۆڕام کردن بێ.

**التأثریة:** لە ڕەخنەدا رێبازو بیرو بۆچوونێکە پێی وایە ڕەخنەی ئەدەبی ئەوەندەی پابەندی زەوقو کارتێکردنی کەسایەتی دەبێ ئەوەندە پابەندی بنەما کارپێکراوەکانو قاعیدە عەقلییەکان نابێ.

**المأثور:** میراتو جێماوی رابوردوان بۆکەسانی سەردەم ٥ فەرمودەی ریوایەتکراو، ئەو فەرمودانەی لە پێغەمبەری ئیسلامەوە گێڕدراونەوە.

**أَنِفَ أَنفاً:** جێگیر بوو، سەقامگیر بوو، (ألفَ فلاناً) شوێنی کەوت، بۆی گەڕاو شوێن پێی هەڵگرت.

**أثفَ القِدر ایثافاً:** مەنجەڵەکەی خستە سەر سێ کوچکە.

**أثَّفَ القدر:** بەمانا (أثفَ القِدرَ)ە یە ٥ (تأثَّفَتِ القِدرُ): مەنجەڵەکە خرایە سەر سێ کوچکە.(تأثَّفَتِ القومُ) خەڵکەکە هاریکاری یەکتربون ٥

(تَأثفَتِ القومُ المكان) ئەو هۆزە لەوشوێنە جێگیربوونو تێیدا مانەوە، بەجێیان نەهێشت.

الأُثْفِيَّةُ: یەکێك لەوسێ کوچکە ئاگردانەیە کە مەنجەڵی دەخرێتەسەر، (ك: أثافي)یە (ثالثة الأثافي) سێیەمی سێ کوچکە ٥ بەمانا بەڵای گەورەش هاتووە ٥ دەگوترێ: (رماه بثالثة الأثافي) واتە: بەڵایەکی گەورەی توشکرد.

أَثَلَ أثولاً: جێگیر بوو چەسپا (أَثَلَ أثالةً) شەرەفمەند بوو، وەجاخزادە بوو، شکۆمەندیی بەدەست هێنا.

أثَّلَ: دەوڵەمەند بوو ٥ (أثَّلَ الشيءَ) رەسەنایەتی ئەو شتەی چەسپاند، (أثَّلَ مالاً) ماڵو سامانی پەزمەندە کرد بۆ ئەوەی بەرهەمی بێنێ.

أثَّلَ مالاً: گەشەی بەماڵو سامانەکە کرد (أثَّلَ أهْلَهُ) پۆشاکی بۆ ماڵو خێزانی کردو رێزی لێ گرتن، (أثَّلَ فلاناً بمالٍ أو برجالٍ) پشتگیری فلانکەسی کرد بەماڵو سامان یان بە پیاوو دارو دەستە بە هێزی کرد.

تأثَّلَ: چەسپا، جێگیربوو، شکۆمەندی بەدەست هێنا.

الأثالُ: ماڵو سامان ٥ شەرەفو پیاوەتی ٥ وەجاخزادەییو کەسایەتی.

الأَثْلُ: درەختێکە لە پێری (طەرفاوی) بەرزو راست هەڵچوە بەتەمەنە، دارەکەی داری چاكو بەسودە، لقو پۆپی زۆرن، گەڵاکانی باریکن.

الأَثْلَةُ: ئەصڵو رەسەن ٥ دەگوترێ:(لفلان أثلةُ مالٍ) فلانکەس ماڵی چاكو باشی هەیە.

الأَثْلَةُ: کەلو پەلی ناوماڵ.

الأثيلُ: لە کیمیادا بەچەند تاکێکی هاوکێشەیی دەگوترێ کە پێك هاتوون لە دوو گەردیلەی کاربۆنو پێنج گەردیلەی ئیدرۆجین.

أثِمَ: تاوانی کرد چەند چاوگێکی هەیە: (أَثْماً، إثْماً، آثاماً، مَأْثَماً، آثِمَةُ إيثاماً): خستیە ناو تاوانەوە ٥ تاوانی پێ کرد ٥ (أثمَهُ) بە تاوانباری دانا ٥ (فلان يَتَأثَّمُ من الصغائر) فلانکەس خۆی لەتاوانی بچکۆلە دەپارێزێ ٥ (تَأثَمَ) تۆبەی لەتاوان کردو پاڕایەوە خودا لێی خۆشبێ.

الآثام: سزای تاوان، بەمانا تاوانیش هاتووە.

الإثْمُ: گوناهو تاوان ٥ کە بکەرەکەی شیاوی سزادان بێ لەسەری، (ك: آثام).

الإثْمِدُ: کل ٥ مادەیەکی مەعدەنییە شێوەی بلوریو رەنگی قصدیرییە رەقە ورد دەکرێو چاوی پێ دەرێژرێ.

أثَا: فیتنەیی کرد ٥ (آثاه مواثاة) دژایەتی لەگەڵ کرد، (تآثَوا) کێشەیان لەناو

خۆیان بەرپاکرد، کێشەیان تێکەوت.
**اجَّتْ، اجَّتِ النارُ اجّاً واجيجاً واجَّةً:** بڵێسەی کرد کڵپەی کرد لرفەی هات. دەگوترێ: (مَرَّ يَؤُجُّ في سيره) رۆیشت لە رۆیشتنەکەی دا لرفەو ورشەی هات ◦ (و سمعت اجَّةَ القوم) گوێم لە خشەی رۆیشتنەکەیان بوو ◦ (أجَّتِ الشيءُ) ئەوشتە بریسکەی دا ◦ (أجَّتِ النهار) رۆژەکە گەرم بوو ◦ (أجَّتِ الأمرُ) کارەکە چەواشە بوو ◦ (أجَّتِ الماءُ) ئاوەکە تاڵو سوێر بوو.
**أجَّجَ النار:** ئاگرەکەی داگیرساند، (أجَّجَ بينهم الشرَّ) شەڕو ئاژاوەی خستە ناویانەوە ◦ (أجَّجَ الماءَ) ئاوەکەی سوێرو تاڵو تفت کرد ◦ (إئتَجَّتِ النارُ) ئاگرەکە داگیرسا ◦ (إئتجتِ النهارُ) رۆژەکە گەرم بوو (تأجَّجَتْ النار) بەمانا (إئتجت)ە دەگوترێ:(تأجَّجَ فلان غضباً وذكاءً) فلانکەس رقی هەڵسا ◦ تورەبوو هەڵچو.
**الأُجَاجُ:** ئەو ئاوە یە لەبەر تاڵیو سوێری دەمو زوبان دەگەزێ.
**الأُجُوْجُ:** چرای زۆر روناكو شوعلەدار.
**أجَدَ البِناءَ أجداً:** دیوارەکەی پتەو کرد قایمو مەحکەمی کرد ◦ دەگوترێ:(الحمد لله الذي أجدني بعد ضعف) سوپاس بۆ ئەو خودایەی جەستەی بێهێزو لاوازی ساغو پتەو کردم ◦ (آجَدَهُ إيجاداً) بەمانا (أجَدَه) دێ ◦ دەگوترێ: (إنه لَمُؤجَدُ الانياب و الاظافر) ئەوە پتەوکەری کەڵبەو نینۆکە.
**الأُجُدُ:** حوشتری مێینەی تێك سمڕاوی جەستە داڕژاو.
**أجَرَ العظمُ: أجراً وأجوراً، وإجاراً:** ئێسقانەکە یەکتری گرتەوە بەناڕێکی ◦ (أجَرَ فلاناً) فلانکەسی بەکرێ گرت ◦ (أجَرَ العاملُ صاحبَ العَمَل) کرێکارەکە ڕازی بوو ئیش بۆ خاوەن کارەکە بکا بەکرێ ◦ (أجَرَ اللهُ عَبْدَهُ) خودا پاداشی بەندەی خۆی دا یەوە.
**أجِرَ فلان في ولده:** کابرا منداڵەکەی مردو خودا پاداشی دایەوە.
**آجَرَهُ ايجاراً:** بەمانا (أجَرَهُ) یە ◦ (آجره من فلان الدارَ): خانوەکەی لێ بەکرێ گرت ◦ (آجَرَهُ مُؤاجَرَةً) شتەکەی لێ بەکرێ گرت.
**إئتَجَرَ:** لەئاکامی خێرو بەخشینی دا بەهیوای پاداش بوو ◦ (إئتَجَرَ على فلان بكذا): بەکرێ ئیشی بۆ فلانکەس کرد.
**اِستَأجَرَهُ:** کردی بەکرێکاری خۆی.
**الإجَارَةُ:** کرێی ئیش، کرێ بەستێکە بەمەبەستی سود وەرگرتن لەپێناو عیوەزێکی تایبەتی دا.

**الأَجْرُ:** بەهای کارو کردەوە. (أجْرُ المهرِ) حەقی مارەیی، (ك: أجور)ە ٥ لەقورئاندا دەفەرموێ: ﴿فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ مارەیی ئافرەتەکانتان بدەن کە مافێکی خۆیانە ٥ (الأَجْرُ) لە زاراوەی ئابوری ناسان دا ئەو موچەو کرێیە یە بەشی بژێوی کرێکارەکە بکا ٥ (الأجر الحقيقي) بەو پارەیە دەگوترێ کە دەست کرێکارەکە دەکەوێو نرخ و بەهای خۆی هەیە.

**الأَجِيرُ:** بەو کەسە دەگوترێ بە کرێ کار دەکا، (ك: أُجَرَاءُ)ە.

**إِسْتَأْجَزَ على الوسادة و نحوها:** سنگی خستە سەر سەرینو ڕەپەوڕو کەوت ٥ (إِسْتَأْجز عن الوسادة) لە پشتییەکە دوور کەوتەوە.

**الإِجَازُ:** ئەوەیە ئادەمیزاد سنگ بخاتە سەر سەرین ڕەپەوڕو بکەوێ ٥ واتە: لەسەر تەنیشتی چەپو ڕاست ڕانەکشێ.

**الأَجْزَخَانَةُ:** دوکانی دەرمانخانە (صەیدەلی).

**الإِجَّاصُ:** درەختێکە لە پێڕی درەختە گوڵدارەکانە، میوەکەی شیرینو خۆشە ٥ لەوڵاتی سوریاو فەلەستین ناوە بۆ سێو.

**أَجَلَ الشَّيْءَ أَجْلاً:** ئەو شتەی قەدەغە کردو مەنعی کرد.

**أَجَلَ فُلَانَاً:** تیماری مل وەرگەڕانی بۆکرد، ملی چاك کردەوە.

**أَجِلَ فُلانٌ:** فلانکەس ئازاری مل وەرگەڕانی بوو.

**آجَلَهُ:** مەنعی کرد نەیهێشت ٥ (أَجَّلَ الشَّيْءَ) ئەو شتەی دواخست، کاتی بۆ دیاری کرد ٥ (أَجَّلَ الماءَ) ئاوەکەی کۆکردەوە.

**تَأَجَّلَ الشَّيْءُ:** بەمانا (أَجَّلَهُ)دێ ٥ (تَأَجَّلَ فلاناً) داوای لێ کرد کاتی بۆدیاری بکا.

**إِسْتَأْجَلَ فلاناً:** داوای لەفلانکەس کرد کاتی بۆدیاری بکا ٥ (الآجِلَةُ) قەرز.

**الأَجْلُ:** هۆکار. دەگوترێ: (من أجْلِكَ فعلت كذا) لەبەر خاتری تۆ ئەوەم کرد، بەهۆی تۆوە بوو هاتم.

**الإِجْلُ:** جەڵەبە گاکێوی و جەڵەبە ئاسك، (ك: آجال)ە.

**الأَجِيلُ:** کاری دواخراو بۆکاتی دیاریکراو ٥ (الأَجِيلَ مِنَ الماءِ) شوێنی کۆبونەوەی ئاو، ئەستێراو، ئەو ئاوەی کۆدەکرێتەوە بۆ ئاودانی درەختو باغچە.

**الْمَأْجَلُ:** ئەستێراوی گەورە ئاوی تێدا کۆدەکرێتەوە و پاشان بەرەڵا دەکرێ بۆ ئاودانی دێبەرو باخ، (ك: مَآجِل).

**أَجَمَ أَجَمَاً وأجوماً:** بەرق هەڵساوی بێدەنگ بوو (أَجَمَ الْمَاءُ) ئاوەکە بۆنی

کردو گۆڕا ٥ (أجَمَ الطعَامَ وغيره): لەخواردنی ئەو خواردنە وەڕز بوو ٥ (أجَمَ النارُ أجْماً و أجيماً): ئاگرەکە بڵێسەی سەندو نێڵە نێڵەی کرد ٥ (أجَمَ فلاناً): زۆرە ملێی لێ کرد تا بە ناچاری کارێکی بەنابەدڵی پێ ئەنجام دا.

**اجِمَهُ اجَماً اَجِمَهُ:** دەگوترێ: (داوم علی طعام واحد حتی اجِمَهُ) بەردەوام بوو لەسەر یەك جۆر خواردن تالێی وەڕز بوو ٥ (أجَمَ النارَ) ئاگرەکەی هەڵگیرساندو خۆشی کرد.

**تـأجَمَ النـارُ:** ئاگرەکە بڵێسەی سەند ٥ (تَأجَّمَ علیه) ڕقی لێ هەڵسا، لێی توڕەبوو.

**الأُجُمُ:** قەصرو باڵەخانە، (ك: آجَامَ)ە.

**الأَجَمَةُ:** درەختی گەورەو پڕگەڵاو لق‌و پۆپ، (ك: أجَمٌ، إجَامٌ، آجَامٌ)ە.

**الأجوم:** خەفەتبارو مەلول ٥ کەسێك زۆر رقی لە شتێك بێ.

**أجَنَ الماءُ أجْناً وأجوناً:** ئاوەکە تام و رەنگ و بۆنی گۆڕا ٥ دەگوترێ: (يُفْسِدُ الرَّجُلَ المجونُ كَما يُفْسِدُ الماءَ الأجونُ) لەهو لەعب‌و بێ ڕەوشتی پیاو دەفەوتێنێ وەکوو چۆن گۆڕان ئاو بێ کەڵك دەکاو سودی سەرەکی لێ نابیندرێ ٥ (أجَنَ القَصارُ الثوْبَ) جل شۆرەکە کراسەکەی تەڕکردو بەدار کوتای بۆئەوەی پاك بێتەوە.

**أجَنَ الماء:** ئاوەکە تام‌و بۆن‌و رەنگی گۆڕا ٥ (أجِنَ اجْناً) بەمانا (أجِنَ) یە، (أجُنَ أجُونَةً و أجَانَةً) هەر بەمانا (أجَنَ)دێ.

**الإجَانَةُ:** سوێنە یان گلێنە تەشتێکە پانکەڵەیە لەگڵ یان لە ماددەی تر دروست دەکرێ جلی تێدا دەشورێ، (ك: أجاجِينَ).

**الأجَنَّةُ:** ئامێرێکە لە ئاسنی زۆر ڕەق بۆ شکاندنی ماددەی رەق بەکاردێ.

**اَلمِنْجَنَةُ:** ئەو دارە تایبەتیەیە کەجل شۆر بەکاری دێنێ بۆ کوتانی جلە تەڕەکانی کە دەیانشوا ٥ (الِميجَنَةُ) هەر بەمانا (المِنْجَنَة)یە.

**أخْ:** لاسایی کردنەوەی دەنگی کۆکەو کەسێك سینگی بێشێ.

**أحَّ احّاً وأحَاحاً واحیحاً:** کۆکەی گرت کۆکە کۆکی هات ٥ ئازاری پەیدا بوو ٥ زۆری تینو بوو.

**أحَّـی:** بەمانا (أحّ) دێ ٥ (الأحَـاحُ) تینوایەتی ٥ ڕق‌و کینە.

**الأحِيحُ:** ڕق‌و کینە.

**أحَّدَ الشيىءَ:** بەتاك‌و تەنهای ناسی تەوحیدی ئەنجام دا ٥ (أحَّدَ العَشرةَ) دەیەکەی کردە یازدە.

**إستَأحَدَ:** تاك بووە.

**أحَادَ:** یەك یەك ٥ دەگوترێ: (جاءوا أحادَ، و جاءوا أحَادَ أحَادَ) هاتن یەك بەدوایەك دا.

**أحَدْ:** بەشێوەی نەکیرەیی ناوە بۆ هەموو ئەوانەی دەکرێ خیطابیان ئاڕاستە بکرێ دەگوترێ:(لیس في الغرفة أحَدٌ) کەس لە ژوورەکەدا نیە ٥ لەقورئان دا دەفەرموێ: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ﴾ محمد باوکی هیچ کام لەئێوەنیە.

**الأحدُ:** یەك ٥ هەوەڵ ژمارەیە لە ریزی ژمارەکان ٥ دەگوترێ: یەك، دوو، سێ، چوار.... هەروا ناوێکە بۆ رۆژێکی هەفتە کە یەکشەممەیە، (ك: آحاد، أُحدان، احَدُون) ٥ دەگوترێ: (فلان أحد الأحَدِينَ) فلانکەس یەکێکی ئەو کۆمەڵەیە ٥ بۆ مێینە دەگوترێ: (إحْدى) (إحدى عشرة) یانزە (إحدى و عشرون) بیستو یەك... هەروا (إحْدى) بەمانا کاری گەورەیە، کاری دزێوە ٥ دەگوترێ: (أتى بإحْدَى الأحَدِ) کارێکی گەورەی ئەنجام دا.

**أحِنَ** علیه أحَناً وأحْناً: رقی لێ بووەوە، دژایەتی کرد ٥ دەگوترێ: (بینهما مضاغنة عظیمة و مؤاحنة قدیمة) لە نێوانیان دا دوژمنایەتیەکی گەورەو رقو کینەیەکی کۆن هەیە.

**الإحْنَة:** کینەو رقو بوغض، (ك: إحَنَ)ە دەگوترێ: (إن الإحَنَ تجر المِحَنَ) رقو کینە بەڵاو ناخۆشی دێنێ.

**أخْ:** دەنگێکە ئازارو ناڕەحەتی دەگەیەنێ.

**إخْ:** دەنگێکە حوشتری پێ بیخ دەدرێ.

**الأخُ:** برا، (الأخُ الشقیق) برای باوکو دایکی (الأخ لأب) برای باوکی ٥ (الأخ لأم) برای دایکی.

**الأخُ والإخُّ:** چڵکنو قێزلێکراو بەکوردی (قخ)ی پێ دەگوترێ ٥ بەزۆری ئاڕاستەی منداڵ دەکرێ.

**الأخِيخَةُ:** خۆراکێکە لەئارد دروست دەکرێ ٥ کەمێك ئاوو زەیتی یا ڕۆنی بەسەردا دەکرێو دەخورێتەوە.

**أخَذَ** الشيء أخذاً وتأخاذاً ومأخذاً: ئەو شتەی وەرگرت پێی خەنی بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا﴾ ئەی موحەممەد لەماڵو سامانی موسوڵمانان زەکات وەربگرە، لە چڵکی چروکیو دەست قوچاوی پاکیان بکەرەوە بامالّو سامانەکەیان گەشە بکا.

**أخَذَ:** قبوڵی کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي﴾.

**أخَذَ فلاناً:** فلانکەسی بەند کرد، قورئان دەفەرموێ: ﴿فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُ﴾ لەجیاتی ئەو یەکێك لەئێمە بەند بکە.

**أخَذَ:** سزای دا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ﴾ سزای خودا

ئـاوا بـەو جۆرەیـە ە بـەمانای کوشـتنیش هـاتووە قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ﴾ هەریـەك لەوگەلانە هەوڵی دا پێغەمبەرەکەی خۆیان بکوژن.

أخَذَ: بـەمانا دیلـی کـرد ﴿فَاقْتُلُواْ الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ﴾.

أخَذَ: بەمانا زاڵبوو ﴿لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ﴾.

أخَذَ: بەهەر دو دەستی گرتی، (و أخـذ براس اخیه يجره اليه).

أخَذَ فلاناً: پاداشتی فلانی دایەوە، سزای دا.

أخَذَ الله فلاناً: خودا فلانکەسی لەناوبرد.

أخَذَ علی يد فلان: نەیهێشت فلانکەس ئەوکارە بکا.

أخَذَ علی فَمِهِ: قسەکردنی لێ قەدەغە کرد، نەیهێشت دەم بکاتەوە.

أخَذَ مَأخَذَ فلان: ڕێبازی فلانکەسی گرتەبەر، ڕەوشتی ئەوی وەرگرت.

أخَذَت فيه الخمرُ: مـەی وشـەرابەکە کاری تێ کرد.

أخَذَ الشيءُ حَدَّهُ: ئـەو شتە بـاری خـۆی گرتو جێی خۆی کردەوە.

أخَذَ اللَّبَنَ: شیرەکەی ترش کرد.

أُخَذَ في الأمرِ: دەستی بەکارەکە کـرد.

(آخِذ) وەرگر ە (مَأخوذ:) وەرگیراو (أخيذ) بەمانا (مَأخوذ) دێ ە (أخاذ و نَبّاز) بەکەسێك دەگوترێ: هەڵپە بکا بۆ بەدەستهێنانی شتێك‌و هەر کە دەستی کەوت خێرا وازی لێ بێنێ.

أخِذَ الرضيعُ أخْذاً: شیرەخۆرەکە بەهۆی شیر زۆری دایکییەوە قەڵەو بوو.

أخِذَتِ العَيْنُ: چاوەکە هێشا، توشی تراخوما بوو.

أخِذَ الحيوان: ئاژەڵەکە شێت بوو هار بوو.

أخُذَ اللَّبَنُ أخوذةً: شیرەکە ترشا.

آخَذَتْه الساحرة: جادوبازەکـە فێڵـی لێکردو داوی بۆنایەوە.

آخَذَهُ بِذَنْبِهِ: لەسەر تاوانەکەی سزای دا.

أخَّذَ الجَمَلَ: حوشترەکەی بەستەوە.

أخَّذَت الساحرة: بـەمانا (آخَذَتـه) دەگوترێ: (هـو مُؤَخَّذ عـن النساء) ئـەوپیاوە بەسـتراوە، جادویـان لـێ کردوە نابێ بەزاوا.

إئتَخَذَ القوم في القتال: خەڵکەکە هەنـدێکیان هەنـدێکیانیان گـرت (إئتَخَذَ في المصارعة:) هەریەکـەو هاوشـانی زۆرانبـازی خـۆی گـرت‌و پاشقولی لـێ گـرت‌و داوی بۆنایـەوە ویستی بیخاتە داوەکەیەوە.

إئتَخَذَ فلان لمرضه: فلانکـەس گەردنکەچـی نەخۆشـییەکەی بـوو نـەیتوانی بەسـەری دا زاڵ ببـێ ە بـاری بەنەخۆشـییەکەوە گـرت ە (إتَّخَذَه) بەمانا (أخَذَهُ)دێ.

إسْتَأخَذَ فلانٌ: فلانکەس گەردنکەچ بوو، لەبەرچـاو ئێشـەی سـەری خـۆی

رادەوەشێنێ (إستَأخَذَ الشعرُ) مووی ریشی، موی سەری درێژ بوون ناچار بوو کورتی کردنەوە.

**الإخَاذَة**: زەوی یەکە ئادەمیزاد بۆخۆی دیاری دەکاو دەستی بەسەردا دەگرێ ٥ گۆماوی بچوك ئاوی پاشماوەی لافاو کەلە شوێنێك دا بمێنێتەوە ٥ دەسکی مەتاڵ، دەسکی دێو جامە.

**الأخــذُ والإخــذ**: رێو شوێنو رێبازو پەیرەوو پرۆگرام ٥ ئەو چاڵەیە ئادەمیزاد لەشێوەی حەوزدا هەڵی کەنێ، (ك: أخذان)ە.

**الأُخُذُ والأَخَذ**: چاو ئێشە، (ك: إخاذ)ە.

**الأُخــذَة**: ئەو فێڵو پاشقولگرتنەیە زۆرانبــاز بــەکاری دەهێنێ دژی بەرامبەرەکــەی ٥ ئەو فێڵو چاو بەستەکییە یەکە لەجادودا دەکرێ.

**الأخِيــذُ**: دیــل، گــیراو لەشــەڕدا ٥ دەگوترێ:(هو أخِيذ في يد العدو) ئەو پیاوە دیلە لەژێر دەستی دوژمن دایە.

**الأخِيذَة**: ئافرەتی رفێندراو، گیراو داگیر کراو لەشەڕدا ٥ هەرشتێکی تر داگیر کرابێو دەستی بەسەر دا گیرابێ.

**المَأخَــذُ**: پەیرەو مەنهەج ٥ هەروەها ئەو رەخنــەو عــەیبو عارانــەی لــەکاری ئەنجامدراو دەگیرێ، (ك: مآخِذ) ٥ (مآخِذ الطــير) شوێنە ڕاوی بالندە ٥ (مآخِــذ الشيء) سەرچاوەو کانی ئەو شتە.

**أَخَّرَ**: دواکەوت (أخَّرَ الشيء) شتەکەی خستە دواکاتو شوێنی خۆی ٥ (أخَّرَ الميعادَ) وادەکەی دواخست.

**تَأخَّرَ عنه**: دوانەو هات.

**إستَأخَرَ**: بەمانا دوا ئەوهات.

**الآخَــرُ**: یــەکێك لــە دوشــت بەمــەرجێ لەیەك بنەماو رەگەزبن.

**الآخِــرُ**: دوایین: پێچەوانەی یەکەمە ٥ ناوێکیشــە لــەناوە جوانــە کــانی پەروەردگار.

**الآخِرَةُ**: رۆژی دوایی، بەرامبەر دونیا ٥ ژیانی پاش مردنو زیندو بونەوە (الآخــرة) قولینچکی چاو بــەلای زوڵف دا ٥ فرۆشتنی شت بەقــەرز (الآخَــرَة و الأَخــرَةُ) کۆتــایی شــت دواجار.

**الأُخــرى**: مێینــەی (الآخَــرَ)ە ٥ رۆژی قیامەتە ٥ بەمانا هەرگیزاو هەرگیز ٥ دەگوترێ:(لا أفعَلَهُ أخرى الليــالي) واتە قەت ئەو شتە ناکەم، (ك: أخَر، أخرَيات)ە.

**الأخِيرُ**: دوایین ٥ دەگوترێ: (لَقِيتُهُ أخيراً) دوایــین کــەس توشــی بــووم ٥ (المِئخَــارُ) ئــەو کەســەی زۆر دوا دەکەوێ لەکارو وادەی دا ٥ (المِئخَــار مــن الشــجر) ئــەو درەختەیــە میوەکــەی دەکەوێتــە دوای وەرزی خۆی، (ك: مآخير).

**المؤخِرُ من العين**: تیلەی چاو بــەلای زوڵف دا ٥ (المؤخِرَةُ من العين) بــەمانا (المؤخِّرُ)ە.

**اَلْمؤَخـــَّرُ**: كۆتـــایی شـت لـه دواوه ◊ دهگوترێ: (مُـؤَخَّرُ السـفينة) پاشینی کهشتی (مُؤَخَّرُ البناء) پاشی خـانوو ◊ (مُؤَخَّرُ المهر) مارەیی قەرز.

**اَلْمُؤَخِــّرُ**: ناوێکـه لـهناوه جوانـهکانی خودا.

**مُؤَخـــَّرَةُ الجَـيْشِ**: هێڵـی دواوەی سـوپا ئەرکەکـەی ئـەوە دەبـێ ئـەهێڵێ دوژمـن بێتـه پێشـەوە تـا هێڵـی پێشەوە پاشه کشه دەکا.

**الإِخـــْشِيدُ**: نـــاز نـــاوی پاشـــاکانی فەرغانەیــه ◊ بــەمانا شــای شــایان، شاهنشــا ◊ نازنـــاوی موحەممـــەدی کوڕی طوغجه کـه لەساڵی (٣٢٦ هـ - ٩٣٧ز) فـەرمانڕەوای میصـر بـووە، ئەم نازناوە بۆ ئەو لـەم ڕووەوە بـووە کــه نــاوبراو لەنـــەوەی پاشـــاکانی فەرغانه بووە.

**الأُخـْطُبُوط**: گیانلەبـەرێکی ناودەریایـه جەسـتەی بازنـەیی هەیــه هەشـت قاچـــی هەیـــه هەرشـــتێکی گـــرت هـــەموو قاچـــەکانی تێوەردێنـــێ و بەری نادا.

**اخا** فلاناً أخوة، وإخاوةً: فلانکەسـی کـردە برای خۆی.

**آخـى فلانــاً مؤاخـاة وإخـاءً**: فلانکەسـی کردە برای خۆی.

**آخى بينهما**: وەکوو دوبرای لـێ کـردن، هـــاوکوفیو هاوشـــانی خســـته ناویانەوە.

**آخى في فلانٍ آخِيَةً**: چاکه یـەکی لەگـەڵ فلانکەس کـرد ◊ شـتێکی باشـی لـەلا ئەنجام دا.

**أَخَّى فلانـاً**: پـێی گـوت براگیانەکـەم ◊ (أَخَّى الدابة) قوڵفەی بەستنەوەی بۆ چوار پێیەکه دابین کرد.

**تَأَخَّى فلاناً**: فلانکەسی کـرد بـه بـرای خـۆی ◊ (تَـأَخَّى الشـيء) پشکنینی ئەو شتەی کرد.

**الآخِيَّةُ**: قوڵفەیەکه لـەدیوار دەکوترێ یــان بــه زەوی دا دادە کـوترێ بـۆ ئەوەی وڵاغ، ئاژەڵ هەرچوار پێیـەك بـێ پێـی دەبەسـتنەوە ◊ (الآخِيَـــة) چـــاکەو پیـــاوەتی، (ك: أواخ)ە ◊ (الآخِيَـةُ) عەهـدو پـەیمانو بـەڵێن ◊ دەگوترێ: (له عندهُ آخِيَةٌ ترعـى) لای فلان وادەو بەڵێنو پـەیمانێك هەیـه کاری پێ دەکرێ.

**الأخ**: برا ئەوکەسـەیه تـۆو ئـەو سکێك یـــان پشـــتێك یـــان ســـكو پشـــت هەردوکیان ئێوەی کۆکردبێتەوە.

**الأخ مـــن الرضـــاعة**: بـرای شـیری ئـەو کەسـەیه تـۆو ئـەو هاوبـەش بـوبن لەشیر خـواردنی مـەمکی ئافرەتێـك دا.

**الأخ**: دۆسـتو هـاوەڵی بـاش ◊ بـرا ئـەو کەسـەیه لـه تەنگانـەو ناخۆشـی دا فریـات بکـەوێ ◊ یارمـەتیت بـدا ◊ هـەر لـه پەنـددا هـاتووە دەڵـێ (رب أخ لم تلـــده أمـــك) زۆر بـــرا هەیـــه

دایکت بەوەلەدی نەهێناوە.

**الأخ:** هاوشـــان‌و هـــاوەڵ و هاوبـــەش، خاوەنی شت.

**الأُخـــتُ:** خوشـــکی بـــاوك‌و دایکـــی، خوشـکی بـاوکی، خوشـکی دایکـی، خوشکی شیری.

**الأُختُ:** هاوشان‌و هاو وێنە ◊ دەگوترێ: (رمـاه الله بليلـة لا أخـت هـا) خـودا بەلایەکی بێ وێنەی بەسەردا دان.

**أخت يوشع:** کینایە یە لەخۆر.

**أَدَبَ أدبـاً:** خواردەمـەنی دروست کـرد و خەڵکی داوەت کرد.

**أَدَبَ القـــوم:** بـــانگی خـــزم‌و دۆســـت ناسیاوەکانی کـرد بـۆ میوانـداری‌و نـانخواردن ◊ خـواردنی بـۆ دروسـت کردن.

**أَدَبَ فلانـــاً:** فلانکەســـی راهێنـــا لەســـەر ڕەوشـــتی جـــوان‌و داب‌و نـــەریتی پەســـەند ◊ بانگـــەوازی کـــرد بـــۆ ڕەوشـتی جـوان (أَدَبَ القَـوْمَ علـى الأمر) قەومەکەی لەسەر فلان کـار کۆکردەوە، هەڵینان بۆ کردنی.

**أَدَبَ فـلانٌ أدبـاً:** فلانکـەس خـۆی ڕاهێنـا لەسەر ڕەوشتی جوان.

**أَدُب فلانٌ:** فلانکەس لـەبوارەکانی ئـەدەب دا پێشکەوت‌و شارەزابوو.

**آدَبَ إيـداباً:** خواردەمـەنی ئامـادە کـرد، دەعوەتی خزم‌و ناسیاوەکانی کـرد ◊ بانگی کردن بۆ نانخواردن.

**أدَّبـهُ:** ڕایهێنـا لەسـەر ڕەوشـتی جـوان‌و بەرز، فێری بوارەکانی ئـەدەبی کـرد ◊ تـــەمبی خـــواردوی کـــرد لەســـەر خراپـــەکانی ◊ دەگـــوترێ: (أَدَّبَ الدابَّـةَ): چـوار پێیەکـەی راهێنـاو ژێربـاری کـرد، ژێـر نـیری خسـت، نیری خستە سەرمل، کورتانی کرد.

**تـأدَّبَ:** فێـری ئـاداب‌و ڕەوشـت بـوو، لـەبوارەکانی ئـەدەب دا شارەزابوو ◊ (تأدَّب بأدب القرآن) فێـری ئـەدەبی قورئـان بـوو، بـەگوێرەی قورئـان هەڵس‌و کەوتی کـرد ◊ (تأدَّبَ بـأدب الرســـول): بـــەگوێرەی ڕەوشـــتی پێغەمبەر هەڵس‌و کەوتی کرد.

**الآدِبُ:** خـــاوەنی دەعـــوەت‌و نـــان‌و خوانەکـە ◊ ئەوکەسـەی میوانـداری میوانەکانی کرد.

**الأدَبُ:** ڕیازە پێ کردنی نەفس‌و دەروونە بـــەفێرکردن و پاڵفتـــە کـــردن‌و راهێنـــان لەســـەر ئـــەو ڕەوشـــتانەی پێویستن ◊ کۆمەڵێك ئاکارو ڕەفتارن دەبـــێ پابەنـــدیان بـــێ ◊ شـــیعرو پەخشانی جوان‌و سەرنج ڕاکێش ◊ هـــەموو ئەوشـــتانەی عـــەقڵی ئادەمیزاد بەرهەمی هێناون ◊ (علوم الأدب) زانیارییـــەکانی ئـــەدەب (زمانـــەوانی، صـــەرف‌و نـــەحوو مەعانی‌و بەیان‌و بـەدیع عـورووض‌و قافیـــەو خۆشـــنوس‌و داڕشـــتن‌و موحـاضـەرەدان)، (ك:آداب)ە. لـەم ڕۆژگارەدا (آداب) نـاوە بـۆ زانیـاری

مێــــژوو جوگرافیـــاو زانیـــاری زمانەوانیو فەلسەفە.

**الآداب العامــة:** دابو نەرێتــە گشتییە پەسەند کراوەکان.

**آداب البحــــث والمنــــاظرة:** یاســـا ســـەرەکییەکانی گفـــتو گـــۆو راگۆڕینەوەو چەلەحانێ.

**الأدبـي:** هەرشتێك پاڵ ئـەدەب بدرێ (قیمـة أدبیـة)، (شـجاعة أدبیة،کسـب أدبي، موت أدبي...الخ).

**الأدیـب:** ئـەو کەسـەی خاوەنی ئـەدەب بێ، رەوشتی ئـەدەب زانـی تێدابێ ◊ رەوشتی جوان پەیڕەو بکا.

**التأدیـب:** پاڵفتـە کـردن، ئـەدەب دادان، تــەمبێ کـردن ◊ (مجلــس التأدیــب) ئەنجومەنێکــە دەشــوبهێنە هــۆڵی دادگا ◊ بەرژەوەندییـە گشتییەکانی تێدا بەرچاو دەگیرێ.

**المَأدُبة، المَأدَبـة:** ئـەو خـواردنو سفرەو خوانەیــە کــە ئامــادە دەکــرێ بــۆ دەعوەتکراوەکان.

**أدَّ في سَیْرِهِ:** پەلەی کـرد لـە رۆیشتنەکەی دا.

**أدّ الإبـــل:** حوشـــترەکە بـــاڕە بارەکـــەی گێڕایەوە ◊ دەنگی خۆی خواردەوە.

**أدَّ الأمْــرُ فلانــاً أدّاً:** فلانکــەس بەلاکـەی لەســەر قـورس بـوو، ئیشـەکەی لـێ ئاڵۆزا ◊ (أدَّ الحَبْلَ) حەبلەکـەی تونـد کرد.

**تَأدَّدَ:** توند ڕەو بوو.

**الأدَدُ:** درێژایی ڕێگەو راستی ڕێگە.

**الإدُّ:** کاری خراپو نەگلەوەت ◊ لـەقورئان دا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جِئْتُمْ شَیْئًا إِدًّا﴾ بەڕاسـتی کـارێکی دزێـوو خراپتـان ئەنجام دا.

**أدِرَ أَدْراً وأَدِرةً:** قۆڕ بـوو، (فهـو آدِرٌ) ئـەو پیاوە قۆڕە.

**الأدرة:** گـون هەڵاوسـان ◊ گـون قـوڕ بوون.

**الإدْرُجین الأیدروجین:** غازێکە بێ ڕەنگو تــامو بۆنـــە لەگـــەڵ ئۆکســـجین بەئەندازەیــەکی تایبــەتی تێکــەڵ دەبێ ئاوی لـێ پێك دێ..

**أدَلَ الجُــرْحُ أَدْلاً:** برینەکـە سـاڕێژ بـوو قەتماغەکـەی سـەری لاچـوو (أدَلَ اللَّبَنُ) شیرەکە ترشا، زۆر مزر بوو.

**أدَلَ الحِمْـلُ:** کۆڵەکە، بارەکـە زۆر قـورس بوو بارە بەرەکەی بەتـەواوی مانـدو کرد.

**أدَمَ بیـنهم أدْمـاً:** نێوانیـانی ڕێك خستو ئاشتی کردنەوە.

**أدَمَ الصَّـانِعُ الجِلْـدَ:** وەسـتاکە پێستـەکەی خارانـدو هـەموو زیـادەو پیتکـەو پڵەکانی لـێ لابردن ◊ دەباغی کرد.

**أدَمَ الطعـــامَ:** خواردنەکـــەی تێکـــەڵاوی پێخۆرەکە کرد.

**أدَمَ فلانــاً بأهلــه:** فلانکەســی تێکـەڵ بـە خاوو خێزانی خۆی کردەوە.

**أدِمَ أَدْماً وأَدَمةً:** ئەسمەرییەکـە زۆر تۆخـە

دەگوترێ: (محمد أدَمُ): موحەممەد زۆر ئەسمەرە ○ (کویستان أدَماءُ) کوێستان زۆر سەوزەیە.

**أدُمَ** أدامة وأدومة: بەمانا (أدِم)یە.

**آدَمَ بينَهُمَا**: رێکی خستنەوە، ناوبژی کردن ○ (آدَمَ الخبز و الجِلدَ) پرژو پاڵو سوتوو پوشکەو شتی لەوجۆرەی لەنانەکە کردەوە، شتە زیادەو پڵو پرژەکانی لەپێستەکە لابردو سفتی کرد.

**آدَمَ الشمس فلاناً**: خۆر رەنگی پێستی فلانکەسی رەش هەڵگێڕا زۆر ئەسمەری کرد.

**أدَّمَ الخبز**: نانەکەی زۆر لەپێخۆرەکە گوشی ○ زۆری تێك هەڵدا ○ (إئْتَدَمَ العُودُ): ئاو بەناو بۆرییەکەدا رۆیی ○ (إئتدَمَ فلان) فلانکەس نانەکەی بە پێخۆرەکەوە خوارد.

**استأدَمَ فلاناً**: داوای پێخۆری لەفلانکەس کرد.

**آدَمُ**: باوکی ئادەمیزاد ○ (الآدَمِيّ) ئادەمیزاد، وەچەی ئادەم.

**الإدامُ**: پێخۆر ئەو شلەمەنیو پێخۆرەی نانەکە والێدەکا بەخۆشی قوت بچێ.

**الأُدْمَةُ**: تێکەڵاویو پێکەوە ژیان ○ دەگوترێ: (بينهم أُدْمَةٌ) لەنێوانیان دا پەیوەندیو تێکەڵاوی هەیە.

**الأديم**: پێست ○ خۆراکی بەپێخۆرەوە ○ (أديم كل شيئ ظاهره) پێستی هەموو شتێك رووە دەرەکییەکەیەتی ○ (أديم الليل) تاریکایی شەو ○ (أديم الأرض) توێی زەوی ○ (أديم النهار) سپیایەتی رۆژ ○ (ليس تحت أديم السماء أكرم منه) لەژێر خێمەی ئاسمان دا لەو بەرێز تر نیە.

**أدا** أدْوًا: بەهێواشی رۆیی ○ رۆیشتنەکەی مام ناوەندی بوو.

**أدَا اللَّبَنُ**: شیرەکە بزرکا ○ (أدَا الَّلبَنَ أدْواً و أدْياً) ماستەکەی هەژاندو کردی بەدۆ ○ (أدَا الظَّبيَ): فێڵی لە ئاسکەکە کرد بۆئەوەی نێچیری بکا.

**أدا فلاناً**: فێڵی لەفلان کرد، فێڵی بۆ کرد.

**أدى** اللبنُ أدْياً وأدْواً: شیرەکە بزرکا.

**آدى فلانٌ إيداءً**: فلان بەهێز بوو (آدى للأمر) ئامادەباشی بۆکارەکە کردو هۆکارەکانی رەخساندن ○ (آدى فلاناً على كذا) یارمەتی داو هاوکاری کرد بۆ ئەنجامدانی ئەوشتە.

**أدّى الشَيْئَ**: ئەوکارەی ئەنجامدا (أدّى الدينَ) قەرزەکەی دایەوە، (أدّى الصلاة) نوێژەکەی لەکاتی خۆی دا بەجێ هێنا.

**أدى الشهادة**: شایەتیەکەی دا (أدّى اليه الشيْئَ) ئەو شتەی پێگەیاند.

**تَأدّى للأمر**: ئامادە باشی بۆکارەکە کردو خۆی بۆ حازر کرد.

**تَـأدى إلى فـلانٍ:** بەفلانكـەس گەيشـت (تَأدّى لـه الأمـرَ) كارەكەی بۆئاسان كـرد ٥ (تَـأدّى الـدينُ) قەرزەكـە درايـەوە ٥ (تَـأدّى الرجـلُ) كـابرا قەرزەكەی دايەوە.

**إستأداه عليـه:** فلانكەسـی بەسـەردا زالّ كـرد ٥ (إستأدى فلاناً مـالاً) مالّەكـەی لەفلانكەس داگیر كرد.

**الأداءُ:** جێبەجێ كردن ٥ خوێندنەوە.

**الأداةُ:** ئـامێرێكی بچـوكە ٥ لـەزاراوەی نەحوييـەكان دا وشـەيەكە دەهێنـدرێ بـۆ دروسـتكردنی پەيوەنـدی نێـوان دوو وشـە يـان مانايەك لەوشەيەكی تـردا بگەيـەنێ وەكـوو (س، سـوف) كـە دەڵـێن: ئـەداتی استقبالن يـان (أل) ئـەداتی تەعريفە.

**الإداوَةُ:** جاميلكـە، پـەرداخ، كـوپ ٥ كەبەكاردێن بۆ ئاو خواردنەوە.

**أذَنَ الحَبُّ أذنـاً:** دانەوێڵەكـە چـروزەكـەی يان گلۆكەكەی دەركەوت.

**أذَنَ فلاناً:** گوێچكەی فلانی ئەنگاوت.

**أذِنَ أذناً:** گوێچكەی گەورەن، گوێچكەكانی مەيلەو درێژ بوون.

**أذِنَ له، واليه:** گوێی بۆ ڕاگـرت، قسـەكانی بيستن.

**أذِنَ لرائحة الطعـام:** حـەزی لەخواردنەكـە كرد.

**أذِنَ لـه فيـه:** رێگـەی پـێدا (أذِنَ لـه علـى فلان) ئيزنی بۆ وەرگرت.

**آذَنَ العُشْبُ إيـذاناً:** گيـاو گژەكـە وردە وردە خەريكە وشـك بێتـەوە ٥ (آذَنَ بە) بانگەوازی بەوەكردو رايگەيانـد، (آذَنَ المؤذنُ للصلاة) بانگدەر بـانگی نوێـژی دا (آذَنَ فلانـاً) گوێچـكەی فلانكـەس هەڵـكۆڵی ٥ (آذَنَ الشـيءُ فلانـاً) ئەوشـتە فلانكەسـی توشـی سەرسوڕمان كرد.

**أذَّنَ فلانٌ تأذيناً وأذاناً:** زۆر بانگەوازی بـۆ ئەو شتە كـردو پڕوپاگەنـدەی زۆری بـۆكرد ٥ (أذَّنَ بالصـلاة) بـانگی نوێژی دا ٥ (أذَّنَ بالحج) كاتی چونە حەجی راگەياند.

**تَـأذَّنَ فـلانٌ:** فـلان ئـەو هەواڵـەی بڵاوكـردەوە ٥ (تَـأذَّنَ في النـاس) هەڕەشەی لەخەڵكەكە كـرد ٥ نـەی لـێ كردن، ترساندنی، (إستأذَنَ على فـلان) داوای لـێ كـرد بچێتە لایو قسەی لەگەڵ بكا.

**الآذَنُ:** گوێ گەورە، گوێی مەيلەو درێژ.

**الآذِن:** برۆ.

**الأذانُ:** بانگ، بـانگی نوێـژ ٥ (الأذانـان) بانگو قامەت.

**الأُذُنُ:** گوێچـكە، ئـامێری بيسـتن لـەئادەميزادو گيانلەبـەری تـردا ٥ هـەروا ئـاوە بـۆ قلّفـەو دەسـكی مەسینەو گۆزەو سوراحی.

**الأُذُنُ:** (بطانـة الرجل) دەستەو دايـەرەی پياو.

أذُنُ الحمارِ: گوێ کەرە، گیایەکە لە باشوری ئەوروپاو دەڕوێ چەقلاوییە گوڵەکانی زەردە، ڕەگەکانی مادەیەکی سوری تێدایە.

آذانُ الأرنب: گوێ کەروێشکە، گیایەکە پەلکەکانی دەشوبهێتە گوێچکەی کەروێشك چەقلی زۆری هەیە و گوڵەکانی شینی سپی واشەن و بەروبومەکەی زبرە دەنووسێ بەپۆشاکەوە.

آذانُ الجَدْي: گوێ کاریلە و گەڵاکانی چروپرن لەناوەڕاستی دا خەڵفی درێژ دەردێن گوڵەکانی وردیلەن، بەرەکەی وشکە، تۆوی وردە.

آذانُ الدبُّ: گیا ورچە: لەوڵاتی شام و وڵاتی سینا دەڕوێ نزیکەی دوو مەتر بەرز دەبێتەوە و ریشاڵ و پەڕو پۆڵێکی زەردی بەسەرەوەیە، بەکۆتایی لاسکەکەیەوە گوڵێکی مەیلەو درێژی زەردی عادەتی هەیە، بەرەکەی پێچراوەیە.

آذانُ الشاۃ: گوێ مەڕە گیایەکە لەئەوروپاو حەوزی دەریای ناوەڕاست دەڕوێ، بۆ چارەسەری کوان و دۆمەڵ و زیپکە بەکاردەهێندرێ.

آذانُ العنز: گوێ بزنە گیایەکی ئاوی یە، پێشی دەگوترێ بلوێری شوان.

آذانُ الفیل: گوێ فیلە رومەکێکە بنەکەی وەکوو کەنگرە دەخورێ.

آذانُ الحیطان: فیتنەو قسە هێن و قسەبەر.

الإذْنُ: لابردنی حیجرو رێگەپێدانی بۆ ئەنجامدانی مامەڵەو گرێ بەست و شتی لەوجۆرە.

الأذَنَة: چروزەی دانەوێڵە لەسەرەتای دەرکەوتنی دا.

الأُذُنَةُ: خۆش باوەڕ، ئەوکەسەی گوێ بۆقسەی هەموو کەس دەگرێ و پێی باوەڕ دەکا.

الأذِينُ: کە فیل، بەرعۆدە بوو، بانگ.

الأُذَيْنُ: گوێچکەڵە و لەزانیاری تەشریح دا بریتی یە لەیەکێك لەو دوو بۆریەی سەروی دڵ کەخوێن لەدەمارەکان وەردەگرن و گوێچکەڵەی لای ڕاست و گوێچکەڵەی لای چەپ.

الأُذَيْنَةُ: ئامێری بیستن، بەشی خواروی گوێچکە.

المِئذنَة: منارە، شوێنی بەرز بۆ بانگدان.

المَأذونُ: ئەوکەسەی رێگەی پێ دەدرێ گرێ بەستی مارەیی و تەلاق بنووسێ و جێبەجێیان بکا.

أذِيَ فلانٌ: توشی ئەزیەت بوو و زیانی پێ گەیی.

آذاهُ، ایذاءً: ئەزیەتی پێگەیاند (ئا ذی یە) لەوشتەوە زیانی پێگەیی.

أرِبَهُ اِرَبَهُ أرَباً: گرێی دا قایمی کرد توندو تۆڵی کرد.

أرِبَ العضوُ: ئەندامەکە بڕا، لێ بوەوە،

ڕزی، کەوتە خواریێ بەهۆی گوڵو نەخۆشی لەو جۆرە ٥ (أرِبَ بالشّيءِ) یان (أرِبَ في الشّيءِ) شارەزابوو لەو شتەدا ماهیرو لێزان بوو.

أرِبَ عليه بكذا: بەسەریا زاڵ بوو ٥ موحتاج بوو.

أرُبَ آرابة وإرْباً: لە لێزانیو سیاسەتو فەندو فێڵ دا سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

أرَبَ عليه إيراباً: سەرکەوت ٥ بەمرازگەیشت ٥ (آرَابَ فلاناً مُؤآرَبَةً) بەربەرەکانی فلانی کردو بەسەری دا زاڵ بوو (أرَّبَ الشّيْءَ) بەمانا (أرَبَهُ) دێ ٥ هەروەها بەمانا بەیدەستی کردو زۆری کرد، تەواوی کرد ٥ (أرَّبَ الذّبيحةَ إرْباً إرْباً): کوشتییەکەی پارچە پارچە کرد (أرَّبَ العضو) ئەندامەکەی لێکردەوە.

تأرَّبَ: توندو تۆڵ بوو پتەو بوو، (تأرَّبَ فُلانٌ) فلانکەس خۆی بەلێزانو سیاسەتمەدار نیشان دا ٥ بەتەکەللوف لێزانیو زیرەکی خۆی نواند ٥ (تأرَّبَ في حاجته) لەکارەکەی دا لەداخوازییەکەی دا توندڕەوی کرد (تأرَّبَ عليه) بەرەنگاری بوەوە توند ڕەوی کرد نیشەکەی گران کرد.

إستَأرَبَ: پتەوی کرد توند ڕەوی کرد ٥ (إستَأرَبَ فلانٌ) فلان کەس لەهەموو لایەکەوە دەردو بەڵا دەوریان داوە ٥ قەرزو قۆڵە لەهەمولایەکەوە ڕویان تێ کردووە بڕستیان لێ بڕیوە.

الأرْبُ: زیرەکیو لێزانیو شارەزا لەکاروبار دا.

الإرْبُ: پێویستی، عەقڵو ئاوەز، زیرەکیو لێهاتوویی، ئەندامی تەواو ٥ دەگوترێ: (قطعه إرْباً إرْباً) ئەندام دوائەندامی لێ کردەوە پەلپەلی کرد.

الأُرْبُ: بێچولەی ئاژەڵ لەوساتەی لەدایك دەبێ.

الأرَبُ: پێویستی، یان پێویستییەکی زۆر ٥ هیواو ئاوات.

الأرِبي: پیاوی شارەزاو لێزان لەکاروباردا ٥ بەڵای گەورەو کارەسات.

الأُرْبَان: عەرەبون، پێشەکی ئەو برە پارەیەی لەکاتی مامەڵەدا کڕیار دەیدا بە فرۆشیار وەکوو برێك لەو ئەندازەیەی لەسەری پێك دێن.

الأُرْبَةُ الأُرْبُ: گرێیەکە کە بەئاسانی ناکرێتەوە ٥ قوڵفەیەکە یان سینگێکە لەدیوار دا قایم دەکرێ وڵاغی پێ دەبەستنەوە ٥ ئەو گلادەو ملەوانکە گوێرەکە یە کە ئاژەڵی پێ ڕادەکێشرێ.

الإرْبَةُ: مەبەستو هیواو ئاوات ٥ ئارەزۆ لەمئافرەت ٥ لە قورئان دا دەفەرموێ: ﴿غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ﴾.

الأُرْبون: عەرەبون.

**الأَرْبِيَة:** ئەستورایی ڕان نزیك بەورگ ٥ ئەوبەشـەی لـەکاتی خۆنوشـتاندنەوەدا بەورگـەوە دەنوسێ.

**أُرْبِيَّةُ:** (أهـل بيـت الرجـل): ئامۆزاو خزمەنزیکەکانی ٥ (الفتـق الأُربـيّ) بـەلای پزیشـکانەوە دڕانـی ورگـە تادەگاتە دەزوی (دەماری) مەنەوی.

**مَـأرِب:** شارێکی ولاتـی یەمەنـە، کـاتی خـۆی بەربەسـتی بـەناوبانگی مەئریب لەوێ کراوە.

**الْمَأْرَب:** (ك: مآرب) بە مانا پێویستی یان پێویستییەکی زۆر.

**الْمَأرَبَـةُ:** هەربـەمانا (مَـأْرَبَ)ە، (ك: مآرب)ە.

**آرثـوذکس:** وشـەیەکی یۆنانییـە بـەمانا قسـەی ڕاسـتو بـێ غـەلو غـەش ٥ ئێسـتا بـەو مەسـیحیانە دەگـوترێ کەڕایان وایە: مەسیح یەك تەبیعەتو یەك ویستو خواستی هەیە.

**أرَّث النـارَ:** ئاگرەکـەی هەڵـگیرساند ٥ دەگـوترێ: (أرَّث بين القوم) پێکیـەوە نانو بەشەڕی دانو دژایەتی خستە ناویانـەوە ٥ (أرَّث بـين الأرْضـين) نـاوانو سنووری خستە نێوان ئـەو دوو زەوییەوە.

**تَأرَّثَـتِ النـارُ:** ئاگرەکـە هەڵـگیرسا ٥ (الإراث) ئـەو شـتەیە ئـاگری پـێ هەڵدەبێ ٥ فیتنەیی‌و دوو زمانی.

**الإرْث:** میرات ٥ باقی مانـدەی شت ٥ گڵ‌و خۆڵ ٥ کارو کـردەوەی کـۆن ٥ دابو نەریتو شتی کۆنینە کە پاشینە لـە پێشینەی وەرگرتبێ.

**الأرْثـةُ:** سـوتەمەنی ٥ سنوورو نێـوانی دووپارچە زەوی.

**أَرَجَ أرجاً:** درۆی کرد (أرَجَ الحق بالباطـل) حەقو بەتاڵی تێکەڵاو کرد.

**أرَجَ بَيْنَ الناس أرجاً و أرجاناً:** خەڵـکەکەی لێك تونـدکردن هـانی دان بۆئـەوەی پەلاماری یەکتری بدەن.

**أرِجَ الطيب:** بـۆ نەخۆشـەکە بـلاو بـۆوە ٥ (أرِجَ المكـانُ) ئـەو شـوێنە بـۆنی خۆشـی تێـدا بـلاو بـۆوە ٥ (أرِجَ النـاسُ) خەڵـکەکە پشـێویان تێکەوتو دەستیان کرد بەگریان.

**أرَّجَ النـارَ:** ئاگرەکـەی هەڵـگیرساند ٥ (أرَّجَ الطيـبُ) بـۆ نەخۆشـەکە بلاوبۆوە ٥ (أرَّجَ المكانُ) ئەوشوێنە بۆنی خۆشی تێدا بلاو بۆوە.

**الأرِيجةُ:** بۆنی خۆش، (ك: أرائِجَ)ە.

**الأرجُونُ:** عونصورێکی گازە بـێ ڕەنـگو بۆنە بەئەندازەیـەکی کـەم لەهـەوادا هەیـە ٥ بەکاردەهێنـدرێ بـۆ پڕکردنـەوەی گڵـۆپو چـرای کارەبایی.

**الأُرْجُـوانُ:** درەختێکـە گـوڵێکی زۆر سـوری هەیـە بـێ بۆنـە، دیمـەنی تـا بڵـێی جوانـە ٥ هـەروا بـە بۆیـەی سوریش دەگـوترێ ٥ کراسـی ڕەنـگ کراو بەگوڵە ئورجوانی.

**أرَّخَ الى مكانه:** ئارەزوی شوێنی خۆی کرد، کورکاندی بۆ جێو ڕێی خۆیو یادی زێدی خۆی کردەوە ◦ (أرَّخَ الكِتابَ) کاتی نوسینی کتێبەکەی دیاری کرد ◦ مێژوەکەی دیاری کرد.

**أرَّخَ الحادِثَ:** رواوەکەی دیاری کرد کاتی رواوەکەی رون کردەوە.

**التَأريخ:** کۆمەڵێك رواوو رۆژگارن تاكو کۆمەڵ پێیدا تێپەڕ دەبن دیاردەکانی سروشتو کۆمەڵایەتی دیاری دەکا.

**التَأريخ:** تۆمارکردنی ئەو رواوو دیاردانە یە.

**المؤرخ:** مێژوو نووسو زانا بەو رواوو دیاردانە.

**الأرَخبِيلُ:** کۆمەڵێك دورگەی لێکەوە نزیك.

**الإرْدَبُ:** پێوەرێکە بیستو چوار ربە دەگرێ، لە کوردستان دا تەغارو حەربەی پێ دەڵێن ◦ قەناتێکە ئاوی پێدا دەڕوا بۆ ئاودانی زەویو زار.

**الإرْدَبّة:** بەلوعەیەکی گەورەیە لە سواڵەت دروست دەکرێ ◦ لەکوردستان پێی دەگوترێ گلێنە یان کونج.

**الإرْدِواز:** بەردەسواڵەت یان سواڵەتە بەردێکی تاریکی مەیلەو شین یان سەوزە، بۆ هەڵاشی خانوو بەکاردێ ◦ وادەبێ تەختە لەوحی نوسینی لێ دروست دەکرێ، جاری وایش دەبێ بۆری ئاوی لێ دروست دەکرێ.

**أزَّ – أريراً:** دەنگی لێ هات ◦ (أزَّ الحيوانُ أزّاً): گیانلەبەرەکە سکی چوو گوفێرەی توشبوو ◦ (أزَّ النارَ) ئاگرەکەی هەڵگیرساند ◦ (أزَّ الحيوانُ): ئاژەڵەکەی دەرکرد، ڕاوی نا.

**الإرَّةُ:** ئاگر.

**ألأرِيرُ:** دەنگ ◦ زڕەی تەلەفۆن دەنگی تەلەفۆن لەکاتی بەرز کردنەوەی بیستەك دا.

**أرَزَ (أرِزَ) أرْزاً و أرُوزاً:** وێك هاتەوەو کۆبۆوە ◦ کۆمە کۆمەو گاگۆڵکێی کرد لەبەر ماندویی ◦ دەگوترێ:(ما بلغ أعلى الجَبَلِ الا آرِزاً) نەگەیشتە تۆپەڵاکی کێوەکە مەگەر بەگرمۆڵەیی و لەسەر چنگان.

**أرَزَ الحيوانُ:** ئاژەڵەکە بەهێز بوو خۆی داڕشت ◦ (أرَزَ الى المكانِ) پەنای بەو شوێنە برد، گەڕایەوە بۆ ئەوێ ◦ لەفەرمودەی پێغەمبەردا (د.خ) هاتووە (إن الأسلام لَيأرِزُ الى المدينة كما تأرِزُ الحيةُ الى جُحْرِهَا) بێگومان ئیسلام دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە وەکوو چۆن مار دەگەڕێتەوە بۆ کونی خۆی.

**أرَزَت الشجرا:** درەختەکە لەزەوی دا ڕەگی داکوتان پتەو بوو.

**أَرَزَ الأصابعُ مِن البرد:** پەنجەکان لەسەرمان گرژ بون.

**أرَزَت الليلةُ أرْزاً وأرُوزاً وأريزاً:** شەوەکە سەرماکەی بەهێز بوو.

**الأَرْزُ:** درەختێکی گەورەی ڕەقە لە توخمی دار سنەوبەرە، هەمیشە سەوزە، زۆر بەرز دەبێتەوە، دارەکەی بۆ کەشتی دروستکردن بەکاردێنن ٥ بەناوبانگترین درەختی ئەرز درەختی ئەرزی لوبنانی یە.

**الأُرُزُ:** مەرمزە ٥ گیایەکی وەرزییە بێ ئاو نابێ زۆر حەزی لە ئاوە، گوڵەکانی چەند دەنکە چەڵتوکێك لەخۆ دەگرن مەیلەو زەردن کەپاك دەکرێ‌و بەکرە دەکرێ دنکە برنجی بچوکی سپی لێ پەیدا دەبێ ٥ خواردنێکی جیهانییە لەزۆر وڵات دا خۆراکی سەرەکییە ٥ دەکوڵێندرێ‌و دەکرێ بە چێشت.

**الأَرِيزُ:** سەهۆڵ، ڕۆژی سەرماو سۆڵ‌و زۆر سارد.

**أَرَسَ (أرِسَ):** بوو بە فەلاو وەرزێر، کشتیار ٥ (آرَس) بەمانا (آرَسَ)یە ٥ (الإِرْس) بنەچە، ئەصڵ، بنەما.

**أرَّسَ:** فلانکەسی کرد بە فەلاو وەرزێر.

**الإرِّيسُ:** فەلاو وەرزێر، (ك: أراريس، أرارسة، أراسِيٌّ).

**الأَرِيسُ:** بەمانا فەلاو وەرزێرە.

**الأَرِسْتُقْرَاطية:** حکومەت یان چین‌و توێژێکی کۆمەڵ کە خۆیان بەخانەدان بزانن‌و ژیانێکی خۆش‌و تایبەتییان هەبێ.

**أرَشَ بينهم أرشاً:** بەشەڕی دان‌و پێکیەوەنان ٥ لەیەکتری هان دان.

**أرَشَ فلاناً:** فلانکەسی بریندار کرد ٥ خوێنی برینداربیەکەی دا.

**أرَّش بينهم الحرب:** شەڕی نێوانیانی خۆش کرد.

**إئتَرَشَ جُرْحَهُ:** خوێنی برینەکەی وەرگرت.

**الأرْشُ:** برین‌و عەیب ٥ وەرگرتنی خوێنی برین ٥ ئەو برە پارەیەی کە کڕیار لەجیاتی دەرکەوتنی عەیبی فرۆشراوەکە لەفرۆشیاری دەستێنێتەوە، (ك: أرُش)ە.

**أرِضتِ الأرْض والرَّوْضةُ أرَضاً:** زەوییەکە ٥ باغەکە گیاو گژی زۆربوو ٥ دیمەنی ڕازاوەو جوان بوو، (أرِضتِ القُرْحةُ) برینەکە داوەشا، دەمی کردەوە، بوو بەخۆرەو چارە.

**أرِضت الخَشَبَةُ:** دارەکە مۆرانە خواردی ٥ خمخۆرکە لێی دا.

**أرُضتِ الأرْض:** بەمانا (أرِضت)ە ٥ (و أرُض فلانٌ) فلانکەس بوو بە پیاوێکی خێر خوازو بێ فیز.

**أرِض فلان:** فلانکەس توشی نەخۆشی بەك بووە بەبێ ئیرادە سەری دەلەرزێ‌و هەمیشە بەملاو بەولادا دەکەوێ.

**أرْض الأرْض:** فێری ئەو خاکە بووە

هەمیشە هاتوو چۆی دەکا.

أرْض الشَّيئَ: ئەو شتەی چاك كردەوە، چاكسازی تێدا کرد.

أرْض السِّقاءَ: مەشکە یان کوندەکەی چـاك کـردەوە نـەرمی کـردەوە چەوری کرد.

تَأرَّضتِ النَبْتُ: گژو گیاکە خۆی گرت لەخۆکـەوت، راسـا، جـوانو پـەرداخ بوو رەگی داکوتان.

تـأرَّض فـلانٌ: فلانکـەس لـەو شـوێنە جێگیر بـوو مایـەوە، (تَـأرَّض المنـزلَ) ئـەو مەنزلـەی هەڵبـژاردو تێیـدا مایەوە.

إسْتَأرَضـتِ الأرض والقرحـة: بـەمانا (مجردەکەیەتی).

اسْتَأرَضـتِ الفَسِـيلُ: نەمامەکـە ڕەگو ریشـەی بـەزەوی دا رۆچـونو بـڵاو بونەوە.

إسْـتَأرَض السـحابُ: هـەور قـورس بـوو، بـەری ئاسمـانی داگـیر کـردو وادەبینـدرێ دەڵێی وەستاوە.

إسْتَأرَض بالمكان: لەوشوێنە مایەوە.

الإرَض: فـەرشو راخـەرێکی پـانو پـۆڕە لەتوکی حوشترو موو خوری دروست دەکرێ.

الأرض: زەوی، یەکێکـە لەهەسـارەکانی کۆمەڵەی خـوری ٥ پلـەی سێیەمی هەیـە لەفەلـەکی خـۆی دا بـەدەوری خـۆردا، ئـەو هەسـارەیە ئێمـەی ئادەمیزاد لەسەری دەژین.

أرض الشـيء: لای خـواروی شـت ٥ (علـم الأرض) زانیـاری زەوی ناسـی زانیارییەکـە لـەزەوی دەکۆڵێتـەوە، لـەبارەی چینەکانیو پێکهاتـەکانیو گۆڕانکارییەکانی بەسەری داهاتوون.

الأُرَضـةُ: دەعبایەکـە سپییەو وەکـوو مێـرو وایـە لـەوەرزی بـەهاردا دەردەکـەوێ ٥ هـەروا کرمێکـە یـان پیرۆیەکە داردەخوا بـەکوردی پـێ‌ی دەگـوترێ مۆرانـە، خمخۆرکـە ٥ دەگوترێ:(خشبة مأروضـة) دارێکی مۆرانە لـێ دراوە ٥ (فلان أفْسَدُ مـن الأَرَضـةِ) فـلان لەمۆرانـە وێرانکـەر ترە.

الأرَضـيَّةُ: کرێـی گرتنـی پارچـە زەوییەکە بۆماوەیەکی دیاریکراو.

أرَطتِ الأبلُ أرطا: حوشترەکە ئەرەطای خـوارد، (أرَط الأديـم) پێستـەکەی بەئەرەطا دەباغ کرد.

أرِطـتِ الإبـل: بـەخواردنی ئـەرەطـا حوشـترەکەی ژانـە سـکی گـرت ٥ (آرَطتِ الأرض ايراطـا) ئـەو زەوییـە روەکی ئەرەطای لـێ ڕوا.

الأرْطـى: روەکێکـی درەخـت ئاسایە لـە پێـری پەتاتەیـە ٥ لـە لمبـەلان دا دەڕوێ و یـەك ڕەگـی هەیـە ٥ گەڵاکـەی باریکـە میوەکـەی وەکـوو عونناب دەچێ.

الأُرْغُنُ: ئامێرێکی مۆسیقایە فوی پێدا

دەکرێ، کۆمەڵێك بۆری و شوێنی فوتێکردنی تێدان، لەبنەڕەت دا وشەیەکی یۆنانی یە.

**الأرْغُولُ**: ئامێرێکی دووفاقی مۆسیقایە دوو بۆری کونکونی تێدان یەکیان لەوی تریان کورت ترە.

**آرَفَهُ مُؤَارَفَةً**: هاوسێیەتی کرد، کەوتە پەنایەوە.

**أرَّف الأرْض**: زەوییەکەی ئیفراز کرد و دابەشی کرد، نیشانداری کرد.

**الأُرْفَةُ**: نیشانەیەکە دادەنرێ سنووری پارچە زەوییەکانی نزیك یەکتری پێ دیاری دەکرێ.

**أرِقَ أرَقاً**: خەوی لێ زڕا، بەشەو خەوی لێ ناکەوێ.

**آرَقَهُ إيراقاً**: وای لێ کرد خەوی لێ بزڕێ ٥ (أرَّقَهُ) بەمانا (آرَقَه).

**إئْتَرَق**: بەمانا (أرِقَ)یە (تَأرَّقَ) بەمانا (أرِقَ)یە.

**الأرَقُ**: خەو لێزڕان ٥ (الأُرُقُ) خەولێزڕانی لێ بوو بە عادەت.

**الأرَقانُ**: یەرەقان، نەخۆشی یەکە تووشی زەرعات دەبێ و زەرد هەڵدەگەڕێ.

**أرَكَتِ الأبِلُ أروكاً وأرْكاً**: حوشترەکە گەڵای درەختی ئەراکی خواردو گەدەی ژانی لێ هات بەهۆی خواردنی ئەو گەڵایەوە.

**أرَكَ الرجلُ بالمكان**: پیاوەکە لەوشوێنەدا جێگیر بوو بەجێی نەهێشت.

**أرَكَ الجُرْحُ**: خەریکە برینەکە چاك بێتەوە توێ بینێتەوە.

**أرَكَ الأمْرَ في عنقه**: ئەوکارەی لە ئەستۆ گرت و پێوەی پابەند بوو.

**أرَكَ الإبِلَ**: گەڵای درەختی ئەڕاکی دەرخواردی حوشترەکە دا.

**أرِكَتِ الإبلُ**: گەدەی حوشترەکە تووشی نەخۆشی بوو بەهۆی خواردنی گەڵای درەختی ئەراك.

**أرِكَتِ الأراكُ**: درەختی ئەراك لقەکانی تێك چڕژان و گەورە بوو.

**الأراك**: درەختی ئەراك یان درەختی سیواك روەکێکی شێوە درەختییەو لەپێری ئەراك ٥ لقەکانی زۆرو پەلکەگەڵاکانی دوو دوو بەرامبەر یەکن ٥ میوەیەکی سوری مەیلەو رەشی هەیە دەخورێ ٥ لەوڵاتی گەرم دا دەڕوێ، بۆ نموونە لەسارای باشووری خۆرهەڵاتی میصردا دەڕوێ.

**الأرِيكَةُ**: قەنەفە، کورسی، (ك: أرائك) ٥ (أريكةُ الجُرْح) گۆشتە ساغەکەی برین: کە گۆشتە سورەکەی دیاربێ و کێم و زوخەکەی نەمابێ.

**الأرْكُونُ**: سەرۆکی گوند، ریش سپی گوند.

**أرَمَ عليه أرْماً**: گەستی ٥ (أرَمَ الشَيْئَ) شتەکەی لە بێخ دەرهێنا ٥ دەگوترێ:(أرَمَتِ السائمة المرعى) ئاژەڵەکە لەوەڕەکەی ژێر پێ دا،

بەسەریا هاتوو لەناوی برد (أَرَمَ الجَدْبُ الماشیة) گرانی و بێ بارانی ئاژەڵەکەی لەناوبرد ○ (أَرَمَ الخَیْلَ) ئەسپەکەی کوشت.

**أرِمَ أرَماً**: فەوتاو لەناوچوو.

**أرِمَ الأرض**: زەوییەکە هیچی لێ نەڕوا بووە سوتەمەڕۆ.

**الأُرَمُ**: ددان ○ دەگوترێ: (فلان یحرق علیك الأُرَمَ) فلانکەس ددانت لێ دەسوێ ئەوەندەی ڕق لێتە.

**الإِرَمُ**: ئەو بەردانەن کەلەڕێگادا دەکرێنە نیشانەی ڕێگاکەو بەزۆری لەمبەرو ئەوبەری کوێرە ڕێدا دادەنرێن بۆئەوەی ڕێبوارەکان بزانن لەکوێوە بڕۆن.

**إِرَمُ**: نەتەوەیەك بووە لەکۆن دا گەلی عاد لقێکی ئەوانن ○ دەشڵێن: شارێکی گەورەی گەلی عادبووە.

**الأَرُومُ والأَرُومَةُ**: بنکی درەخت بەزۆری بۆ ریشەو نژاد بەکار دەهێندرێ ○ دەگوترێ: (هو طیب الأرومة) ئەو ریشە و نژادی ڕەسەن‌و وەچاخزادەیە.

**الأرمادا**: ئوسطولی ئیسپانیا بوو لەسەدەی هەژدەدا ئینگلیز تێکی شکاند.

**أَرَنَ**: گەستی (أرِن، أَرَناً و إیراناً و أریناً): گەشەی کرد، کەیفخۆش بوو، باکی لەهیچ نییە.

**آرَنَهُ مؤارنَةً و إراناً**: شانازیی بەسەردا کردو خۆی بەسەردا ڕانواند.

**الإِرَانُ**: کەڵەگا کێوی ○ ڕەشە وڵاخی نێری کێوی گیا خۆرو کاوێژ کەر.

**الأُرنَةُ**: پەنیری تەڕ یان تۆوێکە دەکرێتە ناو شیرەوە دەیکاتە پەنیر.

**الأَرْنَبُ**: کەروێشك ○ گیانلەبەرێکی زۆر و بەربڵاوە لەزۆر شوێنی جیهان دا هەیە ○ فەروەیەکی نەرم جەستەی داپۆشیوە، کێوی و ماڵی هەیە.

**الأَرْنَبانی**: ڕەنگی مەیلەو تاریك ○ دەگوترێ: (کساء أرنبانی).

**أرْنَبَةُ الأنف**: سەری لوت ○ دەگوترێ: (جَدَعَ أرنَبَتَهُ) سوکایەتی پێکرد ○ (قوم شمَّ الأرَانبِ) گەلێکی شکۆمەندن.

**الأَرَنْدَجُ**: چەرمێکی ڕەشە پێڵاوی لێ دروست دەکرێ ○ ڕۆنێکی ڕەشە پیڵاوی پێ ڕەش دەکرێ.

**أروا النَّارَ أرواً**: قوڵکە ئاگردانی بۆ ئاگرەکە دروست دەکرد.

**أری النحلُ**: هەنگەکە هەنگوینی کرد.

**أری القِدْرُ**: دیزەکە، مەنجەڵەکە بەهۆی ئاگرەکەوە شتی بەبنەکەیەوە نووسا.

**أری فلانٌ**: فلانکەس ڕقی هەڵسا، توڕە بوو.

**أری الدابة الی الدابة**: ئاژەڵەکە، حەیوانەکە یەکیان گرت‌و پێکەوە لەسەر ئاخورێك لەوەڕان.

أَرَى الريحُ السحابَ: با هەورەكەی رادا ◦ (أرى فلانٌ الماءَ) فلانكەس وردە وردە ئاوەكەی پێداكرد.

أرِيَ اللبنُ ونحوه بالاناءِ أرْياً: شیرەكە سوتاو هێندێكی بە دیزەكەوە نووسا.

أرَى الدابةَ الى الدابةِ: ئاژەڵەكانی تێكەڵاو كردن یەك ئاخوڕی بۆ بنیات نان.

أرَّى الشيْءَ: ئەو شتەی جێگیركردو لەشوێنی خۆی چەسپاندی ◦ (أرّى الدابةَ) ئاخوڕی بۆ حەیوانەكە دروست كرد ◦ (أرّى فلاناً) فلانكەس فێڵی لەفلان كرد ئەو داوای ڕێ نیشاندانی لێ كردبوو بەڵام ئەو خیانەتی لێ كرد ئامۆژگاری كردنەكەی بەفێڵ بوو.

أرّى عن الشيْئ: قسەی پێچ‌و پەنای دەربارەی ئەوشتەكرد بەتەورییە دەربارەی دوا، ئەوی مەبەست بوو شتێكی تری دركاند.

إئْتَرى النَحْلُ: هەنگەكە هەنگوینی كرد.

إئْتَرى فلان بالمكان: فلانكەس لەوشوێنە مایەوەو جێگیر بوو.

إئْتَرى الأرْيُ بالخليةِ: هەنگوینەكە بەكوڵەسەكەوە نووسا.

الأرِيُ: ئەوسینگە داكوتراوەیە یان ئەو قوڵفەیە كەلە دیوار قایم دەكرێ كە ئاژەڵی پێوە دەبەسترێتەوە.

الآرِيّ: ڕەگەزی ئاری ئەو گەل‌و نەتەوەیە كۆمەڵێك تایبەتمەندی زمانەوانی‌و ڕەگەزو دیاردە كۆیان دەكەنەوە.

الآرِيَّةُ: تایبەتمەندییەكانی ڕەگەزی ئاری.

الإرَّةُ: قوڵكە ئاگردان ◦ گۆشتێك وشك بكرێتەوە بۆ ئەوەی لەسەفەردا كەڵكی لێ وەربگیرێ.

الأُرْوِيَّةُ: حەیوانەكێوی نێربێ یان مێ، (ك: أراوى، أروى).

الأرْيُ: هەنگوین ◦ شەونم كەدەكەوێتە سەر گەڵای درەخت ◦ ئەو بەشە خواردەمەنییەی بەبنك‌و ئەملاو ئەولای دیزەو مەنجەڵەوە دەنووسێ.

الأرْيَحِيُّ: ڕەوشت بەرزو سەخی سروشت‌و نانبدە.

أزَبَ الماءُ أزباً: ئاوەكە جاری بوو، ڕەوان بوو.

أزَبَتِ الماشية: ئاژەڵەكە كاوێژی نەكرد.

تَأزَّبوا المال بينهم: ماڵەكەیان بەسەرخۆیان دابەشكرد.

الإزْبُ: كورتە باڵای ورگنی سمت گەورە ◦ ناكەس بەچەو خوێڕی ◦ فێڵ زان‌و چاوو ڕاوكەر.

المِئْزابُ: ئەو بۆرییەیە كەلەسەربانەوە یان لەشوێنێكی بەرزەوە ئاوی پێدا دەهێنرێتە خوار، (ك: مَآزِيبَ).

أزَجَ في مشيته أزواجاً: بەخێرایی ڕۆیی تیژ تێپەڕی. (أزَجَ عنه) تەمبەڵی كرد دواكەوت.

أزِجَ أزجاً: بەمانا (أزَجَ)دێ.

أزِجَ العشبُ: گیاو گژەکە لەخۆکەوت‌و بەرز بۆوە.

أزَّجَ البناءَ: دیوارەکەی بەرز کردەوە، باڵەخانەکەی بەرز کردەوە.

الـأَزَجُ: بینایەکی لاکێشەیی بە کەسەقفەکەی قەوس بێ.

أزَجَ أزوجاً: وێك هاتەوە ٥ تەمبەڵی کرد، دواکەوت.

أزَجَ العِرقُ: دەمارەکە پەلەپەلی پێکەوت کەوتە هەڵپەڕین.

أزَحَ القدمُ أو النَّعلُ: قاچەکە خلیسکا ٥ نەعلەکە لەژێر قاچی دا سوڕاو خلیسکی برد.

الأزوحُ: دوا کەوتو لە ڕەوشتی جوان ٥ ئەو ولاخەی لە کاتی باری گران دا دەنرکێنێ، دەناڵێنێ.

الأزاذ: جۆرێکە لە خورمای باش.

أزَرَ الـزرع: کشتوکاڵەکە تێکچڕژاو لە خۆکەوت‌و هەندێکی هەندێکی هەڵگرت.

أزَرَ فلاناً: ئیزاری لەبەر فلانەکەس کرد ٥ (أزَرَ الشيَ) پشتگیری لەو شتە کردو بەهێزی کرد.

أزَرَ الحِصَانُ أزراً: ئەسپەکە سمت‌و کەفەڵ‌و دو قاچی دواوەی سپی بوو قاچی پێشەوەشی ڕەنگێکی ترە.

آزَرَ الـزَّرعُ مـؤازَرَةً: بەمانا (أزَرَ) یە ٥ (آزَرَ فلاناً) یارمەتی فلانی دا.

آزَرَ الشَّيءَ: هاوشانی ئەو شتەبوو بەرامبەری کرد.

أزَّرَه: بەمانا (أزَرَه)دێ (أزَّرَ النَّبتُ الأرض) گژو گیا کە زەوی یەکەی داپۆشی ٥ (أزَّرَ الحائط:) دیوارەکەی بە دیوارێکی تر بەهێز کرد (أزَّرَ الكِتابَ) بەرای خۆی پەراوێزی لەسەر کتێبەکە نووسی ٥ دەگوترێ: (نصره نصراً مؤزراً) یارمەتیەکی بە هێزی فلانکەسی دا.

إئتَزَرَ واتَّزَرَ: ئیزاری لەبەر کرد (تأزَّر) بەمانا (إتَّزَرَ) یە (تأزَّر الزرعُ): بەمانا (أزَرَ)ە یە.

الإزارُ: پۆشاکێکە نیوەی لای خواروی جەستەی ئادەمیزاد دادەپۆشێ ٥ پیاوانی موسوڵمان لەکاتی ئیحرام بەستن دا ئیزار دەپۆشن ٥ دەگوترێ: (فلانٌ عفيفُ الإزارِ) فلانکەس داوێنپاکە ٥ (إزارُ الحائِط) ئەو چینە دیوارو خشتەیە لە لای خواروی دیوارەکەوە پێوەی دەنوسێنرێ بۆ پتەوبوونی یان بۆ پارێزگاری یان بۆ جوانی.

الأزْرُ: هێزو توانا ٥ دەگوترێ: (شدَّ أزْرَه) بەهێزی کرد پشتی قا یم کرد لە قورئان دا دەفەرموێ: (أشدُدْ به أزري)

الإزْرُ: بنەماو ئەصل ٥ (المِئزَرُ): بە مانا (الأزار)ە ٥ دەگوترێ: (شدَّ للأمر مِئزَرَه) خۆی بۆ ئەو کارە ئامادە

کردو پشتێنی بۆ بەست (وشَدَّ مِئْزَرَه دون النساءِ) خۆی لە ئافرەت دور خستەوە ٥ (فلانٌ عفيف المِئزَر) فلان داوێنپاکە ٥ توخنی کاری حەرام ناکەوێ.

أزَّ ازیزاً، و ازازاً: جمو جۆڵی کرد کەوتە هەڵپەرکە ٥ لەبەر تیژرەوی یان کولان دەنگی لێ هات ٥ دەگوترێ: (أزَّ الرعدُ والقِدر والطائِرُ) هەورەکە گۆلاندی ٥ دیزەکە گیزەی هات ٥ باڵندەکە ورشەی هات.

أزَّ النارَ أزَّاً وأزیزاً: ئاگرەکەی داگیرساند (أزَّ القدرَ) دیزەکەی بەویزە ویز خست (أزَّ الشيءَ ) ئەو شتەی بە جمو جۆڵ خست

أزَّ الشَّيءَ: شتەکەی راتەکاندو بەتوندی جولاندی.

أزَّ فلاناً: فلانکەسی هەڵناو سووری کرد لەسەر کردن یان نەکردنی شتێك.

أزَّ بینهما: نێوانی شێواندن لێکی کردن بە دوژمن، یان بەپێچەوانەوە.

إئتَزَّ: بەمانا (أزّ) یە ٥ (إئتزَّ منه) لێی تۆرا ٥ رقی لێ هەڵسا.

تَأزَّزَ: بەمانا (أزّ) یە (تَأزَّزَ المَكانُ:) ئەوشوێنە دانیشتوانەکەی کەوتنە راپەرینو بگرەو بەردە، پشێوی کەوتە ناویانەوە.

الأزُّ: لێدانی بەئێش لە کوانو دۆمەڵ.

الأزَزُ: کۆمەڵی زۆرو قەرەباڵغ.

الأزَّة: دەنگ

الأزیزُ: رۆیشتنی بەپەلە ٥ خێرا رۆیشتن.

أزِفَ الوقتُ: کاتەکە نزیك بووە ٥ دەگوترێ: (أزِف الَتَرحُلُ) سەفەرەکە نزیك بۆتەوە ٥ لە قورئان دا هاتووە (أزِفَتِ الآزفة) رۆژی قیامەت نزیك بۆوە ٥ (أزِفَ الرجلُ) پیاوەکە پەلەی کرد.

آزَفَهُ إیزافاً: پەلەی لێ کردو وای لێ کرد پەلە بکا.

تَآزَفَ الخطوُ: هەنگاوەکانی لێك نزیك بوونەوە (تآزَفَ القومُ) خەڵکەکە لێك نزیك بونەوە

الآزِفةُ: رۆژی قیامەت.

الأزَفُ: دەستکورتیو ژیانی کولە مەرگی ٥ ژینتاڵی.

أزِقَ أزقاً: تەنگە بەربوو ٥ (أزَقَ الشَّيءَ) ئەو شتەی تەنگ کردەوە (تَأزَّقَ) بە مانا (أزَقَ) یە.

المَأزِقُ: تەنگو چەڵەمە، تەنگژە، تەنگەبەرو شوێنی بەرتەسك، (ك: مَآزِق)ە.

أزَلَ المكانُ ازلاً: شوێنەکە تەنگ بوو ٥ (أزلَ الرجلُ) پیاوەکە کەوتە ژینتاڵیو چەرمەسەرییەوە ٥ توشی دەسکورتیو تەنگژە بوو ٥ (أزَلَ فلاناً) ٥ فلانکەسی حەبس کرد ٥ خستیە ناو چورتمو تەنگژەوە ٥

(أزَلَ الدابـة) ئاژەڵەکەی بەنـد کـرد، گوریسـی بەسـتنەوەکەی کـورت کـردەوە، لـەناو لـەوەڕگا بـەجێی هێشت.

**أُزِلَ الناسُ**: خەڵکەکە توشی گرانـیو کـەم دەرامەتی بـوون ٥ دەگـوترێ: (أُزِلـوا حتـى هزلـوا) گرانـیو نـەبوونی وای لێ کردن کزو کۆڵەوار بوون.

**آزَلَـتِ السـنَةُ**: سـاڵەکەی گرانـیو قـاتو قڕی بوو.

**تَـأَزَّلَ**: تـەنگ بـوو، کەوتـە نارەحـەتیو نەبونیـەوە ٥ (تَـأَزَّلَ صَـدْرُهُ) سـنگی تەنگ بوو هەناسەی سوار بوو.

**الآزِلُ**: ئەو کەسەیە لەترسان یان لەبـەر نەخۆشی نەتوانێ دەرکەوێ.

**الأزْلُ**: رۆژگـــاری ســـەخت، ژیـــانی کولەمەرگیو نارەحەتی.

**الأزَلُ**: کـۆنی بـێ سـەرەتا، ئـەو شـتەی کۆنەو سەرەتای نییە.

**الـأزَلِيُّ**: کـۆنی رۆچـوو لـەکۆنی دا کەسەرەتای نەبێ.

**المأزِلُ**: تەنگەبەر ٥ تەنگ ٥ تـەنگل، (ك: مآزِلَ)ە.

**أزَمَ على الشَيءِ أزماً**: بـەدەم گەسـتی زۆر بەتونـدی گەسـتی ٥ دەگـوترێ: (أزَمَ الفـرسُ علـى اللجـام) ئەسـپەکە لغاوەکـە دەجوێ دەیگـەزێ ٥ (و أزَمَ فلان على كـذا) فلانکـەس پابەنـدی فلان شت بوو، بەردەوام بوو لەسـەر ئەنجامدانی ٥ (وأزَمَت عليهم السَنَةُ) ساڵەکە زۆر قاتوقڕیو پـڕ تەنگژەو چورتم بوو.

**أزَمَ الشـيءَ**: شـتەکەی بڕیـەوە (أزَمَ عليـه) بەمانا (أزم)ە یە.

**تَأزَّمَ**: توشی ئەزمەو چورتم بوو (الآزِمُ) کەڵبە.

**الآزِمَةُ**: قاتوقڕیو نەبوونیو تەنگژەو چورتم.

**الأزْمَـةُ، الأزَمَـةُ**: تـەنگو چـەڵەمەو قـاتوقڕیو نـەبوونی ٥ دەگـوترێ ئەزمەی ئابوری ٥ ئەزمەی سیاسی ٥ ئەزمـەی تەندروسـتی ٥ لـەزانیاری پزیشـکی دا بـەئاگامیێکی چاوەڕوان نـەکراوی کتـوپڕ پەیـدابوو کەلـە نەخۆشـییەکی تونـدا دێتـە دی ٥ وەکوو ئیلتیهابی ریخۆڵە.

**المأزِمُ**: رێگەی تەنگەبەری نێوان دوکێو، (ك: مآزم)ە.

**آزَا الظلُّ أزواً**: سێبەرەکەی کـەم بـووە، هەڵکشایەوە (أزَا اليومُ) رۆژەکـە زۆر گەرم بوو.

**أزى ازيـاً و أُزِيّـاً**: وێـك هاتـەوە ٥ (أزَى الظـــلُ) سـێبەرە هەڵـــکشایەوە دەگـوترێ: (أزَى الثـوبُ): کراسـەکە تـێ چـوو، دواشـتن تەسـكو کـورت بـووە ٥ (أزَى لـە أزِيـاً) ٥ لـەرێگای ئەمینـــەوە بـــۆی هـــات بۆنـــەوەی بەخۆی نەزانێ هەڵی خەڵەتێنی.

**أزِيَ أزيَ:** وێك هاتەوە، چووە ناو یەكەوە تێوەچو ◊ (أزِيَ اليومُ) رۆژەكەی زۆر گەرم بوو.

**آزی الشَّيئَ ایزاءً:** ئەوشتەی خستە پاڵ فلان شت.

**آزَی الحَوْضَ:** سەرقاپی خستە سەر تەنكی ئاوەكە ◊ یان شتێكی خستە سەر زاركی حەوزەكە بۆ ئەوەی ئاوەكەی تێدا بمێنێ.

**تآزيا:** بەرامبەر بوون.

**تَأزّی عنه:** لێی زێوان بووەوە، پاشگەز بۆوە ◊ (تأزّی السهمُ) تیرەكە لەنیشانەكەی داو تێیدا لەریەوە.

**الإزَاءُ:** بەرامبەر ◊ هاوشان ◊ بەمانا لێزانو شارەزاش هاتووە ◊ دەگوترێ: (هو إزاءَ الأمرِ) ئەو لەوكارەدا شارەزاو پسپۆرە ◊ هەروا بەمانا سەرقاپی تەنكیو بەرمیلو سەرقاپی حەوزی ئاو هاتووە.

**الاسباناخ:** گیایەكی سەوزی زستانەیە دەكولێندرێ و دەخورێ.

**الاسبیداج:** كاربۆنی رصاص ◊ مادەیەكی سپی یە بۆ بۆیاخكردنو طەلایی بەكاردەهێندرێ.

**الاسبیرین:** مادەیەكە بەكار دەهێندرێ بۆ چارەسەری سەرئێشەو رۆماتیزم.

**الاستاج:** ئەو خولخلۆكە یان ئەو دارەیە كە بەدەست ریسی لەسەر هەڵدەكرێ ◊ بۆ جۆلایی كردنی بۆ تەنین و چنینی.

**الاستاذیة:** مەصدەرێكی صەناعییە واتە: مامۆستایەتی.

**الإستَبْرَق:** دێباجی ئەستور.

**استرالیا:** بچوكترین كیشوەرە لەناو پێنج كیشوەرەكان دا كەو تۆتە نێوان دەریا لوشی هیندیو دەریا لوشی هادی یەوە ◊ باشوری مەیلەو خۆرهەڵاتی ئاسیایە ◊ نێوان دوهێڵی (١٠ - ٣٩) باشورین ◊ مەداری (جەدیی) روبەرەكەی دابەش دەكا بۆ دووبەشی وەكوو یەك ◊ زۆربەی وڵاتەكە ئاووهەوای مام ناوەندی یە.

**أسِدَ:** رەوشتی شێری گرت ◊ شێری چاوپێكەوت و لێی ترسا.

**آسَدَ بین الكلاب مؤاسدةً:** سەگەكانی تێك بەردان، وای لێكردن پەلاماری یەكتری بدەن، (آسَدَ بینهم) نێوانی تێكدانو فەسادو ئاشوبی خستە نێوانیانەوە.

**أسَّدَ الكَلْبَ:** سەگەكەی تێبەردا.

**تَأسَّدَ:** دەگوترێ: (تأسَّدَ الكلبُ) واتە: سەگەكە پابەندی فەرمانی خاوەنەكەی بوو كە گیفیان كردەوە بۆ شەڕ ئەویش ئامادەباش بوو.

**إستَأسَدَ:** خۆی بردە رێزی شیرو وەكوو ئەو ئازایەتی نواند.

**الأسَدُ:** شێر چ نێرو چ مێ ◊ بێچو یان گەورە ◊ درندەیەكی ئازاو چاونەترسە لەزمانی عەرەبی دا زۆر ناوی هەن، (ك: آساد، أسود، أُسد).

**الأَسَدُ:** بورجێکه لەبورجەکانی ئاسمان.
(داء الأسد): جۆرێکە لەنەخۆشی گولی ٥ ئەو ناوەیان لێ ناوە چونکە دەم‌و چاوی توشبوو بەونەخۆشە وەکوو دەم‌و چاوی شێروایە.

**المَأسَدَةُ:** ئەوشوێنەیە شێری زۆر لێ بێ‌و پێیان خۆشبێ‌و وەگری ببن، (ك: مأسِدَ)ەیە.

**أَسَرَهُ أَسْراً و إساراً:** بەدیل گرتی

**أَسِرَ اسَراً:** میزی گیرا ٥ (إستَأسره) بەدیل گرتی ٥ (استَأسَرَ لە) پابەندی فەرمانەکەی بوو، بەقسەی کرد.

**الإِسَارُ:** پێوەند، ئەوشتەی دیلی پێ قۆڵبەست دەکرێ.

**الأَسْرُ:** جەستە تەواوی و لە شساغی، رێك‌و پێکی ئەندام ٥ دەگوترێ: (شَدَّ اللّٰه أسْرَهُ) خوا جەستەیەکی پتەوو رێك‌و پێکی پێداوە ٥ هەروا بەمانا هەموو، گشت هاتووە دەگوترێ:(جاء الأقرباء بأسْرِهم).

**الأُسُرُ والأُسْرُ:** میزگیران.

**الأُسْرَةُ:** زرێی قایم‌و پتەو، خزم‌و کەسی پیاو، کۆمەڵێك ئادەمیزاد کە کارێکی هاوبەش کۆیان بکاتەوە، (ك: أسَرُ).

**الأَسِيرُ:** بەدیل گیراوی جەنگ، (ك: أسَراء، أَسَارى، أُسارى).

**الأُسْرُبُ:** رەصاص.

**أَسَّ بينهم أَسّاً:** نێوانی تێکدان ٥ لێکی دڕدۆم کردن ٥ (أسَّ البناءُ) وەستاکە بناغەی دانا ٥ (أسَّ فلاناً) رقی فلانکەسی هەڵساند.

**أَسَّسَ:** بەمانا (أسَّ)یە.

**الأَسَاسُ:** بناغەی دیوارو خانوو ٥ ئەوشتەی دەیکەیە بنچینە بۆ شتێکی تر ٥ بنەمای هەموو شتێك‌و سەرەتاکەی ٥ دەگوترێ:(أساس الفكرة)، (أساس البحث) (التعليم الاساسي) ٥ (النظام الأساسي): دەستوری وڵات.

**الأَسُّ الإِسُّ الأُسُّ:** بەمانا (الأساس) دێن ٥ ئەگەر لەگەڵ زەمان دا بەکار بێندرێ بەمانا کۆن‌و دێرینە دەگوترێ: (الأكراد يعيشون على أرضهم من أسِ الدَهْرِ) ٥ وشەی (أسّ) ئەگەر لە حیساب دا بەکار هات، مەبەست ئەو ژمارەیە هێزی چەندییەت دەست نیشان دەکات ٥ هێزی دووەم (أس ٢) هێزی سێیەم (أس ٣)و بەوجۆرە.

**التَأسِيسُ:** لە قافیەو سەرەوادا بریتیە لە (ئەلفێك) بە سەرەواوە دەنووسێ لەنێوان ئەوو پیتی رەوی یەکەدا پیتێکی تر هەبێ ٥ (الاطال هذا الليل و اخضلَّ جانبهُ) ئەلفی (جانبه) ئەلفی تەئسیسە.

**المؤسسة:** دام‌و دەزگایە کە مەبەستی بەرهەمهێنان یان بازرگانی‌و کاڵا

گۆڕینەوە بۆ بەمەبەستی سودو قازانج.

الأُسْطبَّة: پاشەرۆك و خلتەو پلتەی دروستکردنی کالاکەتانی و لۆکەییەکان.

الأسْطرْلاَبُ: ئامێرێکە لەکۆن دا زاناکان بەکاریان هێناوە بۆ زانینی بەرزی قەبارە ئاسمانی یەکان و زانینی کات و شەش لایەنەکان (جهات الست).

الأسطبل: تەویلەی ئەسپ و ولاغی بارەبەر.

الأسْطورة: ئەفسانەو چیرۆکی بێ سەرو بەرو بێ بناغە.

الأسطول: کۆمەلێك کەشتی جەنگی یان کەشتی بار هەلگرو گواستنەوە.

الأسطول الجوي: کۆمەلێك تەیارە و بالەفرە، جەنگی یان هی گواستنەوە.

الأسطوانة: کۆلەکە ٥ ئەو قورصەیە کەدەنگ و مۆسیقای لەسەر تۆمار دەکرێ، (ك: أساطين)ە.

أساطين العلم والأدب: ئەوزاناو زیرەك و لێهاتوانەن کەلەزانیاری دا ناویان دەرکردوەو خەلکی بتمانەیان پێ دەکەن.

أَسِفَ عليه أسفاً: پەرۆشی بوو ٥ غەمی بۆ خوارد (أسِفَ له) دلْ نارەحەت بوو. پەشیمانی دەربڕی ٥ (آسَفَهُ) وای لێ کرد غەمباربێ ٥ (تَأَسَّفَ عليه) بەمانا (أسِفَ)یە.

الأَسِيفُ: کرێکار ٥ ئەوکەسەی بەهیچ شتێك قەلەو نابێ ٥ دالگۆشت، دلنەرمو گرینۆك ٥ خاتۆ عائیشە دەربارەی باوکی بە پێغەمبەری گوت: (إن أبا بكر رجل أسيفٌ فمتى مايقم مقامك يغلبه البكاء) ئەبوبەکر پیاوێکی دلنەرمو سۆزاوی یە هەرکاتێ بچێتە شوێنی جەنابت کولی گریانی هەلدەستێ.

الأسفاناخ: بەمانا (الأسباناخ)ە ٥ واتە (السبانخ) بەکوردی سپیناخ.

الأسْفَلْتُ: قیر؛ خلتە پاشەرۆکی بەرهەمی نەوتی خامە لەکاتی پالاوتن دا بەرهەم دێ و بەکاردەهێندرێ بۆ جادەو بان..

الإسْفَنْجُ: گیانلەبەرێکی دەریایی روەکی یە، جەستەی نەرمە کونی ورد وردی تێدان ٥ بەزۆری لەدەریاکانی میصردا هەیە ٥ هەروەها جەستەیەکی نەرمو نیانە کونکونە لەگیانلەبەری دەریا وەردەگیرێ زۆر ئاو هەلدەمژێ.

الإسْفِيداج: کاربۆنی رەصاص.

الأسفين: هۆرە ٥ سینگێکە بۆ زۆر شت بەکاردێ یەکێ لەوانە پەیوەستکردنی قەبارەیەك بەقەبارەیەکی ترەوە ٥ یان مانەوەی دوو قەبارە یان زیاتر لەسەر حالێ

خۆیان و نەگۆڕانی بۆشایی نێوانیان.

الإسْقَالَةُ: ئەو دارو حەبلانەیە کە ئەندازیارەکان لێکیان دەبەستن بۆئەوەی دەستیان بگاتە شوێنی بەرزی بینا، (ك: أساقيل). ئێستا کورد پێی دەڵێن: ئەسکەلە.

الأسْقَرْبُوط: نەخۆشی یەکە توشی جەستە دەبێ بەهۆی گەندە خۆری یەوە ٥ یەکێ لەدیاردەکانی زیعفی گشتی و ئازاری دەست و قاچە.

الأسْقُفُ: پلەو پایەیەکی ئایینی یە بۆ کەشیش و پیاوە ئایینی یەکانی مەسیحی یە لە ژوور قەسیس و لەخوار مەترانەوەیە.

الأُسْكُرُجَة: قاپێکی بچوکە لەسەر سفرە دادەنرێ زەڵاتە و ئەو جۆرە شتانەی تێدەکرێ.

الإسْكيم: کراسی ڕەبەنەکانە.

الإسْكيمو: چینێکی ئادەمیزادن لەناوچەی قوتبی باکور ژیان بەسەردەبەن.

أَسُلَ إسَالَةً: لووس بوو، ڕاست و ڕێك و پێك بوو ٥ دەگوترێ: (خَدٌ أسيلٌ) کولمی ڕێك و جوان (كفٌ اسيلة الأصابع) دەستێکە پەنجەکانی ڕێك و پێکن ٥ (أسَّلَهُ) ڕێك و پێکی کرد ٥ ئاسنەکەی تیژ کرد، شمشێرەکەی تیژ کرد.

تَأَسَّلَ أباه: لەباوکی چوو ئەخلاق و ڕەوشتی باوکی پەیڕەوکرد.

الأَسَلُ: ڕوەکێکە لق و پۆپی زۆرن چقڵاوییە لەپێری (أَسَلِة) لەناو ئاوو زەوی تەڕدا دەڕوێ، حەصیرو حەبلی لێ دروست دەکرێ ٥ هەروا ناوە بۆ چقڵی درێژ ٥ بۆ ڕمب بۆ تیر بۆ هەرشتێك لەئاسن بێ و تیژ بکرێ، شمشێربێ یان کێرد بێ یان سەر ڕمب بێ.

الأسَلَةُ: هەموو قەبارەیەك درێژو ڕاست بێ ٥ هەروا ناوە بۆ سەروبنی قەبارەی باریك، جا تیرۆك بێ، سوژن بێ، شیشی توتن بێ.

الإسْمَنْتُ: چیمەنتۆ.

إسمنجوني: ڕەنگی شینی کاڵ.

أَسَنَ الماءُ أسناً وأسوناً: ئاوەکە گۆڕاو بۆگەنی کردو بەکەڵکی خواردنەوە نایەت.

أسِنَ الماءُ والهواءُ: هەربەمانا (أَسَنَ)یە (أَسِنَ فلان) فلانکەس بەهۆی پیسی هەواوە بێ هۆش بوو.

آسَنَتْهُ الرائحة المنتنة ايساناً: هەوای بۆگەن ئاوەکەی گۆڕی (تَأَسَّنَ الماءُ) بەمانا (أسَنَ)یە (تَأَسَّنَ عهد فلان) پەیوەندی و دۆستایەتی فلانکەس گۆڕا.

أَسَا بينهما أساً وأسواً: چاکسازی نێوانی کردن ٥ (أَسَا الجرحَ) برینەکەی چاك کردەوە ٥ (أسا فلاناً) چاکسازییەکانی لابردن ٥ (أَسَا فُلاناً

بفُلان) وایكرد فلان شوێن پێی فلان هەڵبگرێ.

الأُسْوَارُ: سەركردە، پاڵەوان، سوارچاك لەبنەڕەت دا وشەكە (فارسی)یە.

أسى الجُرْحَ أو المرض أو المريض: چاكی كردەوە.

أسِيَ عليه: پەرۆشی بوو، خەمی بۆخوارد.

آساه: غەمباری كرد ◊ (تآسوا) خەڵكەكە هەندێكیان هەندێكیانی خەفەتبار كرد.

آسى فلاناً بمصيبته: تەعزییەی لەفلان كرد بەهۆی كارەساتەكەیەوە دڵخۆشی دایەوە دڵنەوایی كرد.

إئتسى به: كردی بە پێشەنگو رابەری خۆیو شوێنی كەوت.

تأسّى به: بەمانا (إئتسى به)یە.

الآسِيُ: پزیشك، دكتۆر.

الآسِيَةُ: كۆڵەكە ◊ بینای پتەو بناغەدامەزراو.

الأُسْوَةُ: پێشەواو رابەر ◊ هاوشانو هاو وێنە.

المأساة: ترازیدیا، شانۆیەكی توندو تیژو كاریگەرە، بەزۆری لەمێژوو چیرۆكو ئەفسانە وەردەگیرێو كۆتایی یەكەشی خەماوییە.

آسيا: گەورەترین كیشوەرە لەپانو پۆڕیو فراوانی دا كەوتۆتە نێوان دوو هێڵی پانی باكوری (١,٥- ٧٨,٥) جگە لە دوورگە خۆرهەڵاتیە هیندییەكان ◊ ئەم كیشوەرە لەناوچەی گەرمەڵانە وە تاناوچەی بەستەڵەكی باكور دەڕوا ◊ نیوەی دانیشتوانی سەرزەوی تێدا دەژێ.

الأسيتون: شلەمەنی یەكی گازاوی بێ ڕەنگە بۆنێكی تایبەتی هەیە.

أشَبَ الأشياءَ أشباً: شتەكانی كۆكردنەوەو تێكەڵاوی كردن ◊ أشَبَ فلاناً بكذا: فلانكەسی بەوشتە بەوتاوانە لەكەدار كرد.

أشِبَ الشَّجَرُ أشَباً: درەختەكە لقو پۆپەكانی تێك چڕژانو لێك هاڵان ◊ (أشِبَ الأمر بينهم) خەڵكەكە نێوانیان تێكچوو ئاشوبو فەساد كەوتە بەینیانەوە ◊ دەگوترێ: (أشِبَ مابيني و بينه) دۆستایەتی نێوان منو ئەوی تێك دا.

إئتَشَبَ: كۆبونەوەو تێكەڵاوبوون ◊ (تَأشَّبَ) بە مانا (أشِبَ)یە (تَأشَّبَ القومُ) كۆبونەوەو تێكەڵ بوون ◊ لە حەدیثی پێغەمبەردا دەڵێ كاتێك پێغەمبەر (د.خ) ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾ی دەخوێندەوە (فَتَأشَّبَ أصحابه اليه) واتە هاوەڵانی لەدەوری كۆبونەوەو تێكەڵاو بون ◊ لە فەرمودەی عەباس دا هاتووە دەڵێ: رۆژی غەزای حونەین عەباس بانگی تێكشكاوو هەڵاتوەكانی كرد

(حتى تأشَّبو حول الرسول) هەتا هەموویان لەدەوری پێغەمبەر گردبونەوە.

الأشابة من الناس: خەڵکی تێکەڵو هەمەجۆر ٥ (الإشابة من الكسب) ئەو ماڵو سامانەیە حەرامی تێکەڵ بوو بێ، (ك: أشائبَ)ە.

الإشَابَةُ: لەزانیاری کیمیادا بریتییە لەبەیەك گەیشتنی دوو (مەعدەن) کانزا یان بەیەکگەیشتنی کانزایەك بەشتی تر.

أشَرَ الخشبة أشراً: درەختەکەی بریەوە (أشَرَ الأسنان) ددانەکانی برینەوە، ئەم لاو ئەولاکانیانی تاشیو تەنکی کردن.

أشِرَ أشراً: کەیفخۆش بوو نیشاتی پەیدا کرد ٥ خۆی بەزلزانیو لەخۆی بایی بوو ٥ لەقورئان دا دەفەرموێ: ﴿بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أشِرٌ﴾، (ك: أشاری و أشری)، (أشِرَ البرقُ) هەورە بریسکەکە، روناکایی گلۆپەکە لایتەکە لەمەعانی کردو لەشوێنێك نەوەستا هاتوچۆی کرد ٥ (أشِرَ النباتُ) زەرعاتەکە گەشەی کرد ٥ (أشَرَةُ) بەمانا (أشَرَةُ) دێ ٥ دەگوترێ: (ثغرٌ مؤشّرٌ) ددانەکانی رندراون راستەو پاستەکراون شاش و پاشییان نەماوە.

الإشارة: ئامازە بۆکردنو دەست بۆراکێشان.

الأُشُرُ: تیژی ددان بەسروشتی یان بەدەستکاریکردنی پزیشك.

الأُشَرَةُ: گرێیەکە بەسەری کلکی کوللەوەیە وەکوو گاز وایە پێی دەگەزێ.

المِنْشَارُ: مشار.

الإشْرَاسُ: سرێش ٥ گیایەکە تۆوێکی درێژکۆڵەی هەیە، ورد دەکرێو دەکرێتە ناو ئاوەوە وەکوو غەرەو سیکوتینو کەتیرە دومادەی پێ لێك دەدرێن ٥ بەزۆری بۆ جزوبەندو تەجلیدی کتێب بەکاردەهێندرێ.

أشَّ أشاً وأشاشاً وأشاشة: بۆشو بێناوك بوو گەشەی کردو حەسایەوە ٥ (أشَّ ورق الشَّجَرِ) بەعاصاو گۆچان لەدرەختەکەی دا بۆ ئەوەی گەڵاکانی هەڵوەرن.

الأشُّ: نانی وشك.

الإشْفی: دەرزی پینەچی.

تَأشَّنَ: دەستی یان شتی تری بە ئەسپۆن شت.

الأُشْنَانُ: روەکێکە یان درەختێکە لەلبەڵان دا دەروێ گەڵاکەی وشك دەکرێو وەکوو صابون دەستو دەمو چاوو پۆشاکی پێ دەشۆرێ.

الأُشْنَةُ: روەکێکە بێ گوڵ لەدو نەبات پێك دێ ٥ یەکیان قەوزو ئەوی تریان فیطریاتە ٥ پێکەوە گونجاون لەسەر شێوەی تویکڵو لقو پۆپی

باریك‌و وردیله لەسەر بەردو دركە شاخ یان لقی دار دەروێ بەپرچە پیرێژن ناوزەد دەكرێ.

**أَصَدَ** الباب أصْداً واصاداً: دەرگاكەی داخست ٥ گاڵی دا.

آصده إيصاداً: بەمانا (أصَدَهُ) هاتووەو لۆغەتێكە لە (أَوْصَدَهُ) لە قورئان دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ﴾.

**أَصَّدَ الثَّوْب**: كراسەكەی بێ قۆڵ كرد ٥ (أصَّدَ الجارِيةَ) كراسی بێ قۆڵی لەبەر چەتیوەكە كرد.

**الأُصْدَةُ**: كراسی بچوكی بێ قۆڵە.

**الإِصْدَةُ**: شوێنی كۆبونەوەی خەڵك، (ك: إصَدٌ)ە.

**الأَصِيدُ**: حەوشەی ماڵ.

**أَصَرَهُ أَصْراً**: گرێی داو قایمی كرد ٥ بای داو خواری كرد، حەبسی كرد.

**إِئْتَصَرَت الأرض**: گژوگیاكەی بەردەوام بوو گیاكەی باڵای كردو تێك هاڵاو چڕو پڕ بوو (إِئْتَصَرَ القومُ) زۆربون، ژمارەی ئەو هۆزو گەلە زیادیان كرد.

**الآصرة**: ئەو پاڵنەرەیە كەوات لێ دەكا هەندێ خزمو كەس‌و كارت خۆش بۆی ٥ جائەو پاڵنەرە خزمایەتی بێ یان زاوابەندی یان چاكەو پیاوەتی بێ.

**الإِصَارُ**: قەدوباڵای پیاو.

**الإِصْرُ**: پەیمانی جەخت لەسەر كراو، لە قورئان دا دەفەرموێ: ﴿قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي﴾ هەروەها بەمانا كۆڵی قورس هاتووە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا﴾.

**الأَصِير**: روەكی ئەصیر گیایەكی درێژەوە بوو لێك هاڵاوە ٥ دەگوترێ: (شعر أصير) قژێكی درێژ.

**المَأْصِرُ**: زنجیرێكە بەسەر روباردا رایەڵ دەكرێ بۆ لەمپەڕ دانان لەبەردەم كەشتییەكان دا ٥ لەمپەرێكە دادەنرێ لەسەر رێگە لەبەردەم رێبواران، (ك: مآصِرٌ)ە.

**أَصَّتَ النَّاقَةُ، أَصًّا وأصيصاً**: حوشترەكە گۆشتەكەی توندو پتەو بوو خۆی دارشت‌و تێك سمڕا، (ك: أُصُص)و (أصائص).

**أَصَّ القَوْمُ** بعضهم بعضاً أصًّا: كۆبوونەوە و قەرەباڵغیان كردو شانیان لێك داو كردیانە كەڵەكە تەرە ٥ (إِئْتَصُّوا) كۆبونەوەو نیزدیحامیان كرد.

**الأَصَّاصُ**: مەركانە دروستكەر.

**الأَصِيصُ**: قەبارەیەكی ناو بەتاڵە لەشێوەی جەرەدا دوو قولفەی بەم لاو ئەولایەوە هەن، قوری تێدا دەگوێزرێتەوە ٥ مەركانەیەكە (زەرفێكە) لەشێوەی جەرەدا لە

سوالەت دروست دەكرێ بەزۆری گوڵو رەوەكی تایبەتی تێدا دەڕوێندرێن.

**الأَصَصَةُ:** خانووی لەیەك نزیكو بەپەنایەكەوە.

**الأُسْطُبَّةُ:** بنشەو خلتەو پلتەو پاشماوەی پێشەسازی كەتانو لۆكەیە مانای وشەی (الأُسطبة) دەگەیەنێ.

**الإِصْطَبْلُ (الإسطبل):** تەویلەی ولاغ.

**الأَصطفْلِينُ:** گێزەر، روەكێكە دەخورێ.

**الإِصْطِيْلُ:** كوێر ٥ شەریفی مورتەضا بەم نازناوە خیطابی ناڕاستەی ئەبوعەلای مەعەری كرد.

**الأَصَفُ:** گیایەكە چقڵدارە گەڵاكەی سەوزو ناسكە، چرۆكەی بەكوڵاوی و بەكاڵی دەخورێ ٥ ترشی پێ دەكرێ یان خوێ.

**أَصَّلَ الشَيْءَ أَصْلاً:** شوێن ئەوشتە كەوت تا گەییشتە بنجو بناوانی.

**أَصِلَ اللحمُ أَصَلاً:** گۆشتەكە گۆڕاو بۆنی كرد.

**أَصُلَ آصالةً:** جێ گیربوو دامەزرا بەهێز بوو ٥ (أَصُلَ الرأيُ) رایەكەی پەسەند بوو بەهێز بوو.

**أَصُلَ الأسلوبُ:** ئوسلوبەكەی تازەو تازەگەری تێدا بوو (أَصُلَ النسبُ) بنەچەو بنەماڵەكەی رێزدارو وەجاغزادەن.

**آصَلَ إيصَالاً:** لەكاتی دەمەوئێوارە (زەردەپەڕ)دا داخڵی ئەو شوێنە بوو.

**أَصَّلَ الشَيْءَ:** بناغەی ئەوشتەی چەسپاندو شوێنی خۆی گرتو پتەو بوو.

**إِسْتَأْصَلَ الشَّيْءَ:** لەبناغەوە ئەوشتەی دەرهێنا.

**الأَصَالَةُ في الرأي:** رای جوانو پەسەند (الإِصَالَة في الأسلوب) راهێنانی رێبازو شێواز (الأصالة في النسب) وەجاغزادەییو خانەدانی لەبنەچەو خێزان دا.

**أَصْلُ الشَيءِ:** ئەو بناغەو بنەمایەی شتەكەی لەسەر بنیات دەنرێ ٥ سەرچاوەی ئەوشتە لەچییەوە هاتووە لەكوێوە هاتووە.

**الأَصْلُ:** حەصڵزادەو خانەدان ٥ دەشگوترێ (ما فعلته أصلاً) قەت ئەو شتەم نەكردوە ٥ (ولا أَفْعَلُهُ أصلاً) هەرگیز شتی واناكەم.

**الأَصْلِيُّ:** ئەوەتا بناغەو بنەمای شت بێ ٥ بەرامبەرەكەی پێی دەگوترێ: (الفرعي، الأحتياطي، المقلد).

**الأَصَلَةُ:** ماری قوڵە هۆیباب ٥ ماری ژەهراوی پیس پیردەبێو دەتۆپێ.

**الأُصُولُ:** بنەمای زانیارییەكان ئەو قاعیدە پاسایانەیە كە زانستەكەیان لەسەر بنیات دەنرێ، ئەحكامەكانی لەسەر دادەمەزرێ.

**الأصِيلُ**: كاتى دەمەو ئێوارە زەردەپەڕ ٥ كـاتى خۆرئـاوابوون، (ك: أُصُـــل، أُصْلان، آصال، أصائل).

**الأصِيلَةُ**: شتى چەسپاو ثابت (أصـيلة الرجــل) دەسـت مايـەى پيـاو ماڵـە سەرەكييەكەى ٥ بەمانا (هـەموو)ش هاتووە.

**أضَّــتْ إضاضــاً**: ئافرەتـە دوگيانەكـە لەئازارى منداڵبوون دا تلاو تلى كرد ٥ (أضّ الأمـــرُ فلانـــاً) فلآنكەســى غەمباركرد نارەحەتى كرد.

**أضّ الشيءَ**: شتەكەى شكاند.

**آض فــلان مؤاضــة**: فلآنكـەس دەسـت پێشخەرى بۆ ئەو شتە كرد.

**إئــتَض فـــلان**: فلآنكـــەس توشــى نارەحــەتى بــوو، ناچـاربوو (إئـتَض الشَــيءَ) داواى ئەوشــتەى كــرد ٥ (إئتَض فلاناً) لەفلآنكەسى دا.

**الإِضُّ**: بناغەو بنەما.

**أضَــمَ** عليــه أضـــماً: رق‌و قــارى خــۆى خواردەوە، دانى بەخۆيا گرت.

**أضِمَ** به: ئەزيەتى دا چونكە رقى لىَ بوو.

**الإضــاءُ**: درەختــى لق‌و پۆپـدارى پــڕ گەلآ.

**الأضــاةُ**: زەلكاو، زۆنگـاو شـوێنێك چاڵ بىَ‌و ئاوى تێدا كۆبێتەوە.

**أطَرَ** الشَّيءَ أطراً: چوارچێوەى بۆ ئەوشـتە دروســت كــرد ٥ (أطـــرَ العـــودَ) شوڕكەكەى خوار كردەوە.

**إنأطَرَت المرأةُ**: ئافرەتەكـە لـە رۆيشـتن دا لارو لەنجـەى كـرد ٥ (إنـأطَرَ بِالْمكـان) لەو شوێنەدا حەوق بوو، گيرى خوارد.

**الآطِرَةُ**: بەمانا (الآصرة)ە.

**الإطــارُ**: هەرشـتێك لـەدەرەوە دەورەى شتێكى تربدا ٥ وەكـوو چوارچێوەى وێنە، چوارچێوەى دەرگاو پەنجـەرە ٥ چوارچێوەى دەف.

**الأطِيرُ**: تاوان ٥ دەگوترىَ: (أخذني بـأطير غـــيري) بـــەهۆى تـاوانى كەســانى ديكەوە منى سزادا.

**المَأطُورَةُ**: قەوسى كەوان.

**أطَّ** أطا وأطيطـا: دەنگـى لـىَ هـات، ناڵـەى كــرد، دەگــوترىَ:(شـــجاني أطـــيط الركاب) دەنگ‌و عەڵبەغەڵبى قەتار چيەكان نارەحەتى كردم (أطَّ الـبطن من الجوع) سكى قۆڕەى دىَ لەبرسان ٥ يان لەبەر زۆرئاو خواردنەوە.

**أطَّ الظهـرُ**: پشـتى قرچەقرچـى لـىَ هـات لەبـەر كۆڵـگرانى ٥ (أطّــت الأبــل) حوشـــترەكە لەبـــەر بـارى گرانـــى سەرپشـتى نركـەو ناڵـەى لـىَ هـات، نركاندى ناڵاندى.

**الإطلُ**: كەلەكە، (ك: آطال)ە.

**الأيْطلُ**: كەلەكە، (ك: أياطلَ)ە.

**الأطلَسُ**: كۆمـەڵێك وێنـەى جوغرافين لەشێوەى كتێب دا كۆدەكرێتەوە.

**أطَمَ** أطوماً: ئەوەى لەدڵيدا بوو شارديەوە دەرى نەخست.

**أطمَ بيده:** دەستی خۆی گەست ◊ بەدەستی خۆی ڕۆگەزی.
**أطـمَ علـى البيـت:** پـەردەی ماڵەکـەی دادایەوە.
**أطمَ أطماً:** میزی گیرا، یان قەبز بوو (أطمَ فلانٌ) فلانکەس ئەوەی لەدڵی دا بوو دەری نەبڕی.
**أطـمَ البَـابَ:** دەرگاکـەی داخست (آطـمَ فلانـاً) ڕقـی فلانکەسـی هەڵسـاند، توڕەی کرد.
**أطمَ الهَوْدَجَ:** کەژاوەکـەی داپۆشی، (أطـمَ الأُطمَ) باڵەخانە، یان قەلاکەی بـەرز کردەوە.
**تَـأطمَ:** ئـەوەی لـەدڵی دا بـوو دەری نەبڕی (تَـأطمَ عَلَـيَّ) زۆر تـوڕە بـوو، بەرامبەرم سنووری بەزاند.
**تـأطمَ الليـلُ:** شـەوەکە زۆر تاریـك بـوو (تَـأطَّمَ السـيلُ) شـەپۆلی لافاوەکـە بەرزبوونـەوە ◊ هەنـدێکیان بەسـەر هەنـدێکیان دا شـکانەوە (تأطَّمَـتِ النـارُ) بڵێسـە ئاگرەکـە بـەرزبۆوە ◊ (تَأطمَ البولُ أو البزارُ) میزی گیرا یان قەبز بوو.
**الأُطامُ:** گیرانی میز بەتەواوەتی.
**الأُطمُ – الأُطمُ:** قەلاو شورا، خانووی بەرز، (ك: آطام، أطوم)ە.
**الأطوم:** سولەحفاتی دەریایی ◊ قرژاڵ ◊ ژیشك، گیانلەبەری ئاویی کەئێسقان لە لەشی دا نەبێ، (ك: أطمٌ).

**أغسطس:** مـانگی آب مـانگی هەشـتەمی ساڵ.
**أَلخَـهُ أَلخـاً:** مسـتەکۆڵەی لـەلوتی دا ◊ بەتونـدی لـەیافوخی دا ◊ (اليَـافُوخُ) بۆشـایی یەکـە بەپەردەیـەك داپۆشراوە ◊ بەوشوێنە دەگوترێ کە ئێسـقانەکانی جومجومەیـەك دەکەون.
**أفِـدَ أفـداً:** نزیـك بـۆوە، دەگـوترێ: (أَفِـدَ موسمُ الحج) کاتی حـەج نزیـك بـووە ◊ پەلەی کردو بەتاو هات ◊ (إستَأفَدَ) بەمانا (أفِدَ)یە.
**أفَـرَ أفْـراً وأفـوراً:** نیشـاتی پەیـداکرد ◊ لەرۆیشتنی دا بازی دا.
**أفَرَ القِدْرُ:** مەنجەڵەکە دیزەکە بەتونـدی دەکوڵـێ ◊ (أفَـرَ الحيـوان) ئاژەڵەکـە دوای لەڕی قەڵەو بوو.
**أفَرَ الخـادمُ:** خزمەتکارەکە کەمتـەر خـەم بوو لە ئەرکی خۆی دا.
**أفِرَ:** نیشاتی پەیداکرد، دوای لەڕی قەڵەو بوو.
**الأفِـرَّةُ:** تێکـەلاوی‌و گـوریس کێشـەکە، توندو تیژی‌و چورتم.
**الأفّارُ:** ئەوکەسەی لەڕاکردن دا ئازابێ‌و بازی چاك بدا.
**المِئفَرُ:** خزمەتکارو شاگردو بەردەست.
**الإفرِنـــجُ والأفرنـــجَةَ:** توێـــژێکی ئادەمیزادن لەئـەوروپا دا دەنیشـن ◊ کورد پێیان دەڵێ فەرەنگ.

**الإفْرِيزُ**: دیکۆری خانوو ئەو زیادەو بەرزیو نزمیانەن کەلەدیوار دەردەچن.

**إفْرِيقِيَّةُ**: یەکێکە لەحەوت کیشوەرەکانی جیهان زۆربەی روبەرەکەی دەکەوێتە ناوچەی گەرمەڵانەوە ٥ لەنێوان هێڵی پانی (٣٧)ی نیمچە باکورو (٣٥) نیمچە باشور ٥ دەریای سپی ناوەڕاستو دەریالوشی ئەتڵەسیو دەریالووشی هیندیو دەریای سور دەویان داوە ٥ عەرەب ناوی ئەفریقایان تایبەت کردبوو بۆ وڵاتی تونس.

**أفَّ أفّاً**: لەنارەحەتیو خەمو خەفەت ئاخو ئۆفی کرد ٥ (أُفَاف، أُفُوف) بەوکەسە دەگوترێ کە زۆر ئاخو ئۆف بکا.

**أفَّفَ**: بەمانا (افَّ)یە ٥ (أَفَّفَ فلاناً) لەفلانکەس ورز بوو جاڕز بوو یەخەی خۆی لەبەردادڕی.

**أفّ**: هەمزەکەی بەسەرۆژێر دەخوێندرێتەوە (ف)کەشی بەهەموو دووسەر دوژێر دوو بۆر یان بەتاك بزوێن دەخوێندرێتەوە.

**الأفَّةُ**: ترسنۆك، فێزەونو پیسو پۆخەڵ.

**اليَأفُوفُ**: ترسنۆکی لەخۆڕازیو فشەکەر ٥ خواردەمەنی تاڵ ٥ بێچوە دوراج.

**أفَقَ أفْقاً**: بەدونیادا گەڕا ٥ (أَفَقَ فلاناً) بەسەر فلانکەس دا زاڵ بوو.

**أفِقَ أفَقاً**: لەسەخاوەتیو زانیاری دا گەییشتە پلەیەکی بەرز زۆر زاناو سەخی سروشتە.

**تَأفَّقَ فلان بالقوم**: فلانکەس چووە ناو قەومەکەوەو هیچ گرنگی پێ نەدان.

**الأفَقَة**: کەلەکە ٥ (الأُفَاق): ئەوکەسەی زۆر بەدونیادا دەگەڕێ ٥ کەسێك کەزێدی دیاری کراوی نەبێو کەس نەزانێ خەڵکی کوێیە.

**الأُفُقُ**: ئاسۆ ٥ هێڵێکی کەوانەیی یە بینەر وائاسمان دەبینی کەبەزەویەوە نوسابێ، لەسەر وشکانی هێڵەکە خوارو خێچ خۆدەنوێنێ ٥ لەناو دەریادا هێڵەکە بەکەوانەیی تەواو دێتە بەرچاو.

**الأُفُقِي**: ئەوکەسەی زێدی دیاریکراوی نەبێ ٥ هێڵێکی راست بەرامبەر بەسەطحی زەوی ٥ (الأفقي من الصحيفة) لەراستەوە بۆ چەپ.

**الأَفِيقُ**: پیاوی ئازاو بەجەرگ.

**أفَكَ فلانٌ أفكاً وإفْكاً وأفوكاً**: فلانکەس درۆی کردو شتی هەڵبەست.

**أفَكَ فلاناً**: درۆی بەدەم فلانکەسەوە هەڵبەست ٥ فێڵی لێ کرد.

**أفَكَ فلاناً عن الشيْ أفْكاً**: فلانکەسی زێوان کردەوە، لەوهەڵوێستەی لای

دا، (أَفَكَ الأمْرَ عن وَجْهِهِ) کارەکەی هەڵگێڕایەوە لەڕوی خۆی لای دا.

**أفكَ أَفْكاً وإفكاً**: درۆی کرد، (أُفِكَ عنه) لێی گوم بوو.

**آفَكَهُ ايفاكاً**: هەڵینا بۆ بوختانکردن ◦ (أَفَّكَ) درۆی کرد.

**أفّكَ فلاناً**: فلانکەسی بەدرۆ خستەوە.

**إئتَفَكَتِ الأرض**: زەوی بەهەموو سەرنشینەکانیەوە هەڵگەڕایەوە وەرگەڕا ◦ (إئتَفَكَتِ الرياحُ) لەهەموو لایەکەوە با هەڵی کرد.

**إئتَفَكَتِ القومُ**: ئەو قەومە باری ژیانیان گۆڕا توشی چورتمو ناخۆشی بوون، لەحاڵەتی خۆشیو هەرزانیو ئاسایشەوە کەوتنە ناوژیانی تەنگو چەڵەمەو گرانیو ترسو لەرزەوە.

**تأفّكَ**: درۆی هەڵبەست.

**المُؤتَفِكاتُ**: بای هەمەلایەن کەلە هەرچوارلاوە روبکاتە شوێنێك ◦ ئەوشارو گوندانەی قەومی لوط کەخودا غەزەبی لێ گرتنو ژێرو زەبەری کردن.

**أفَلَ النجم أفلاً وأفُولاً**: ئەستێرەکە ئاوا بوو، لەپێش چاو گوم بوو، (ك: أُفُل)ە ◦ (أفضلَ المرضعُ) شیردەرەکە شیرەکەی نەما، وشکی کرد.

**أفِلَ**: بەمانا (أَفَلَ)ەیە.

**الأفِيلُ**: بێچووە حوشتر یان کاریلەو بەرخۆلە.

**أَفِنَ الرجلُ أفناً**: پیاوەکە عەقڵی سوك بوو بێ عەقڵ بوو.

**أفَنَ اللهُ فلاناً**: خودا عەقڵی فلانکەسی کەم کرد ◦ لەپەندا گوتراوە (البِطنَةُ تأفِنُ الفِطنَةِ) زۆر خۆریو ورگ زلی عەقڵ کەم دەکا ◦ (أفَنَ الناقةَ) لەکاتێك دا حوشترەکەی دۆشی کە وەختی دۆشینی نەبوو.

**أفِنَ أفناً وأفَناً**: بێ عەقڵ بوو ◦ حوشترەکە شیری کەم بوو.

**أفِنَ الطعامُ**: خواردنەکە بەڕواڵەت جوانو ڕازاوە بوو وەلێ بێ کەڵك بوو تامی نەبوو.

**تَأَفَّنَ**: ڕەوشتێکی دەرخست کە تێیدا نەبوو.

**أفَنْدي**: وشەیەکی تورکی نەژادە بۆ ڕێزلێنانە بەمانا گەورەو ڕێزدارە.

**الأفيون**: تلیاك؛ گوشراوی روەکی خەشخاشە بۆ بێهۆشکردنو خەولێ خستن بەکاردێ.

**أقّتَهُ**: کاتی بۆدیاری کرد.

**الأقحوانُ**: گوڵە ئوقحوان ◦ گوڵێکی زەرد یان سپی یە گەڵاکانی کەلکەلو چین چینە وەکوو ددانی مشار، لەئەدەبی عەرەبی دا زۆرجار تەشبیهی ددان کراوە بەگەڵای گوڵە ئوقحوانی سپی، (ك: أقاحٍ و أقَاحِيّ) فەلا میسرییەکان پێی دەڵێن: (خوان).

**الأقِــط**: کەشــك ٥ دۆی ترشــاو دۆیەکــە دەکوڵێندریٚو ئاوەکەی لـێ دەگیریٚ ئــەمجار رەق دەکـــریٚو دەکـــریٚ بەچێشــتو لــێ دەنــریٚ دەکرێتــە دۆکوڵیو دۆو رۆنو چەم سوتەکە.

**الأقّــةُ**: حوقــە؛ ئــامێرێکی کێشــانە وەزنەکەی چوار سەد دیرهەمە، یان هــەزارو دووســەدو چـلو هەشـت گرامە.

**الإقْليدُ**: کلیلە، (ك: أقاليد).

**الإقْلــيمُ**: بەشــێکە لــەزەوی چــەند تایبەتمەنـــــدی سروشـــــتیو کۆمەلایــەتیو نەتەوایــەتی تێــدا بــەدی دەکرێن ئەم تایبەتمەندیانــە ئــــەو بەشــــە زەوییــــە دەکەنـــــە یەکەیەکی تایبەتی وەکوو ئیقلیمی کوردستان، ئیقلیمی باسك.

**الأُقنُــــومُ**: جەوهـــەر، کەســـایەتی ٥ بنـەماکان ٥ مەسیحییە عەرەبـەکان بــەکاری دێــنن بــۆ ئامــاژەکردنی ئالوثی ئەقدەس.

**الأُقيَانوس**: دەریـاڵووش، دەریـای گـەورە کەدەورەی کیشوەرەکانی دابێ.

**أکتـوبر**: مـانگی دەیـەمی سـاڵی زایـین تشرینی یەکەمی سورەیانی.

**أکّــدَ** الشَــيْءَ: جــەختی لەســەر شــتەکە کــردەوە ٥ پتــەوی کــرد ٥ بنــەوانی شێلا.

**أکّــدَهُ إيکــاداً**: چەســپاندی، تەئکیــدی لەسەر کردەوە.

**أکّدَهُ تأکيداً**: بەمانا (أکّدَهُ)دێ.

**تَأکّدَ**: چەسپا، توندو تۆڵ بوو.

**الإکادُ**: پشتێنێکە شتی پێ دەبەستریٚو قایم دەکریٚ.

**أکَرَ** الأرْض: زەوی کێلاو چاندی، کشتو کاڵی تێدا کرد ٥ (أکَرَ النَهْرَ) شوێنی روبارەکـەی هەڵـکەندو قوڵی کـرد، (أکَرَ البِئْرَ) بیرەکەی هەڵکەند.

**آکَرَهُ مؤاکرةً**: زەوییەکەی کرد بەکشتو کـــاڵ بەومەرجـــەی نیـــوەی یـــان ســـێیەکی (بەشـــێکی دیـــاریکراو) لەبەرو بوومەکە بۆ ئەوبێ.

**الأُکْـرَةُ**: چـاڵێکە، بیرێکـە قـوڵ دەکـریٚ بۆئـەوەی ئـاوی ژێـرزەوی دزەی بـۆ بکاو تێیدا کۆببێتەوە.

**الأکّارُ**: فەلا، وەرزێر، (ك: أکَرَة)٥.

**الأکّـــارَةُ**: ئامێرێکــە جــۆمو جۆگـــاو جۆباری پێ هەڵدەکەندرێن.

**الأُکْســـــجِينُ**: عونصـــرێکی گازییـــە لەپێکهاتـەکانی هـەوا ٥ بـێ رەنـگو تــامو بۆنــە، بەئەندازەیــەکی کــەم لەئاودا دەتوێتەوە بۆ هەناسـەدان و هەڵمــــژینی گیانلەبـــــەرو روەكو درەخت پێویستە ٥ بێ ئـەو ژیانیـان نابێ.

**الأُکْسِيدُ**: ژەنگ لەسەر قـەبارە دیاری دەدا هەرکاتێك لەگەڵ ئۆکسجین دا یەکی گرت ٥ سەیری مادەی (صَدَأ)بکە.

**الإِكْسِيرُ**: مادەیەکی تێکەڵە، پێشینان پێیان وابوو بەهۆی ئەوەوە مادەی هەرزان بەها دەگۆڕدرێ بۆ زێڕ، هەروا بەمانا شەرابێکە هەرکەسێك بیخواتەوە تەمەنی درێژ دەبێ، واتە: (ئاوی حەیات).

**أَكَّفَ** الحِمَارَ و البَغْلَ: کورتان یان سەرجلەکەی لێ قایم کرد ◦ (أَكَّفَ الإِكَافَ) کورتانی دروستکرد یان سەرجلی بۆ دروستکرد.

**الإِكافُ**: کورتانی وڵاخ یان سەرجل.

**الأَكَّافُ**: کورتاندرو.

**أَكَّ** اليومُ أَكًّا وأَكَّةً: ڕۆژەکەی زۆر گەرمو شێدارو بێ‌هەوا بوو (أُكَّ فلان) فلاّن کەس تەنگەتاو بوو، بێ چیکڵدانە بوو، توڕەبوو، ڕەوشتی خراپ بوو ◦ (إِئْتَكَّ اليوم)بەمانا (أَكَّ)یە ◦ (إِئْتَكَّ فلان من الأمر) فلاّنکەس ئیشەکەی لێ گەورە بوو بۆی هەڵناسۆڕێ ◦ هەرناخو نۆفیەتی و تەواو جارس بووە (إِئْتَكَّ الجَمْعُ) قەرەباڵغ بونو کردیانە ئیزدیحام.

**أَكَلَ** الطعامَ أَكْلاً: خواردەمەنییەکەی جوو قوتی دا ◦ (أكلته النار) ئاگر لەناوی بردو سوتاندی ◦ (أَكَلَهُ السُّوسُ) مۆرانە کرمۆڵی کرد بێ کەڵکی کرد.

**أَكَلَ** عليه الدهر وشرب: لەشێوەی پەنددا دەگوترێ واتە: تەمەنی درێژ بوو ◦ (أَكَلَ مالَهُ أو حَقَّهُ) بەڕەوای زانی ماڵەکەی بۆخۆی بەرێ مافەکەی زەوت بکا.

**أَكَلَ لَحْمَ** فلان: پاشملە باسی فلاّنکەسی کرد، غەیبەتی کرد ◦ (أَكَلَ عُمْرَهُ): پیر بوو ددانی لەدەمی دانەما ◦ (أَكَلَهُ رأسُهُ، أو جِلْدُهُ) خرۆیەکی زۆر کەوتە سەریەوە یان لەشی خرۆی تێکەوت ◦ هەردەیخورێنێو خرۆی ناشکێ.

**أَكِلَ أَكْلاً**: هەندێکی خوارد (أَكِلَ أسنانُهُ) ددانەکانی کەوتن هەڵوەرین.

**آكَلَ الشجرُ إيكالاً**: درەختەکە بەروبوومەکەی پێگەیاند ◦ (آكَلَ بين القوم) فیتنەیی و دوزمانی لەنێوان خەڵکەکەدا کردنو لێکی دڕ دۆم کردن ◦ (آكَلَهُ مؤاكلةً) خواردەمەنی لەگەڵ خوارد.

**أَكَّلَ بين القوم**: بەمانا (آكَلَ)یە ◦ (أَكَّلَ فلاناً الشيءَ) شتەکەی خستەبەر دەستی فلاّن، وای کرد بتوانێ ئەوشتە بخوا.

**أَكَّلَ الماشِيَةَ**: ئاژەڵەکەی بەرەڵلای ناو لەوەڕگاکە کردن بەئارەزوی خۆیان بلەوەڕێن.

**إِئْتَكَلَ الشيءُ**: ئەوشتە هەندێکی هەندەکەی تری خوارد (إِئْتَكَلَتْ النارُ) ئاگرەکە بڵێسەی بەرز بۆوە ◦ دەڵێی هەندێکی هەندێکی دەخوا ◦

(تَأَكَّلَ الشيْءُ) بەمانا (إِتَكَلَ)ەیە ٥ (تَأَكَّلَ راسُهُ) سەری گڕوێ بوو خروی تێکەوت.

إِستَأْكَلَ فلان غيره: فلانکەس ماڵەکەی خوارد (استأكَلَ فلاناً الشَيْءَ) داوای لەفلانکەس کرد خواردنی بۆ دابنێ.

الإِتكال: لەزاراوەی زانستی دا بریتیە لەو گۆڕانکاریانەی دێنەدی لەناکامی تێچوون و یەکتر خواردنەی مادەکان لەناوخۆیان دا جا یەکتر خواردن و تێچوونەکە سروشتی بێ یان کیمیاوی بێ یان شتی تر بێ.

الآكِلَةُ: خوراندن.

الأَكَالُ: هەرشتێك بخورێ.

الأُكال: خوراندن، گڕوێ بی.

الأَكَّالُ: زۆر خۆر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ ..﴾.

الأُكُلُ والأُكْلُ: میوەو بەروبوم، رزق و رۆزی زۆرو زەبەندە، (ك: آكَالٌ)ە.

الأَكْلَةُ: ژەمە خواردنێك ٥ (الأُكْلَةُ) زۆر خۆر مانای (الأَكَّال) دەگەیەنێ.

الأَكِلَةُ: خرو خۆو لەش خوران.

الأُكُولَةُ: ئەو ئاژەڵەی قەڵەودەکرێ بۆسەر بڕین ٥ (دابەستە)، (ك: أكائل).

الأَكِيلُ: زۆر خۆر ٥ (الأَكِيلَةُ) بەرماوەی شێر لەنێچیر ٥ کەهەندێکی خواردبێ و هەندێکی مابێتەوە.

المِئْكَالُ: کەوچکی چێشت خواردن ٥ کەسب و بژێوی.

المَأْكَلَةُ: هەرشتێك بەکەڵکی خواردن بێ.

إِسْتَأْكَمَ الموضعُ: شوێنەکە بەرزبووە بوو بەتەپۆڵکە.

الأَكَمَةُ: تەپۆڵکە، (ك: أَكَمٌ، إِكَامٌ، آكام).

المَأْكِمُ المَأْكَمُ، المَأْكَمَةُ: کەفەڵ سەرسمت، (ك: مآكم)ە.

الأُكْنَةُ: هێلانەی باڵندە ٥ خلانە، (ك: أُكَنَ).

أَكُونِتين: مادەیەکی سرکەرو بێهۆشکەرە لەرووەکی گورگ خنکێنە بەرهەم دەهێندرێ.

ألْ: حەرفی تەعریفە ٥ هەمزەکە هەمزەی وەصڵەو وایش دەبێ دەچێتە سەر فیعلی موضاریع و ئامادەباشی دەگەیەنێ، وەکوو (اليُؤْكَلُ): ئامادە باشی خواردنە، (أَلْيُدَابُ): ئامادەباشی توانەوەی هەیە.

ألا: ئامرازێکی ئاگادار کردنەوەیە.

إلى: حەرفی جەرە.

اولى، أولاءِ، أولئك: ئیسمی ئیشارەن بۆ کۆبەکاردێن بۆ نێرو بۆ مێ.

الأُولى: کۆیەو تاکی لەوشەی خۆی نیە بەمانا (أَلَّذين)ەیە.

**أولاتِ:** بەمانا (ذوات)ە ٥ دەبێ ئیزافە کرابێ ٥ وەکوو لە قورئان دا هاتووە: ﴿و إن كنَّ أولاتِ حمل﴾.

**أولـو:** بـەمانا (ذو)ە ئـەویش دەبـێ ئیزافە کرابێ.

**أَلَـبَ القـومُ أَلبـاً:** خەڵـکەکە کۆبونـەوە ٥ (أَلَبَ السَّمَاءُ) ئاسمـان بـەردەوام بـوو لـەباران بـارین دا ٥ (أَلَـبَ الـزرعُ) زەرعاتەکـە چـروزەی کـرد ٥ (أَلَـبَ الجُـرْحُ)برینەکـە دیـوی دەرەوەی قەتماغـەی کـردوە بـەڵام نـاوەوەی چاك نەبۆتـەوە ٥ (أَلَـبَ القـومُ الیـه) لەهەمو لایەکەوە خزمو کەسو کـار هاتن بـۆلای (أَلَبَ فلانٌ القـومَ) فـلان خەڵکەکەی کۆ کردنـەوە (أَلَبَ علیـە الناسَ) خەڵکی هەڵنا بۆسەری.

**أَلِبَ الجُرْحُ أَلَباً:** بـەمانا (أَلَـبَ)یـە (أَلَّـبَ القَوْمَ) خزمو کەسو کاری کۆکردەوە (أَلَّـبَ بینـهم) نێـوانی تێکـدان (أَلَّـبَ علیـە النـاسَ) خەڵـکی هانـدا کەلـە کۆمەکی لێ بکەن (تَأَلَّبوا) خەڵکەکە کۆبونـەوە (أَلَّبـوا علیـە) خەڵـکەکە دژی ئەو یەکیان گـرت هەوڵەکانیان یەك خست.

**الأُلْـبُ:** بەکۆمـەڵێك دەگـوترێ یـەکیان گرتبـێ لەسـەر دژایـەتی کردنـی ئادەمیزادێك ٥ هـەروا بەمانا مـەیل کردنـی نەفسـە بـۆ هەوەسـبازی ٥ بـەمانا گـەرمای زۆرو تینوایـەتی کوشـندەش دی ٥ هـەروا تـای بەشیدەت.

**الإِلْـبُ:** برسـیەتی، برسـیایەتی تونـدو زۆر ٥ (المِئْلَبُ) گورجو گوڵ، تیـژڕەو، (ك: مَآلِبَ).

**أَلَتَ الشَّيْءَ أَلْتاً:** ئەوشتـەی کـەم کـردەوە ٥ (أَلَـتَ فلانـاً) لـەرێزی فلانکەسـی داشـکاند ٥ فلانکەسـی لەمەبەسـتی خـۆی دا لادا ٥ (أَلَتَ فلاناً یمیناً) داوای لەفلانکەس کـرد سوێندی بـۆ بخوا، یان شایەتی بۆ بدا.

**الأُلْتَةُ:** بەخشینی کەم، بەخشراوی کەم ٥ سوێندێك بەئەنقەست درۆی تێـدا بکا.

**أَلَسَهُ أَلْساً:** غەشـی لـێ کـرد، دزی لـێ کرد ٥ (أُلِسَ فـلان أَلْسـاً): فلانکـەس عەقڵی تێك چـوو ٥ (آلَسَهُ مُؤَالَسَـةً) بەمانا (أَلَسَ)ە یە ٥ دەگوترێ: (فلان لا یُؤَالِسُ ولا یُدالِسُ) فلانکـەس نـە غەش دەکاو نەدزی دەکا.

**تَـأَلَّسَ:** ئـازاری لـێ پەیـدا بـوو ٥ (....المَـدِینُ) قـەرز دارەکە دانـەوەی قەرزەکـەی دواخسـت ٥ (الأَلُـوسُ) خۆراکی کەم.

**أَلَفَهُ:** هـەزاری پێـدا ٥ (أَلِفَـهُ إِلْفـاً و ألفـاً والافاً) ٥ هۆگری بوو خۆشی ویست ٥ دەگـوترێ:(هو آلِفٌ) ئـەو گونجاوو

هۆگره لەگەڵ ئادەمیزاد دا، (ك: أُلاَفٌ)٥ ٥ هەروەها دەگوترێ: (هـو أَلِـفٌ) ئەو گونجاوو مـاڵی پـە وەگـری ئـادەمیزاد دەبـێ، (ك: أَلَفَـاءُ وآلاَئـف) ٥ لەپەنـدو مەتەڵی پێشینان دا هاتووه دەڵێ: (هـو آلَـفُ مـن الكلـب) فلاّن دەعبا لەسەگ باشتر وەگری ئادەمیزاد دەبێ.

**آلَـفَ الجَمْـعُ ایلافـاً:** هـەمووی بـوو بـه هەزار (آلَفَ الجَمْعَ) کۆیەکەی کـرد بەهەزار (آلَفَ فلانـاً)وای کـرد فلاّن وەگری ببێ.

**آلَفَـهُ مؤالَفَـةً:** مامەڵـەی لەگـەڵ کـرد لەسـەر هـەزار (أُلَّـفَ فـلان) مـاڵو سـامانی فـلاّن بـوو بەهـەزار دەگـوترێ:(فـلان مـن المـؤلَّفين) فلاّن هەزار لێره، ملیۆنێره (أَلَّفَ بینهمـا) بەیـەکی گەیانـدن کـۆی کردنـەوه ٥ (أَلَّـفَ الکتـاب) مـادەی کتێبەکـەی کۆکردەوەو ڕێکی خستو داینا (أَلَّفَ العدد): ژمارەکەی گەیانده هەزار.

**أَلِّـفَ قَلْبَـهُ:** دڵـی کـێش کـردو وەگـری خۆی کرد.

**إِتَلَّفَ فلانـاً:** فلاّنکەسی وەگـری خـۆی کرد لەگەڵی گونجا.

**الإِلاَفُ:** پـەیمانو بـەڵێن ٥ جۆرێکـه لەعەهـدو پـەیمان وەردەگـیرێ لەبازرگان که لەوڵاتێکەوه دەچن بۆ وڵاتێکی تر.

**الأَلْفُ:** هەزار (دەچار سەد).

**الأَلِـفُ:** یەکـەم پیتـی هیجایـه (الإِلْـفُ) ڕەگێکه لەناو قوڵی ئـادەمیزاد دایـه تادەگاته باسکی.

**الأُلْفَةُ:** گردبوونـەوەو پێکەوه گونجانو خۆشەویسـتی بـۆ یـەکتری ٥ لـەزاراوەی دەروونناسـی دا (الأُلْفَـةُ) بریتیـه لـه تایبەتمەندییـەك کـەدیارده دەروونیـەکان لـەبواری هەست دا بۆلای یەکتری کێش دەکاو پێکیانـەوه دەگونجێنـێ ٥ لـەزاراوەی ئـەخلاق دا (الأُلفـةُ) بریتیـه لـه پەیوەنـدی نێـوان دوو کـەس یـان زیاتر کەبەهۆی کێشکردنی ئارەزوه دەروونیـەکان بـۆلای یـەکتری پەیـدا دەبـێ ٥ وەکـوو صـیلەی ڕەحمـی دۆستایەتی و خزمایەتی.

**الأَلُـوفُ:** ئەوکەسـەی زۆر دیـاردەی ئولفەتکردنو گونجانی تێدابێ.

**المُؤَلَّـفُ:** دانـەری کتێـب ٥ (المؤَلَّـفُ) ئەوکتێبـەی زانیـاری تێـدا کۆدەکرێتەوەو تۆماردەکرێ.

**أَلَـقَ** الـبرقُ ألیقـاً: بریسکەی داو ڕونـاکی دایەوه ٥ (أَلَقَ أَلْقـاً وإِلاقـاً) هەورەکه بریسکەی داو بارانی بەدوانەبوو.

**أَلَقَ** فلان أَلقاً: فلاّنکەس درۆی کرد.

**أَلِقَ** فلان أَلَقاً وأُلاقـاً: فلاّنکـەس شێت بـوو ٥ (إِئتَلَقَ البَرْقُ) بریسکەی داو ڕوناکایی دایەوه.

**تَألّقَ البرقُ:** بەمانا (إئتلَقَ)یە ٥ (تألقت المرأة) ئافرەتەکە خۆی ئارایش داو درەوشایەوە ٥ یان خۆی ئامادەکرد بۆ شەڕو جەنگو کێشەو دوبەرەکی.

**الإِلاَقُ:** هەورەبروسکەی درۆزنە ئەوەی بارانی بەدواوە نەبێ ٥ هەروەها پیاوی درۆزنو بێ بارو فێڵاوی.

**الأَلاَقُ:** شێتی

**الإِلْـقُ:** پیاوی درۆزنی بێ رەوشت ٥ گورگە نێرە.

**الإِلْقَةُ:** ئافرەتی درۆزنی بێ ڕەوشت ٥ دێڵە گورگ ٥ ئافرەتی ئازا.

**الأُلْقَةُ:** هەورە بریسکەو درەوشانەوە.

**الأُلق:** هەورە بریسکەی بێ باران.

**الأَوْلَقُ:** شێت، ئەحمەق و نەزانو گێل.

**الْمِئْلَقُ:** شێتو ئەحمەق، (ك: مَأْلَقٌ)ە.

**أَلَـكَ** بين القومِ أَلْـكاً وأُلوكاً: بوو بە نێردراو، پەیامبەر لەناو گەلەکەدا (ألك فلاناً أَلْـكاً) پەیامی خۆی گەیاند بەفلانکەس ٥ دەگوترێ: (أَلِكْنِي برسالة الى فلان) ببە بە نوێنەرو پەیامێکم بۆ بگەیەنە بەفلانکەس.

**أَلَكَ الفرسُ اللجامَ:** ئەسپەکە لغاوەکەی خۆی جوو ٥ (إِستألَكَ الى فلان مَألَكةً): نامەیەکی بۆ فلانکەس برد.

**الأُلُـوكُ:** نامە، پەیامبەر ٥ هەرشتێك بەکەڵکی جوونو خواردن بێ ٥ (المَألُـك والمَألُكةُ) نامە، (ك: مآلِكَ).

**الْمَلَـكُ:** تاکی فریشتە، (ك: ملائك، ملائكة).

**الإِلِكْتُرُونُ:** شتێکی زۆر وردە، هێزێکی کارەبایی (سالب)ی تێدایە ئەو (شحنة) کارەباییە جوزئێکە لەبەربچوکی کەرت ناکرێ وەکوو دەگوترێ: جوزئی (لایتجزی)یە.

**الَّ** في سيرِه ألاًّ: لەرۆیشتندا پەلەیکرد، تیژرەو بوو ٥ (ألّ اللون): بریسکەی داو روناکی خستەوە (ألَّ فلان الأً وألَـلاً): بەدەنگی بەرز دوعاو پاڕانەوەی کرد ٥ لەبەر ئازار هاواری کرد.

**الَّ الفرسُ:** ئەسپەکە هەردو گوێی قوت کردن (ألّ الصقر) بازەکە راوی نەکردو نێچیری نەگرت ٥ (الَّ عليه): هەڵیکوتایە سەر، (ألّ فلاناً): فلانکەسی دەرکرد ٥ کێردێکی لێدا ٥ (ألّ الثوبَ) کراسەکەی دوری.

**اَلِلَ** السقاءُ أَلَلاً: بۆنی دۆڵچە ئاوەکە گۆڕا (أَلِلَ أسنانُه) ددانەکانی کرمۆڵ بون.

**أَلَّلهُ:** قەراخەکەی تیژ کرد.

**إِئْتَلَّ:** بەکاڵەخۆ کارەکەی ئەنجام دا ٥ (تَأَلَّلَ) قەراخەکەی تیژ بوو.

**الإِلُّ:** وادەو بەڵێنو پەیمان ٥

خزمایەتی، قارو دوژمنایەتی، بنەماو بنەچەی باش ٥ کانی چاك.

**الأَلَلُ:** دەمی کێرد، هەموو پانی یەك ٥ (الأَلَّةُ) حەربەی دەم پان، پان بریسکەدار، هەر ئامێرێکی شەڕ.

**الإلَّةُ:** خزمایەتی، (ك: إلَلّ).

**الأَلِيلُ:** زرینگەی بەردە ورد ٥ هاوارو رۆڕۆ ٥ دڵە راوکێی تادار، ناڵین.

**أَلِمَ أَلَماً:** ئازاری بوو، دەگوترێ: (أَلِمَ بطنُهُ) سکی هێشا.

**آلَمَهُ إيلاماً:** ئازاری پێ گەیاند.

**الأَلَمُ:** لەزاراوەی فەلسەفەدا هەستکردن بەشتێك دژی لەزەت بێ ٥ جاهەستکردنەکە دەروونی بێ یان جەستەیی بێ، (ك: آلاَمّ).

**الأُلُومَةُ:** خوێڕیەتیو هیچو پوچی.

**الألْمَاسُ:** بەردێکی بەنرخی شەفافە، بریسکەدارە، چەند رەنگێکی هەیە ٥ لەهەموو بەردێك بەنرخترە، لەهەمووشتێك رەقترە، کار لە هەموو شتێك دەکاو هیچ شتێك کار لەو ناکا.

**الألَمِينْيُمُ:** کانزایەکی وەزن سوکە ٥ سپیو زیوی هەیە ژەنگ ناکات ٥ بەکەڵکی توانەوە دێ، تێکەڵ بەمس دەکرێ قاڵبی لێ دروست دەکرێ دەشوبهێتە ئاڵتون بۆ زۆر شت بەکار دەهێندرێ.

**أَلَهَ فلان إلاَهة وأُلوهَة وأولوهية:** فلانکەس بەندایەتی کرد.

**أَلَهَ فُلاَناً:** پەنای فلانکەسی داو لەخۆی گرتو پارێزگاری لێکرد.

**أَلِهَ:** بەمانا (أَلَهَ)مەیە ٥ سەرسام بوو (أَلِهَ اليه) پەنای بۆبرد.

**أَلِهَ عليه:** زۆر هاوارو دادو فیغانی بۆ کرد (أَلِهَ بالمكان) لەوشوێنە جێگیر بوو مایەوە.

**أَلَّهَهُ:** کردی بەخوداو پەرستشی بۆکرد، بەخودای داناو بەندایەتی بۆکرد (تَأَلَّهَ) خەڵوەی گرتو خودا پەرستی کرد، لافی خودایەتی لێ دا، خۆی بەخودا زانی.

**الإلـــهُ:** هەرشتێك بەخودا بزانرێو بەندایەتی بۆ بکرێ، (ك: آلِهَةٌ)ە ٥ (الحقُ الإلهي) بنەمایەك بوو لەسەدەکانی ناوراست دا مەلیكو پاشاکانی ئەوروپا پەنایان بۆدەبرد ئەو بنەمایە بریتی بوو لەوە کە دەسەڵاتی پاشا لەخوداوەیەو خودا ئەو مافەی پێداوە، بەهۆشیار بوونەوەی ئەوروپا ئەو دیاردەیە نەما.

**الإلاهيات:** هەرشتێك پەیوەندی بەزاتو صیفاتی خوداوە بێ.

**الإلاَهَةُ:** خۆر ٥ ماری گەورە، هەژدیها ٥ (الأُليهة) خۆر.

**التأليهُ:** دان نان بە هەبوونی خودایەك کەبەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەری بونەوەرە.

**اللهُ**: ناوی خودای حەق و تاك و تەنهاو پەرستش بۆكراوو بەدیهێنەرە.

**اللهمّ**: وشەیەكە بەكاردەهێندرێ بۆ پاڕانەوەو هاوار كردنە خودا.

**ألاَ ألواً وأُلُوّاً وأليّاً**: كۆششی كرد ◦ لاواز بوو، كەمتەر خەمی كرد، تەمبەڵ بوو (ألا الشيءَ ألوّاً) توانی شتەكە ئەنجام بدا ◦ (ألا فلاناً الشيءَ) ئەوشتەی دا بەفلان.

**ألِيَ ألياً وألى**: سمتی گەورە بوون دەگوترێ: (هو ألْيانٌ وهي ألْيا).

**آلى إيلاءً**: سوێندی خوارد (إئتَلى) سوێندی خوارد.

**تألّى**: هەوڵی دا ◦ تێكۆشا، سوێندی خوارد.

**الإلى – الألى**: نازو نیعمەت، (ك: آلاءُ)ە.

**الألاَ**: درەختێكە لەلمبەلان دا دەڕوێ ◦ دیمەنی جوانەو تامی تاڵە هەمیشە سەوزە، بەتەڕی دەخورێ كەوشك بوو پێستەی پێ خۆش دەكرێ.

**الأَلْوُ**: نیعمەت ◦ (الإلْوَةُ – الأُلْوَةُ) سوێند ◦ (الأَلُوَّةُ) داری بخورد ◦ قاوەڵتی، كاتی نێوان بەرەبەیان و خۆرهەلاتن.

**الأَلْيَةُ**: سمت، یان هەموو گۆشت و بەز كە كۆدەبێتەوە لەكەفەڵ دا هەروا (ألْيةُ القدمِ) و(ألْيةُ الساق) ئەو گۆشتەی لێیان بەرز بۆتەوە ◦ بەكوردی پاژنە پێ، سینگە پێ، (ك: آلايا)یە.

**الأَلِيُّ**: ئەوكەسەی زۆر سوێند دەخوا.

**الأَلِيَّةُ**: سوێند ◦ كەمتەر خەمی.

**المِئلاةُ**: دەسڕۆكەیەكە ئافرەت لەكاتی شین و واوەیلادا بەدەستیەوە دەگرێ و ئاماژەی پێ دەكا ◦ ئەو پارچە قوماشەیە كە ئافرەت لەكاتی بێنوێژیدا لەخۆی قایم دەكات.

**الأَمْبِيرُ**: یەكەی هێزی سەیالی كارەبایە.

**أَمَتَهُ أمْتاً**: مەزەندەی كردو خەرساندی، ئەندازەكەی دیاری كرد ◦ (أمَتَ فلاناً بشرٍّ): فلانكەسی عەیبدار كرد، تۆمەتباری كرد.

**الأَمْتُ**: شوێنی بەرز، سەرتەپۆڵكە، بەرزو نزمی گردۆڵكەو تەپۆڵكە ◦ رەقی و پتەویی ◦ بێ هێزی و لاوازی ◦ گومان ◦ عەیب ◦ خوارو خێچی.

**أَمِجَ أمَجاً**: تیژ تێپەڕی (أمِجَ) أمَجاً: گەرماو تینوەتی تینی بۆ هێنا ◦ (أمِجَ الصيف) هاوین گەرماكەی تینی پەیداكرد.

**أَمَجَ الجُرْحُ أمَجاناً**: برینەكە دەستی بەئازار كرد.

**أَمِدَ أمَداً**: رقی هەڵسا ◦ دەگوترێ: (أمِدَ علیه) رقی لێ هەڵسا.

**أَمَدَهُ**: رق و قینی خۆی بۆ دەربڕی ◦ (أَمَدَ السقاءَ) ئاوی لەكوندەكەدا

نەهێشت ◦ (تَأَمَّدَ) ناڕازی بوونی دەرکەوت.

الآمِدُ: کەشتی پڕ لە کاڵا ◦ هەروا هەرشتێك پڕ ببێ لەچاك و لە خراپ، لەخێرو لەشەڕ.

الآمِدَةُ: کەشتی پڕ لەکاڵا، (ك: أَوَامِدُ).

الأَمَدُ: ئامانج و کۆتایی ◦ دواکات و دوا شوێن ◦ دەگوترێ: (ضرب له أمداً) کاتێکی دیاری کراوی بۆ دانا، (ك: آمَادٌ).

أَمَرَ عليهم أمراً وإِمَارَةً: بوو بە فەرمانڕەواو کاربەدەستیان.

أَمَرَ اللهُ القومَ: خودا وەچەو نەوەی زۆرکردن، ئاژەڵی بۆ زۆر کردن ◦ دەگوترێ: (مُهْرَةٌ مأمورة) حوشترێکی بەزاوو زێیە زۆری بێچوو لێ کەوتونەوە.

أَمِرَ عليهم امراً: بوو بە فەرمانڕەوایان (أَمُرَ عليهم) بوو بە فەرمانڕەوایان.

آمَرَ اللهُ القَومَ إيماراً: خودا وەچەو نەوەی قەومەکەی زۆر کردن، ئاژەڵیان بەزاوو زێ بوو.

آمَرَ فلاناً في الأمر: راوێژی بەفلانکەس کرد لەکارەکەدا.

آمَّرَ فلاناً أَمَارَةً: نیشانەی دانان، فلانکەسی کرد بە فەرمانڕەوا.

أَمَّرَ السِّنَانَ: سەرە رمبەکەی تیژ کرد.

أَمَّرَ القَنَاةَ: سەرە رمبەکەی لەرمبەکە بەست و قایمی کرد.

إِئْتَمَرَ: فەرمانەکەی ئەنجام دا ◦ (إِئْتَمَرَ القوم) قەومەکە لەناو خۆیان دا راوێژیان کرد، هەندێکیان فەرمانیان بەهەندێکیان کرد.

إِئْتَمَروا بفلان: راوێژیان کرد بۆئەوەی زیان بەفلان بگەیەنن.

إِئْتَمَرَ فلان برأيه: فلانکەس سوربوو لەسەر رای خۆی.

تَآمَرُوا: راوێژیان کردو بیرو بۆچونی خۆیان ئاڵ و گۆڕکرد ◦ پیلانیان دانا بۆ کودەتاو زیان گەیاندن بەکەسانی دی.

استأمَرَهُ: داوای فەرمانی ئەوی کرد. راوێژی پێکرد.

الأَمَارَةُ: نیشانە ◦ وادەو کات ◦ (الإِمارة) مەنصەبی فەرمانڕەوا ◦ بەشێك لەولات فەرمانڕەوایەك بەسەری رادەگا.

الأَمْرُ: شەئن و حاڵ، ئیش. قورئان دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ﴾ ئەوە ئیشی تۆ نیە، تۆلەوە بەرپرسیار نیت.

الأَمْرُ: داواو طەلەب یان کاری پێویست، قورئان دەفەرموێ: ﴿وقضي الأَمْرُ﴾ کاری پێویست ئەنجام درا، ئەوەی داواکرابوو جێبەجێ بوو ◦ (أولوالأمر) پیاو ماقوڵ و ریش سپی، زانا و سەرکردە.

الإِمْرَةُ: فەرمانڕەوایی.

**الأمَـــرَة:** زێــده بــون و گەشــەکردن، نیشانەو گەواهیدەر.

**الإمَّرُ، الأمَّرُ:** ئادەمیزادی بێ هەڵوێست، هـاوڕای هـەموو کـەس بـێ و لەبـەر لاوازی خۆی هیچ رایەکی نەبێ.

**الإمَّـرَة:** ئـافرەتی بـێ هەڵوێـست کـەبۆ خۆی هیچ رایەکی نەبێ.

**الأمـــيرُ:** فـــەرمانڕەوا، کاربەدەســـت لێپرسراو.

**أمـير المـؤمنين:** نازانـاوی خەلیفـەکانی ئیسلامە.

**التّــــامورُ التَــــأمورُ:** کەنیشــــتە، خەڵوەتخانە، لانەی شێر ٥ وەزیـری مەلیك. نەفس، دڵ، خوێن، مەی.

**التّــــامورة والتــــأمورة:** کەنیشــــتە، خەڵوەتخانە، پەرستگا ٥ لانەی شێر، شەراب، (التُؤمُرِيُ) ئادەمیزاد.

**الـتُّـأمُورُ:** نیشـانەدانان بـۆ شـارەزایی کردنـی نەشـارەزایان، (ك: تــآمیر). هـەروا دەگـوترێ: (مابالـدار تؤمـوراً) واتە لەو خانوەدا کەسی تێدانیە.

**المـؤتمر:** کـۆنفراس: کۆبونـەوەی چـەند کەســانێکی تایبــەتی بــۆ راوێــژو لێکۆڵینــــەوە دەربـــارەی کارێـــك، روداوێـــك وەرگرتنـــی هەڵوێـــست، پلانـدانان...هتد.

**المِئتَمَرُ:** راوێژو پرس و را.

**المـأمور:** فرمـان پـێ کـراو، راسـپێردراو فەرمانبەر.

**الأمریکیـة الجنوبیـة:** بەشێکە لەحـەوت کیشـــوەرەکانی جیهـــان، لـــەکۆتایی چـەرخی پـانزەی زایینـی دا ئـەم کیشوەرە دۆزرایەوە، کەوتۆتە نێوان دەریا لووشی ئەتڵەسی و دەریالووشی ئارامـەوە، لـەنێوان دوو هێڵـی پـانی (٨)ی باکوری و (٥٥)ی باشوری دایە. روبەرەکـەی شـێوە سـێ گۆشـەیەکی گــەورەی لــەخۆگرتووە لایــەکی بــۆ باشــور دەڕوا بەشــە باکوریەکــە دەکەوێتە ناوچەی گەرمەوە.

**الأمریکیة الشمالیة:** ئەمەریکای باکوری یەکێکــە لەحــەوت کیشــوەرەکانی جیهـان، ئـەمیش وەکـوو ئـەمریکای جنـــوبی لـــەکۆتایی ســـەدەی پانزەهـەمی زایینـی دا دۆزرایـەوە ٥ ئـەم کیشـوەرە کەوتۆتـە نێـوان دوو دەریـا لووشـی ئەتڵەسـی و ئارامـەوە. لەشیمالیشـــــیەوە دەریالووشـــــی بەســـتەڵەکی شـــیمالی هەیـــە ٥ روبەرەکــەی نیمچــە سێگۆشــەیە دەکەوێتــە نێـوان دوو هێڵـی پـانی (١٠)و (٨٣) شـــیمالی لەناوچـــەی گەرمـەوە دەسـت پێدەکـا تـا دەگاتـە ناوچەی بەستەڵەکی شیمالی.

**أمـــس:** دوێنـــێ، رۆژی پـــێش رۆژی کەتێیـدای ٥ واش دەبـێ بـۆ رابـردو بـــەرەهایی بەکاردەهێنـــدرێ، (ك: أموسُ، آمُس، آماس)ە.

**أمِض أَمَضاً**: سوربوو لەسەر کارەکەی‌و گوێی بەرخنەی کەسانی دیکەنەدا ٥ قسەی لەدەم دەرپەڕی وتەیەکی وت بەدڵ مەبەستی نەبوو بەسەر زاری دا هات.

**الإمَّعُ**: ئەوکەسەی بە هەموو کەس دەڵێ من لەگەڵ تۆم و لەسەر هیچ شتێك بەردەوام نابێ‌و بۆخۆی هەڵوێستی نیە ٥ چاولێکەرو لاسایی کەرەوە لەئایین دا ٥کەسێکی راراو دوو دڵ کەلەسەر هیچ شتێك بەردەوام نەبێ ٥ جاری وا دەبێ بۆ موبالەغە تایەکی خڕی پێوە دەلکێنن، دەگوترێ: (إمَّعَة).

**أمَقُ** العین: قولینچکی چاو بەلای لوتەوە، (ك: آمَاقٌ).

**أمَلَهُ أمْلاً وأمَلاً وإمْلاً**: چاوەڕوانی لێ کرد بەتەمای بوو.

**تأمَّلَ**: تێی فکری‌و هەڵوێستەی لەسەر کرد، لێی ورد بووەو سەرو ناوی کردو پێیدا چۆوە ٥ بۆئەوەی راستی بۆدەربکەوێ.

**الآمِلُ**: یارمەتیدەری پیاوو بەردەستی، (ك: أمَلَةٌ).

**الأمَلُ**: هیواو ئاوات، (ك: آمالٌ) بەزۆری بۆ شتێك بەکاردەهێندرێ کەهاتنەدی دوور بێ.

**أمَّتِ المرأةُ**: ئەوئافرەتە بوو بەدایك، منداڵی بوو، وەکوو دایکی لێ هات (أمَّ فلانــاً أمــاً) لەتۆقەسەری فلانکەسی راکێشا ٥ (أم الیه) بەمانا بۆلای چوو قەصدی لای ئەوی کرد ٥ دەگوترێ:(خَرَجوا یؤمّون البلدَ) رۆیشتنە دەرەوە بۆ شارچوون.

**أمَّ القَومَ، أمَّ بهم**: بوو بە ئیمام‌و پێش نوێژیان ٥ پێشیان کەوت‌و نوێژی بۆ کردن.

**أمَّمَهُ**: قەصدی کردو چو بۆلای ٥ (أمَّمَ الشرکة أو المشروع) کۆمپانیەکە یان پڕۆژەکەی کرد بەموڵکی گەل‌و هاوبەش.

**إئتَمَّ بالرجل**: شوێنی کەوت، لەپاشیەوە نوێژی کرد (إئتَمَّ الشیئَ) قەصدی کرد.

**تأمَّمَ بە**: کردی بەپێش نوێژی خۆی، نوێژی لەدواوە کرد.

**تأمَّمَ بالتراب**: تەیەمومی کرد ٥ (تَأمَّمَ إمْرأة) ئافرەتێکی کردە دایکی خۆی ٥ (تَأمَّمَ الشیئَ) قەصدی ئەوشتەی کرد (إستَأمَّ إمْرَأةً) ئافرەتێکی کردە دایکی خۆی.

**الآمَّةُ**: برینی تۆقە سەر کە قوڵ بێ.

**الإمام**: ئەوکەسەی خەڵك لەپاشیەوە نوێژ دەکەن ٥ هەرکەسێك خەڵك شوێنی کەوێ ٥ خەلیفەی موسوڵمانان، قورئان، سەرکردەی سوپا ٥ مەلای مزگەوت ٥ شارەزایی کەری رێبواران، حودیە خوێنی حوشتران ٥ ئەوبەشە زانیاریەی

قوتابی رۆژانه لە قوتابخانە فێری دەبێ ٥ دەگوترێ: (حفظ الصبي إمَامَهُ) قوتابیەکە وانەکەی لەبەرکرد ٥ ڕێگای پان و پۆڕو ئاشکرا.

الإمَامَةُ: سەرکردایەتی موسوڵمانان، پلەو پایەی خەلیفە.

الإمَامِيَّةُ: تاقمێکی شیعەن پێیان وایە ئیمامی عەلی کوڕو نەوەکانی شیاوی خەلافەتن و کەسی تر ڕایەی ناکەوێ ئەوپلەو پایە بگرێتە ئەستۆ.

الأمُّ: ئالای پێشەنگی سوپا (الأمُّ) بنەمای هەموو شتێك ٥ دایك، بەنەنکیش دەگوترێ دایك، دەگوترێ: (حواء ام البشرِ) حەوا دایکی ئادەمیزادە.

أُمُّ الشيئ: ئەوەی دەورو بەری شتەکە ٥ ئەوەی سەر بەنەون.

أمَّات: بەمانا (أمّهَات)ە، دەگوترێ: (هو من أمَّهَاتِ الخير) ئەو بنەماو کانی خێرە، دەگوترێ: (لا أمَّ لك) خێرت تێدا نیە، ئەصل زادەنی ٥ جاری وادەبێ ئەو رستە بۆ مەدح بەکاردێ، یان بۆسەر سوڕمان.

أُمُّ القرآن: سورەتی فاتیحەیە ٥ (أمّ الكتاب) لەوحولەحفوظە.

أُمُّ النجوم: مەجەڕەی ئەستێرەیە ٥ (أم الطريق) ڕێگەی گەورەو شەقامەڕێی وەها کەلەم لاو لەولای ڕێگای تر هەبن.

أُمُّ المثوى: ڕێکخەری ناومال، ئافرەتی ناومال ٥ دەگوترێ: (من أمّ مثواك؟) کێ ناوماڵت بۆ ڕێك دەخا؟ ٥ (أم القرى) مەککە هەموو شارێکی گەورە دەتواندرێ بلێی (أمُّ ماحولها من المدن).

أُمُّ الرأس: دەماغ ٥ مێشك.

أُمُّ الدماغ: پێستی دەماغ ئەوپێستە تەنکەی دەماغەکەی کۆکردۆتەوە ٥ (أمُّ الخبائث) مەی، عەرەق ٥ (الأمُّ الحنون) لەزاراوەی تەشریح دا بریتییە لەو پەردە تەنکەی بەدەوری مخ و دەزوو نوخاعی شەوکی دایە.

أُمُّ قَشْعَم: مردن.

الأمَمُ: بەرامبەری شت، نزیك، شتی کەم ٥ دەگوترێ: (ماطلبت الأشيئاً أمَمَا) شتێکی کەم و بەیدەستم داواکردووە.

الأُمَّةُ: دایك ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد زوربەیان لەیەك نەژاد بن چەند ڕەوشتێکی بۆماوەو بەرژەوەندی و هیواو ئاوات کۆی کردبنەوە ٥ یان شوێن، یان ئایین، یان ڕۆژگار کۆی کردبنەوە ٥ دەگوترێ: (الأمَّة المصرية، الأمّة العربية، الأمّة الكردية) ٥ یان پیاوێك کە هەموو ڕەوشتە باشەکانی تێدابن وەکوو قورئان

دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا﴾.

**الأُمَّةُ:** ڕێبازو پرۆگرام وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ﴾ بەمانا کاتو ماوەش دێ ٥ وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ الْعَذَابَ إِلَى أُمَّةٍ مَعْدُودَةٍ﴾....

**الأُمَّةُ:** پیاو ماقوڵانی وڵات ٥ دەگوترێ: (مجلس الأمة) پەرلەمان.

**الأُمُومَةُ:** یاسای دایك سالاری ٥ بەپێچەوانەی باوك سالارییەوە.

**الأُمِّيُّ:** نەخوێندەوار (الأمية) چاوگێکی (صەناعی)یە بەمانا بێ ئاگاو نەفامە.

**الأَمِيمُ:** کەسێك لەسەری درابێو تێك چوبێ ورێنە بکا ٥ هەروا بەمانا بەژنو باڵا ڕێكو پێك دێ.

**الأُمَيْمَةُ:** دایکۆکە، دایکیلە، باجیلە ٥ چاکوچی ئاسنگەر.

**المِئَمُّ:** شارەزایی کار، ڕێ نیشاندەر، وشتری پێشەنگ.

**أَمِنَ أَمْنًا وأَمانةً وأَمنًا:** دڵنیابوو نەترسا، خۆفی نەما.

**أَمِنَ البلدُ:** دانیشتوانی وڵات لەئارامی دان ترسیان لێ ڕەویوەتەوە.

**أَمِنَ الشَّرَ:** لەشەڕو نەگبەتی دڵنیابوو (أَمِنَ فلاناً علی کذا) فلانکەسی دڵنیاکرد لەوکارە، لەداهاتووی خۆی.

**أَمُنَ أمانةً:** ئەمیندار بوو.

**آمَنَ إيماناً:** بوو بە خاوەنی ئەمنو ئاسایش (آمَنَ بِهِ) بڕوای پێ کرد بەڕاستی زانی ٥ (آمَنَ فلاناً) وای کرد فلان دڵنیا بێ.

**أمَّنَ علی دُعائه:** کە ئەو دوعای کرد ئەمیش ئامینی لەسەرکرد.

**أمَّنَ علی الشیئ:** تەئمیمی دانا بڕێکی ماڵ پێشەکی لەصندوقی فەرمانگەیەکی دیاریکراودا دانا بۆئەوەی لەدوا ڕۆژدا خۆی یان ماڵو خێزانی بەشێوەیەکی ترو ئەندازەیەکی تر وەری بگرنەوە بەمەبەستی قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی لێی کەوتووە ٥ دەگوترێ: (أمَّنَ علی حیاته)، (....علی داره)، (....علی سیارته ... الخ).

**إِئْتَمَنَ فلاناً:** بەمانا (أَمِنَهُ)ە ٥ (إئتَمَنَ فلاناً علی الشَّيْءِ) فلانکەسی کردە ئەمینداری ئەوشتە.

**إِسْتَأْمَنَ اليه:** پەنای بۆ بردو داوای پارێزگاریو پارمەتیدانی لێ کرد.

**إِسْتَأْمَنَ الحربيُّ:** کابرای دوژمن و حەربی لەوڵاتی کوفرەوە هاتە ناو وڵاتی ئیسلامەتیو داوای پارێزگاریو ئەمانی کرد.

**إِسْتَأْمَنَ فلاناً:** داوای ئەمانی لەفلانکەس کرد.

**الأَمَانَةُ:** سپاردە، ئەمەكو وەفا.

**الأَمَنَـةُ، والأُمَنَـةُ:** ئەوکەسـەی بـڕوا بـە هـەموو شـتێك دەكـاو هەرچــی دیبیسـی بەڕاستی دەزانـێ خـۆش باوەڕە، لەهەموو کەس ئەمینە.

**الأُمْنَـةُ:** ئەوکەسـەیە هـەموو کـەس دەتوانێ قەناعەتی پێ بكا.

**الأَمُونُ:** وڵاغی سواری مەندو خۆشڕەو.

**الأمِـينُ:** پارێزگـارو چـاودێر (المـأمون) ئەوکەسـەی چـاودێری شـتێك لەئەستۆ دەگرێو پارێزگاری دەكا، (ك: أُمَنَاء)ە.

**الإيمان:** بڕوا کردن لەناخەوە ە لەشەرع دا بریتییـە لـە بـڕوا کـردن بـەدڵو دان پێدانانو ئیعتیراف بەزوبان.

**التَّأمِينُ:** گرێ بەستێکە لەنێوان تەئمین کـارو تـەئمین کـراو یـان خـاوەنی تـەئمین کــراودا، تــەئمین کــار بـەرعودەی ئـەوە دەبـێ هـەرکاتێ مـەرجو مـاوەی ئـاوگرێ بەسـتەکە هاتنـەدی ئـەو مەبلەغـەی بڕیـار دراوە، بێدا بەلایەنەکەی تر.

**أمَهَ اليه:** پێی سپارد.

**أمِهَ أمْهاً:** لەبیری چو، عەقڵی لەدەست دا.

**أمِهَ الغَنَمُ:** مـەڕو بزنەکـە توشـی گروێـی بوون، ئاوڵەیان تێکەوت.

**تَأمَّـهَ إمْـرَأَةً:** ئـافرەتێکی کـردە دایکـی خـۆی ە وەکـوو دایکـی مامەڵـەی لەگەڵ کرد.

**الأمَهُ:** ئاوڵە، گروێیی.

**الأمِيهَةُ:** ئاوڵەی ئاژەڵ.

**أمَـتِ المَرْأةُ أُمُـوَةً:** ئافرەتەکـە بـوو بـە ئەمەتە، جارییە.

**امَتِ الهِرَّةُ:** پشیلەکە میاوە میاوی کرد.

**تَأمَّتِ المرأة:** ئافرەتە ئازادەکە بـوو بـوو بە کۆیلە، بوو بە ئەمەتە.

**بنو أُمَـيَّةَ:** لقێکن لـە هـۆزی قـوڕەیش دەچنەوە سەر (أمیە)ی کوڕی عەبدو شەمس.

**اناضـول (أنـاطول):** واتـە خۆرهـەڵات ە ئێستا بـەو زەویو خاکـە دەگـوترێ کـە کەوتۆتـە خۆرهـەڵاتی دەریـای سـپی ناوەڕاسـتەوە بەشـێکە لــە حکومەتی تورکیا.

**الأنـام:** هەرچـی ئـادەمیزادی سـەرزەوی هەیە.

**الأنانــاسُ:** گیایــەکی هەمیشــەکاتە بەئەندازەی مەترێك بەرز دەبێتەوە گــەڵاکانی درێــژن، بەرەکــەی دەشوبهێتە ترێ تـامو بۆنی خۆشە، لەهــەموو وڵاتــە ئیسـتیوائیەکان بەرهـەم دەهێنـدرێ ە بەتایبـەتی لەدورگەکانی نۆهایوی ئەسپانی.

**أنَّـبَهُ:** سەرزەنشـتی کـرد، تونـد ڕەوی کرد لە لۆمەکردنی دا.

**الآنابُ:** میسك یان عـەترێك بشوبهێتە میسك.

**الأَنَبُ:** بازنجان.

**الأنْـبَجُ:** درەختـی مـانجۆ (مەنجـە) ئـەم

درەختــە زێــدی ســەرەکی وڵاتــی هیندوستانە ٥ ئێستا لەزۆر وڵاتــی تــریش هەیــە، زۆرجــار بەبــەرو بومەکــەی‌و ئــەو شــتانەی لــێ‌ی دروست دەکرێ دەگوترێ ئەنبەج واتــە ئــەو وشــەیە دەمێــك نــاوە بۆخــۆدی دارەکــەو دەمێکیش بــۆ بەرو بومەکەی.

الإنبــق: ئامێرێکــە شــلەمەنی پــێ دەپاڵێورێ.

أَنَــتَ أنیتــاً: ناڵانــدی (أَنَــتَ فلانــاً ألتــاً) حەسودی پێ برد، (أَنَــتَ الشَّیْئَ) ئەندازەی گرت.

أنتارکتکــا: کیشــوەرێکە لەحــەوت کیشــوەرەکانی جیهــان کیشــوەری بەستەڵەکی باشورە ٥ لەســەردەمی تــازەدا دۆزراوەتــەوە، دورگەیــەکی پــانو گەورەیــە، روبەرەکــەی لەروبــەری هــەموو ئــەوروپا گــەورەترە ٥ دەورەی جەمســەری بەستەڵەکی باشوری داوە، برێ لقو شێوو دۆڵی درێــژ دەبنــەوە بــەرەو باکور تا دەگاتە هێڵی پانی (٦٣)ی باشورو لەئەمەریکای جنوبی نزیك دەبێتــەوە ٥ تێکــڕا دەڵێ‌ی بانوێکی گەورەیــە، هەمیشــە بەســتەڵەك داپۆشــیوە ٥ جگــە لەقــەراخ‌و بیجاخــەکانی کەلــەهاوین دا هەنــدێ لەخاکەکەی دەردەکەوێ.

الأنْتیمون: کلە سوبحانی.

أَنُــث ألولــةً وأنالــةً: پیــاوێکی ژنــانی یــە، کوڕێکی کچانی یە، نەرمە.

أنّث الحامِلُ إیناثاً: ئافرەتە دووگیانەکە کچی بوو.

أنّث في الأمْرِ: لەکارەکەدا نەرمی نواند (أنّــث الكلمــة) نیشــانەی مێینــەی بەوشــەکەوەنا ٥ (تأنّــث) قبــوڵی کچایەتی کرد، ئامادە باشی تێدا بوو نــەرمی بنوێنــێ ٥ بەعــەرەبی دەگــوترێ فیعلەکــە مــەعنای (مطاوعەی تێدایــە) ٥ هــەروا بــەمانا (أنّــث) هــاتووە هــەروا بــەمانا ئــەوە هــاتووە کــە خــۆی شــوبهاندوە بەئافرەت.

الأنثــى: مێینــە پێچــەوانەی نێرینــە لەهەموو شتێك دا.

إمرأة أُنثی: ئافرەتێکی تەواو مێینەیە هــەموو رەوشــتێکی ئافرەتانــە یــە، (ك: إنــاث وأنــاثی)یــە ٥ (الأنثیــان) دوگون، دوو گوێ.

الأنیــث: ئاسنی نــەرم، ئاسنی نــارەق ٥ دەگوترێ:(ســیف أنیــث) شمشێرێکی نەرمە لیقە، شمشێرێك ئاسنەکەی رەق نەبێ ٥ (مکان أنیــث) شوێنێکە گیای چاك لــی دەڕوێ ٥ (رجل أنیث) پیــاوێکی قسە نــەرم‌و ژنــانی یــە، وەکوو ئافرەت لارو لەنجە دەکا.

أسطوانة
أوتوبوس
إزرة
أكورديون
أكارينا
إطار
إنبيق
ألماس
إصار
الأفق
أسطوانة
أسطرلاب
أسنتين
أنجر
ماسورة
خط أفقي
أسلة
أشنان أصفر
أسطرك
أسطر الصين
أقحوان الحدائق
أكيدنيا
أفوكاتو
أقنثا
أشنة
أسطراغالس
أناناس
أزدرخت
أمانيت
أقاقيا
أقحوان
أبيس
إسقمري
ألية
ابن آوى
أم أربع وأربعين
إسقنقور
أطوم
أسد
آكل النمل
أنق الأيل
إسفنجة
أيل
إوزة
ألكة

المِئْناث: ئافرەتێکە زۆر کچی دەبێ، هەرکچی دەبێ هەروا پیاوێك کە خێزانەکەی کچی زۆر ببن پێی دەگوترێ:(رجل مِئناث) پیاوێکە کچی زۆرن ٥ (أرض مِئناث) زەوییەکی بەپیتو بەرەکەتە گیاو گژی زۆری لێ دەروێ ٥ (سیف مئناث) شمشێرێکی نەرمە، (ك: مآنیث)ە.

المُؤَنَّث: مێینە (رجل مؤنث) پیاوێکە دەشوبهێتە ئافرەت ٥ (عطر مؤنث) بۆنی خۆشی تایبەت بە ئافرەت کەلەخۆی دەدەن رەنگی ئەو شوێنەی رێی دەکەوێ دەیگۆڕێ بەزەعفەرانی.

الإِنْجَاصُ: قۆخ، یان میوەیێکە لەشێوەی سێودا.

الأَنْجَرُ: شوێنی راگرتنی کەشتی لەبەندەر.

الإِنْجِيل: نامەی ئاسمانی کەنێردراوە بۆسەر حەزرەتی عیسا ٥ وشەیەکی یۆنانییە بەمانا موژدەیە.

أَنَحَ أَنْحاً وأنيحاً وأُنُوحاً: بەنالە نالۆو نوزە نوزەو هەناسەی دا، بەهانکە هانك بەهۆی نەخۆشیو ماندو بونەوە هەناسەی دا.

الأَنْزِيمُ: دەرهاتەیەکە لەخانە زیندوەکان دەردێو گۆڕانکارییەکی کیمیاوی لەتێکەڵاوەکان دا پەیدا دەکا.

أَنَسَ بە وإليه أُنساً: ئارامی پێ گرتو دڵی پێوە نووساو وەگری بوو، بەهاوڕێیەتی ئەو دڵ خۆش بوو (أَنَسَ) بەمانا (أَنِسَ)دێ.

أَنِسَ بە وإليه أُنساً وأَنَسَةً: کەیف خۆش بوو.

آنَسَ فلاناً ايناساً: دڵنەوایی فلانکەسی کردو غەمو خەفەتی لەبەدڵی رەواندن هەروا بەمانا هەستکردنە ٥ وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿آنست ناراً﴾ ئاگرێکم بەدی کرد، هەستم بەئاگرێك کرد ٥ (آنَسَ صوتاً) دەنگێکی بیست.

آنَسَ الأَمْرَ: کارەکەی زانی لەمەسەلەکە حاڵی بوو.

أَنَّسَهُ: دڵنەوایی کرد وەحشەتی لەسەر لابرد، چاوی پێکەوت لەدوورەوە بینی.

آنَسَهُ: دڵنەوایی کردو وەحشەتگەرییەکەی لابرد ٥ دیتیو هەستی پێ کرد ٥ (تَآنَسا) ئەو دووە وەگری بەکتری بوونو پێکەوە گونجان ٥ (تَأَنَّسَ بە) بەمانا (أَنِسَ)بە.

تَأَنَّسَ البازِيُ: هەڵۆکە چاوی گێڕاو دەوروبەری خۆی بەتاقی کردەوە.

إِسْتَأْنَسَ: بەمانا (أَنِسَ)بە (استأنس الوحْشِيُّ) گیانلەبەرە کێوییەکە هەستی بەهەبوونی ئادەمیزاد کرد ٥ لەپەندو مەتەڵدا هاتووە دەڵێ:

(اذا جاء الليلُ استأنس كل وحشي واستوحش كل إنسي).

إسْتَأنسَ الزائرُ: ديدەنی کەر داوای روخسەتی کرد بچێتە ژور ٥ (إسْتَأنسَ الشیء) چاوی بەو شتە کەوت.

الآنِسَةُ: پێچەوانەی (الآنِسَ)ە بەمانا کچۆڵەی خۆشەویستو عاقڵو رەزان ٥ کەرەوشت جوانو قسە خۆشو رەزا شیرین بێ.

الآنِسَةُ: ئافرەتێك شوی نەکردبێو هێشتا گەنج بێ، (ك: أوَانِسَ)ە.

الأُنْسُ: گفتو گۆ لەگەڵ ئافرەت داو دڵداری کردن لەگەڵی دا.

الإنْسُ: ئادەمیزاد ٥ دۆستی گیانی خاوەن وەفاو ئەمەك، (ك: آناسَ)ە.

الإنْسَانُ: بونەوەرێکی زیندوو بیرکەرەوە، (ك: أناسِيُّ) (انسان العَيْن) بیلبیلەی چاو (انسان السيف والسهم) تیژیەکانیان ٥ (الانسان) ئادەمیزادی تەواوو نمونەییو بێ عەیب کەلە ئادەمیزادی ئاسایی جیابێ بەهۆی ئەوەی خاوەنی رەوشتی بەرزو نمونەیی یە.

الإنْسَانِيةُ: پێچەوانەی ئاژەڵیە چەند رەوشتێکی تێدان ئادەمیزاد لەرەگەزەکانی کە جیا دەکاتەوە ٥ مرۆڤایەتی.

الإنْسِيُّ: نیسبەتە بۆلای (إنْس) ٥ لای چەپی هەموو شتێك.

الأنُوسُ: بەمانا (آنسة)یە (الْكَلْبُ الأنُوسُ) سەگی بەوەفاو ماڵی، زێنە خرۆنەبێ.

الأنِيسُ: هەرشتێك ئادەمیزاد ئولفەتی پێوەبگرێ ٥ دەگوترێ: (هو أنيس وجليس) فلانکەس یان فلان شت غەمرەوێنو هاونشین مە ٥ یان دەگوترێ: (مابالدَّارِ انيس) لەخانوەکە کەسی تێدا نیە غەمرەوێنم بێ، هەروا بەمانا کەڵەشێر دێ.

الأنِيسة: بۆ مێینە بەکاردەهێندرێ بەزۆری بۆ ئافرەت.

المؤنساتُ: چەكو سیلاح.

الأنْسُولِين: هۆرمۆنێکە، دەرمانێکە بۆ نەخۆشی شەکرە بەکاردێ.

الأنيسون: روەکێکە بۆنێکی خۆشی هەیە، دەنكو بەرەکەی بەکاردەهێندرێ بۆ دروستکردنی مەشروباتو شیرنی ٥ زوربەی خەڵك بە (بانیسون) ناوی دەهێنن.

الأنْشوجة: رەگەزی ماسی بچوکە لە پێری (صابونیات) هەڵدەگیرێو بەعولبەکراوی دەفروشرێ.

**أنَضَ** اللَّحمُ أنيضاً: گۆشتەکە گۆڕاو بۆگەنی کرد بەکەڵکی خواردن نەما.

**أنُض اللحمُ أناضةً:** گۆشتەکە نەکوڵیو پێ نەگەیی.

**آنَـض اللَّحْـمَ إيناضـاً:** گۆشـتەکەی نەکوڵاندو پێی نەگەیاند.

**أنَفَتِ الماشِيَةُ أنَفاً:** ئاژەڵەکە چووە ناو لەوەڕی تازەو زێرپێیدا.

**أنف فلاناً:** لەلوتی دا ٥ (أنِـفَ الماءُ فلاناً) ئاوەکە گەییشتە لوتی فلانکەس.

**أنِـفَ الـبعير:** حوشترەکە بەهۆی لغاوو ریشمەیەوە لوتی هێشا.

**أنِـفَ أنَفـاً وأنَفَـةً:** لوتبەرزی نواندو تەکەببوری کرد ٥ (أنِفَ الحامِلُ): خواردەمەنی لەوەپێشی حەز لێنەبوو، ئەو ژنە دوگیانە ئەوخوردەمەنییەی لەوەپێش حەزی لێبوو پێش چاوی کەوتووە ٥ بەکوردی (بێزو دەکا) ٥ (أنِفَ المسافرُ): کاتی بەیانی ڕێبوارەکە بەرێکەوت ٥ یان سەرەتای شەو کەوتە ڕێ ٥ (أنِفَ الشَّيْ): خۆی لەوشتە دوورگرتو لای ناخۆش بوو ٥ (أنِفَ) لوتی هێشا.

**آنَفَهُ:** وای لێکرد لوتی ژان بکا ٥ (آنَفَ أمْرَهُ) پەلەی پێکرد ٥ (آنَفَ الماشيةَ) ئاژەڵەکانی برد بۆ لەوەڕی تازە.

**أنَّفَ الشيئ:** فەراخەکانی شتەکەی تیژ کردن، دەگوترێ:(نصلٌ مؤنَّفٌ) تیرێکی سەر تیژە ٥ (سكين مؤنَّفٌ) کێردێکی تیژە ٥ (أنَّفَ الماشية) وای لەئاژەڵەکە کرد لوتی ژان بکا.

**إئْتَنفَهُ:** دەستی پێکرد، پێشوازیی لێ کرد.

**تَأنَّفَ الكلأ ونحوه:** هیچی لە لەوەڕەکە نەخوارد بۆزوی کرد ٥ حەزی لێنەبوو پێش چاوی کەوت ٥ دەگوترێ: (هو يَتَأنَّفُ الإخوان) دەگەڕێ برادەری وا پەیداکا کەلەوەوپێش برادەری کەسیان نەکردووە.

**تَأنَّفَتِ المرأةُ الشهوات:** ئەو ئافرەتە جار دواجار حەزی لەو شتەیە چونکە بێزو دەکا ٥ (إسْتَأنَفَ) بەمانا (إئتَنَفَ)یە.

**إسْتَأنَفَ الحُكمَ:** داوای کرد جارێکی تر چاو بەبڕیارەکەدا بخشێننەوە داوای پێداچوونەوەی حوکمەکەی کرد.

**الإسْتِئنافُ:** ڕەخنەگرتنە لەبڕیاری دادوەرو داوای چاوپێداخشانەوە کردنە لەلایەن دادگایەکی بەرزتر لەودادگایەی حوکمەکەی دەرکردووە ٥ بە پوچکردنەوەی یان تەعدیل کردنی.

**الآنِفُ:** رابردوی نزیك ٥ یان سەرەتای ئەوساتەی تێیدای.

**الآنِفَةُ:** بۆ مێینەی بەرامبەر (آنِف) بەکار دەهێندرێ ٥ سەرەتای هەموو شتێکە دەگوترێ: (مَضتْ آنِفَةُ

الشـباب) سـەرەتای گـەنجی بەسـەر چوو.

**الأُنَانِيُّ**: لوتزل، لوتکەورە.

**الأَنْفُ**: ئەندامێکی دەمو چاوە ٥ ئەرکی سـەرەکی هەناسـەدانو بۆنکردنـە، هێنـدە ئاشـکرایە پێناسـەی نـاوێ ٥ دەگـوترێ: (حَمِيَ أَنْفُهُ) رقـی هەڵساو خـۆی گیـف کـردەوە، (رجـل حَمـي أنـف): پیاوێکە قبوڵ ناکا ستەمی لـێ بکرێ ٥ (رَغِـمَ أَنفُـهُ): ژێردەستە بوو، چەوسایەوە، (مات حَتْـفَ أَنفِـهِ) بـەمردنی خـۆی مـرد، نـەکوژرا ٥ (أَنْـفُ القَـوْمِ) گـەورەی نەتـەوە، سەرەك خێڵ ٥ ریش سپی بنەماڵە ٥ (أَنْـفُ الجَبَـلِ) لوتکـە بـەرزەکانی تۆپەڵاکی کێو.

**الأُنُفُ**: بەشتی تازە دەگوترێ: دەکرێتـە ناوەڵنـاوی نێـرو مـێ ٥ دەگـوترێ: (كَـلأٌ أُنُـفٌ) لەوەڕگایـەکی تازەیـە (روضة أُنُفٌ) باخێکی تازەیە.

**الأَنَفَـةُ**: شـکۆمەندیو خـاوەن شـکۆو شەهامەت.

**الأَنـوفُ**: ئـافرەتی بۆنخۆشـی سروشتی، خـۆی لـەخۆی دا بـۆنی خـۆش بـێ ٥ یان پیاوی ئازاو شکۆمەند.

**الأَنيـفُ**: ئاسـنی نـەرم ٥ شـوێنێك تـازە گژوگیای تێدا رسکابێ.

**الأَنِيفَةُ**: بۆ مێینە بـەکاردێ: دەگـوترێ: (أَرْض أنيفَةٌ) زەوییەکە تازە گژوگیای تێدا رسکاوە.

**المُئْتَـانِفُ**: بەکەسـێك دەگـوترێ لـەوەڕی تـازە بـدا بـە ئاژەڵـەکانی ٥ هـەروا بەکەسـێك دەگـوترێ سـەرەتای رۆژ یان سەرەتای شەو سەفەر بکات.

**الإِنْـسْفْلُوَنْزَا**: پەتایەکـە دەتەنێتــەوە، بـەهۆی ڤایرۆسـەوە پەیـدا دەبـێ ٥ کۆئەنـــدامی هەناســـەدان یـــان هەزمکردن، یان جیهازی (العصبـي) تێـك دەچـێ، وادەبێ کۆکـەو خـەو زراندنیشی پێوە دەبێ.

**أَنِــقَ أَنَقــاً**: هەنــدامی ریــكو پــێکن، جەستەیەکی جوانی هەیە ٥ کـەیف خۆشو دڵتـەڕە ٥ (أَنِقَ به و له) پـێی موعجـەب بـوو سـەرنجی راکێشـا ٥ (أَنِقَ الشَّيءَ) ئەوشتەی خۆشویست ٥ (روضـة أنيـقَ) بـاغێکی رێـكو پێکـە (وروضة أنيقةٌ).

**آنَقَـهُ الشـيءُ إيناقـاً**: ئەوشـتە سـەرنجی راکێشاو تووشی رامانی کرد.

**أَنَّقَ الشَّيْءَ**: شـتەکەی والـێکرد رێـكو پێك بێ ٥ (أَنَّقَ الشيءُ فلانـاً) شـتەکە سەرنجی فلانی راکێشا.

**أَنـَّقَ الروضـةَ**: باغەکـەی هەڵپـەرداوت‌و رێکـی خسـت ٥ (أَنَّـقَ فِي الروضـــةِ) لەززەت‌و خۆشی وەرگرت بـەجوانی باغەکە.

**الأَنوقُ**: باز، هەڵۆ.

**الانقليس:** جۆرە ماسییەکە شێوەی لەمار دەچێ لەناوی چۆمو دەریاکانی سەر بەدەریای ناوەراست دا دەژیا ٥ (الانکلیس) بەمانا (الانقلیسە).

**الأنموذج:** نموونە ٥ نموونەی شت.

**أنّ** المریض: نەخۆشەکە نالاندی.

**أنّنَهُ:** رازی کرد.

**الأُنُّ:** بالندەیەکە وەکوو کۆتر وایە وەلێ شێوەی رەشە قاچو دەنوکی سورن دەنگی وەکوو نالین وایە.

**الأنّانُ:** ئەوکەسەی زۆر دەنالێنێ ٥ زێدەرۆیی دەکا لە نالین دا.

**الأنّةُ:** ئاسنێکی سەرگۆچانیو چەماوەیە بۆ دەرهێنانی دۆڵچە لەبیر بەکاردەهێندرێ.

**الأُنّةُ:** بەمانا (الأنان)ە.

**الْمَئِنَّةُ:** شوێنی شتو جێگای هەرشتێك پالی بدرێ ٥ دەگوترێ: (هو مَئِنّةُ الخیر) ئەوجێگای خێرو بێرە.

**أنَی أنْیاً إنیً:** نزیك بووە، کاتی ئەوە هاتووە تۆ ئەوە بکەی... مۆلەتی دا، لەگەلیا لەسەرەخۆ بوو،

**أنَی السائلُ:** شلەمەنییەکە گەیشتە ئەوپەری پلەی گەرمی.

**أنَی الشَیْءُ أنِیاً:** شتەکە دواکەوتو تەمبەلی کرد.

**أنِيَ أنْياً وإنیً:** مۆلەتی پێدا، لەگەلی دا لەسەرە خۆ بوو، دواکەوت، تەمبەلی کرد.

**آناه إیناءً:** لەکاتی خۆی دواکەوت، دەگوترێ: (لاتُؤْنِ فُرْصَتَكَ) هەلی هەلکەوتوی خۆت دوامەخە هەلت لەکیس مەدە.

**أنَّی:** دواکەوت، تەمبەلی کرد (أنّی الشَیءَ) شتەکەی دوا خست، نەیهێشت لەکاتی خۆی دا ئامادەبێ.

**تَأنَّی:** بەمانا (أنِيَ)یە دێ ٥ (تَأنَّی فلاناً) مۆلەتی فلانکەسی دا ٥ لەگەلی دا هێدیو لەسەرە خۆ بوو.

**إستأنی:** بەمانا (تَأنّی)یە ٥ دەگوترێ: (إستَأنَی بە حولاً) سالێك مۆلەتی دا ٥ هەروەها دەگوترێ: (هو یَسْتَأنی بالجراحة) ٥ چاوەروانی سەرەنجامی نەشتەرگەرییەکەی دەکا.

**الآناءُ:** ساتەکانی شەو ٥ دەگوترێ: (فلان یقوم آناء اللیل).

**الإناءُ:** قاپو قاچاغی کە خواردنو خواردنەوەیان تێ دەکرێ، (ك: آنیة)ە، کۆی (ك: أوانی)یە.

**الأناةُ:** لەسەرە خۆییو عاقلمەندیو دامەزراوی ٥ دەگوترێ: (فلان لذو أناة ورفق) فلانکەس لەسەرە خۆو هێدیو هێمنە ئەگەر بۆ ئافرەت بەکار هێندرا مەبەست ئافرەتی بەناز پەروەردەو خاوەن ئەدەبو رێزە، (ك: أنَوَات).

**الأنیلین:** شلەمەنییەکی زەیتی

هەڵچووە، ڕەنگی نیە، بۆنی کەسکونی هەیە، تامی سوتێنەرە وەکوو بیبەر ٥ هەرکاتێ بەر هەواو روناکی بدرێ رەق دەبێ لەگەڵ‌و بەنزین دا دەتوێتەوە صبغێکی کیمیاوییە لەگوشراوی روەکی نیلی کە لە میصر زۆرەو پێی دەڵێن (نیلیة) لەگەڵ (بۆتا ساکاویە) وەردەگیرێ.

**الأنیمیا**: نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی کەمخوێنی، یان رێژەی پێکهاتەکانی تێك دەچێ، لەرێ‌و لاوازی لێ پەیدا دەبێ.

**أَهَبٌ للأمر**: خۆی بۆ کارەکە ئامادەکرد.

**تَأَهَّبَ لە**: خۆی بۆ ئامادە کرد ٥ دەگوترێ: (تَأَهَّبَ للسفر والأمر) خۆی بۆسەفەر ئامادەکرد، یان بۆ فلانکار خۆی حازرکرد.

**الإهاب**: پێستی گیانلەبەر پێش ئەوەی دەباغ بکرێ ٥ دەگوترێ: (کاد الفرس یخرج من اهابِهِ) ئەسپەکە ئەوەندە بەنیشاتو خۆشرۆ بوو خەریك بوو لە پێستی خۆی بچێتە دەر ٥ هەروا دەگوترێ: (جاع القوم حتی أکلوا الأُهُبَ) خەڵکەکە ئەوەندەیان برسی بوو پێستەیان خوارد.

**الأُهْبَةُ**: تویشوو پێداویستی کار.

**أَهَلَ اهلاً وأهولاً**: ژنی هێنا، هاوسەر گیری ئەنجام دا.

**أَهَلَ المکانُ أهولاً**: ئەوشوێنە بەخەڵکی خۆوەڵاتی ئاوەدان بۆوە ٥ (أَهَلَ فلانةَ): فلان ئافرەتی مارەکرد ٥ (أهل به) وەگری بوو.

**أَهِلَ المکانُ**: شوێنەکە ئاوەدانی تێ کەوت، قەربالغ بوو.

**أَهِلَ الطعامُ**: خواردەمەنییەکە (چێشتەکە) بەزی تێکرا ٥ دەگوترێ: (ثریدة مأهولةٌ) تشریبێکی بەزتێکراوە.

**آهَلَهُ ایهالاً**: کردی بەهاوسەری خۆی ٥ (آهَلَ فلاناً للأمرِ) فلانکەسی والێ کرد بە کەڵکی ئەوکارە بێ ٥ یان پێی وا بوو بەکەڵکی ئەو نیشە دێ ٥ (أَهَّلَ به) پێشوازی لی کرد.

**أَهَّلَ فلاناً**: ژنی لەفلانکەس مارەکرد.

**إِتَّهَلَ**: ئافرەتی مارەکرد، بوو بەخاوەن خێزان.

**تَأَهَّلَ**: بەمانا (اِستَهَلَ)ەیە ٥ (تَأَهَّلَ للأمر) شیاوی ئەوکارەیە.

**استأهَلَ**: بەزەکەی بردو کردی بە پێخۆر.

**استأهل الاهالة**: پیوەکەی خوارد.

**استأهل الشَّیْءَ**: شیاوی ئەوکارەیە.

**الآهِلُ**: گیانلەبەری ماڵی ٥ (الاهالة) بەزو پیو، زەیت، هەر شتێك بکرێتە پێخۆر.

**الأَهْلُ**: خزمو کەسو کارو هۆزو خێڵ ٥ (أَهْلُ الشَّيء) شیاوی شت، خاوەنی گونجاو بۆی ٥ (أهلاً وسهلاً) واتە هاتێتە شوێنێکی ئاوەدانو خۆشو دڵگیرو پڕ دۆستو خزمو کەسو کار.

**الأَهْلِيُّ**: پاڵدراو بۆلای ئەهل، گیانلەبەری خانەکیو ماڵی.

**الأَهْلِيَّةُ**: بۆ مێینە بەکار دەهێندرێ بەرامبەر (الأهلي)

**الأَهْلِيَّة للأمر**: گونجاو بۆئەو کارە.

**الإهْلِيجُ**: درەختێکە لەولاتی هیندو ئەفغانستانو صین رواوە، بەرەکەی لەشێوەی، صنەوبەری گەورە دا یە.

**الإهيلَجيُّ**: پاڵدراو بۆلای ئیهلیج، یان ئەو درەختەی بەرەکەی وەکوو بەری ئیهلیج وایە.

**أَهَّ أَهًا وَأَهَّةً**: ئازاری هەبوو هاواری کرد وتی: (ئاە).

**آبَ اليه أوباً وأوبةً وإياباً ومآباً**: گەڕایەوە، (آبَ الى الله) تۆبەی کرد لەتاوانەکانیو وازی هێنا، ملی لەخودا پەرستی نا.

**آئب، آیب، أوّاب**: بەمانا گەڕاوەو پەشیمان بوو.

**آبَتِ الشمسُ**: خۆرئاوا بوو (آب بیده الی السیف) شمشێرەکەی بۆ گەڕاندەوە بۆئەوەی لێی بدا بە شمشێر لێی راسا.

**آبَ الماءَ**: بەشەو چووە سەر ئاوەکە ٥ دەگوترێ: (أَبْتُ بني فلان) بەشەو چوومە لای فلان بنەماڵەو دیدەنیم کردن.

**آوَبَهَ في السير**: پێشبڕکێی لەگەڵ کرد لەرۆیشتن دا.

**أَوَّبَ**: گەڕایەوە، یان گەڕانەوەی دەنگە ٥ سەرانسەر رۆژ بەرێگادا رۆیشت تا شەو داهات ٥ (أَوَّبَ القومُ) ئەو کۆمەڵە لەرۆیشتن دا پێشبڕکێیان کرد ٥ (تآوَبَا في السير) ئەو دوکەسە لەرۆیشتن دا پێشبڕکێیان کرد.

**تَأَوَّبَ**: گەڕایەوە، یان سەرەتای شەو گەڕایەوە یان بەشەو بۆ ئەو جێگایە چوو، دەگوترێ: (تَأَوَّبْتُ بني فلان) بەشەو چوومەلایان.

**تَأَوَّبَ الشيءُ فلاناً**: ئەوشتە بۆ فلانکەس گەڕایەوە.

**الأَوْبُ**: پەلەکردن، با، هەور، کۆمەڵێک هەنگ ٥ قەصد کردنو بەردەوام بوون لەسەر کار، رێبازو عادەت، ئەملاو ئەولا ٥ دەگوترێ: (جاءوا من كل أَوْبٍ) لەهەموو لایەکەوە هاتن.

**الأَوَّابُ**: ئەوکەسەی زێدە رۆیی بکا لە پەشیمان بوونەوە ٥ ئاودەر، ئاوگێڕ.

**الأَوْجُ**: بەرزی ٥ دوورترین خاڵ لەمەداری مانگ لەزەوی را ٥ لەحنێکی مۆسیقایە.

**آدَ — أَوْداً وأوروداً وإياداً**: دوولا هاتەوەو

خواربوو (آدَعَلَيـه) بۆی گەڕایـەوە ٥ (آدَ العودَ) خۆی بەسەردارەکەدا دا.

آدَ الشَّـيئَ: شـتەکەی لـەکوڵ کـرد ٥ قورسایی کەوتە سەرو ماندو بوو.

أوِدَ أوَداً: خـوارو خـێچ بـوو، دەگـوترێ: (أقـام أوَدَهُ) خـوارو خێچـی یەکـەی راسـت کـردەوە، (أوَّدَهُ) خـواری کردەوە، دولای هێنایەوە.

تَأوَّدَ: خـوارو خـێچ بـوو (تـأوَّدَ الشَّيئُ) شتەکە خوار بوو.

الأرِيـد: هەسـتو شـعور (أرِيـدُ النـاس) هەستی خەڵك.

اسْتَأوَرَ: ترسا، هەڵسلەمییەوە، تەرەبوو، (اسْتَاوَرَ البَعِيرُ) حوشـترەکە خـەریکی هەڵسان بـوو (اسـتاوَرَ القـوم غضـباً) جەماوەرەکە رقیان هەڵسا زۆر تـوڕە بوون.

الآرُ: عەیبو عار.

الأُوَارُ: گەرمایی خۆر، گـەرمایی ئـاگر ٥ دەگوترێ: (لَفَحَني أوَارُ النار)گەرمای ئـاگر داخـی کـردم، (لَفَحَنـي أوَرُ الشـمس) تیشکی خـۆر گەسـتمی ٥ هەروا (الأوار) بەمانا تینوێتی دێ ٥ دەگـوترێ: (کـاد يغشـي عليـه مـن الأوَار) نزیـك بـوو لـەتینوان بـێ هۆش ببـێ ٥ هـەروا بـەمانا دوکەڵو بڵێسەی ئاگر دێ.

الأوَارِيّ: ئادەمیزادێك زۆری تینوبێ.

أورانـس: یەکێکە لە نـۆ ئەسـتێرەکانی کۆمەڵـــەی خـــۆریی ٥ یەکـــەم ئەسـتێرەیە کە لەسـەردەمی تـازەدا دۆزرایـەوە هـەموو هەشـتاو چـوار سـاڵ جارێـك بـەدەوری خـۆردا دەسوڕێتەوە.

أوروبة: یەکێکە لەحەوت کیشوەرەکانی جیهان، جگە لە کیشوەری ئوسـتراليا لـە هـەموو کیشـوەرەکان بچوکترە ٥ کەوتۆتە نێوان دوو هێڵی پانی (٣٧-٧١)وە ٥ کێوەکـانی ئـۆراڵو قـەوقازو دەریـــای ڕەش لـــە ئاســـیای جیادەکاتـەوە لـەنێوان کیشـوەری ئـەوروپاو ئەفـەریقادا دەریـای سـپی ناوەراست هەیە ٥ لەخۆرئاواوەیە وە دەریالوشـی ئەتڵەسـی هەیـە ٥ لەباکوریەوە دەریالوشـی بەسـتەڵەك هەیـە ٥ زۆربـەی خاکەکـەی ئـاوو هـەوای مـام ناوەندییـە بـڕێ بەشـی بـاکوری دەچـێتە ناوچـەی بەستەڵەکەوە.

الأُورطـــي: شـــادەماری ســـەرەکی لەجەســـتەی ئـــادەمیزاد کـــە بەوخوێنەی لەدڵەوە دەردی جەستە پاراو دەکا.

الإِرْزُ: جـۆرە باڵندەیەکـە دەشـوبهێتە مـراوی وەلـێ لـەو گـەورە تـرو مـل درێژ تـرە ٥ کـورتو تۆکمـەو تونـدو تۆڵ ترە.

**الإِزِّي**: زەویەکـــە زۆری باڵنـــدەی ئیومزە تێدابێ، (ك: مَآرِزَ)ە.

**أوزوریـــس**: پەرســـتراوێکی میصـــرییە کۆنەکانە، پێیان وایە مردووەکانیان دەپارێزێ.

**آسَـــهُ أوســـاً وإیاســـاً**: پێـــی بەخشـــی، قـــەرەبووی ئـــەوەی بـــۆ کـــردەوە کەلەکیسی چوبوو، یارمەتی دا.

**إسْتَآسَهُ**: داوای بەخششی لێ کرد.

**الأَوْسُ**: گورگ ٥ هۆزێکی قەحطانیشە کـــە بەشـــێکن لەیارمەتیـــدەرانی پێغەمبەر لەسەرەتای هاتنی ئیسلام ٥ ئەنصـــارەکانی پێغەمبـــەر بریتـــی بـــوون لـــە هـــۆزی ئـــەوس و هـــۆزی خەزرەج.

**الأُویس**: هەربـــە مانـــا گورگـــە ٥ هـــەروا بچوککردنەوەی (أوس)یشە.

**آفَـــت الـــبلاد أوفـــاً وآفـــةً**: ولات توشـــی ئافـــەتی گرانـــی و نەخۆشـــی بـــوو ٥ (آفـــت الطعـــام) خۆراکەکـــە لەکەڵـــك کەوت.

**إیفَ** الزرع: کشت و کاڵەکە توشی ئافەت بوو.

**الآفَةُ**: ئەوشتەیە توشی هەرشتێك بێ لەکەڵـــکی بخـــا، جـــا نـــە خۆشـــی بـــێ قات و قڕی بێ هەرشتێ: فەوتێنەری سـودبێ ٥ دەگـوترێ: (آفـــة العلـــم النســـیان) بـــەڵای زانیـــاری لـــەبیر چونەوەیە.

**آقَ أوقاً**: بەهۆی قورسایی خۆیەوە خـوار بۆتـــەوە، (آق علیـــه) خـــوار بـــۆوە بەسەریا کۆمبۆوە.

**أوَّقَـهُ**: زۆر بەنارەحـەتی هـەڵی گـرت ٥ زەلیلی کرد، خواردنی کەمکردەوە.

**الأَوَاقـــي**: قەصـــەبی جـــۆلا کـــە داوە رایەڵەکانی پێدا رۆیشتون.

**الأَوْقُ**: قورسایی، نەگبەتی.

**الأَوْقَةُ**: پێڕو کۆمەڵ.

**الأُوقَةُ**: چاڵایی یە کە وەکوو بەلوعـە ئـــاوی پێـــدا دەڕوا، هـــەروا شـــوێنی حەوانەوەی باڵندەیە لەسەر کێوان.

**الأُوقِیة**: بەشێکە لەدوازدە بەشی ریطلی میصری، کێشێکە شتی پێ مەزەنـدە دەکرێ.

**آلَ** الیه أولاً وإیالةً وأیلولة ومآلاً: گەڕایـەوە بـۆلای ٥ (آلَ عنـــه) پاشـگەز بـووە ٥ (آلَـتِ الماشـیة) ئاژەڵەکـە لـەڕو لاواز بوو (آلَ اللَّبَنُ) شیرەکە خەست بـوو بوو بە فرۆ ٥ (آلَ اللَّـبَنَ) شیرەکەی خەست کـردەوە ٥ (آلَ علـی القـوم) بـوو بەگـەورەو ریـش سـپیان ٥ (آلَ الرعیـــــةَ) بـــوو بەفـــەرمانڕەوای جەماوەر (آلَ المـالَ) ماڵەکەی چـاك کردەوە، رێکی خست.

**أوِلَ أولاً**: پێش کەوت ٥ (أوَّلَ الشیئَ الیـه) شـــتەکەی بـــۆلای خـــۆی گێڕایـــەوە لەدوعا کـردن دا دەگـوترێ: (أوَّلَ اللهُ

عليك ضالتك) خودا شته هونبوەكەت بۆ بگێڕێتەوە.

أَوَّلَ الكلامَ: قسەكانی شی كردنەوە، مەبەستی سەرەكی لە دەقەكە دیاری كرد ٥ خەونەكەی لێك دایەوە.

إِئْتالَ المالَ والرعية: سەروكاری ماڵو داروودەستەكەی خۆی كردو پێكی هێنان.

تَأَوَّلَ الكلامُ: مانا راستەقینە شێراوەكەی لەدەقەكە دەرخست.

تَأَوَّلَ في فلان الأمرَ: وای مەزندە كرد كە فلان ئەو ڕەوشتەی تێدایە.

الآلُ: تراویلكە، یان سەرەتای ڕۆژو كۆتایی ٥ (آلُ كلُ شيءٍ شخصه) ئالی هەموو شتێك كەسایەتی ئەوشتەیە ٥ (آلُ الرجلِ) خاوو خێزانو كەسو كاری.

الآلة: ئامێری خۆشیو هەڵپەركێ ٥ كۆڵەكەی خێوەت ٥ تەنگو چەڵەمە ٥ (الآلة الحدباء) دارە مەیت (الآلة) ئامێری ئیش یا ئامێری هەرشتێك بێ.

الآلاتيُّ: مۆسیقا ژەن ٥ دانەری لەحنەكانی مۆسیقا.

الآليّ: یان (الذاتي) ئەو جمو جوڵەیە كە لەجەستەكە پەیدا دەبێ بەبێ ئاڕاستەكردنی هەستێك یان بەپیرەوە چونی كاریگەرییەكی دەرەكی.

الإِيالُ: قاپێكە شیری تێدا دەمەیەندرێ دەكرێ بە ماست.

الإِيالة: شیو ٥ یان بەشێك لەوڵاتێك فەرمانڕەوایەك بەسەری رابگا كە سوڵتان (خەلیفە) دایەنابێ.

آمَ أُوماً: تینوایەتی تینی بۆهێنا ٥ (آمَ فلاناً) روخساری شێواند، ناشیرینی كرد ٥ (آم النحلَ) هەنگەكەی قانگ دا ٥ (آمَ على النحلِ) دوكەڵی بەسەر هەنگەكەدا كرد بۆ ئەوەی كۆڵەسەكە چۆڵ بكەنو هەنگوینەكە دەربێنێ٥ (أَوَّمَهُ) تینووی كرد روخساری شێواند، قەڵەوی كرد.

الآمةُ: هەرزانیو ساڵی هاتو باراناویو بەپیت.

الأُوَامُ: گەرمایی تینوایەتی، دەگوترێ: (في جوفه أوام وأوآن) لەناو سكی دا گەرمایی تینوایەتی هەیە ٥ دوكەڵ ٥ ژیێ كەوان.

آنَ أوناً: ژیانی خۆش بوو، گوزەرانی باش بوو حەسایەوە.

أَوُنَتِ الحاملُ: ژنە دوگیانەكە ورگی بەرز بووە لەمنداڵبون نزیك بۆتەوە.

أوَّنَ الرجلُ والدابةُ: ئاژەڵەكە ئەوەندەی خواردو خواردەوە تا هەلاوسا كەلەكەی بەرز بوونەوە، دەڵێی دوتای لەخۆی باركردون ٥ مۆڵەتی دا.

تَأَوَّن: بەمانا (أَوَّنَ)یە ◦ (تأوّن في الأمر) هەڵوێستەی لەکارەکەی دا کردو کەمێك راوەستاو بیری لێ کردەوە.

الأَوَان: وەرزو کات ◦ دەگوترێ: (جاء أوان البرد) کاتو وەرزی سەرما هات ◦ لاتاو هاوسەنگ، کۆڵەکە، لاکەلەکە ◦ لایەکی تێرەو خورجی.

آهَ اوهاً وآهاً وآهةً: ئاهو ناڵەی کرد ◦ (تأوّهَ) لە ترسی خودا ناڵەو ئاخو ئۆفی کرد ◦ دەگوترێ: (فلان مُتأوِّهٌ) فلانکەس زۆر ئاهو ئۆی کرد لەترسی خودا.

آه آه: وشەیەکە لەکاتی هەبوونی ئازارو ئێش‌و ناخۆشی دا دەگوترێ.

الآهَةُ: نەخۆشی ئاوڵەو سورێژە.

الأوّاه: ئەوکەسەی زۆر لەخودا دەپارێتەوە ◦ بەرەحم‌و خاوەن بەزەیی‌و دڵنەرم.

أَوَى الجرحُ: برینەکە نزیکە چاك بێتەوە.

أوِيَ له واليه أوياً ومأويةً ومأواة: دڵی بۆ سوتا بەزەیی پێدا هاتەوە (أوِيَ المكانَ) لەشوێنەکەدا نیشتە جێ بوو ◦ دەگوترێ: (أنا آوي الى ظلال لك): من خۆ دەخەمە ژێر سێبەری تۆوە ◦ پەنا بۆ لای تۆ دێنم، (أوى فلاناً اليه) فلانکەسی لای خۆی جێکردەوە، یان جێگای لای فلان کەس بۆ کردەوە.

آوَى الجرحُ: برینەکە نزیکە چاك بێتەوە ◦ (آوى الى المكان) خۆی خستە ئەو شوێنەوەو تێیدا نیشتە جێ بوو.

إئْتَوى اليه: گەڕایەوە بۆلای، پەنای بۆ برد، (إئتوى لفلان) بەزەیی بەفلانکەس دا هاتەوە (إئتوى المكان) لەوێ داینا لەوێ مایەوە.

تَآوَوْا: خەڵکەکە هەندێکیان پەنایان بردە بەرهەندێکیان ◦ (تآوّى الجرح) برینەکە خەریکە چاك بێتەوە (تآوّى الناسُ او الطيرُ) ئادەمیزادەکان یان باڵندەکان کۆبونەوە، گردبونەوە، (تآوّى المكان) بەمانا (أوَى)یە.

استأوى فلاناً: داوای رەحم‌و بەزەیی هاتنەوەی لە فلانکەس کرد.

المأوى: پەناو شوێنی داڵدە دان دەگوترێ: (فلان ماوى المحاويج) فلانکەس پەنای ئاتاجانە.

ابن آوى: گیانلەبەرێکە لەپێڕی سەگ لەگورگ بچوکترە.

أيْ: پیتی بانگکردنە (أي محمدُ، اى عليُّ) حەرفی تەفسیرو شیکردنەوەیە ◦ دەگوترێ: (رأيت غضنفراً اى أسداً).

إيْ: حەرفی وەڵامە بەمانا (بەڵێ) یە ◦ (قل إى وربي...).

أيا: حەرفی نیدایە بۆ دوور، دەگوترێ: (أيا صاعِدَ الجبل).

آبَ أيباً وإياباً وأيبةً: گەڕایەوە، تۆبەی کرد.

الأيّابُ: ئاوگێڕ ئەوکەسەی زۆر ئاودەدا بەخەڵك.

الآحُ: سپێنی هێلکە ◦ ئەوەی دەخورێ.

آدَ أيداً وآداً: بەهێز بوو پتەو بوو

دەگوترێ: (هو ایدٌ) ئەو خاوەن هێزو توانایە قورئان دەفەرموێ: ﴿والسماءَ بنیناهَا بأیدٍ﴾ ئاسمانمان بەهێزو دەسەلات دروستکردوە لەپەندی پێشیناندا هەیە دەڵێ: (الکیدُ ابلغ من الأیدِ) فێڵو پیلان لەهێزو توانا کاریگەرترە.

**آیَدَ:** بەمانا (آدَ)یە ٥ (آیدَ فلاناً) بەهێزی کرد پشتگیری کرد ٥ (آیدَهُ مؤایدة) بەپشتگیری کردن بەهێزی کرد.

**أیّدَهُ:** پشتگیری کرد (تَأیّدَ) بەهێز بوو.

**الإیادُ:** هەرشتێك پشتگیری پێ بکرێ ٥ پەردە ٥ پەنا ٥ بەستەرەوە ٥ لای راستو چەپی سوپا.

**الأیّدُ:** خاوەن هێزو توانا.

**المُؤیِّدُ:** کاری گەورەو گرنگ، بەلاو کارەساتی سامناك.

**الأیْرُ:** ئەندامی نێرایەتی لەئادەمیزاددا ٥ (الأیَارُ): مسی زەرد.

**أیّار أو أیَارُ:** مانگی هەشتەمی سورەیانی یە مانگی پێنجەمی رۆمی یە ٥ (الأیّارُ): هەوا.

**ایزیس:** پەرستراوێکی میصرییە کۆنەکانە، مێردی (أوزوریس)ە.

**آسَ أیساً:** گەردنکەچ بوو ملی دا ٥ (أسَ فلاناً) بەسەر فلانکەس دا زاڵ بوو.

**أیِسَ منه:** لێی هیوا براو بوو هیچ هومێدی پێ نەما.

**آیسَهُ:** هیوا براوی کرد.

**أیّسَ فیه:** کاری تێکرد ٥ (أیّسَ فلاناً) ملکەچی کردو خستیە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە ٥ (تَأیّسَ) نەرم بوو خۆی بە بچوك نیشان دا.

**الآیِسَةُ:** ئەوئافرەتەیە کە نەکەوێتە عادەی مانگانەی خۆیەوە.

**الإیَاسُ:** سیل ٥ هەروا کاتو رۆژگارێکی حەریجە لەژیانی ئادەمیزاددا، بۆ ئافرەت لەتەمەنی چل بۆ پەنجا ساڵی رودەدا ٥ بۆ پیاو دوا ئەو تەمەنە، هۆکارەکەشی کەمبونی ئیفرازاتی گەرایە.

**أیْسَ:** ماناکەی پێچەوانەی مانای (لیس)یە ٥ دەگوترێ: (إئتِ به من حیث أیْسَ ولَیْسَ) بەبونو بە نەبوون ئەو شتەم بۆ بێنە.

**أیْشٍ:** لەرستەی (أی شیء) وەرگیراوەو هەمان ماناشی هەیە.

**آض أیضاً:** گەڕایەوە دەگوترێ: (آض الثلجُ ماءً) بەفرەکە بووە بەئاو.

**أیِكَ:** درەخت ٥ (أیِكَ أیکاً) درەختەکە لقو پۆپو گەلای زۆر بونو تێك چرژان.

**إسْتأیكَ الشجرُ:** درەختەکە لقو پۆپو گەلای زۆر بوو.

**الأیکَةُ:** درەختێکی لقو پۆپ زۆر تێك چرژاوە ٥ جۆرە درەختێکیشە.

**ایل:** لەزمانی عیبریدا ناوی خودایە.

**إیلیا:** بەیتولەقدیسە.

**الأیِلُ:** کەڵەکێوی، (ك: أیایل، أیائل)ە.

**أیلول:** مانگی دوانزەی سورەیانیو مانگی نۆی رۆمی یە.

آمَتِ المرأة أيماً وأيوماً وأيمةً: ئەو ئافرەتە لەو ولاتە جێ گیربوو مایەوە بێ ئەوەی مێرد بکا جالەوەپێش کچ بوو بێ یان بێوەژن ٥ هەروا بەمانا ئەوەش دێ: ئەو ئافرەتە مێردەکەی مردو بێوەژن بوو.

آمَ المرأة: ئافرەتەکەی بە بێوەژنی مارەکرد (أيم النخلَ) و (أيَّمَ على النحل) هەنگەی ڤانگ دا دوکەڵی بەسەردا کردن بۆئەوەی لەهەنگەڵانەکە دوور بکەونەوەو هەنگوینەکە دەربێنێ.

أيَّمَ المرأةَ: ئافرەتەکەی بێوەژن کرد.

إِئْتامَتِ المرأةُ: بەمانا (آمَتِ المرأة)ە ٥ (إئتام فلانٌ المرأةَ) فلانکەس ئافرەتەکەی مارەکرد بەبێوەژنی.

الآمَةُ: عەیبو لەکە.

الأيْمُ: نێرەمار.

أيْمُ الله: وشەیەکە بۆ سوێند بەکاردەهێندرێ.

الأيِّمُ: عازەب چ کوربێ چ کچ بێ، دەگوترێ: (ترکوا النساء أيامى والأولاد يتامى).

اَلْمَأيَمَةُ: ئافرەت بەبێوەژن کردن ٥ دەگوترێ: (الحَرْبُ مأيَمَةٌ للنساء) جەنگ بێوەژن کردنی ئافرەتانە چونکە مێردەکانیان دەکوژرێن.

اَلْمُؤْيِمَةُ: ئافرەتی ساماندار بێ مێرد.

آنَ: کاتی هات ٥ ماندوو بوو شەکەت بوو.

الآنُ: ئەوکاتەی تێیدا ژیان بەسەر دەبەی‌و قسەکە دەکەی ٥ دەگوترێ: (حضرت الآنَ) یان (الآن آنُك ان فعلت) کات کاتی خۆتە ئەگەر ئەوئیشە بکەی.

الأيْنُ: بەمانا (الأيْمَ) کەبەمانا مارە.

أيْهِ بهِ: بانگی کرد، لێی تورە بوو (إيهِ) وشەیەکە بەکار دەهێندرێ بۆ درێژەدان بەقسە لەلایەن قسەکەرەوە یان بۆ ئەنجامدانی کرداری زیاتر.

أيْهاتَ أيْهاتِ: بەمانا (هیهات)یە واتە: دوورە.

الأيوان: باڵەخانە، کۆشك.

أيَّا بالمكانِ: مایەوە، گیری خوارد لەوشوێنە.

الآيةُ: نیشانەو پەندو عیبرەت ٥ موعجیزەی سەر ئاسا.

إِيَا: خۆر، روناکی یەکەی، تیشکەکەی، جوانی یەکەی.

الأيُونُ: گەردیلە یان کۆمەڵە گەردیلەیەك پێکەوە نووسا بن شوحنەیەکی موجەب یان سالبی هەبێ ٥ بەئەلکترۆنیش دەگوترێ: (أيون).

أيُّ: حەرفی شەرتە، حەرفی ئیستیفهامە، حەرفی مەوصولە.

أيّانَ: زەرفی زەمانی داهاتووە وەکوو قورئان دەفەرموێ: ﴿أيان يبعثون﴾ ٥ جاری وا دەبێ بەمانا شەرت بەکاردەهێندرێ.

ب: پیتی دووەمە لە زنجیرەی پیتەکانی هیجا ٥ حەرف ماناداره ئیسمی دوای خۆی مەجرور دەکا.

البابا: سەرکردەی کەنیشتەی کاثولیکی، وەلێ ئێستا بەسەرۆکی کەنیشتەی ئارثوذکسیەش دەگوترێ.

البابوية: پلەو پایەی ئایینی پاپا.

بابة: مانگی دووی قیبتییەکانە دەکەوێتە وەرزی پایزەوە.

البابوج: پاپوج (بە فارسی پێی دەگوترێ پاپوش).

البابونج: رەگەزو پێری ئەو گیاو گژانەیە کە تێکەڵ دەکرێن و بۆ رەنگ و چارەسەری نەخۆشی بەکاردەهێنرێت.

الباذق: گوشراوی ترێ کەکەمێك بکوڵێنرێ و بێتە سرکەو سەر خۆشکەر بێت.

الباذنجان: باینجان (رەش و سپی درێژ و خڕی هەیە).

البارود: تێکەڵیەکە لە خوێی بارودو کبریت خەڵوز بۆ گوللە تۆپ و قومبولە بەکار دەهێنرێت ٥ هەروەها بۆ تەقاندنەوەی شاخ وباڵەخانەو شتی تر.

البازلت: جۆرە بەردێکە زادەی بورکان و تەقینەوەکانی ناو زەوییە رەنگەکەی رەشە لە پانوی حەبەشە و ناوچەی ئەبوزەعبەلی وڵاتی میصردا هەیە ٥ بۆ رەصیف کردنی رێگاوبان بەکاردەهێنرێت چونکە پتەوو قایمە.

الباسليف: رەگێکە لە قۆڵدا بەسەر ماسولکەوەیە.

الباسور: مایەسیری، نەخۆشیەکە لە کۆمدا پەیدا دەبێت.

الباشا: پاشا نازناوێکە تورك دایان هێنا و لەو وڵاتانەی لەژێر دەسەڵاتیاندا بوون بڵاو بووە.

البالية: جۆرە رانواندنێکیی شانۆییە، بەزۆری بە کۆمەڵێ ئەنجام دەدرێ و سەمای تێدایە لەسەر شێوەی مۆسیقایەکی تایبەتی و جۆرە لیباسێکی تایبەتی تێدا لەبەردەکرێ، رووداوێك دەگێڕێتەوە یان فکرەیەك دەردەبڕێ.

بَأْبَأَ: لە قسەکردندا پیتی(ب)ی دووبارەو سێ بارە کردەوە.

بَأْبَأَ الصبيُّ: منداڵەکە وتی بابا ٥ (بَأْبَا فلانا): بەفلانکەسی گوت: باوك و دایکم بەقوربانت بن.

**البُؤْبُؤُ**: ئەصل و ڕەسەن، ناوەڕاستی شت، بیلبیلەی چاو.

**البأجُ**: شتی یەککرتو و یەکسان ٥ ڕێگای ڕاست و تەختکراو ٥ مندالی قەڵەو ٥ جۆرێك خواردن.

**بَـأدَلَ**: بەهێواشــی ڕۆیشـتو لەنجـەی کردو سمتی لەرییەوە.

**البَأدَلَـةُ**: گۆشـتێکە لـە نێـوان گـردن و چــوڵەمەدایە یــان لــەژوور گــۆی مەمکەوەیــە یــان لــە نــاوڕان دا بــەزۆری لــەئادەمیزادی قەڵــەودا دیاری دەدا.

**بَأرَ بَأراً**: چالی هەلکەنـد، بیری هەلکەنـد، بَــأرَ الشَــيَ: شـتەکەی شــاردەوە، پەزمەنــدەی کــرد،(بَــأرَ الخَــيرَ): بــەنهێنی خێـری کـرد، نەیویســت کەس بزانێ.

**ابتَأرَ الشيَ**: شتەکەی شاردەوە.

**البأرُ**: ئەو کەسەی زۆر بیر لێ دەدا

**البُـؤرَةُ**: چـالَ ٥ قولکـە ئـاگردان ٥ ئـەو شــتەی پەزمەنــــدە دەکــــرێ و هەڵدەگیرێ.

**البئـر**: بـیر ٥ چـالێکی قوڵـە ئـاو یـان نـەوتی لێ دەردەهێنـرێ، (ك: أبـؤرُ، أبآر، آبار، بِئار)

**بِئرُ السُّلم**: کونی مەصعەد ٥ بۆشاییەکە لــەناو بینــادا قالدرمــەی پێــدا سەردەکەون.

**البِئرُ** الإرتوازية: بیری ئیرتیوازی.

**البِئـرَةُ** بـِـ **البَـئِيرَةُ**: شـتی هـەلگیراوو پەزمەنده کراو.

**البَأزُ**: بەمانا بازە، (ك: أبْؤُز، بئوز، بِئزانٌ).

**بَئِسَ بَأساً**: هەژاربوو، پێویستیاتی زۆربون خۆی پێ بەرێوە ناچێ.

**بَؤسَ بَأساً**: بەهێزبوو ئازابوو دەگوترێ(هو بَئيس) قورئان دەفەرموێ: ﴿بِعَذابٍ بَئِيسٍ﴾.

**بِـئسَ**: خـراپ ٥ فیعلـی ذەممـە ٥ (بِـئسَ الشرابُ) شەرابێکی خراپ.

**أبْأسَ**: خراپەی توش بوو، توشـی بـەلاو کارەسات بوو.

**إبتَأسَ**: غەمناك بوو، خەفەتبار بوو.

**البَــأسُ**: زەبــرو زەنگــی جــەنگ، ســزای بەشیدەت، ترس‌وبیم.

**البَأســاء**: مانــدوبوون و نارەحــەتی ٥ البۆسی بەمانای(البُؤس)ە.

**بَأشَ** فلانـاً بَأشـاً: فلانکەسـی بـەغافلگیری کوشت.

**تبأطَ**: ڕاکشا، لەسەر تەنیشت خۆی درێژکرد، کــە شــەوی لێ داهــات خەم‌وخەفــەتی وەلانان‌و بێ خەم لێی ڕاکشا.

**بَؤلَ بألَـةً وَبَؤلـةً**: زەعیـفو بـێ هێزبـوو و دەسەلاتی نەما.

**بأتِ** الدابةُ بَـأواً: لەڕۆیشتندا پەلـەی کـرد بازی باشی هاویشتن خۆشڕۆ بوو.

**بَأيَ** فلان: فلانکەس شانازی کـرد بـەخۆی نازی‌و خۆی بەزل زانی ٥ دەگـوترێ: (بَأيَ عليه)شانازی بەسەردا کرد (بأيَ

نَفسَهُ) خۆی بەسەردا هەڵناپەوە.

**البَـبُ**: منـداڵی قەڵـەو، گـەنجی بـەناز پەروەردەو شۆخ‌وشەنگ.

**البَبَّانُ**: شتی یەککگرتوو، ڕێگای ڕاست‌و تەختکراو، جۆرێك خواردن

**البَبَّـةُ**: ئەحمـەق‌و تەمبـەڵ‌و قـونگ گران.

**البَبرُ**: بـەور، دڕندەیـەکی گوانـدارو گۆشـت خـۆرە لـە پێـری پشـیلەیە ٥ قـەبارە گەورەو دڕندەو بەسام‌و هەیبەتە

**البَبَغـــاء**: باڵندەیەکـــە لـــە پێـــری بەبەغاوییـەکان بـەنێرو مێیانـەوە، دەنـــوکێکی ئەســـتوری کەوانـــەیی هەیـــە، هـــەموو قاچـێکی چـوار پەنجـەی پێـوەن، زمـانێکی گۆشـتی ئەستورو خەپەلۆسەی هەیە لاسایی قسەی ئادەمیزاد دەکاتەوە.

**بَتَأَ** بالمكانِ بَتْأً وبتوءً: مایـەوە ٥ جێگیر بـو لەو شوێنە

**بتَّ** الشـئُ بتوتـاً: ئـەو شـتە پچڕا ٥ (بَـتَّ فلانٌ): فلان کزو لاواز بوو، ئەحمەق بـوو ٥ (بَــتَّ الــیمینُ): سـوێندەکە پێویست بوو.

**بـتَّ** الشـئُ بتـاً وبتـةً: لـە ڕەگ‌و ڕیشـەوە بڕییـەوە ٥ (بـــتَّ الســـفرُ فلانـــاً): سەفەرەکە فلانە کەسی مانـدو کـرد برستی لێ بـڕی ٥ (بتَّ طلاقُ إمرأته): ژنەکـەی وا تـەلاق دا گەڕانـەوەو ژێوان بوونەوەو مارەکردنەوەی تێدا نەبێ ٥ (بتَّ الحکـم): بـەبێ چەندو چـون بڕیارەکـەی دەرکـرد ٥ (بـتَّ الأمـر): بڕیـاری ئـەو کـارەی داو سوربوو لەسەر کردنی ٥ (بتَّ الصِّیَامَ مـــن اللیـــل): لەشـــەودا بڕیـــاری بەڕۆژوبونی دا، نییەتی هێنـا ٥ (بتَّ الـــیمین): ســـوێندەکەی ڕۆیانـــدو ئیمزای لەسەر کرد.

**أبـتَّ**: دابـڕا، دواکـەوت.(أبـتَّ الشَّـئَ) شتەکەی بڕیـەوە پچڕاندی ٥ (بَتَّـتَ فلانــاً): بەسـور بـوون‌و جەختـەوە پێی بەخشی، بەدڵنیایی بەشی دا.

**إنْبَتَّ**: دابڕا، دواکەوت ٥ (إنبتَّ الرجـل في السیر) قەتار چییەکە زەحتـی لـە وڵاغەکەی کرد تا ماندو بـوو وەسـتا نــەیتوانی ڕێ بکــات ٥ پێغەمبــەر (د.خ) فەرموویەتی: (إن هـذا الـدین متین فأوغل فیـهِ برفـق فـإن المنبـتَّ لا أرضا قطع ولا ظهرا أبقى) ئەم ئایینە قایم‌و پتەوە بەهێدی‌و لەسـەرەخۆو شـارەزایانە بچـۆرە نـاوی چـونکە کاروانچـــی دابـــڕاوو وڵاغ وەســـتاو ئەگەر هەرزەخت لەوڵاغەکە بکا نـە قۆناغەکــە دەبــڕێ‌و نــە پشــتی وڵاغەشی بەساغی دەمێنێتەوە.

**تَبَتَّت**: کەل‌و پەلی ناومالّی پێکەوە نـا ٥ (البتّات) پێداویستی موسافیر، کـەل‌و پەل پێویست بۆ سەفەر، دەگـوترێ: (لا افعله بتاتاً) هەرگیز شتی وا ناکەم ٥ (البـــتُّ): پۆشـــاکێکی ئەســـتورە

پاشـــان لەســـەدەی نۆزدەیـــەم دا ئەوچـــینو توێـــژە بوونـــە خـاوەنی کارگـــەو ئـــامێری بەرهـــەمهێنانو لەبەرامبـــەریان چـــینی کرێکـاریش پەیـدا بـوو بـەم جـۆرە کۆمـەڵگای ئەوروپاو خۆرئاوا بـوو بەدووچینو دوو کـــەمپی دژ بەیـــەك چـــینی سەرمایەدارو چینی کرێکار.

**بَرِحَ** بروحاً وبَرْحاً: لەشوێنی خۆی لاچو، نەما، (بَرِحَ فلان) رقی هەڵسا.

**بَـرِحَ الظبـــي والطـائرُ**: ئاسـکەکە یـان باڵندەکـە لـەلای راسـتی بینـەرەوە رۆیـی بـۆلای چـەپی ٥ (عـەرەب بـــەبینینی ئـــەم دیاردەیـــە رەشبینییان لەلای دروست دەبێ).

**بَرِحَ بَرَحاً وبراحاً وبروحاً**: لەشوێنی خۆی لاچوو ٥ بـۆ بـەردەوامی لەشتێکیش دا دەگـوترێ: (مـا بَـرِحَ یفعـل کـذا) هەمیشـەو ئێستاشـی لەگـەڵ دابـێ خەریکی ئەونیشەیە.

**بَـرِحَ الخفـاءُ**: ئیشـەکە رون بـووەو تـەمو مژی لەسەر رەوییەوە.

**بَرِحَ مکانهُ**: لەشوێنی خۆی لاچوو بەجێی هێشت.

**أبرَحَ بِهِ**: زۆری ئەزیەت دا، جارِسی کـرد ٥ هەرکاتێ یەکێك زێدەرەوی بکا لـە سەرزەنشـت کـردنو سـەخاوەت دادەگـوترێ: (أبْرَحْـــتَ لومـــاً) و (أبْرَحْتَ کرماً).

**أبْـــرَحَ الشَّـــيْئَ**: ڕێـــزی لـــێ گـــرتو بەگەورەی زانی.

**بارَحَ براحاً**: پەردەی لەسەر هەڵدایەوە ٥ (بارَحَ المکـانَ مبارحـةً)، ئەوشـوێنەی جێ هێشت.

**بَـرَّحَ الله عنـه**: خـودا چـورتمو تـەنگو چەڵەمەو ناخۆشی لەسەر لابرد.

**بَـرَّحَ بـه**: بـەمانا (أبْـرَحَ)دێ، (بَـرَّحَ بـه الضَّـــرْبَ): بەتونـــدی لـــێ دا.. دەگوترێ: (ضربه ضرباً مبرحـة) (بَـرَّحَ بفـلان الأمـر) ئـەوکارە فڵانکەسـی زۆر مانـدوکردو ئەزیـەتی دا ٥ هەرلـەم بارەیە کەدەگوترێ: (بَرَّحَتْ به الحمـی) لەرزوتاکە زۆر ئـازاری فڵانکەسی دا ٥ هاڵاوی گەرمی تا لێ دا.

**تَبَرَّحَ**: لاچوو، وازی لـێ هێنا.

**البـــارِحُ**: گـــرەی گـــەرمای هـــاوین ٥ رەشەبای گەرمی هاوین.

**البارِحَـــةُ**: بـۆ مێینـــەی (البـــارح)ە ٥ نـزیکترین شـەوی رابـردو ٥ هەرلـەو بـوارەدا پەنـدێکی پێشـینان هەیـە دەڵێ: (ما أشبه الليلة بالبارحة).

**بَـرَاحِ، بـراحَ**: نـاوە بـۆ خـۆر ٥ کـە دەگـوترێ: (لابَـراحَ ولابُـراحَ) واتـە: هیچ گومانو گۆڕانکاری نیە.

**البَـرَاحُ**: پانتـایی یەکـە لـەزەوی روتـەن نـەدرەختی تێـدابێ نـە گیـاو گـژو سـەوزایی ٥ (البَراحُ من الأمـر) کـاری رونو ئاشـکرا ٥ راوو بـیرو بۆچـونی ناپەسەند.

**البَرَحُ**: تەنگانەو سزای بەئێش‌و ئازار، دەگوترێ: (لقي منه بَرَحاً بارحاً وبَرَحاً مبرحاً) لەوەوە زۆری ئازارو ناخۆشی پێ گەیی (ولقي منه بناتِ بَرَح) جورتم‌و ناخۆشی لەوەوە توش هات.

**بَرَحى**: وشەیەکە ئاڕاستە دەکرێ ئامازەی نارەزامەندی دەکا بەپێچەوانەی (مَرَحى) کە بۆ پەسەندی‌و پشتگیری دێ.

**البُرَحاءُ**: جورتم‌و تەنگانەو ئازار (بُرَحاء الحُمى) ئازاری تاو نەخۆشی.

**البُرْحَةُ**: سەرپشکی کردن لە هەموو شتێك دا.

**اَلْبَرِيحُ**: ماندوبون (التباريحُ) ناخۆشی جۆراو جۆر.

**تباريح الهوى**: ئازاری عەشق‌و ئەوین.

**بَرَدَ بَرداً وبروداً**: پلەی گەرمی دابەزی دەگوترێ: (هو بارد وبَروداً)

**بَرَدَ حقَهُ على فلان**: مافی خۆی لەسەر فلان چەسپاند ◦ هەر لەم مانایەدا یە ئیمامی عومەر دەفەرموێ: (وددت أنه بَرَدَ لنا عملُنا).

**بَرَدَ فلانٌ**: کەمتەر خەمی کرد، لێ سارد بۆوە ◦ دەگوترێ: (جدَّ في الأمر ثم بَرَدَ): لەسەرەتاوە بەجیدی دەستی دایە بەڵام پاشان لێ سارد بۆوە.

**بَرَدَ**: مرد، ساردبووە، گیانی تێدانەما، (بَرَدَ الأمر) کارەکە ئاسان بوو گیروگرفتی نەهاتە پێش.

**بَرَدَ السيف**: شمشێرەکە کول بوو، نەیبڕی.

**بَرَدَ الشَّيْءَ**: ساردی کرد، یان بەفری تێکەڵ کرد.

**بَرَد الخُبْزَ بالماء**: نانەکەی بەئاو تەڕکرد، رشاندی.

**بَرَدَ اللَّيْلُ القوم وعليهم**: خەڵکەکە سەرمای شەویان توش هات.

**بَرَدَ العينَ**: چاوی رشت ◦ (بَرَدَ بريداً) رەوانەی کرد.

**بَرُدَ برودة**: سارد بوو ◦ (بَرُدَ الأرضُ) زەوی ساردو سەرمای بەسەردا هات، وەرزەکەی سارد کرد.

**بُرِدَ القومُ**: خەڵکەکە سەرمایان بوو، سەرما لێی دان.

**أَبْرَدَ**: چووەوە کاتی فێنکی‌و سەرما ◦ کەوتە دەمەو ئێوارە ◦ لەئێوارە دا چووە ناوەوە.

**أَبْرَدَ لَهُ**: ساردی دەرخواردا (أَبْرَدَ برسالة) نامەکەی لەرێگەی بەریدەوە بۆنارد.

**أَبْرَدَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەساردی هێنا ◦ ساردی کردەوە.

**أَبْرَدَ خُبْزَهُ**: نانەکەی بەئاو تەڕکرد (أَبْرَدَ الشَّيْءَ فلاناً) ئەوشتە برستی لەفلانکەس بڕی بێ هێزی کرد ماندوی کرد.

**بَرَّدَلە**: بەمانا (أبرد)ێ ◦ (بَرَّدَ عنه) بارەکەی لێ سوك کرد ◦ لەفەرمودەی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ:

(لاتُبَـرِّدوا عـن الظـالِم) سـزای تـاوانی ستەمکار سوك مەکەن بەوە جنێوی پێ بدەن یان دوعای لێ بکەن.

بَرَّدَ الشَّيْئَ: شتەکەی سارد کرد ٥ (بَـرَّد طعامـــه وشـــرابه) خـــواردن‌و خواردنەوەکـــەی خســـتە نـــاو سەلاجەوە بۆئەوەی ساردبێ ٥ (بَرَّدَ الشَّيئَ فلاناً) بەمانا (أبْرَدَهُ)دێ.

اِبْتَرَدَ: بەئاوی سارد خۆی شت ٥ ئاوی ساردی خواردەوە بۆئەوەی ناوسکی فێنکی بێتەوە.

اِسْـتَبْرَدَ عليـه لسـانه: زمـانی لـێ بەرەڵاکرد وەکوو برمەند.

الأبردان: ئێوارەو بەیانی.

الإبْرِدةُ: سەرمایێ کە لەناوسك دا پەیدا دەبێ.

البارِدُ: ژیانی خۆشی‌و بێ‌مەینەت.

البـاردة: مێینـەی (البـارد)ە هـەروەها قازانجی بازرگانی دەستەو پەخەیـە، خێرا بیکرێ‌و بیفرۆشی‌و خێـر بکا ٥ دەگـوترێ: (غنيمـــة بـــاردة) دەستکەوتی بێ ماندوو بوون ٥ بۆیە پێغەمبەر فەرموویـەتی: (الصـوم في الشتاء الغنيمـة البـاردة) بـەرۆژووبون لـەوەرزی زسـتان دا دەسـتکەوتێکی بێ ماندوبوونە.

الحـرب البـاردة: جـەنگی سـارد، شـەڕی پڕوپاگەنـــدەو چـــاوو راو بـــەبێ بەکارهێنانی چەك‌و تەقەمەنی.

البُرادةُ: وردە ئاسن ئەو خشت‌و خاك‌و وردە ئاســنەی لــەکاتی بڕینــەوەی ئاسن دا دەکەوێتە خوار.

البِرادةُ: میهنەی ئاسن بڕینەوە.

البَـــرْدُ: پەسـیوی‌و پەتایەکـە توشـی داپۆشـەری (أغشــية)ی کۆئەنـدامی هەناسەدان دەبێ.

البُرْدُ: پۆشاکێکی خەتخەتە وەکوو جاجم ولێفـە بـەخۆدادەدرێ یـان وەکـوو عەبا لەبەردەکرێ، (ك: أبْرَاد، أبْـرُد، بُرود).

البَرَدُ: تەرزە ٥ ئاوی بەستو کەلەهـەورەوە دێتـــەخوارەوە ٥ دەنکـــە دەنکـــە لەبیچمی دەنکە نـۆك‌و نیسـك دا ٥ پێشی دەگوترێ دەنکی هەور.

البَـرِدُ: هـەوری تـەرزاوی، هـەوری خـاوەن تەرزە.

بَرَدَى: چۆمێکە سەرچاوەکەی لەگوندی (الزَّبداني) هەڵدەقوڵێ، گەورە چەمی دیمەشـــقە پێـــنج فرســـەخ لـــە دیمەشـــقەوە بـــۆلای بەعلەبـــەك دوورە.

البُرَداءُ: لەرزو تای زۆر سەرما ئاوەر.

البَرْدان: بەمانا (الأبردان)ە.

البُـــرْدَةُ: پۆشـاکێکی خەتخەتـە وەکـوو عەبا لەبەردەکرێ یان وەکوو جاجم بەخۆ دا دەدرێ، (ك: بُرْد، بُرَد).

البَرَدة: قەڵەوی.

البَرَدِيُّ: روەکێکی ئـاوی یـە لاسکەکەی

مـەترێك و زیـاتر بـەرز دەبێـتەوە، زوو پـێ دەگـاو گەشـە دەكـات... بـەزۆری لـەزەلكاوەكانی لای سـەروی چۆمی نیـل دا دەرسكێ، میصـرییە كۆنـەكان لـەو رووەكـە كـاتی خـۆی وەرەقی بەرەدایان دروست كردوە.

البُرْدِيُّ: جۆرە خورمایەكی پەسەندە.

البَـرّادُ: صیغە موبالەغەیـە ◇ كەسێكە جەرەو گۆزە دروست دەكا بۆئـەوەی مەی تێدا سارد بكات.

البَرّادةُ: مێینـەی (ألْبَـرّادَ)ە ◇ مەكینـەی ئاو سارد كردن (ثلاجة).

البَرودُ: هەرشتێك فێنـك كـەرەوە بـێ ◇ وەكوو شەراب كە دەرونـی پـێ سارد دەكەیــەوە، كـل كەچـاو فێنــك دەكاتەوە ◇ بەقوماشێكیش دەگوترێ نەنەرم بێ نەتەنك.

البریـدُ: لەبناغـەدا بـەو ولاغـە دەوتـرێ كەنامــەكانی لــێ بــاردەكرێ ◇ نامەبەرو نێردراوی دەست رۆیشتو یەك بۆلای یـەكێكی تر ◇ مەسافەی نێـوان دوو قۆناغــە رێ لەقۆناغــە رێگاكانی كـاروان كـەقۆناغ بریتییـە لەچـەند میلێك راجیایی هەیـە لـە چەندییەتەكەدا ◇ نامەو پەیام.

التَّبْرِیـدُ: لـەزانیاری سروشـت ناسی دا بریتیــــە لـــــەرێگا چـــارەیەك بۆبەدەستهێنانی جۆرە گەرمییـەك بەهۆی شلەمەنیەكەوە.

المِبْرَدُ: برمەنـد؛ ئامێرێكـە گـرن گرنـە بۆ رێكخستن و راستەو پاستەكردنی قەبارەیەك.

البَرْدَعةُ: كورتانی گوێدرێژ یـان هێسـتر كەلەپشتی دەكرێ بـۆ ئـەوەی بـاری لـی بنـدرێ یـان سـواربوونی خـۆش بێ، (ك: برادع)ە.

اَلْبَرْذَعـةُ: بـەمانا (البردعــە)یــە، (ك: براذع)ە.

بَرْذَنَ الفَرَسُ: ئەسپەكەرۆیشت بەشێوەی رۆیشتنی بارگیر.

بَرْذَن الرجلُ: ئـەو پیـاوە سـواری بـارگیر بـوو یـان بـوو بـە خـاوەنی بـارگیر ◇ زمــــانی گـــیراو نـــەیتوانی وەلام بداتەوە.

البِـرْذَوْنُ: ولاغـە بەرزەیەكـە جیـا لـە هێسـترو ئەسـپی عـەرەبی بـەكوردی پـێی دەگوترێ بارگیر، جەستەیەكی گـەورەی هەیـە قـاچ ئەسـتورو سـم گەورەیە، (ك: برازین)ە.

بَرَّ حَجُّهُ بـرّاً: حەجەكـەی وەرگیراو قبـوڵ بوو.

بَـرَّ الـیَمینُ: سوێندەكە راسـت بـوو ◇ (بَـرَّ السلعةُ) كالاكە رەواجی بوو.

بَـرَّ البَیْـعُ: مامەڵەیـەكی بـێ غـەل و غـەش بوو، درۆو خیانەتی تێدا نەكرا.

بَرَّ اللهُ حَجَّهُ: خـودا حەجەكـەی لـێ قبـوڵ كرد ◇ (بَرَّ اللهُ قَسَمَهُ) خودا نیازەكەی بۆ هێنایەدی.

بَـرَّ فـلانٌ رَبَّـهُ: فلانكـەس زۆر جـۆر خـودا

پەرستی ئەنجام دا (بَرَّ فلان والديه) فلان زۆر چاکەی لەگەڵ باوكو دایکی داکرد ٥ دەگوترێ: (هو بار)، (ك: بَرَرَة)ە ٥ (هوبَرٌّ)، (ك: أبرار)ە.

بَرَّ فلاناً: بەقسەیان بەکردەوە بەسەر فلان دا زاڵ بوو.

بَرَّ فلانٌ: فلانکەس راستاڵو بەخۆ چاراو بوو (دژی خراپەکان).

أبَـرَّ: بەوشکانی دا سەفەری کـرد ٥ دەگوترێ: (أبَـرَّ وأبْحَـرَ) زۆر سەفەر دەکـا ٥ هەمیشـە بەوشـکانیو بەدەریادا لەهاتوو چۆ دایە.

أبَرَّ الرجلُ: پیاوەکە منداڵی زۆر بون ٥ (أبَرَّ القومُ) ئەونەتەوە زۆر بون.

أبَرَّ القومَ: بەسەر خەڵکەکەدا زاڵ بوو (أبَرَّ العملَ) مەبەستی بە کردەوکانی بەدەستهێنانی رەزامەندی خودایە، کاری کرد بۆئەوەی لەخودا نزیك بێتەوە.

أبَـرَّ اللهُ: بەراسـتیو راسـتگۆیی سوێندەکەی ئەنجام دا.

أبَـرَّ اللهُ يَمينِـه: خـودا ئاواتـەکانی دوعاکانی بۆهێنایەدی ٥ پێغەمبەر (د.خ) فەرمویـەتی: (ربّ اشـعثَ أغْبَرَ ذی طمرين لا يؤبَهُ له لـو أقسم على الله لأبَـرَّهُ) زۆر ئادەمیزادی قژ ژاکاوو تەپوتۆزاوی پۆشاك دڕاوو پینەکراو کەکەس گرنگی پێنادا و لای خـودا زۆر رێـزدارە ئەگـەر داوا لەخودا بکا ئاواتی بێتەدی خودا داواکەی رەت ناکاتەوە.

بَرَّر عَمَلَهُ: پاساوی بۆکارەکەی هێنایەوە، پاکانەی بۆخۆی کرد.

إبْتَـرَّ: لەهاوەڵانی جیابووە، گۆشەگیر بوو.

تَبَـارّوا: ئەوانـە هەنـدێکیان لەگـەڵ هەندێکیان پێشبڕکێیان کرد.

الأبَرّ: (اسم تفضيل)ە گوتراوە: (اصلحُ العرب اَبَـرُّهم أصـلحهم في الفصـاحة أبعـدهم في البَـرّ): بەخۆچاراوترین عەرەب ئەوانەیانن زۆر چاکە کارو چـاك خـوازو خوداپەرسـتن رەوانبێژترینیان ئەوانەن لەقوڵایی سـارادا نیشـتە جـێنو ژیـان بەسەردەبەن.

البَرُّ: ئـەو وشکانی بـە ئاو داینەپۆشیبێ، (ك: برور)ە ٥ هەروا ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا.

البِـرُّ: خێـرو چـاکە ٥ دڵو دەرون ٥ دەگوترێ: (فلان لايعرف هرّاً من برٍّ) ٥ فلانکەس گێلو نەفامە فەرقی دۆسـتو دوژمنـی خـۆی ناکـات ٥ نازانـێ کـێ خـۆش دەوێو کێـی دەدزێ.

البُـرُّ: گـەنم (ابـن بُـرَّة) نانـە (البَرّانـی) دەرەکی.

بَـرَّةُ: نـاوە بۆچاکەو ئیسمێکی غـەیرە مونصەریفە.

البَرِّيَة: سارا، (ك: براراي)يە.

البرير: بەروبوومی داری ئەراك.

المَبرّة: شوێنی چاکە کردنو بەهاناوە چونی لێقەوماوان وەکوو پەناگەو خەستەخانە.

بَرَوَزَ برروزاً: دەرکەوتو ئاشکرابوو پاش ئەوەی چ دیار بونێکی نەبوو.

بَرَزَ لَه: بۆی تاق بووە بۆئەوەی زۆرانبازیو بەرامبەری لەگەڵ بکا.

بَرُزَ فلان: دوای گێلیو نەفامی تێگەییشتو عاقڵ بوو.

بَرَزَ: چوو بۆ دەست بەناو گەیاندن.

بَرَزَ الأرضُ: زەوییەکە بوو بەشوێنی دەست بەناو گەیاندن.

بَرَزَ الى المكان: چوو بۆ ئەوشوێنە.

بَرُزَ برازةً: عەقڵی تەواو رای پەسندی هەبوو، رەوشت جوانو داوێنپاك بوو.

بَرُزت المرأة: ئافرەتەکە پۆشاکی بالآپۆشی وەلا ناو خۆی سفور کردو تێکەڵاوی پیاوانی بێگانە بوو.

أبْرَزَ: بڕیاری سەفەرکردنی دا ٥ (أبْرَزَ الشيئَ) ئەوشتەی دەرخستو ئاشکرای کرد ٥ رونی کردەوە.

أبْرَزَ الكتابَ: کتێبەکەی بلاو کردەوە، کتێبەکەی لەچاپ داو بلاوی کردەوە.

بارَزَهُ مبارزةً: بەشمشێرو شتی وا بەرامبەری کرد.

بَرَّزَ: چوو بۆسەر ئاو (بَرَّزَ الفرسُ على الخيلِ) ئەسپەکە لەراکردن دا پێش ولاغەبەرزەکان کەوت.

بَرَّزَ الرجلُ: پیاوەکە بەسەر هاوەڵانی دا بالادەست بوو دەگوترێ: (بَرَّزَ عليهم) بەسەریان دا زاڵ بوو.

بَرَّزَ الشيئَ: بەمانا (أبْرَزَهُ)دێ ٥ (بَرَّزَ الفرسُ راكبَهُ) ئەسپەکە سوارەکەی رزگار کرد.

تبارَزا: هەریەکە لەو دوو کەسە لەگۆڕەپان دا کەوتنە بەرامبەری کردن لەگەڵ یەکتردا و هەریەکەیان هەوڵی دا دەستی خۆی لەبەرامبەری بوەشێنێ.

تَبَرَّزَ: چوو بۆسەر ئاودەست ٥ بۆشوێنی دەست بەناو گەیاندن.

الإبْرازُ: لەزانستی ئاژەڵداری دا بریتییە لەهاتنەدەرەوەی هەندێ ماددەی تایبەتی لەناو لەشی ئاژەڵ بەبێ ئەوەی کارلێکی یاسایی لەگەڵ جەستەکەدا بکا وەکوو هاتنە دەرەوەی میزو عەرەقو فرمێسك.

البَرازُ: دەشتو سارایەکی بەرافراوانی بێدارو درەختو گزوگیا ٥ هەروا ئەو ماددانەی لەریخۆڵە دێنە خوار لەکاتی چونە سەر ئاودەست دا.

البَرْزةُ: لوتکە شاخو دوندی کەژ ٥ ئافرەتی بێ چاوو رو کەلەگەڵ پیاوی بێگانەدا دانیشێو بکەوێتە گفتو گۆ.

البَريزةُ: ئەوشوێنەی کارەبای لێ وەردەگیرێ ٥ لەهێڵی سەرەکییەوە.

**المُبـــارَزَةُ**: جۆرێکـه لـەیاری وەرزش‌و جـــۆرە چــــەکێکی تێـــــدا بەکاردەهێندرێ.

**البَرْزَخ**: لەمپەرو پەردەی نێوان دووشت ٥ ئەوماوەیـەی نێـوان مـردن‌و زینـدو بوونـــەوە ٥ هەرکەســێ دەمــرێ دەچێتە ژیانی بەرزەخەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَـى يَوْمِ يُبْعَثُـونَ﴾ ٥ لـەزانیاری جوگرافی دا بـــەرزەخ بریتییـــە لەپارچـــە زەوییــــەك تەنگەبـــەری نێـــوان دووئـــاوی وا کـــە دوو زەوی لێــك جیادەکەنـەوە ٥ لـەزانیاری پزیشکی دا بـەرزەخ بریتییـە لەپارچـەیەکی گرژبوی غودەی دەرەقی.

**بَرَس** الأرض: زەوییەکـەی کێڵاو شـەندی کردەوە.

**البُرْسُ**: لۆکە.

**البُرُســـتانَةُ**: غودەیەکــە دەوری ملـــی کیسەی میزەڵدانی داوە.

**بُرْسِمَ**: نەخۆشی بیرسامی توش بوو، کە بریتییـە لـە (التهـاب) هـەوکردنی پێستی سیەکان یان پەردەی نێوان جەرگ‌و دڵ.

**البِرْسِـمُ**: گیایـەکی سـالانەیە بـەزۆری لەولاتی میصردا بەرهەم دەهێندرێ گـەڵاکانی سـێ پەلکەیـەو گوڵـەکانی سـپی‌و تۆوەکـەی زەردێکـی مەیلـەو سـوورە، دەکرێتــە ئــالفی ئــاژەڵ بەتەڕی‌و بە وشکی.

**بَرِشَ بَرَشاً وبُرْشَـةً**: رەنگـی جـۆراو جـۆرو خاڵخاڵــە هەنــدێ خــاڵی ســورو هەندێکی رەش یـان بـۆرو خـۆڵاوی‌و بــەو جــۆرە ٥ دەگــوترێ: (جلــد أبرش)و (فرسٌ أبْرَشٌ وروضٌ أبْرَشُ).

**أبْرَشٌ**: بەمانا (بَرِشَ)دێ.

**البُــرْشُ**: حەصـیرێکی بچکۆلەیە لـەپرژی دارخوما دروست دەکرێ بـۆ لەسـەر دانیشتن.

**بَرْشَقَ اللحمَ**: گۆشتەکەی کـەرت کـەرت کرد.

**إبْرَنْشَقَ**: کەیف خۆش‌و تەڕدەماخ بوو.

**بَرْشَـمَ برشَـمَةً وبِرْشـاماً**: دەمو چاوی گرژ کردو خەمباری خۆی دەرخست ٥ چاوی تێبڕی‌و زۆری سەیرکرد ٥ لەحـەدیس دا هاتووە، دەفـەرموێ: (كان الناسُ يسـألون رسولَ الله صلى الله عليه وسلم عـن الخير وكنت أسأله عن الشرّ فبرشَموا لـه) واتـە: چاویان تێ بڕی.

**بَرْشَـمَ في الشَّـيْءِ**: ئـەو شـتەی خاڵخـاڵ کـردو وای لــێ کــرد رەنگـاو رەنـگ بنوێنێ.

**بَرْشَمَ المِسْمَارَ**: بزمارەکـەی داکوتـا پـاش رۆچـونی بۆئـەوەی سـەرەکەی پـان بێتەوە.

**البُراشِمُ**: ئەوکەسەیە چاوی تیژ بێ.

**البِرْشـــامُ**: بەرگێکــە دەرمـــانی تێــوە دەپێچرێ.

**البُرْشُمُ**: سەرپۆش، لەچکە.

بَـرِصَ بَرَصـاً: بەڵەكی لەجەستەی پەیـدا بو، مارێكی بەڵەك كە خاڵخاڵی سپی تێدابن.

بَـرِصَ الأرضُ: زەوییەكـە هەنـدی شوێنی گیاوگژەكـــەی خـــوراوەو پەڵـــە پەڵەبووە.

أبْـرَصَ الله فلانـاً: خـودا فلانـی توشـی نەخۆشی بەڵەكی كرد.

بَرَصَ المطر الأرْض: زەوییەكە پێش ئـەوەی بكێڵدرێ بارانی لـی باری.

بَرَصَ الرأسَ: سەری تاشی.

تَبَــرَّصَ الأرْض: هەرچـــی گیاوگـــژی ناوزەوییەكەیـــە ئاژەڵـــەكانی خواردیو هیچی تێدانەهێشت.

الأبْرَصُ: دەعبایـەكی ئـاوی ژەهراویـیە، وەكـوو مارمێلكـە وایـە جەسـتەی بەڵەكـە بـەكوردی پـێی دەگـوترێ بوكـــە خاتونكـــە ٥ ســـەرمازەڵە ٥ قۆڕی.

البَــــرَصُ: ســـپیایەتیەكە لەپێســـت دا پەیدادەبێ لەبەر نەخۆشی یەك.

البُرْصَـةُ: دەلاقـەو كەلێنێكـە لەهـەوردا پەیدادەبێ لێوەی ئاسمان دەبینـدرێ ٥ پەڵە زەوییەكی لمبەلانە كە هیچی تێدانەڕوێ.

البَرِيصُ: بریسكەو بریقە.

البُــرَيصُ، أبـــو بـــريص: ئازنـــاوی سەرمازەڵەیە.

البُرْصُــومُ: ئەوپــەڕۆو قوماشــەیە كــە دەمی دیزەی پێ دەبەسترێ ٥ دەمـی

سەتڵەو مەنجەڵی پێ دەگیرێ.

بَرَضَ الماءُ بَرْضاً وبروضاً: ئاوەكە كەم بـوو، هاتە دەرەوە بەكەمی.

بَرَضَ النبـات: گژوگیاكە چەكەرەی كـردو ســـەری لـــەزەوی دەرهێنـــاو بەدەركەوت.

بَرَضَ له مـن مالـه بَرْضـاً: كـەمێكی لـەماڵی خۆی پێدا.

بُـرِضَ: ئەوسـامانەی لای بـوو تـەواوبوو لەبەر ئەوەی زۆری لـێ بەخشی.

أبْرَضَـتِ الأرض: زەوییەكـە گژوگیاكانی بـــەزۆری ســـەریان دەرهێنـــاو لەخۆكەوتن.

بَرَّضَتِ الأرضُ: بەمانا (أبْرَضَ)یە.

بَرَّض الرجلُ: پیاوەكـە هـەموو سامانی خـۆی لەبەخشـین دا خـەرج كـردو هیچی نەهێشتەوە.

إبْتَرَضَ الماءُ: ئاوەكە كـەم بـوو، بەكـەمی هاتەدەرەوە.

ابْتَــرَضَ فـلان في عيشـه: فلانكـەس بۆدەســـتەبەر كردنـــی بـــژێوو پێداویسـتی ژیـانی هـەموو ئـەم لاو ئەولایەك دەكاو هەمیشە خەریكە.

تَبَرَّضتِ الأرضُ: بەمانا (أبْرَضت)ە.

تَبَــرَّضَ فــلانٌ: فلانكــەس كــەمێكی پێداویستی ژیان بۆدابین بوو.

تَبَرَّضَ صـاحبه اومالـهُ: وردەوردە مـاڵو سامانەكەی لـی كێشایەوە ٥ كەم كەم لـێی ستاندەوە.

تَبَرَّضَ الماءَ: كەم كەم ئاوەكەی هـەڵێنجا

٥ هەر کەتۆزێك لەبنکی بیرەکەدا ئاوەکە کۆبووەوە ئەو هەڵی هێنجا.

تَبَرَّضَ الشرابَ: شەرابەکەی هەڵقوڕاند، خواردیەوە.

تَبَرَّضَتِ الماشيةُ النباتَ: ئاژەڵەکە گژوگیاکەی بەناسکی خوارد، پێش ئەوەی بەرزببێتەوەو لەخۆبکەوێ خواردی.

البارِضُ: گژوگیایەکە تازە دەرپسکێ‌و سەر دەردەهێنێ‌و هێشتا جۆرەکانی بەباشی لێك جیاناکرێنەوە.

البُراضُ: شتی کەم ٥ (البُراضَةُ) بەمانا (البُرَاضَ)دێ.

البَرْضُ: بەمانا (البُراضُ)دێ.

البَرْضُ من الآبار: ئەو بیرانەی ئاویان کەمە، (ك: بُرُضُ، براض، أبراض)ە.

البُرْضة: ئەوشتە کەمەیە کەوردە وردە بەهەوڵدان دەست دەکەوێ ٥ بەزەوییەکیش دەگوترێ گیای لێ نەڕوێ.

بَرْطَلَ: لەبەرامبەر حەوزەکەی بەردێکی گەورەی چوار گۆشەی دانا.

بَرْطَلَ رأسُهُ: سەری درێژ بوو دەڵێی بیرطیلە.

بَرْطَلَ فلاناً: مێزەری لەسەر کرد، فێس‌و عەمامەی خستەسەری یان بەرتیلی پێدا.

تَبَرْطَلَ: فێسی لەسەر کرد، بەرتیلی وەرگرت.

البُرْطُلُ: شتێکە سەری پێ دادەپۆشرێ وەکوو مێزەرو جامانەو فێسو گوترەو عەگاڵ.

البُرْطُلَةُ: چادری هاوینە.

البِرطيلُ: ئاسنێکی درێژە یان بەردێکی درێژی رەقە بەرداشی ئاشی پێ بیراز دەگرێ، یان بەردێکی چوار گۆشەی گەورەیە بەئەندازەی نیومەترێك، خانووی پێ دروست دەکرێ، یان بەمانا بەرتیلە، (ك: براطيل)ە.

بَرْطَمَ الليلُ: شەو داهات‌و جیهان زۆر تاریك بوو ٥ (بَرْطَمَ فلان) فلانکەس رقی هەڵسا ٥ سووربووەو هەڵچوو ٥ لەخەم‌و خەفەتباری لیچی دا ژەنین.

بَرْطَمَ فلاناً: فلانکەس تورەی کردو رقی هەڵساند.

تَبَرْطَمَ: لەقسەکە توڕەبوو.

البُراطِمُ من الرجال: پیاوی لچ‌و لێو ئەستور.

البَرْطَمُ: ئەوکەسەیە لاڵ بێ، زمانی بگیرێ، قسەی بۆنەکرێ.

البَرْطمانُ: قاپێکی گەورەیە لەشوشە یان لە سواڵەت مورەباو شتی لەوجۆرەی تێدا هەڵدەگیرێ.

البُرطُومُ: دینگە، پاڵو، دارێکی گەورەی ئەستور وپتەوە دەکرێتە دینگەو سەقفی خانووی دەخرێتە سەر، (ك: براطيم)ە.

**بَرَعَ بُروعاً**: بەسەر هاوەڵەکانی دا باڵادەست بوو، لەکارەکەی دا پێش ئەوان کەوت.

**بَرَعَ الجَبَلَ**: چووە سەر لوتکەی کەژەکە (بَرَعَ صاحبَهُ) بەسەر هاوەڵەکەی دا باڵا دەست بوو.

**بَرُعَ براعةً**: بەسەر هاوەڵەکانی دا باڵا دەست بوو پێشیان کەوت.

**تَبَرَّعَ بالعطاء**: بێئەوەی داوای لێ بکرێ ماڵی بەخشی، بەخشینو پیاوەتیەک کەلەسەری پێویست نەبوو خۆبەخشانە ئەنجامی داو داوای قەرەبوو کردنەوەشی نەکرد ٥ بەتەما هیچ نەبوو لەبەرامبەر پیاوەتیەکەی دا.

**البارع** (سعد البارع): ئەستێرەیەکە.

**البَرَاعةُ**: پیاوەتیو مەردایەتیو رەوشت جوانی تەواو زمانڕەوانیو قسە شیرینی وەها کە لەهاوەڵەکانی جیا بکرێتەوە.

**بَرْعَمَ الشجرُ**: درەختەکە چرۆی کرد ٥ (تَبَرْعَمَ الشجر) بەمانا (بَرْعَمَ)یە.

**البُرْعُمُ**: میوەی درەخت لەناو توێکلەکەی دا ٥ گوڵی درەخت (خونچە) پێش ئەوەی بپشکوێ ٥ لەزانستی رووەکناسی دا بریتییە لە پرۆژێك کەلە چەند پەلکە گەڵایەکی کەم هێزو سیس دا پەیدا دەبن ٥ یان بریتییە لەچەند پەڕەگوڵێکی کەوتبنە سەر یەك.

**البُرْعُمة والبرعُوم والبرعُومَة**: هەموویان بەمانا (البرعُمُ)ن.

**البُرعُومَة**: بەمانا تۆپەڵاکی کێو هاتووە.

**بَرَغَ بَرْغاً**: نازپەروەر بوو ژیانی خۆش بوو.

**البَرْغ**: تف، لیك.

**البَرْغَشَةُ**: رەنگێکە لەنێوان خاکیو رەش دا کەمێك سپی تێدایە.

**البُرْغُوثُ**: مێشوولە، جۆرە مێشێکی بچوکی گەزندەی گورجو گۆڵە.

**اِبْرَغَشَّ**: لەنەخۆشینەکەی چاك بووەو هەڵسا رۆیی.

**البَرْغَشُ**: مێشوولەی گەزندە.

**بَرْغَلَ**: لەزەوی نزیك ئاو دانیشتەجێ بوو.

**البُرْغُلُ**: ساوار، گەنمی هاڕاو، گەنمی کرەکراو.

**البِرْغِيلُ**: زەوی نزیك ئاو، زەوی دەم چەم ٥ شارۆچکەی نێوان ساراو گوندو هۆبە، (ك: براغيل).

**بَرَقَ البَرْقُ بَرْقاً**: چەخماخەو بریسکە دیاری دا.

**بَرَقَ السحابَةُ أو السماءُ**: هەورە بریسکەی لێ دا.

**بَرَقَ الشَّيْءُ**: درەوشایەوە، دەگوترێ: (بَرَقَ الصبحُ) بەیانی گزنگی دا (بَرَقَ أساريرُ وجههِ) دەمو چاوی گەشایەوە ٥ (بَرَقَ السيفُ) شمشێرەکە

بریسکەی دا ◦ (بَرَقَ فلان) فلانکەس هەڕەشەی کرد ◦ (بَرَقَ البَصَرُ) چاوی تاساو لەترسان نەیتروکاندن ◦ (بَرَقَتِ المراة) ئافرەتەکە خۆی جوان کردو خۆی ئارایش دا (بَرَقَت بوَجهِها) روخساری خۆی بەئەنقەست دەرخست ◦ (بَرَقَ الطعامَ بزيت أو سمن) کەمێك زەیت‌و رۆنی کردە ناو خۆراکەکەوە.

بَرِقَ بَرَقاً: ترساو واقی وڕماو لە ترسان هیچی نەبینی.

بَرِقَ البَصَرُ: بەمانا (بَرَقَ)یە.

بَرِقَ الشَّيْءَ: دوو رەنگی تێدا کۆبونەوە رەش‌و سپی ◦ دەگوترێ: (هو أبرق وهي برقاء)، (ك: بُرَق).

أبْرَقَت السماءُ: بەمانا (بَرَقَ)یە.

أبْرَقَ: تیشکی بەرق لێیدا ◦ بەرقیەی بۆنارد ◦ هەڕەشەی کرد (أبْرَقَ السحابُ) هەورەکە بارانی باراند بەسەر وڵات دا.

أبْرَقَ فلانٌ البرقَ: فلانکەس بەرقی بینی (أبْرَقَ بالسيف) شمشێرەکەی هەڵسوڕاند بۆئەوەی بریسکەی ببیندرێ.

أبْرَقَ بالشيئ: بریسکەو ورشەی لەوشتەدا دەرخست.

أبْرَقَتِ المراة بوَجهها وبِعينها: ئافرەتەکە بەروخسارو چاوی جوانی‌و بریسکەی لێ دەرکەوت.

بَرَّقَ بصره وبِبَصَرِهِ: چاوی تیژبڕی‌و زۆری سەیرکرد.

بَرَّقَ فلانٌ: فلانکەس هەڕەشەی کردو وادەی شەڕی بەبەرامبەرەکەیدا لەپەندی پێشیناندا هاتووە دەڵێ: (بَرَّق لمن لايعرفُك) هەڕەشە لەوانە بکە کەناتناسن.

بَرَّقَ: سەفەری دورو درێژی ئەنجام دا (بَرَّقَ في المعاصي) چووە زەلکاوی تاوانەوەو نوغرۆبوو ◦ (بَرَّقَت المرأة برجهها) بەمانا (بَرَقَت)ە (بَرَّق منزلَهُ) مەنزڵ‌و شوێن‌و جێگای خۆی جوان کرد.

الأبْرَق: شوێنێکی بەرداوی‌و رەقەن‌و بێ گژوگیا ◦ خاکەکەی پێك هاتووە لەخرکەبەردو لم‌و گڵ، (ك: أباريق).

الإبْرِيقُ: شمشێری بریسکەو ورشە دار، ئافرەتی جوان‌و روخسار تەڕو تازە کەجوانی خۆی بە ئەنقەست بۆ پیاوی بێگانە دەربخا ◦ مەسینەو لوولێنە.

البارِقَةُ: مێینەی (الابارق)ە ◦ هەروەها بریسکەی چەك‌و شمشێرە ◦ لەحەدیثی پێغەمبەردا هاتووە دەڵێ: (كفى ببارقة السيف على رأسه فتنة).

البَرْقُ: روناکییەکە لەئاسمان دیاری دەدا بەهۆی تەقینەوەی کارەبایی لە هەوردا ◦ ئامێرێکە نامە

دەگوێزێتەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تری دوور بەهۆی چەند نیشاراتو جمو جوولێکی تایبەتی یەوە، (ك: بُرُوق)ە.

البَرَقُ: کاور، بێچوی مەڕ، (ك: أبراق، بُرْقان)ە.

البَرَقَاءُ: زەوییەکی توندو پتەوە کەپێك هاتبێ لەبەردو لمو گڵی جیاجیا، (ك: براقي).

البُرْقَةُ: بەمانا (الأبراق)ە هەروەها بەمنا کەمێك لە چەوری (ك: بُرَق، براق).

البَرْقِيَة: نامەیەکە لەشوێنێکەوە دەنێردرێ بۆشوێنێکی تر بەهۆی نامێری تەلغورافەوە.

البَيْرَقُ: ئاڵاو عەلەم، (ك: بيارِق).

البيرقدار: هەڵگری ئاڵا.

بَرْقَشَ الشَّيْءَ: ئەوشتەی بەجۆرەها رەنگ نەخشاند ٥ جوانی کرد، رازندیەوە.

بَرْقَشَ الكلام وفيه: قسەکانی تێکەلاو کرد.

تَبَرْقَشَ: بەجۆرە هارەنگ رازاندرایەوە ٥ (تَبَرْقش النبتُ) گژوگیاکە بەجۆرەها شێوە خۆی ئارایش دا.

إبْرَنْقَشَتِ الأرض: زەوی سەوز بوو سەوز هەڵگەڕا.

بَرقِش (أبو بَراقش): باڵندەیەکە بەجۆرە هارەنگ رەنگی دەگۆڕی کەسێك زۆر ئەمبەرو ئەوبەربکاو هەر رۆژە راو بۆچونێکی هەبێ پێی دەگوترێ: (أبو براقش) هەروا بۆسەگیش بەکاردەهێندرێ.

البِرْقِشُ: باڵندەیەکی بچوکە وەکوو چۆلەکەوایە پەڕەکانی سەرەوەیان خاکیو ناوەراستیان سوورو خوارەوەیان رەشە.

بَرْقَطَ فلان: فلانکەس لەسەر قاچی دانیشتو ئەژنۆی بلاو کردنەوە.

بَرْقَطَ الشَّيْءَ: شتەکەی بلاو کردەوە.

بَرْقَطَ الكلامَ: قسەکانی بەبێ سەروبەر گوتن.

تبَرْقَطَ: بەسەر پشتە ملی دا کەوت.

تَبَرْقَطَ الماشيةُ: ئاژەڵەکان لەکاتی لەوەڕان لەپاوان دا هەریەکەیان روی لەشوێنێکە.

بَرْقعت وَجْهَها: بەقیناع دەمو چاوی خۆی داپۆشی.

بَرْقَعَ الرجُلَ بالعصا: بەگۆچان لەنێوان دوگوێی پیاوەکەی دا.

البُرْقُعُ: قیناعی ئافرەت یان هی ئاژەڵ ٥ پارچە قوماشێکە یان چەرمێکە خوارەوەی ریشاڵ ریشاڵ کراوەئافرەت لەهەندێ وڵاتی دواکەوتوو دەمو چاوی خۆی پێ دادەپۆشێ ٥ هەروا لەناوچاوانی ولاغیش قایم دەکرێ بۆئەوەی بە راوەشاندنی مێشو مەگەز لەدەمو چاوی خۆی دووربخاتەوە ٥ هەروەها

نيشـــانەيەكە لـــەسمتى ئـــاژەڵ دا دەكرێ.

البرقوع: بەمانا (البرقُعَ)ە، (ك: براقيعَ).

المُبَرْقـعُ: ئەسـپێكە هـەموو دەمو چاوى سپى بێ ٥ جۆرێكيشە لە مۆسيقا.

المُبَرْقَعَــةُ: مێينــەى (المُبرقَــع) هــەروا مەڕێكە سەرى سپى بێ.

البَرْقُـــوقُ: درەختێكـــە لـــەپێرى گوڵدارەكانە، لەوناو چانە دەڕوێ كە ئـــاوو هـــەواى مامناوەنـــدى بـــێ ٥ گوڵەكەى سپى يە، ميوەكەى رەنگى جۆراو جۆرە، (كۆخ، قۆخ).

بَرْقَلَ: درۆى كـرد، قسـەى كـردو كـردەوەى لەگەڵ نەبوو.

البِرقيلُ: ئەوكەوانەيـە كـە گوللـەى پـێ دەهاوێژرێ.

بَرَكَ البَعيرُ بروكاً وتَبْراكاً: وشترەكە بەسەر سينگى دا كەوت ٥ لەشوێنێك ييخى خـواردو نـەجولا ٥ (بَـرَكَ فـلان) فلانكـەس جـێگير بـوو مايـەوە، تێكۆشاو هـەوڵى دا، (بَرَكَ على الأمر) لەسەر ئەوكارە بەردەوام بوو.

بَرَكَ السماءُ: ئاسمان بارانەكەى بـەردەوام بوو.

بَرَكَ للقتـال: چوكى دا دا بۆشـەڕ، لەسـەر ئەژنۆ هەڵتروشكا بۆ شەڕ.

بَرَكَتِ المرأة: ئافرەتەكـە كوڕى گـەورەى هەيـەو شـوى كـردەوە.ا دەگـوترێ: (هي بروك).

أَبْرَكَ في عَدْوِهِ: لەرۆيشـتن دا بـەگورجى هەنگاوى هەڵێنا.

أَبْرَكَ البَعيرَ: حوشترەكەى ييخ دا.

بارك على الشَّيْئِ: بەردەوام بوو لەسـەر ئەوكارە.

بَـارَكَ اللهُ الشَّـيْئَ وفيـه وعليـه: خـودا خێرو بەرەكەتى خستە ئەو شتەوە.

بَرَّكَ البَعيرُ: بەمانا (بَرَكَ)يە.

بَرَّكَ السحابُ: بـارانى هەورەكە هێنـدە زۆرو تونـد بـوو هـەموو روى زەوى پەستاوت.

بَرَّكَ فيه وعليه: دوعـاى خێـرو بەرەكـەتى بۆكرد ٥ لەحەديثى (أم سـليم)دا هاتووە دەفەرموێ: (فحنكه وبرَّك عليه).

اِبْتَرَكَ البَعيرُ: بەمانا (برك)يە.

اِبْتَرَكَ القوم في القتال وله: لەسەر چوك دانيشـتن بـۆ شـەڕ لەشـەڕدا لەسـەر ئەژنۆ دانيشتن.

اِبْتَـــــرَكَ الدّابـــــةُ: ولاغەكـــــە لەرۆيشـتنوراكردن دا خـۆى بەسـەر لايەك دا دا، بەلاسەنگى غارى دا.

اِبْتَرَكَ الصَّيقَلُ: شمشێرەكە بەلايـەكى دا خواربوو.

اِبْتَرَكَ في العَدْوِ: بەمانا (أَبْرَكَ)يە.

ابْتَرَكَ السماءُ: ئاسمان بەرەكـەتى رشـت ٥ رژاند.

إِبْتَـرَ مُصـارِعَهُ: زۆرانبـازى بەرامبـەرى خستە سەر زەوىو خۆى بەسەردادا، خستيە ژێر سنگيەوە.

برغي
إبريق
بارجة
بردعة
بئر ارتوازيّة
بارودة
بابوج
بؤبؤ
بالطو
برّاد
بانطلون
مبرد
بالون
برطاش
باخرة
برزخ
برسكوب
بابور
مرسلة البرقيات
بادرة
مبخرة
بورة
بربريس
باوباب
بان
بتولا
بابونج
بَرْديّ
برواق
باميا
باذنجان
برعم
برتقال
بخّور مريم
بيدر
بزّ
بجعة
برقش
برغشة
برغوث
برغوث البحر
ببر
سامّ أبرص
باشق
ببغاء
باز

ابتَرَكَ الرَّجُلَ في عرضه وعليه: پیاوەكەی سەرزەنشت كردو زێدەرۆیی كرد لەزەمكردنیو شكاندنی دا.

تبارَكَ: بەرز بووە پیرۆز بوو، (تبارك الله) خودا پاكو خاوێنو بەرزو پیرۆزە لەوەی كەمو كوڕی هەبێ.

تبارَكَ بە: خێرو بەرەكەتی لێ چاوەڕوان كرد بەپیرۆزی زانی.

بَراكِ: (اسم فعل أمر) بەمانا جێگیر بە بوەستە بسەكنە.

البراكاء: گۆڕەپانی شەڕ، خۆڕاگریو ورەبەرزی لەشەڕدا.

اَلْبَرْكُ: سینگ، ئەوشوێنەیە حوشتر لەكاتی پالكەوتن دا دەیخاتە سەرزەوی ◦ كۆمەڵە حوشتری زۆر.

البُرْكُ من الرجالِ: پیاوی بەردەوامو كۆڵنەدەر لەسەر شت ◦ ترسنۆك ◦ مۆتەكەو كابوس ◦ دێوەزمە.

البَرَكَةُ: خێرو فەڕو گەشەو نەشو نما ◦ خۆشبەختیو بەختەوەری.

حَبَّةُ البَرَكة: گیایەكی ساڵانەی دەنك ڕەشە، لەولاتی میصرو ولاتانی حەوزی دەریای ناوەراستو ولاتی هیند دەڕوێ پەلكە گەلاكانی وردو گوڵەكانی شینو بەروبومەكەی لەتوێكڵ دایە دەنكو تۆوەكەی بچوكو بەكوردی پێی دەگوترێ ڕەشكە، بۆچارەسەری نەخۆشی بەكاردەهێندرێ، زۆرجار تێكەڵ بەهەویر دەكرێ بۆتام خۆشكردنی نانو كولێرەو بۆن خۆشكردنی، دەشكوشرێو ڕۆنی ڕەشكەی لێ دەردەهێندرێ بەعەرەبی پێی دەگوترێ: (الحبة المباركة، الشونيز، حبة الشونيز، الحبة السوداء).

البِرْكَةُ: زەلكاو، ئەستیر، ئەستێڵ.

البُرْكة: باڵندەیەكی ئاوی بە شێوە مراوی یە.

بُرَك: كرێی ئاشەوانو فڕنچی.

البُرُوكُ: حەڵوا ◦ دۆشاوو ئارد تێكەڵاو دەكرێو دەخورێ.

البَرِيك: پیرۆزو بەفەر ◦ خورمای تەڕو تازە لەگەڵ ڕۆنەكەرەدا تێكەڵ دەكرێو دەخورێ.

اَلْبَرِيكةُ: حەڵوا.

المَبْرَك: شوێنی پیخ دانی حوشتر.

البَرْكارُ: پەرگاڵ ◦ سەیری وشەی (برجل) بكە.

البُرْكانُ: بریتیە لەشەقبونی توێكڵی زەویو دەرپەڕینی ماددە تواوە غازو بوخارەكان لێیەوە ◦ هەروا بەوكێوەش دەگوترێ كەلەو ماددانە پێك دێ.

بَرْكَعَ: بەسەر ئەژنۆدا كەوت ◦ بەگاگۆڵكی ڕۆیشت.

بَرْكَعَ الشَيْءَ: شتەكەی بڕیەوەو پارچە پارچەی كرد.

تَبَرْكَعَ الشَيْءُ: شتەكەی بڕایەوەو پارچە پارچە بوو.

اَلْبِرْكَعُ: كورتە باڵا (حوشتری كورتە

بالا، ئادەمیزادی کورتەبالا).

اَلْبَرْلَنْتُ: بەرزترین‌و بەنرخترین جۆری ئەڵماس لەورشەداری‌و سفت‌و لووسی دا.

بَرَمَ الحَبْلَ: لەهەردو سەرەوە حەبلەکەی گرێدا.

بَرَمَ الشَّيْءَ: شتەکەی قایم‌و پتەوی کرد دەگوترێ: (برم الأمر والْعَقْدَ).

بَرِمَ بالشيءِ بَرَماً: بەوشتە جاڕزبوو، پێی نارەحەت بوو.

بَرِمَ بِمَنْطِقِهِ: زمانی گیراو قسەی پی نەکرا ٥ دەگوترێ: (بَرِمَ بالحجة والجواب).

أبْرَم: برمەی دروست کرد ٥ (أبْرَمَ الكَرْمُ) میوەی میوەکە بەئەندازەی برمەکەبوو.

اَبْرَمَ الحَبْلَ والشيءَ: حەبلەکەو شتەکەی پتەوو قایم کرد.

أبْـرَمَ الـثـوبَ: ریسەکەی دوقات بادا، بەکرەکەی گشت بادا.

أبْـرَمَ الحكـمَ: بریارەکەی پشت راستکردەوە ٥ (أبْرَمَ الأمر) کارەکەی بنج پتەو کردو بنەوانی شێلا.

تَبَرَّمَ بالشَيءِ: بەمانا (بَرِمَ)یە.

اَلْبَرّامـةُ: ئامێرێکی لەولەبی یە بۆ کونکردنی شت‌و بۆدەرهێنانی سەدادەو شتی وا بەکاردێ بەکوردی (برێنەی پی دەڵێن).

اَلْبَرِّيمَةُ: بەمانا (اَلْبَرّامَة)دێ.

البَرَمُ: بەوکەسە دەڵێن: کەلەگەڵ خەڵك‌و هاوەڵانی دا ناچێتە قومارخانەو مەیخانەوە لەبەر رژدی ٥ کلی تواوە ٥ بۆڵە بەرسیلە لەسەرەتای دەرکەوتنی دا.

البُرْمة: دیزەی بەردین، (ك: بُرَمْ، بُرَمْ، برام).

اَلْبَـرِيمُ: هەرشتێك لەدەزووشتی تر دروست بکرێ کەدوو رەنگی تێکەڵاوی تێدابن ٥ هەروا بەحەبلێك دەگوترێ دورەنگی تێدابن، بەجەوهەر رازێندرابێتەوە، ئافرەتان لەقۆڵی دەکەن یان لە پشتێنی دەبەستن ٥ هەروا بەنوشتەیەك دەگوترێ بەمناڵ دا دەکرێ بۆ چاوەزار ٥ هەروا بەحەبلێك دەگوترێ: دوو حەبل تێك باهەڵدرابن وپاشان لەگەڵ حەبلێکی تر واتە هەرسێك حەبلەکە بەیەکەوە بادرابن ٥ کۆمەڵێك لەخەڵك ٥ سوپای پێکهاتولەچەند نەتەوەو چین توێژێك ٥ کۆمەڵێك ئاژەڵ تێکەلاو لەمەڕو بزن ٥ فرمێسکی تێکەڵاو بەکل ٥ روناکی خۆر لەبەیانی دا ٥ تاوانبار.

البَيْرَمُ: پارچە ئاسنێکە دارتاش دەمی برینی مشارەکەی پێ فراوان دەکا.

المِبْرَمُ: تەشی، (ك: مبارم).

المُبْرِمُ: قورس ٥ کەسێك قسەی پروپوچ بکا.

**البَرْمـائي**: گیانلبـەر یـان روەك كەلـەناو وشكانی‌و ئاودا بژیا.

**البرمیـل**: زەرفێكـە لـەدار دروسـت دەكریَ ترشـیات‌و مـەی‌و سـركەی تێـدا هەڵدەگیریَ، ئێستا لـەنایلۆن‌و شـتی تر دروست دەكریَ.

**بَرْمَهَـــاتُ**: مــانگی حەوتــەمی مــانگی قیبطیە، لەو مانگـەدا وەرزی بـەهار دەست پیَ‌دەكا.

**بَرْمودة**: مانگی هەشتەمی مانگی قیبطیـە دەكەوێتـــە ناوەڕاســـتی وەرزی بەهارەوە.

**البَرْنِــــيُّ**: جــۆرێكی باشــی خورمایــە، دەنكـەكانی خـڕو سـوورەو مەیلـەو زەردە، دەگـوتریَ: (نَخلٌ بَرْنـيٌّ ونخلـة برنية).

**اَلْبَرْنِيَّـةُ**: زەرفێكـی دەم پانـە (سـوێنە یەكـە) لەسـواڵەت یـان لـە شوشـەی ئەســـتور دروســـت دەكــری ٥ كەڵەشـێرێكی بچوكی گـەنج‌و تـازە پێگەیشتووە.

**البَرْنامجُ**: دەفتـەری حیسـاب، یـان تۆمـاری ئەوكاڵایەی لەوڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تـر دەنێـردریَ (مەنـمەنێس) ٥ یـان ئـەو دەفتــەرەی حــەدیس گێـڕەوە، ناوی راوی‌و رشتەی كتێبەكانی تێدا تۆمـار كـردوە ٥ پلانێكـی نەخشـە كێشـراوە بـۆ نیشـی رۆژانــە یــان سـەعاتی، وەكـوو بەرنامـەی رادیـۆو تەلـــەفزیۆن‌و وانـــە گوتنـــەوە ٥ بـەكوردی پـیَ دەگـوتریَ بەرنامـە، (ك: برامج)ە.

**البُرْنُزُ**: تێكەڵەیەكە لـەمس‌و قەصدیر، جاری وادەبیَ ماددەی تریشی تێكەڵ دەكــریَ، وەكــوو مــادەی زەنــك‌و فسفۆر.

**تَبَـرْنَسَ**: كـراس یـان رۆبـی خـاولی سـەر بەكڵاوی لەبەركرد.

**البُرْنُسُ**: هەرلیباسێك سەر كلاوی پێـوە لكێنـدرابیَ ٥ فـێس‌و كـڵاوی قـوچ ٥ پۆشــاكێكە دووقــۆڵی هەیــە دوای خۆشـــتن‌و حــەمام كــردن لەبــەر دەكریَ، (ك: برانس).

**البَرْنـوفُ**: روەكێكـە لـەپێری (الفصـيلة المركبــة) تەمــەنی درێــژە لەكــەنار چـۆم‌و روبارەكـانی میصـر دەڕویَ، بـۆنێكی كەسـكونی قورسـی هەیـە دەعباو حەشەراتی پیَ راودەنریَ.

**البُرْنيطـــــة**: پۆشـــاكی ســـەر لای فەرنگییەكان، (ك: بَرانيطَ).

**بَرْنَقَ الشَّيْءَ**: شـتەكەی بـەرەنگی بەرنـەقی بۆیەی كرد.

**اَلْبَرْنيقــی**: رەنگێكــە لـەتۆوی كـەتان دروست دەكریَ رەسم‌و شتی وای پی چەور دەكریَ ٥ ئەم ماددەیە نسبەت دەدریَ بۆ وڵاتی برنیقا لەئیسپانیا.

**بَـرِهَ الرَّجُـلَ بَرَهـاً**: پیاوەكـە جەسـتەی پڕكـردوە دوای ئـەوەی كـەلاواز بـوو بەنەخۆشی، لاشەی وەكوو خۆی لـیَ هاتەوە.

اِبْرَهَ: بەڵگەی سەرسوڕهێنەری خستە بەرچاو و بەسەر جەماوەردا باڵادەست بوو.

اَلْبُرْهَةُ: ماوەیەکە لەزەمان (البَرْهَة) بەمانا (البُرْهة)دێ.

بَرْهَمَ: چاوی تێ بڕی بەبێ ئەوەی چاوی بتروکێنێ ٥ دەشتگوترێ (بَرْهَمَ الیه).

اَلْبَراهِمَةُ: پێڕو تایەفەیەکی هێندین پێیان وایە دروست نییە بۆ خودا پێغەمبەر بنێرێ بۆسەر ئادەمیزاد ٥ خواردنی گۆشتیشیان بەلاوە حەرامە ٥ بەتاکەکانی ئەم تایەفە دەگوترێ: (برهمی).

اَلْبَرْهَمَةُ والبُرْهمةَ: چرۆی درەخت.

بَرْهَنَ: بەڵگەی هێنایەوە لەسەرداواکەی ٥ دەشگوترێ (برهن علیه).

اَلْبُرْهانُ: بەڵگەی یەکالاکەرەوە ٥ لەزانستی مەنطیق دا بریتیە لە قاعیدەو قیاسێك کەلەچەند پێشەکی (مقدمات) پێك دێ ٥ بەلای ڕیاضییەکانەوە بورهان ئەومیە (قەضییە یەك) بچەسپێنێ کەپێك هاتووە لەچەند پێشەکی یەکی سەلمێندراو.

بَرا البُرَةَ بَرْواً: لوتەوانەکەی دروست کرد.

بَرا الجملَ وغَیرَهُ: لوتەوانەی لەلوتی حوشترەکە کرد.

بَرا القَلَمَ أو السَّهْمَ: قەڵەمەکە یان سەرەتیرەکەی تاشی.

برا اللهُ الشَّيءَ: خودا ئەوشتەی بەدی هێنا، دروستی کرد.

أبری الجَمَلَ وغیرە: لوتەوانەی لەلوتی حوشترەکە کرد.

اَلْبُرَةُ: ئەڵقەیەکی بچوکە لەزەرد یان لەشتێکی تر دروست دەکرێ لەلایەکی لوتی حوشتر دەکرێ بۆ ئەوەی ژێرباربێ، یان ئافرەت لەلوتی خۆی دەکا بۆ جوانی وەکوو چۆن گوارە لەگوێ دەکا ٥ هەروا (البُرَة) ناوە بۆ هەموو ئەڵقەیەکی وەکوو بازنەو خرخاڵو گوارەو ئەوجۆرە شتانە.

اَلْبَرْوَةُ: لۆغەتێکە لە (البُرَة) هەروا ناوە بۆدادراوی قەڵەم و دارو صابونو ئەو جۆرە شتانە ٥ بەو بلیسکە صابونەش دەگوترێ: کەدوای بەکارهێنان دەمێنێتەوە.

اَلْبَرِیَّةُ: بونەوەر، خەڵك.

البروتیستنتیة: ڕێبازێکی مەسیحی یە لەئاکامی جەمو جۆڵو هەوڵدان بۆ چاکسازی لەئایینی مەسیحی دا سەری هەڵدا ئەم ڕاپەڕینو جەمو جۆڵە بەرابەرایەتی (لوثر) ئەنجام درا بانگەوازیی ئەوەی دەکرد کەتاك لەدەسەلاتی کەنیسە ڕزگاری بیو بەرامبەر بەخودا بەرپرسیار بێ هەرکەسەو خودای خۆی ٥ لەبەرامبەر ئەمەدا ڕێبازو بیرو بۆچونی (کاثۆلیك) یش هەبوو کە (ئەرثوذکسیە) شی پێدەگوترێ.

بروتستو: بەڵگەنامەیەکی رەسمی یە لەسەر داوای خاوەن مەبەست دەنوسرێ بۆ سەلماندنو چەسپاندنی ئەوەی کابرای بەرامبەر پابەندی کۆمپیالەی نێوانیان نیەو وەفا بەوەعدو بەڵێنی خۆی ناکا ٥ بروتون بەشێکە لە پێکهاتەی ئەو قەبارە هەرە بچکۆلەیەی پێی دەگوترێ زەرە.

بَرْوَزَ الصورة ونحوها: چوار چێوەی بۆ رەسمەکە دانا ٥ چوارچێوەی بۆئەو شتە دروست کرد.

البُرُوفَةُ: پراوە پێکردنی شتێك پێش ئەوەی بۆجەماوەر نمایش بکرێ بۆدڵنیایی بوون لەگونجاوی.

البَرْوَقُ: ئەو سەوزایی یە کە لەسەرەتادا زەوی دادەپۆشێ ٥ بەهەموو ئەو روەکانەش دەگوترێ کەباڵا ناکاو بەسەر زەوی دا پەل دەهاوێو پان دەبێتەوە.

بَرَيَ العودَ أو الحَجَرَ ونحوهما: دارەکە یان بەردەکەی تاشی، دەگوترێ: (هوبارٍ) ئەوە سەنگتراشە، دارتاشە ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (أعط القوس باريها) کارەکە بخەرە ئەستۆی خاوەن کار.

بَرَى القَلَمَ: لایەکی قەڵەمەکەی دادا بۆ پێنووسین.

بَرَى السفرُ والجوعُ الانسانَ والجَمَلَ: سەفەرو برسایەتی ئادەمیزادو حوشتری لاواز کرد.

انْبَرَى الشَّئُ: ئەوشتە توشی لاوازی بوو.

باراه في الأمر: بەربەرەکانی کرد چاوی لەئەوکرد چی کرد ئەویش هەمان شتی رەچاو کرد.

بَارَى إمرأته: لەگەڵ ژنەکەی رێك کەوتن کەلێك جیاببنەوە.

اِنْبَرَى العودَ والحجر: بەمانا (بَرَاه)دێ.

تبارى الرجلان: دووپیاوەکە پێشبڕکێی یەکتریان کرد، هەریەکە یان هەڵسو کەوتی وەکوو ئەوی تری کرد.

تَبَرَّى لـه: خۆی بۆتەرخان کردو بەدڵسۆزی هەوڵی دا کارەکەی بۆ ئەنجام بدا.

اَلْبَرَى: گڵو خۆڵ ٥ مەخلووقات.

البُراء: هەموو ئەو وردەو خشتو خۆڵەی لەئاکامی تاشینو بڕینەوەی شت دەکەوێتە خوار.

البُرَايَةُ: بەمانا (البُراءُ)دێ ٥ پروپوچی ناوکۆمەڵ ٥ حوشتری لوتەوانە لەلوت کراو ٥ حوشتری قەڵەو، حوشترێك بەردەوام بێ لەسەر رۆیشتن.

البِرَايَةُ: دارتاشی، سەنگتراشی.

البَرَّاءُ: ئەوکەسەی کارەکەی بریتییە لەدارتاشی یان سەنگتراشی.

البَرَّاءَةُ، اَلْبَرَّايَةُ: قەڵەم دادەر، هەرشتێك قەڵەمی پێ دابدرێ یان داروشتی وای پێی داتاشرێ وەکوو تەشوێ.

البِري بِري: ئەخۆشی یەکە بەهۆی کەمبوونی (ڤیتامین ب)وە پەیدا دەبێ دڵ لاواز دەکاو ئیلتیهابی ئەعصاب دەخاتەوە.

المباراة: کێ برکێی وەرزشی یە لەنێوان دوو تاقم دا یان لەنێوان دوکەس دا، (ك: مباريات)ە.

المِبْراةُ: بەمانا (البَرّاءة) واتە قەڵەم تاش.

بَزْبَزَ: لەرۆیشتندا پەلەی کرد ٥ تێشکاو هەڵهات ٥ زۆری جمو جۆڵ کرد.

بَزْبَزَ الرَّجُلَ: پیاوەکەی بەهێز راپسکاوت.

بَزْبَزَ الدابَّةَ: ولاغەکەی بەتوندی راکێشاو لێی خوڕی.

بَزْبَزَ الشَّيْءَ: ئەوشتەی چارەسەرکردو رێکی خستەوە ٥ لێی ستاندو لێی داماڵی ٥ فڕێی داو ئەیدایەوە.

البُزابِزُ: تیزرەو، ئەوکەسەی بەپەلە بەرێگادا دەڕوا ٥ کەسێك گورج و گۆڵو هەمیشە لەجمو جۆڵ دابێ ٥ منداڵی تازە پێ گەیشتوو سوکەڵە لەسەفەردا.

اَلْبَزْبازُ: بەمانا (البُزابِزُ) وە (البُزْبُزُ) بەمانا (البُزابِزُ) وە.

بَزَجَ بَزْجاً: خۆی هەڵکێشا، خۆی هەڵنایەوە.

بَزَجَ عليه: گێچەڵی پێ کرد.

بَزَجَ الشَّيْءَ: شتەکەی جوانکردو رازاندیەوە.

بَازَجَ فِي الشَّيْءَ: شانازی پێوەکردو خۆی پێوە هەڵکێشا.

بَزَّجَ الشيئ: بەمانا (بَزَجه)دێ.

تبازج الرجلان: ئەو دووپیاوە خۆیان بۆیەکتر هەڵکێشا.

البَزِيجُ: پاداشدەرەوەی چاکە.

بَزَخَه بَزْخاً: لەسێبەندەی دا ٥ سێ بەندەی چاڵ کردو ناوکی دەرپەڕاند ٥ بەگۆچان کەوتە وێزەی ٥ لێیدا تا گرمۆڵەی کرد.

بَزَخَ القَوْسَ: کەوانەکەی چەماندەوە.

بَزَخَ الرَّجُلَ: ئابڕوی پیاوەکەی برد فەزحی کرد.

بَزِخَ بَزَخاً: پشتی چووە ناوەوەو سنگی دەرپەڕی.

بَزِخَ الفرسُ: پشتی چاڵ بوو دەگوترێ: (هو أبْزَخ وهي بَزْخَاءُ)، (ك: بُزْخ).

بَزُخَ: ملکەچ بوو.

إنْبَزَخَ ظهرُ الفرس: بەمانا (بَزَخَ)یە.

تبازَخَ: رۆیشت بەشێوەی رۆیشتنی کەسێك پشتی چاڵ بوو بێو ناوکی دەرپەڕی بێ ٥ وەکوو دانیشتنی ئەو دانیشت.

تبازخت المرأةُ: ئافرەتەکە سمتی دەرپەڕاندن ٥ (تَبازَخَ الفَرَسُ) ئەسپەکە دەستەکانی بۆلای ورگی چۆماندنەوە بۆئەوەی دەمی بگاتە ئاو.

تبازَخَ عن الأمر: دواکەوت لەکارەکە.

البِزْخُ: لمبەلانی نزم، شوێنی چاڵو ئەوی لەلمبەلان.

البَزْدَرَة: میهنەی وەرزێری و جوتیاری.

بَـزَرَ الحَـبَّ: تۆوەکـەی وەشـاند، بـەناوی زەوییەکــــە دا بــــڵاوی کــــردەوە بۆئەوەی بڕوێ.

بَزَرَ القِدْرَ: دەنکە تۆمـەکانی فڕێدایـە نـاو دیزەکەوە.

بَزَرَ فلانـاً بالعصـا: بەگۆچان لەفلانکەسـی دا.

بَزَرَ القصارُ الثوبَ: جل شۆرو جل کوتەکە بەگۆچان لەکراسەکەی دا بۆ ئـەوەی پـاك بێتـەوە ٥ جـل دەبرێتـە سـەر ئـاوو تـەڕ دەکـرێ‌و ئـەمجار لەسـەر تاتەبـەردێك بـەدار پـیّ دەکێشـرێ بۆئەوەی پاك بێتەوە.

بَزَّرَ القِدْرَ: بەمانا (بَزَرَها)دێ.

بَزَّرَ الطعـامَ: خۆراکەکـەی رازانـدەوەو وای لـێ کرد هەوەسی بچێتێ.

اَلْبـازور مـن الرجـال: پیـاوی گومانـاوی، دڵ پیس.

اَلْبَــــزْرُ: ئــەوتۆوە کەبــەزەوی دەکــرێ بۆئـەوەی بـڕوێ ٥ منـداڵ‌و وەچـەو نەوە ٥ زرِوێت، (ك: بُزُورَ).

البِزْرُ: ئـەو تـۆوەی بـەزەوی دا دەچێندرێ بۆئـــەوەی بـــڕوێ، (ك: بُـــزورَ) ٥ ئــــەومیوەو دەنکــــە زەیتــــون‌و ئەوشــــتانەیە لەگــــەڵ خــــواردن دادەنرێ.

بِـزْرُ قطونـا: تـۆوی گیایـەکی سـاڵانەیە لەپێری (لسان الحمل)ە ٥ لە لەبەلانی وڵاتـی میصـرو وڵاتـانی حـەوزی دەریـای ناوەڕاسـت دەڕوێ ٥ کەسێك زۆر قـەبز بـێ‌و پیسـایی بۆنـەکرێ لەبــەروبوومی ئەوگیایــە دەخــوا بۆرەوان بوون.

اَلْبَزْراءُ: ئافرەتێك زۆری منداڵ بووبن.

اَلْبِزْرَةُ: هەرتۆوێك لەزەوی دا بچێندرێ بــۆ زەراعــەت ٥ لــەوڵاتی میصــر تایبـەتیان کـردوە بـەتۆوی پـەمبۆ ٥ لــــــــــەزانیاری زەراعـــــــــەت دا بەودانەوێڵەیە دەگوترێ کە تایبـەت دەکرێ‌و هەڵدەگیرێ بۆ تـۆو کـردن‌و داچاندن.

اَلْبَزَّارُ: تۆو فرۆش.

اَلْبَیْـزارُ: جوتیـار ٥ هەڵـگری بـازی راو، (ك: بیازِرة).

اَلْبَیْـزارةُ: ئـەوداره ئەسـتورەیە کـەجل شـۆر پۆشـاکەکانی پـێ دەکوتـێ بـۆ پاکبونەوە.

اَلْبَیْزَرُ: بەمانا (اَلْبَیْزارة).

اَلْبَیْزَرَةُ: زانیارییەکە لەحاڵ‌و چۆنیەتی ئـەو دڕندانـە دەکۆڵێتـەوە کـە بـۆ ڕاوکردن بەکاردەهێندرێن.

المِبْزَرَةُ: بەمانا (اَلْبَیْزارَةُ)دێ.

اَلْمَبْزُور: پیاوێکە منداڵی زۆر هەبن.

بَـــزَّ قرینـــه بَـــزَّةً وبِزِّیــزی: بەســەر بەرامبەرەکـەی دا زاڵ بـوو روتـی کردەوە، لەپەندی پێشینان داهاتووە (مـن عَزَّ بَزَّ) هەرکەسێك باڵادەست بـێ‌و سـەربکەوێ چـەك‌و سـیلاحی زێرکەوتوەکە وەردەگرێ.

بَزَّ الشَّيْءَ: شتەکەی دەرکێشا، بەتوندو تیژی رای پسکاندو کێشی کرد.
اِبْتَزَّ قرینه: بەمانا (بَزَّهُ)دێ.
اَلْبِزازة: کۆتاڵفرۆشی ◦ میهنەی کوتاڵفرۆشی.
اَلْبَزُّ: جۆرێکە لە پۆشاك ◦ جۆرێکە لەچەك.
البِزُّ: گۆی مەمك.
البَزَز: چەك.
البَزّازُ: کوتاڵ فرۆش.
اَلْبِزَّةُ: چەكو سیلاح ◦ شێوەو روخسار ◦ نیشانە.
بَزَغَ الصَبِيُّ بَزاغة: منداڵەکە قسەخۆش بوو عاقڵو زیر بوو ◦ ئازایە بۆ قسە کردنو لەکەس ناخواتەوە ◦ ئەوپەڕی شۆخو شەنگی بەدەست هێنا.
بَزَغَ الرجلُ: ئەوپیاوە بوو بە گەورەو دەمڕاستی نەتەوەکەی ◦ دەگوترێ: (هو بَزيغٌ، وبُزاغ).
تَبَزَّغَ الصَّبِيُّ: بەمانا (بَزَغَ) هاتووە.
تَبَزَّغَ الشَّرُّ: شەڕ بەرپا بوو تا ئێستا دانەمرکاوەتەوە.
بَزَغَتْ السِّنُّ بَزْغاً وبزوغاً: ددانەکە گۆشتی پوکەکەی قەڵاشتو دەرکەوت.
بَزَغَتِ الشمسُ أو القمرُ أو النجم: خۆر یان مانگ یان ئەستێرە لەئاسۆ دەرکەوت ◦ لە قورئان دا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا﴾.

بَزَغَ الطبيبُ الجلدَ بَزْغاً: پزیشکەکە پێستەکەی هەڵدڕیو خوێنەکەی رەوان بوو.
بَزْغَهُ: بەمانا (بَزَغَهُ) دێ.
بَزَغَ البيطارُ الدابَّةَ: بەیتارەکە بەمەبەستی چارەسەرکردن دەرزی یەکی سوکی لەژور سمتی ئاژەڵەکە دانەیگەیاندە دەماری.
ابْتَزَغَ الربيعُ: سەرەتای بەهار پەیدابوو.
البازغة: ددان.
المِبْزَغُ: کێردی پزیشك تیغی عەمەلیاتکردن.
بَزَقَ بَزْقاً وبُزاقاً: تفی لێ کرد (بَزَقَ الشمسُ) بەمانا (بزغ) یە.
البُزَقُ: ئامێرێکی مۆسیقایە، جۆرێکی بچوکە لەتەنبور دەشوبهێتە عود.
البُزَاقُ: بەمانا (البُصَاق) واتە: تف.
بَزَلَ النابُ بزلاً وبزولاً: کەڵبەکە دەرکەوت ◦ دەگوترێ: (هو بازلٌ).
بَزَلَ البعيرُ: حوشترەکە کەڵبەی دەرهاتن، ئەمەش کاتێکە تەمەنی دەگاتە هەشت نۆ ساڵی.
بَزَلَ الرجلُ: پیاوەکە ئەزموونی تەواو بوو، بەنێو زۆر ئەزمونو چورتم دا تێپەڕی.
بَزَلَ الرأيُ والأمر: نیشەکە جێگیر بوو کارەکە سەقامگیر بوو.
بَزَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵدڕی.
بَزَلَ الشرابَ: کوبە شەرابەکەی کون کرد

بۆئـــەوەی شـــەرابەکە بێتـــە دەرو برژێ ٥ شەرابەکەی پاڵاوت‌و صافی کرد.

بَزَلَ الأمر والرأيَ: بڕیاری لەسـەر کارەکـە داو بڕاندیەوە.

بَزَلَ الرأي: بیرو بۆچونی تازەی داهێناو بیدعەتی خستە ولاتەوە.

بَزَلَ الحاجَة: ئیشەکەی جێبەجێ کرد.

بَزَلَ الرأيُ والأمـر: کارەکـە سەری گـرت‌و سەقامگیر بوو.

بَزَّلَ الشَّيْئَ: بەمانا (بَزَلَهُ)دێ.

انـْبَزَلَ: شـەق بـوو، قەڵشـا، دڕا، درزی برد ٥ دەگوترێ: (تَبَـزَّلَ الجِلْـدُ بالـدَّمِ والسـقاء بالماءِ): پێستەکە هەڵدڕاو خوێنی لـی هاتـەدەر، کوندەکـە دڕاو ئاوی لێ چوو.

تَبَـزَّلَ الشـرابُ: کوپەکـە قەڵشـاو درزی برد مەیەکەی لـێ ڕژا.

البـازِلُ: ددان کـاتی ڕوانـی کەلـەپوك دەردەکەوێ.

البازِلَـةُ: برینێـك لەپێسـت دەکـرێ‌و خوێنی لـێ دێ ٥ هـەر کـەل‌و پـەل‌و مـــاڵ‌و ســـامانێك پێداویســـتی دەستەبەربکا.

البُـزالُ: ئەوشـوێنەیە قەڵشـاوە یـان دڕاوەو شلەمەنیەکەی لـی دێتەدەر.

البِـزالُ: ئامێرێکـە کوپـەو بـەرمیل‌و بـۆری‌و شـتی لـەوجۆرەی پـێ کـون دەکرێ.

المِبْـــزالُ: ئالەتێکـــە شـــەرابی پـــێ دەپـاڵێورێ، شـەراب پاڵێوێـك، (ك: مَبَازِلُ).

المِبْزَلَـــةُ: شـــەراب پاڵێوێـــك وەکـــوو (چاپاڵیوك).

بَزَمَ القولُ: قسەکە رەق‌و زبر بوو.

بَـزَمَ علیـه: بـەددانی پێشـەوە (کەڵبـە)ی گەستی.

بَـزَمَ علـى الأمـر: لەسـەرکارەکە بـەردەوام بوو سوور بوو لەسەرکردنی.

بَزَمَ بالعِبْءِ: بەوئەرکە قورسە هەڵسا.

بَزَمَ الرَّجُلَ بازمة: ڕۆژگار ئەوپیاوەی توشی چـورتم‌و نەهامـەتی کـردوە هـەزار دەردی سەری بینیوە.

بَزَمَ الشَّيْئَ: شتەکەی شکاند.

بَـــزَمَ الناقـــةَ: بـەدو پەنجـە (پەنجـەی شـــایەتومان‌و قامکـــە گـــەورە) حوشترەکەی دۆشی.

بَزَمَ الوَتَرَ: بەپەنجەی شایەتومان‌و قامکە گـــەورەی وەتـــەری ئـــامێری مۆسیقاکەی گرت.

بَـزَمَ فلانـاً الشَّیْئَ: شـتەکەی لەفلانکـەس ستاند.

الإبْزِيمُ: بروانە وشـەی (إبـزيم) لـەپیتی (ألف)دا.

البازِمَةُ: تەنگانەو چورتم‌و ناخۆشی.

البَزْمـةُ: تەنگانـەو ناخۆشـی ٥ یەکـژەم نـان خـواردن لەشـەوو ڕۆژێـك دا ٥ کێشی سی دیرهەم.

الْبَزِيمُ: لقی شلکی دارخوما کەشتی پـێ

ببەستریٚ یان پاقلەی پیٚ گورزە بکریٚ ◊ گورزە پاقلە ◊ تیٚشوی زیٚدە، پاشماوەی تیٚشوو، (ك: بُزَم)ە.

البَزِيمَةُ: بەمانا (البَزِيم)، (ك: بَزَائِم).

بَـزا بَـزْواً: گوێی هەڵخستو سەرنجی دا بۆئـەوەی قسـەکە ببیسـتیٚ یـان شتەکە ببینی.

بَـزا الرجـلُ: پیاوەکـە سنگی دەرپـەڕیوەو پشتی چاڵ بووە.

بَزا بَزَواناً: بازی دا، گوڕی بەست.

بَزا الرجُـلَ بَـزْواً: پیاوەکـەی ملکـەچ کـردو هەڵمەتی بۆ برد.

بَزِيَ بَزاً وبَـزاءً: سـنگی دەرپـەڕ یـوە سکی بەناودا چووە.

أبْـزى بـە: زێربـاری کـرد، هەڵمـەتی بۆبرد.

أبْزى بالأمر: بەسـەرکارەکەدا بالآدەسـت بوو کۆنترۆڵی کرد.

تبازى: سـنگی دەرپەڕانـدو پشـتی چـاڵ کرد.

تَبَـازَى الرجُـلُ: پیاوەکـە هـەنگاوەکانی فـراوان کـردن، شـەقاوی درێـژی هاویشـتن، خـۆی هەڵکێشا بەشـتێك کـەلای نـەبوو، لافی هـەبوونی شـتی زۆر لـێ دەداو هیچی نیە.

البـازي: پێـری بـازی بچوکە یـان بـازی مامناوەنـدی کـەباڵیان مەیلـەو کـورتن، قاچـیو کلکـی مەیلـەو درێژن، لە جۆرەکانی باشوو بەیدەق هەیە.

اَلْبَـزْوُ: هاوتـا هاوشـان ◊ (بَـزْو الشَّـيْ) هاوشانو هاوتایەتی.

بَـسْ: واتـە بەسـە لەبنـەڕەت دا وشـەکە فارسییە.

بِسْ: دەنگێکە پشیلەی پیٚ دەردەکریٚ.

بِـسْ بِـسْ: دەنگێکـە حوشـتری پـیٚ بـانگ دەکریٚ بۆ دۆشین هەروا مەرو بزنی پـیٚ بـانگ دەکـریٚ بـۆ دۆشـین ◊ دەنگێکە بانگی پشیلەی پـیٚ دەکـریٚ بۆئەوەی دەستەمۆبیٚ.

بَسَأَ بە بَسْـئاً وبُسُـوءاً: وەگری بـوو، خـوی پێوە گرت.

بَسَأَ بالأمر: بـەوکارە راهاتو فێـری بـوو ◊ بـــەهیچو پوچـــی لەقەڵـــەم دا ◊ سوکایەتی پیٚ کرد.

بَسِيَ بَسْئاً وبَسَاءً: بەمانا (بَسَأَ)یە.

أبْسَأَ: نولفەتی پێوەگرت وەگری بوو.

بَسْبَسَ: خێـرا رۆیـی ◊ (بَسْـبَسَ بالناقـة أو الشاة) بانگی کرد بۆ دۆشین.

بَسْبسَ بينهم: هـەوڵی دا دوبـەرەکی بخاتـە نێوانیان.

تَبَسْبَسَ الماءُ: ئاوەکە بەسەرزەوییەکەدا بڵاو بووە.

البَسْبَاسَةُ: درەختێکـە لـەپێری گـوێزی (الطيب) تۆو توێکڵە تۆوی بۆنخۆشی هۆشیارکەرەوەی هەیە.

البَسْبَسُ: سارای چۆڵو هـۆڵ، (ك: بَسَابِسَ) ◊ (ترهـــات البَسَـــابِسِ): قســـەی پڕوپوچو بیٚ سەروبەر.

بسبوسة: حەڵوایە کەلەئاردی گەنمو شەکرو رۆن دروست دەکرێ.

بَسْتَرَ اللَبَنَ: شیرەکەی لەسەر رێبازی زانای فەرەنسی باستۆر تەعقیم کرد.

البَسْتَرَة: تەعقیم کردنی شیرە لەسەر رێبازی باستۆر.

البُسْتَانُ: باغچەیەکە درەختە خورمای پەرت بڵاوی تێدان کەدەکرێ لەنێوان دارخورماکان دا کشتوکاڵ بکرێ.

البُسْتَانِي: باخەوان.

البَسْتَنَة: زانیاری بەخێوکردنی باغو باغچەکانو چۆنیەتی وەبەرهێنانیان.

بَسَرَ بَسْراً وبُسُوراً: پەلەی کرد، روگرژی نیشان دا.

بَسَرَ بالشيء: بەوشتە دەستی پێکرد.

بَسَرَ فلان النَخْلَةَ بُسْراً: فلانکەس تەلقیحی دارخورماکەی کرد پێش ئەوەی کاتی بێ (پێش وەخت موتوربەی دارخورماکەی کرد).

بَسَرَ النَبَاتَ: گژوگیاکەی شین خواردو کرد، هەربەناسکی مەڕی تێدا لەوەڕاند.

بَسَرَ القَرْحَةَ: برینەکەی هەڵاشتەوە پێش ئەوەی چاك بێتەوەو گۆشتەوەزون بێنێتەوە.

بَسَرَ الدَّيْنَ: قەرزەکەی وەرگرتەوە پێش ئەوەی کاتی بێ.

بَسَرَ السِّقَاءَ: شیرەکەی خواردەوە پێش ئەوەی ببێتە فرۆ یا بمەیێ.

بَسَرَ البُسْرَ: خورما کاڵەکەی تێکەڵ کرد بەخورمای تەڕو سرکە.

بُسِرَ: توشی نەخۆشی مایەسیری بوو.

أَبْسَرَ النَّخْلُ: دارخورماکە خورماکانی بوونە بەرسیلە ٥ خورماکاڵەکانی خۆش بوون.

أَبْسَرَ المركبُ في البحر: کەشتیەکە لەدەریادا وەستا.

بَاسَرَتِ الدابةُ: ئاژەڵەکە پێش وەخت بەکەڵ هات.

إِبْتَسَرت الرَّجُلُ: قاچی تەزیو ئاڵ بووە، قاچەکە لەکارکەوت.

إِبْتَسَرَ بالشَّيْءِ: بەوشتە دەستی پێکرد لەحەدیثی پێغەمبەردا هاتووە دەڵێ هەرکاتێ پێغەمبەر لەسەفەردا هەڵبستایە دەیفەرموو: (اللهُمَّ بك ابْتَسَرْتُ).

إِبْتَسَرَ النخلةَ والحاجةَ: پێش وەخت تەلقیحی خورماکانی کردن پێش وەخت کارەکەی ئەنجام دا.

ابْتَسَرَ الفاكهةَ: بەتەڕو ناسکی میوەکەی لی کردەوە، دەگوترێ: (ابْتَسَرَ الرأيَ) رای خۆی دەربڕی پێش ئەوەی جوان بیری لی بکاتەوە.

أبْتُسِرَ لونُهُ: رەنگی گۆڕا، رەنگی بزڕکاو روی ترش بوو.

تَبَسَّرَ: داوای خورمای نەگەیوی کرد.

تَبَسَّرَ الرجلُ: قاچی تەزی.

تَبَسَّرَ النباتُ: زەوی هەڵکۆڵی بۆدەرهێنانی روەکەکە پێش ئەوەی بەئاسایی سەردەربێنێ ٥ وەکوو ئەوەی کەخاکە لێوەی بەهار کەنگرکەر بەپێی لێزانی خۆیان زەوی هەڵدەکۆڵن کەنگرەکە دەدۆزنەوە هێشتا سەری دەرنەهێناوە.

الباسور: مایەسیری.

البَسْرُ: روگرژی ٥ دەگوترێ: (وجه بسر وباسِر) ٥ هەروائاوە بۆ ئاو کەتازە بەتازە لەئاسمانەوە دێتە خوار.

البُسْرُ: خورما پێش ئەوەی پێبگاو شیرین ببێ ٥ میوەی تەڕو تازە لەهەرجۆرێك بێ ٥ هەرشتێك تازە پێبگاو سەرەتای بێ ٥ هەروا ئاو کەتازە لەهەورەوە دەبارێتە سەرزەوی.

البُسْرَةُ: تاکی (البُسْرَ) هەروا ئاوە بۆ هەموو روەکێك کە تازە سەردەردێنێ.

المِبْسَارُ: ئەودرەختە خورمایەیە کە خورما بەرسیلەکانی نابنە روتاب و شیرین نابن.

المُبْسِرَةُ: بای وادە، بایەکە دەبێتە نیشانەی ئەوە کەباران بارین نزیکە ٥ (المَبَسَّرَة) بەمانا (المُبْسِرَةُ)دێ.

بَسَّ الرَّجُلُ بَسّاً: پیاوەکە داوای کردو هەوڵی داو تێکۆشا ٥ قاوتی دروست کرد ٥ قاوتی پەیدا کرد.

بَسَّ الشَّيْءَ: شتەکەی وردو خاش کرد، قورئان دەفەرموێ: ﴿وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسّاً﴾.

بَسَّ الشَّيْءَ وفيه: ئەوشتەی بڵاوە پێکردو زۆری لی روّیی زۆری لێ فەوتا ٥ دەگوترێ: (بَسَّتْ منه الأيامُ) رۆژگار کاریگەریی خۆی تێدا کرد، پیرو لاوازی کرد، کۆنی کردبوو ٥ لەحەدیثی موتعەدا هاتووە دەڵێ: (ومعي بردة قدبُسَّ منها) بوردەیەکم پێ بوو کۆن بو بوو.

بَسَّ عليه عَقارِبَهُ: دوژمنەکانی ناردنە سەر، نۆکەرو پاساوڵەکانی ناردنە سەر بۆئەوەی زیانی پێ بگەیەنن، ئەزیەتیان دا.

بَسَّ له من يَتَخَبَّرُ بِخَبَرِهِ: کەسێکی کردە جاسوس بەسەریەوە بۆ ئەوەی هەواڵەکانی پێ بگەیەنی و لەهەڵس و کەوتی ئاگاداری بکا.

بَسَّ الابلَ وبها: بەهێواشی حوشترەکانی ئاژوتن ٥ یان لەکاتی رۆیشتنی بەپەلەدا هێواشی کردنەوە بەوشەی (بس بس).

بَسَّ بالناقة: بەوشەی (بسْ بَسْ) حوشترە شیردەرەکەی هێواش کردەوە بۆئەوەی رابوەستێ و بیدۆشێ.

بَسَّ الرَّجُلَ: پیاوەکەی دەرکرد دوری خستەوە ٥ (أَبَسَّ الابل) بەمانا (بَسَّ) دێ ٥ لەپەندی پێشینان‌دا هاتووە

دەڵێ: (الایناس قبل الابساس) نەرمو نیانی کردن پێش داواکردنو پرکێشی کردن.

اِنْبَسَّ: رۆیی رابورد ٥ دەگوترێ: (اِنْبَسَّتِ الحَیّة علی وجه الأرض) ٥ مارەکە بەسەر زەوی دا رۆیی کشا ٥ بەمانا بلاو بونەوە دێ، دەگوترێ: (اِنْبَسَّ الماء علی وجه الأرض) ئاوەکە بەسەر زەوی دا بلاو بووە.

اَلْبَاسَّةُ: مێینەی (اَلْبَاسُّ)ە ٥ ناوێکە لەناوەکانی شاری مەککە.

اَلْبَسُّ: پشیلەی خۆماڵی.

البَسَّاسَةُ: ناوێکە لەناوەکانی شاری مەککە.

البَسُوسُ: شوان ٥ حوشترێ شیرنەدا مەگەر بەلاواندنەوەو هەوڵ لەگەڵدانو پشی پشی بۆکردن، (ك: بُسُس)ە ٥ هەروا ناوی ئافرەتێکە بووەتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی بەسوس کە لە نێوان دوو هۆزی گەورەی عەرەب دا زیاد لەسی ساڵ بەردەوام بوو، لەدەست رەشیو خراپەکاری دا بووەتە نمونە ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە دەڵێ: (أشأمُ من البسوس).

البَسِیسُ: خۆراکی کەم.

البَسِیسَةُ: قاوەت، یان ئارد تێکەڵ بەزەیت یان رۆن یان شتی ترکرابێو دوای کوڵاندن بخورێ ٥ نان وشك بکرێتەوەو ورد بکرێو تێکەڵ بەئاو بکرێو بخورێتەوە.

بَسَطَ الشَّیْءَ بَسْطا: شتەکەی بلاو کردەوە ٥ (بَسَطَ یده او ذراعه) دەستی خۆی راخست باسکی راخست ٥ هەروا دەگوترێ: (بسط کفه ونشر أصابعه) لەپی دەستی کردەوە، پەنجەکانی بلاو کردنەوە.

بَسَطَ یَدَهُ فِي الانفاق: دەست بلاوی کرد، زیاد لەپێویست ماڵو سامانی خەرج کرد.

بَسَطَ یده الیه: دەستی پارمەتی یان خراپکاریی بۆ درێژ کرد.

بَسَطَ لِسانه الیه: بەخراپە یان بەچاکە باسی کرد.

بَسَطَ اللّٰهُ الرزق: خودا رزقو رۆزی بۆبەندەکانی زۆرکرد.

بَسَطَ فلاناً: فلانکەسی کەیف خۆش کرد ٥ پێغەمبەر (د.خ) دەربارەی فاتیمەی کچی دەفەرموێ: (یُبْسِطُنِي مایُبْسِطُها) ئەوشتەی فاتیمە دڵخۆش بکا منیش پێی دڵخۆش دەبم.

بَسَطَ المکانُ القَومَ أو الفِراشُ النائمَ: شوێنەکە یان جێگەی نوستنە کە بەرفراوان بوو بۆیان زیادەی هەبوو.

بَسَطَ فلاناً علی فلان: فلانکەسی بەسەر فلانکەس دا بالا دەست کرد، رێزو شکۆمەندیی پێدا.

بَسَطَ العُذْرَ: پاساوو بیانوەکەی لێ قبوڵ کرد.

بَسَطَ مِن فلان: شەرمو حەیای لێ هەڵگرت.

بَسَطَ لسانُهُ: زمانی کرایەوەو بەرەوانی کەوتە ئاخاوتن.

بَسَطَ يدَهُ: دەستی یارمەتیو بەخشندەیی بۆ ئاتاجان درێژکرد.

بَسَطَ وَجْهُهُ بساطة: دەمو چاوی درەوشایەوە.

بَاسَطَهُ: دڵنەوایی کرد

بَسَّطَ الشَّيْءَ: شتەکەی بڵاو کردەوە، ئاسانی کردو گرێ گوێرکەی تێدا نەما.

اِنْبَسَطَ الشَّيْءَ: شتەکە بڵاو بۆوە، (انبسطت يَدُهُ) دەستی پیاوەتیو یارمەتیدانی درێژکرد.

اِنْبَسَطَ لِسانُه: زمانی کرایەوە کەوتە قسەکردن.

اِنْبَسَطَ فلان: فڵانکەس کەیف خۆش بووە شەرمو حەیای وەلانا.

اِنْبَسَطَ النهار: رۆژگار درێژبوون.

تَبَسَّطَ: بڵاوبووە، دەگوترێ: (تَبَسَّطَ فِي کلامه) قسەکانی رونکردنەوەو گوزارشی لەبیرو راکانی خۆی دا ە خۆی پاراست.

تَبَسَّطَ فِي البلاد: بەهەموو وڵات دا گەڕاو هەموو شوێنێکی پشکنی.

البَاسِطُ: ناوێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار.

الباسِطة: قامەتی پیاو بەجۆرێك دەست هەڵبڕێ بۆ حەوا.

اَلْبَسَاطُ: زەوی پانو پۆڕ.

البِسَاط: هەرشتێك رابخرێو بڵاو بکرێتەوە ە هەروا بەمانا زەوی پان دێ ە دیزەو مەنجەڵی گەورە ە جۆرێکە لەراخەر لەخوریو دەزو دروست دەکرێ.. بەکوردی پێ‌ێ دەگوترێ: قاڵی، فەرش، (ك: بُسُط).

البَسْطُ: لەزانیاری حیساب دا ژمارەی هەرمبەرزی کەرتی ئاسایی یە.

اَلْبَسْطاءُ مِن الآذان: گوێچکەی پانی گەورە، (ك: بُسْطٌ).

البَسْطَةُ: زێدەو بەشی زۆر ە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾.

البَسْطَة مِن النساء: ئافرەتی جوانو نەرمو ناسك ە نان کەلەئاردو شیرو هێلکەو شەکر دروستکرابێ.

البَسِيطُ: پێچەوانەی مورەکەبە ە شتێك ئاسان بێو گرێو گوڵی تێدانەبن ە یەکێکە لەبەحرەکانی عەروز ە زەوی پانو بەرفراوان.

اَلْمُتَبَسِّطُ: روبەری تەختو پانو پۆڕ.

بَسْطِرْمة: گۆشتی ران تەوابیلو سیری تێکەڵ دەکرێ پاشان دەهەنجندرێ.

بَسَقَ الشَّيْءُ بسوقاً: شتەکە بەرزبووەو گەیشتە شوێنی خۆی.

بَسَقَ الرجلُ: پیاوەکە ناوو شۆرەتی بڵاوبووە، دەگوترێ: (بَسَقَ أَصْحَابَهُ)

(وبَسَقَ على اصحابه) بەسەر هاوەڵانی دا لەناو هاوەڵانی دا بەرز بووەو ناوو شۆرەتی پیاوەتی ئەو دەنگی دایەوە ٥ لەحەدیثی (ابن الحنيفة) دا هاتووە دەفەرموێ: (كيف بَسَقَ ابوبكر أصحاب رسول الله).

**بَسَقَ في الشَّيْءِ:** لەوشتەدا كارا مابوو لێزان‌و كار دروست بوو ٥ (أبْسَقَتِ النَّاقَةُ والجاريةُ ونحوهما) شیر لەگوانی حوشترەكە یان لەمەمكی ئافرەتە كە هاتە دەرەوە بەبێ ئەوەی بێچوی بووبێ، مندالی بووبێ.

**بَسَقَ عليه:** بەسەریدا بەرزبووە گەورەو شكۆمەند بوو.

**بَسَقَ فلان:** ناوو شۆرەتی پیاوەتی بەرز بووە.

**الباسِقَةُ:** هەوری سپی‌و بێ خەوش‌و رەنگ رون ٥ پێغەمبەر لەوەصفی هەوردا دەفەرموێ: (كيف ترون بواسقها).

**بَسَاقَةُ القمر:** بەردێكی سپی صافە هەمیشە دە درەوشێتەوە بەكوردی پێی دەگوترێ بەردە سیخرۆ.

**البَسْقَةُ:** زەوی یەك كەبەردی رەشی تێدابن.

**بسكويت:** بسكیت، لەئاردو شەكرو هێلكەو رۆن دروست دەكرێ.

**بَسُلَ بسولاً:** لەناكامی رق هەڵسانی روی گرژ بوو یان لەروی ئازایەتی‌یەوە ٥ (هو باسِلٌ)، (ك: بُسْلٌ وبواسِل)ە ٥ (هوبَسِيلٌ)، (ك: بُسَلاَء)ە.

**بَسَلَ الطعامُ أو الشرابُ:** خواردنەكە یان شەرابەكە گۆڕانی بەسەردا هات‌و بەكەڵكی خواردن‌و خواردنەوە نەهات، تێكچوو گۆڕا.

**بَسَلَ اليومُ والقولُ:** رۆژەكە توندو تیژ بوو قسەكە زبرو ناخۆش بوو.

**بَسَلَ فلاناً:** سەرزەنشتی فلانی كرد ٥ (بسل عن حاجته) پەلەی لەئیشەكەی كرد.

**بَسَلَ الشَّيْءَ:** كەم كەم لێی وەرگرت (بَسَلَ الدقيق) ئاردەكەی لە هێڵەك دا.

**بَسُلَ بسالاً وبَسَالَةً:** ئازاو بەهەڵمەت بوو چاونەترس‌و بێ منەت بوو ٥ لەكاتی شەڕدا گرژو مۆن بوو (هو باسل).

**أبْسَلَ الشَّيْءَ:** شتەكەی قەدەغە كرد.

**أبْسَلَ نَفْسَه للموت والضرب:** ملی دا بۆمردن‌و لێدان‌و هیچ پەلە قاژەی نەكرد، خۆی راهێنا لەسەر ئازارەكانی‌وچاوەڕوانی ئاكام بوو.

**أبْسَلَ الشَّيْءَ وفلاناً:** شتەكە یان فلانكەسی كردە بارمتە.

**أبْسَلَ فلاناً للهلكة:** فلانكەسی تەسلیمی تێداچون‌و هیلاكەت كرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أن تُبْسَلَ نَفْسٌ بِمَا كَسَبَتْ﴾.

**أبْسَلَ فلاناً لعمله:** ئیشەكەی بەفلانكەس سپاردو خستیە ئەستۆی.

باسَلَهُ: لەشەڕدا بەربەرەکانی کرد.
بَسَّلَ وَجْهَهُ: دەم‌و چاوی خۆی زۆرگـرژو مۆن کرد.
بَسَّـلَ الطعـام او الشـراب: خواردەمەنییەکـە یـان شـەرابەکەی ترشاندو لەکەڵکی خست.
اِبْتَسَـلَ فـلان للمـوت: فلانکـەس خـۆی تەسلیمی مردن کرد.
تَبَسَّلَ الرجـلُ: پیاوەکە ڕوی گـرژ کـرد لـەئاکامی رق هەڵسـانی‌و ئازایـەتی خۆی ئازاکردو ورەی بەخۆی دا.
تَبَسَّلَ الوجـهُ: دیمـەنی ناشـیرین بـوو، گرژو مۆن بوو.
اسْتَبْسَـلَ فـلانٌ: فلانکـەس پرکێشـی شـەڕی کـردو خـۆی خسـتە نـاوی‌و گیانی خۆی بۆمردن دانـاو لـەگیانی خۆی بورد.
اِسْتَبْسَـلَ للمـوت أو الضـرب: بـەمانا (أبسَلَ) هاتووە.
الباسِلُ: شێر ◊ شیری ترشاو ◊ سرکەی تـام گـۆڕاو ◊ قسـەی تونـدو زبـری ناخۆش.
بَسَلْ: بەڵێ.
اَلْبَسْـلُ: شـتی حـەرام‌و نەشـیاو، قەدەغـەکراو، گوشـراوی روەکـی عوصـفورو خەنـە ◊ پیـاوی دەم‌و چاوناشیرین، نەکڵەوەت‌و رەزا گران.
بَسْـلاً لَـهُ: هـاوار بۆئـەو (بسْـلاً بَسْـلاً) ئامین ئامین.
اَلْبِسِلَّةُ: روەکێکی پاقلە ئاسایەو ساڵانەیە لـەپێری قـەرنیاتی پەپولـە شـێوەیەو جۆرەکـانی زۆرن گەڵاکـەی‌و تۆوەکـەی دەکوڵێندرێ‌و دەخورێ.
اَلْبِسِلّى: بەمانا (اَلْبِسِلَّة)یە.
اَلْبَسُولُ: صیغة موبالەغەیە ◊ ناوێکیشە بۆ شێر.
اَلْبَسِيلُ: پاشماوەی شەراب کەلەبنکی پـەرداخ دا بمێنێتـەوەو شـەوی بەسەردا تێپەڕێ.
اَلْبَسِـيلَةُ: بـەمانا (اَلْبَسِـيلُ)دێ ◊ تـاڵی تامی هەندێ خۆراك ◊ ترمس.
اَلْمُتَبَسِّلُ: شێر.
بَسَمَ بَسْماً: دولێوی لێك کردنـەوەو ددانـی بەباشی دەرکەوتن ◊ واتە پێکـەنینی بێـدەنگ، ئـەوەش سـوکترین جـۆری پێکەنینـەو جـوانترین شـێوەیەتی، زەردەخەنە.
تَبَسَّـمَ: بـەمانا (اِبْتَسَـمَ)دێ ◊ چـرۆو غونچە کە بکرێتەوە.
اَلْبَسِـيمَةُ: جۆرێکـە لەحـەڵوا کەلـە گـوێزی هینـدی‌و شـەکرو کـەمێك ئاردو رۆن دروست دەکرێ.
اَلْمَبْسِمُ: پوك ◊ هەروا لولەیەکە لـە دار یـان لەمەعـدەن یـان لـەوجۆرە ئـاگردان (دەمەقەلـەی) نێرگەلـەی دەخرێتە سەر (ك: مَبَاسِم)ە.
بَسْمَلَ: (بسم الله الرحمن الرحيم)ی کرد ◊ یان نوسی.
اَبْسَـنَ: شێوەو روخساری جوان بـوو، پێستی جەستەی نەرم بوو.

الباسِنَةُ: جەواڵێکی ئەستورە کەلە (بن شـەی) کـەتان دروسـت دەکـرێ ٥ زەمبیلەیەکـە بەرچـنەیەکە بـەبێ دەسـك لـە لقـی دارخورمـا دروسـت دەکرێ ٥ گاسنی جوت، (ك: بواسن).

بَسَـن: بـەمانا جـوان دێ ٥ دەگـوترێ: (حسنٌ بَسَنٌ) جوانو شۆخ.

البشْـتُ: کوڵـە بـاڵ پەستەك ٥ پۆشاکێکە لـەخوری دروسـت دەکـرێ ئەسـتورە قـۆڵی نـسین ٥ لادێییـەکان زسـتان لەبەری دەکەن.

بَشَرَ به بُشراً: کەیف خۆش بـوو (بَشَرَ فلاناً بـالأمر) فلانکەسـی بەکارەکـە دڵخۆش کرد (بشر فلاناً بوجه طلقٍ) بەرویەکی خۆشەوە فلانکەس بەرەو روی بووە.

بَشَرَ الأديم وغيره بشراً: پێستەکەی کـەوڵ کرد ٥ قەلاشتییەوە.

بَشَرَ الشاربَ: سمێڵی کورتکردنـەوە هـەتا وای لـێ هـات پێسـتی ژێرمـوی سمێڵەکانی دەرکـەوتن ٥ لەحـەدیثی پێغەمبـەردا هـاتووە (أمر ان نبشُـرَ الشوارب بَشراً).

بَشَـرَ الجَـرادُ الأرضَ: کولـە چـی رووەك لەزەوی دا هەبوو خواردی.

بَشَرَ بالشيء: هیوای موژدەی لـێ کرد.

بَشِرَ بالخبر بشـراً: بەهەواڵەکە دڵی خـۆش بوو.

بَشُرَ بَشارَةً: جوانو شۆخ بوو (هـو بشـير)، (ك: بُشَـراء)ه، (هـي بشـيرة)، (ك: بشائر).

أبْشَرَت الأرضُ: زەوی سـەرەتای روەکـی لـی هاتەدەرەوە.

أبْشَرَ الرَجـلُ: پیاوەکە کـەیفخۆش بـوو دەگـوترێ: (أبشـربه) پـێی دڵخـۆش بـوو ٥ لـەقورئان دا هـاتووە: ﴿وَأَبْشِـرُوا بِالْجَنَّـةِ الَّتِـي كُنـتُمْ تُوعَدُونَ﴾.

أبْشَرَ الناقـة: حوشترەکەی بەکـەڵ دا ٥ یان حوشترەکە کەڵی گرت.

أبْشَـرَ فلانـاً: فلانکەسـی کـەیف خـۆش کرد.

أبْشَرَ الفَرَحُ وَجْهَـهُ: کـەیفـو شـادی دەمو چاوی گەش کردەوە.

أبْشَرَ الأديمَ: پیستەکەی جوان کرد.

أُبْشِرَ الرجـلُ: ئەزمونەکـەی تـەواو بـوو (هو مُبْشَرٌ).

باشَـرَ زَوْجَـهُ مباشـرة وبشـاراً: پێسـتی لەپێستی ژنەکەی کـەوت ٥ لەگـەڵی جـوت بـوو ٥ لـەقورئان دا هـاتووە دەفـەرموێ: ﴿وَلاَ تُبَاشِـرُوهُنَّ وَأَنـتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ﴾.

باشَـرَ الأمـرَ: بۆخـۆی سـەروکاری ئیشەکەی کـرد ٥ (باشَرَ الفعلَ) بـەبێ ناوەنـدو واسـیتە، خـودی خـۆی کارەکەی ئەنجام دا.

باشَـرَ النعـيمُ فلانـاً: کاریگـەریی نـازو نیعمەت لەسەر فلانکەس دەرکەوت.

باشَرَ الشَّيْئَ بالشيئ: دوشتەکەی خستنە پەنایەکـەوەو بەیەکیـەوە نوسـاندن ٥ پێغەمبـەر (د.خ) لەپاڕانـەوەو دوعـای دا فەرموویـەتی: (اللـهُمَّ إنـي أسـألُك ايمانـاً تباشر به قلبي).

بَشَّرَت الناقة او النخلة: حوشترەکە یـان دارخوماکە نۆبەرەکەی دەرکەوت.

بَشَّـرَتِ الـريحُ بالغيـث: بایەکـە لەگـەڵ خـۆی دا هـەورێکی بارانـاوی هێنـا ٥ قورئان دەفـەرموێ: ﴿وَمِـنْ آيَاتِـهِ أَن يُرْسِلَ الرِّيَاحَ مُبَشِّرَاتٍ﴾.

بَشَّـرَ فلانـاً: هـەواڵێکی دڵخۆشـکەرەی بەفلانکـەس راگەیانـد ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّـرُكَ بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى﴾.

بَشَّـرَ صـاحب الـدِّيْنِ النـاسَ: خـاوەنی شەریعەت‌و بـانگخوازی ئـایین وادەی پاداشـتی خودایـان دا بەخـەڵك ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَبَشِّـرِ الَّذِين آمَنُـواْ وَعَمِلُـواْ الصَّـالِحَاتِ أَنَّ لَهُـمْ جَنَّاتٍ﴾.

اِبْتَشَـرَ الشـيئ: تـوێکڵی لەشـتەکە کردەوە، کەوڵی کرد، پێستەکەی لـێ دارنی.

تَباشَـرَ القـومُ: خەڵکەکـە مـزدەی خۆشییان دەدا بەیەکتری.

تَبَشَّـرَ: کـەیف خـۆش بـوو هەڵهەڵـەی کێشا.

اِسْتَبْشَرَ: کەیف خۆش بوو ٥ دەگـوترێ: (استَبْشَرَ بالشيئ) موژدەی خۆشی بە وەدیهـاتنی شـتەکەدا ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿يَسْتَبْشِـرُونَ بِنِعْمَـةٍ مِّـنَ اللّهِ وَفَضْلٍ﴾.

استَبْشَرَ فلاناً: بەمانا (بَشَّرَهُ)دێ.

البُشَارُ: (البُشارُ مِنَ النـاس) ئـادەمیزادی هیچ‌و پوچ‌و خوێڕی.

البِشَـارَةُ: هـەواڵی دڵخۆشـکەر کەلـەوە پێش موژدە پێدراو ئاگای لـێ نەبوە ٥ هـەروا ئەوخـەڵات‌و موژدانەیـە کەموژدەپێدراو دەیداتـە مـوژدەدەر، (ك: بشائر) ٥ (بشـائر) بـەمانا دەف‌و تەپڵ‌و ئەوجۆرە شتانەیە.

بَشَـائِرُ الصـبحُ: بەرەبـەیان‌و سـەرەتای رۆژبوونەوە.

بَشَـائِرُ الوجـه: دیـاردە جوانـەکانی روخسار.

بَشَائِرُ الفاكهة والزرع: نۆبەرەو باکورەی میوەو بەروبوومی کشت‌وکاڵ.

البِشْرُ: گەشانەوەی روخسار.

البَشَرُ: ئادەمیزاد.

البَشَـرَةُ: روی دەرەکـی پێست ٥ (بَشَـرَةَ الأرض) ئەو گژوگیایەی یەکەم جار دەردەکەوێ.

البُشرى: موژدە، موژدانە.

البِشْـرِيَّةُ: کۆمـەڵێکن لـە موعتەزیلـە لەسـەر رێبـازی بیشـری کـوڕی موعتەمیرن.

البَشُـورُ مِـن الرياح: ئـەو بایەیـە کـە موژدەی بارانی پێیە.

التباشير: تەباشیری هەموو شتێك سەرەتاو نۆبەرەکەیەتی ◦ وەکوو سەرەتاو دیاردەی بەرەبەیان، نۆبەرەی میوەو گوڵ ◦ نۆبەرەی خۆرماو میوەی تر ◦ ئەو ڕێگەو دیاردانەی بەهۆی ڕەشەباوە لەسەر زەوی دیاردەکەون.

التَّبْشِيرُ: بانگەوزایی بۆ ئایین.

المِبْشَرَة: ئامێری رازاندنەوە.

المُبَشَّرَة مـن النسـاء: ئافرەتێك کەلەهەمموو رویەکەوە جوانو بێ عەیب بێ.

اَلْمَبْشُورَةُ من النساء: بەمانا (اَلْمُبَشَّرَة)دێ.

اَلبَشْرَفُ: پێشەکی ئاوازی مۆسیقا.

بَشَّ وجهُهُ بشاً وبَشَاشَةً: دەمو چاوی جوانو گەشو روناك بوو، روخۆش بوو ◦ (بَشَّ فلان بفلان) فلانکەس بەپێکەنین روی گەشەوە بەرەو ڕوی فلان بووە.

بَشَّ له بخير: بەشی دا، خێری پێکرد.

أبْشَتِ الأرضُ: زەوی یەکەم روەکی خۆی رواند، سەرەتای گژوگیای دەرخست ◦ گژوگیاکەی راساو تێك هالا.

تَبَشَّشَ به: بەمانا (بَشَّ)دێ.

اَلْبَشِيشُ: دەمو چاو، روخسار.

بَشِعَ الطعامُ بشعاً وبَشَاعة: خۆراکەکە تامەکەی ناخۆش بوو، دەگوترێ: (بَشِعَ بالطعام) خواردنەکەی بۆ قوت نەچوو.

بَشِعَ الطعامُ والكلامُ: خواردنەکە ناخۆش بوو قسەکە زبرو ڕەق بوو.

بَشِعَ حَلْقُهُ: لەبەر وشکیو ناخۆشی خواردنەکە قورگی تەسك بووە خواردنەکەی پێدا ناچێ.

بَشِعَ الرجُلُ: بۆنی دەمی گۆڕا، دەگوترێ: (بَشِعَ فَمُهُ).

بَشِعَ خُلُقُهُ: ڕەوشتی ناشیرین بوو، دڵو دەرونی پیس بوو.

بَشِعَ وجْهُهُ: روخسارو دیمەنی ناشیرین بوون.

بَشِعَ الوادي: دوڵەکە بە ئادەمیزاد یان بەئاو تەنگەبەر بوو.

بَشِعَتِ الخَشَبَةُ أو العودُ: دارەکە گرێی زۆر بون.

بَشِعَ بالأمر: بەکارەکە تەنگەتاوو جاڕس بوو.

بَشِعَ بعدوه: هەڵمەتی بۆ دوژمنەکەی برد، بەتوندی پەلاماری دایە.

أبْشَعَهُ الطعامُ او الشرابُ: خۆراکەکە یان شەرابەکە هێندە ناخۆش بوو لێی تۆراو بۆی نەخورا.

اسْتَبْشَعَ الشَّيْءَ: شتەکەی بەناشیرین دایە قەڵەمو لێی ناڕازی بوو.

بَشَقَ بَشقاً: چاوی تێبڕیو زۆری سەیرکرد.

بَشَقَ الشَّيْءَ: شتەکەی هەڵگرت.

بَشَقَ الثوبَ: بەهێواشی کراسەکەی بڕی.

بَشَقَ فلاناً بالعصا: بەگۆچان لەفلانکەسی دا.

**الباشَقُ**: باشوو، جۆرێکه لەبازو هەڵۆ گورجو گۆڵەو باڵندەیەکی بەتواناو بەزەبرە گۆشت خۆرە جەستەی درێژەو دەندوکی کورتو چەماوەیە، (ك: بواشق).

**البَشِقُ من الرجال**: ئەوکەسەیە خۆدەخاتەکاری وەهاوە لێی رزگار نابێ.

**بَشَكتِ الدابَّةُ بَشْكاً**: وڵاخەکە بەخێرایی لەغاردان دا هەنگاوی هەڵێنا.

**بَشَكَ** فلان: فلان درۆی کرد (هو باشك وبشّاك).

**بَشَكَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕی، لێکی کردەوە، پارچە پارچەی کرد.

**بَشَكَ الدابَّةَ**: بەخێرایی وڵاخەکەی لێی خوڕی، ئاژوی.

**بَشَكَ الثوبَ**: قوماشەکەی درو بە دروانێکی خراپ، تەقەڵەکانی لێك دووربوو.

**بَشَكَ العَقَالَ**: عەگاڵەکەی کردەوە، شلی کردەوە.

**بَشَكَ الكلامَ**: قسەکانی تێکەڵ بە درۆ کردن، (بَشَكَ العملَ) کارەکەی خراپ ئەنجامدا.

**بَشَكَ الشَيْءَ**: شتەکەی تێکەڵ بە شتی ترکرد.

**أَبْشَكَ الكلام**: بەمانا (بَشَکە)دێ.

**إِنْتَشَكَ الخَيطُ ونحوه**: دەزووەکە پچڕا، دوولەت بوو.

**إِنْتَشَكَ فلانٌ**: فلانکەس درۆی کرد.

**إِنْتَشَكَ الكلامَ**: درۆی تێکەڵ قسەکانی کرد ○ بەسەر دەستەکیو سەفەری قسەی کرد ○ (إِنْتَشَكَ عرض فلان) ناموسی فلان کەسی شکاند.

**اَلْبَشَكي**: گورجو گۆڵو جەستە سووك: دەگوترێ: (ناقةٌ بَشَكي وإمرأة بَشَكي) خێرا ڕۆو جەستە سوکە.

**اَلْبَشْكُورُ**: ئاسنێکی درێژی سەر گۆچانییە نانو سەموونی پێ لە تەندوورو فڕن دەردەهێندرێ.

**بشكور العسل**: ئەو قەڵانگەیە شانە هەنگوینی پێ لەهەنگەڵان دەردەهێندرێ.

**البَشْكيرُ**: خاولییەکی گەورەیە لەگەرماودا بەکار دەهێندرێ.

**بَشِمَ من الطعام بَشْماً**: زۆری لەو خواردنە خوارد تالێی وەڕز بوو ئینتەلای کرد.

**أَبْشَمَهُ الطعامُ**: زۆر خۆری کۆئەندامی هەرسی تێك داو تەبیاتی گۆڕی.

**البشامةُ**: درەختێکی بۆنخۆشو تام خۆشە، سیواکی پێ دەکرێ، گەڵاکەی وردە، بێبەرە، کە گەڵاکەی ببڕی یان لقێکی ببڕی شیری سپی لێ دێ.

**اَلْبشمَلَةُ**: درەختێکی بەردارە، لەپێڕی دار گوڵەکانە ○ لە وڵاتی میسرو قەراخەکانی وڵاتی شام دەڕوێ.

بَشَنْس: ناوی مانگی نۆیەمی ساڵی قیبطییەو دەکەوێتە وەرزی بەهار.

البَشْنِینُ: روەکێکی ئاوییە لەپێری نیلۆفەرە، بەرواڵەت لە چۆمو زەلکاودا دەروێ، لەناو حەوزی ئاودا دەروێندرێ.

بَصْبَصَ الكلبُ: سەگەکە کلکی لەقاند بەتەمای ئەوەبوو شتێکی بەلوتەوە بچێ، یان بۆ خۆبردنە پێشەوەو رازی کردنی خاوەنی.

بَصْبَصَ الابلُ: حوشترەکە لەکاتی حودیە بۆ خوێندن کلکی باداو بەپەلە رۆیی.

بَصْبَصَ فِي دعائه: لەکاتی دوعاو پاڕانەوەدا ئەنگوشتی شایەتومانی بەرز کردنەوەو رای وەشاندن.

بَصْبَصَ بسيفِهِ: شمشێرەکەی راوەشاند.

بَصْبَصَ الجِرْوُ: بێچووەکە چاوی هەڵێنان.

بَصْبَصَ الأرضُ: یەکەم روەکی رواوی زەوی دەرکەوت.

بَصْبَصَ الرجلُ للمرأة: پیاوەکە فشەی بۆ ئافرەتەکە کردو دڵداری لەگەڵ دا ئەنجام دا.

تَبَصْبَصَ: بەمانا (بَصْبَصَ)یە.

البُصَابِصُ: ئەسپێکی شێیە، شینایی زۆر پێوە دیاربێ.

البَصْبَاصُ: حوشتری قەد باریکی کزو لاواز. لەوەرو گەڵایەك بەپێوە مابێ ٥ ئاوی کەم ٥ رۆژی گەرم ٥ شیر ٥ نان.

بَصِرَ بَصَراً: بینی ٥ (بصِرَ به) پێی زانی.

بَصُرَ بَصَراً وبصارةً: زانی، ئاگاداربوو، ناسی.

بَصُرَ بە: پێی زانی، دیتی، تێی روانی بۆئەوەی ئاخۆ دەیناسێ.

أَبْصَرَ فلان: فلانکەس بەچاو سەیریکردو بینی ٥ بەچاوی دڵو عەقڵ شتەکەی زانیو رێگای راستی دۆزییەوە ٥ هاتە شاری بەصرە.

أَبْصَرَ النهارُ: رۆژی روناك پەیدابوو شەو نەما وای لێهات هەموو شتێکی تێدا دەبیندرا ٥ (أبْصَرَ الطريقُ) رێگاکە ئاشکراو دیاربوو، نیشانەکانی بەباشی دەبیندران.

أبْصَرَ اليه: روی تێکرد (أبْصَرَ الشَّيْءَ:) شتەکەی بینی ٥ بۆی روانی ئاخۆ دەیبینێ.

تباصَرَ القومُ: جەماوەرەکە یەکتریان بینی ٥ هەندێکیان هەندێکیانی دی.

تَبَصَّرَ: تێفکریو لێی وردبۆوە، (تَبَصَّرَ الشَّيْءَ:) لەشتەکەی کۆڵیەوە بزانێ چییەو چی بۆدەردەکەوێ ٥ سەیری کرد بزانێ ئاخۆ دەیبینێ.

إستَبْصَرَ: بەمانا (أبْصَرَ)یە (إستَبْصَرَ الطريقُ والأمر) رێبازەکە ئاشکرابوو دەرکەوت، زاندرا ٥ (إستَبْصَرَ من أمره ودينه) بوو بەخاوەن عەقڵو فامو لەئایینی خۆی حاڵی بوو تێگەیی ٥ (إستَبْصَرَ الشَّيْءَ) شتەکەی رون کردەوە.

**الباصِرُ**: چاوی تیژو بینا ◦ (الباصرة) بۆ مێینه بەکاردێ.

**البِصَارةُ**: توێکڵی فول‌و گیای (ملوخی) یان پنگه بکوڵێ‌و ببێته گیا برژانه بۆ خواردن.

**البَصَرُ**: چاو، هێزی دیتن لەکاتی تێکەڵبوونی تاریکی‌و رووناکیدا لەسەرەتای شەوو کۆتایدا.

**صلاة البَصَر**: نوێژی شێوان یان نوێژی بەیانی ◦ دەگوترێ: (فعلته بین سمع الأرض وبصرها) لەشوێنێکی چۆڵەوانی ئەوەم کرد، کەس نەیبینیم.

**البَصْرُ**: بەردی سپی نەرم ◦ قوڕی لینج‌و بەرداوی.

**البِصْرُ**: بەردی سپی نەرم.

**البُصْرُ**: زەوی باشی گڵە سوور ◦ توێکڵ ◦ بەرزی‌و ئەستووری هەموو شتێك ئەملاو ئەولای.

**البَصْرةُ**: زەوی رەق‌و بەست ◦ بەردی نەرم کە سپی تێدابێ ◦ قوڕی لینج کە بەردە وردەی تێدابن ◦ شارێکی گەورەیە لە عێراق لەسەر کەنداوی فارس ◦ (البصرتان): بەصرەو کوفه.

**البُصْرَة**: زەوی باشی گڵە سوور ◦ تارمایی‌و پاشماوەی شیر.

**البصريون**: ئەوانەی پاڵ شاری بەصرە دەدرێن ◦ نەحوییەکانی بەصرە.

**البصيرُ**: ناوێکە لەناوەکانی خودا ◦ کوێرو نابینا.

**البَصِيرةُ**: هێزی هەست پێکردن ◦ زانیاری‌و ئەزموون ◦ بەڵگە ◦ چاودێری‌و جاسوس ◦ پەند وەرگرتن‌و تەمێ بوون ◦ پەردەیەك هەموو دەرگا دابگرێ ◦ هەرشتێك بکرێتە مەتاڵ‌و پارێزەر ◦ کەمێك لە خوێن کە نیشانەبێ لەسەر بریندار بوونی نێچیر، (ك: بَصائِر، وبِصَار).

**المُبْصِرُ**: چاودێری‌و سەرپەرشتیاری‌و پارێزەری شت.

**بَصَّ بَصِيصاً وبَصّاً**: درەوشاوەیە.

**بَصَّ العينُ**: بەتیلەی چاوروانی ◦ (بصَّ الماء) ئاوەکە پرژا.

**بصَّصت الأرضُ**: زەوی سەرەتای گژو گیاکەی دەرکەوت.

**بَصَّصَ الجَرْوُ**: بێچووەکە چاوی کردەوە.

**تَبَصَّصَ الرجل**: پیاوەکە مەرایی کردن (ماستاوی کرد).

**بَصَعَ الماءُ بَصْعاً**: کەم کەم ئاوەکە پرژا.

**بَصَعَ العرق بصاعةً**: عارەقەکە لەبن مووی جەستەی هاتە دەر.

**تَبَصَّعَ العرقُ**: بەمانا (بَصَعَ)دێ.

**البَصْعُ**: کونی پچووك پچووك کەناوی پیا نەیە.

**البَصِيعُ**: عەرەقی چۆڕاو، عەرەقی زەنگوڵ زەنگوڵ.

**بَصَقَ بَصْقاً**: ئەوەی لەناو دەمیدابوو تفی کردەوە.

بَصَقَ الشاةَ: مەڕەکەی دۆشی‌و بێچوو لەسکیدا بوو.
البُصَاقُ: تف کەڕۆبکرێ ٥ هەروا ئەو خلتەو پلتە کە کۆئەندامی هەناسە لەکاتی نەخۆشیدا دەری دەدا.
البُصَاقَةُ: (بصاقة القمر) بەردە سیخرو بەردێکی سپییە دەدرەوشێتەوە.
بَصَّلَهُ مِن ثیابه: روتی کردەوە ٥ پۆشاکەکەی لەبەردا رنی.
تَبَصَّلَ الشیئُ: توێکلەکەی وەکوو توێکلە پیاز سواری یەکتر بوون.
تَبَصَّلَ فلاناً: فلانکەسی لەپۆشاك رووت کردەوە ٥ دەگوترێ: (تَبَصَّلُوهُ) زۆریان پرسیار لێکرد تا هیچی پێنەما.
البَصَلَةُ: قەبارە روەکێکە بنکەکەی کەوانەییە لەژێر گڵدا پێدەگا، رەگی ورد وردی هەن لەژێریەوە بە گڵەکەدا رۆدەچن، لق‌و پۆپیشی هەن، کەمێك لەزەوی بەرز دەبنەوە ٥ هەیە پێچراوەیەو دەخورێ، هەیە پێچراوە نییە ناخورێ وەکوو بنکی سەوسەن ٥ خراپی سەر، هێلکەی سەر، (ك: بَصَل).
البُوصَلة: ئامێرێکە: دەوروبەری پێ دیاری دەکرێ.
بَصَمَ بَصْماً: بە سەرە پەنجەی مۆری کرد.
البَصْمُ: چاوە قامك.
البُصْمُ: ئەستورایی پۆشاك ٥ جلی زۆر.
البَصْمَةُ: شوێنەواری مۆر بە چاوە قامکەوە.
بَضَّ بَصواً: زێدەڕەوی کرد لە لێکۆڵینەوەی ئەوەی لای دوژمنەکەی یان قەرزدارەکەی هەیە.
بَصَا الحیوانُ بَصواً: زۆر هەوڵیدا گونی ئاژەڵەکە سەرەو ناوبکا.
البَصْوَةُ: پشکۆ ئاگر.
تَبَضْبَضَ فلاناً: هەموو مافێکی بۆ فلان وەرگرت.
البَضَابِضُ: من الناس والحیوان: خاوەن هێزو توانا.
البَضْبَاضَةُ: ئەوکەسەی جەستەی تێرو پڕو رەنگی پێستی صاف‌و بێگەرد بێ ٥ پێستی تەڕو ناسك بێ.
بَضَّ البَدَنُ: بضاضة وبضوضة: جەستەی تێروپڕ بوو تەڕو ناسك‌و گەش بوو ٥ دەگوترێ: (بَشَرَةٌ بَضَّةٌ وبضیضة:) پێستی تەنك‌و تەڕو تازە.
بَضَّ الماءُ بضاً وبضوضاً: ئاوەکە پرژا، لە جەرەکەوە دڵۆپ دڵۆپ تکەی کرد.
بضّض الحجرُ: بەردەکە ئاوی لێ رەوان بوو ئاوی لێ هاتە دەر وەکو عەرەق.
بَضَّ عینُه: فرمێسکی باراند.
بَضَضَ: تەڕو تازەبوو، پێستی ناسك‌و تێرو پڕ بوو.
ابْتَضَّ الشَیئَ: شتەکەی لە ریشە دەرکێشا.

**تَبَضَّبضَ حَقَّهُ:** مافی خۆی ورده ورده وەرگرت، کەم کەم قەرزەکەی وەرگرتەوە.

**البُضَاضَةُ:** پاشماوەی کەم لە ئاو کەلە پیاڵەو حاجەتدا دەمێنێتەوە ٥ دەگوترێ: (مافی السقا بضاضة) لە کوندەکەدا چوڕ ئاوی تێدا نەماوە.

**بَضَعَ الدمع بضعاً:** فرمێسکەکە لەچاو تزاو قەتیس مان، هەڵنەوەرین، نەڕژان.

**بَضَعَ من الماء وبه:** تێر ئاو بوو، گەدەی پڕبوو لە ئاو.

**بَضَعَ من فلان:** لەفلان چاڕز بوو لە دوبارەو سێبارە کردنەوەی ئامۆژگاری بۆیە ئامۆژگارییەکانی پێ بڕین.

**بَضَعَ فلان:** بازرگانی کرد.

**بَضَعَ اللحْمَ:** گۆشتەکەی پارچە پارچە کرد.

**بَضَّعَ الجِلْدَ:** پێستەکەی هەڵدڕیو شەقی کرد.

**أَبْضَعَ الشيئ:** شتەکەی کرد بە کاڵای بازرگانی.

**باضَعَ الزوجة:** سەر جێی ژنەکەی خۆی کرد، لەگەڵی جووت بوو.

**بَضَعَ الجلد واللحم وغيرهما:** بەمانا (بَضَعَهُ)دێ.

**إنبَضَعَ الشيئُ:** شتەکە کەرت بوو، لێبووەوە، هەڵدڕا.

**تَبَضَّعَ العرقُ:** عارەق لەبنکی مووەکانی لەشیەوە کەم کەم هاتەدەر ٥ دەگوترێ: (تَبَضَّعَت الجبهةُ) ناوچەوانی عارەقی کرد.

**استَبْضَعَ الشَيْئَ:** شتەکەی کردە کاڵای بازرگانی ٥ هەر لەم بارەوە پەندێك هەیە دەڵێ: (کَمُستَبْضِعِ التَمْرَ الی هجر) خورمای برد بۆ هەجەر بۆ فرۆشتن ٥ (دۆشاوی برد بۆ شینکایەتی).

**الباضِعَةُ:** برینێك پێستەکەی بڕابێ خوێنی لێنەیە.

**البِضاعةُ:** ئەو کاڵاو سامانەیە کە بازرگانی تێدا بکرێ، (ك: بَضَائع).

**البِضْعُ:** لە ژمارەدا (لە سێوە تا نۆ) دەکا، دەگوترێ: (بضعة رجال وبضع نساء) لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿فلبث في السجن بِضْعَ سنين﴾.

**البُضْعُ:** هاوسەر گیری ٥ گرێبەستی مارەبڕین ٥ مارەیی ٥ بیلامانەی ئافرەت، (فەرج)، (ك: بضوع وأبضاع).

**البِضْعَةُ من اللحم:** پارچە گۆشت ٥ دەگوترێ: (هو بِضعةٌ مني).

**البَضيعَةُ:** ئەوشتەیە کاڵای دەخرێتە سەر.

**المِبْضَعُ:** مقەست.

**بَطَؤَ بُطئاً:** بە سستی ڕۆیی، تەمبەڵ بوو (أبطأ) دواکەوت.

**بَطاء:** ژێوانی کردەوە لە کارێك کە سوربوو لەسەر نەنجامدانی.

تباطا: بەمانا (بَطُؤَ)دێ.
تَبَطا: بەمانا (تَباطا)یە ٥ (اسْتَبْطاه): داوای لێکرد خۆی دوا بخا، تەمبەڵی بکا ٥ بە تەمبەڵی لەقەڵەم دا.
بُطْآنَ: دەگوترێ: (بُطْآن ما فعل کذا بُطْآن ما کان کذا): تەمبەڵی نەکرد، دوانەکەوت.
بَطْبَطَ البَطُّ: مراوییەکە دەستی کرد بە قیرەو قاژە ٥ لەناو ئاوەکەدا خۆی نقوم کردو مەلەی کرد.
بَطْبَطَ رأیُ فلان: بیرو بۆچوونی فلان لاوازبوو.
بَطَحَ الشیء بَطْحاً: شتەکەی بڵاو کردەوە، رای خست ٥ (بَطَحَ المکانَ) شوێنەکەی تەخت کرد، رێکی خست.
إنْبَطَحَ: فراوان بوو ٥ (إنْبَطَحَ فلان) بەرەو دەم راکشا، لەسەر سکی پاڵکەوت ٥ (تَبَطَّحَ) بەمانا (إنْبَطَحَ)یە.
تَبَطَّحَ السیلُ: لافاوەکە بە پانتایی دۆڵەکە هات ٥ (تبطح فلان) فلان کەس دابەزی بۆ لبەلانی خوار مەککە.
اسْتَبْطَحَ المکانُ: شوێنەکە بەرفراوان بوو، تەخت بوو.
الأبْطَحُ: شیوی پان و پۆڕ کە لافاوی پێدا بڕواو هەندی زیخ و لم و بەردە وردە بەجێ بێڵێ ٥ شوێنێکە لەخوار مەککە چونکە هەمان دیاردەی پێوە دیارە، (ك: أباطح)ە.
البُطاحُ: بزرکاندن و ورێنەیەکە لەناکامی لەرزو تاوە لە نەخۆش دیاری دەدا.
البَطْحاءُ: بەمانا (الأبْطَحَ)ە.
البَطْحَةُ: مەسافەیەکە بە ئەندازەی قامەتی ئادەمیزادی راکشاو.
البَطیحَةُ: بەمانا (الأبطح)ە.
أبْطَخَ: کاڵەکی لەلا زۆر بوون ٥ کاڵەکی خوارد.
تَبَطَّخَ: کاڵەکی خوارد ٥ لەخوارەزم دابەزی و نیشتە جێبوو ٥ دەگوترێ: (التبطّخ خیر من التبطّخ) نیشتە جێبوون لە مەککە باشترە لە نیشتە جێبوون لە خوارە زم.
البطّیخ: کاڵەك ٥ رووەکێکی ساڵانەیە بەسەر زەویدا بڵاو دەبێتەوە لەپێری کولەکەیە ٥ بەرەکەی خڕ یان درێژ یان مەیلەو درێژە ٥ جۆری زۆرن ٥ حیجازییەکان پێی دەڵێن: (الطِّبیخُ).
المَبْطَخَةُ: شوێنێ زۆری کاڵەك لێ بڕوێ، (ك: مباطخ)ە.
بَطَرَ الشَّیْءَ: شتەکەی دڕاند، شەقی کرد (هو مبطور) (هو بطیر).
بَطِرَ فلان بَطَراً: فلانکەس چوست و چالاك بوو، زێدە ڕەویکرد لە کەیف و شادیدا (بَطِرَ بالأمر) بەوشتە بارگران بوو، لەسەر شانی قورس بوو ٥ سەری سوڕماو حەیران بوو ٥ (هو بَطِرٌ).

بَطِرَ النعمةَ: نازو نیعمەتەکانی بەکەمو بێ نرخ زانیو کوفرانی نیعمەتی کرد ٥ لە قورئانـدا هـاتووە دەفـەرموێ: ﴿وَكَـمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا﴾.

بَطِرَ الحَقَّ: حەقو راستییەکانی پاش گوێ خســتنو پەســەندی نــەکردن بــە ناحەقی لەقەڵەم دان.

بَطِـرَ الشـيءَ: ئەوشـتەی دزاو رقـی لێـی هەڵسا بەبێ ئـەوەی شـیاوی ئـەو رق لێبوونە بێ.

أَبْطَرَه: کەیف خۆشی کـرد ٥ (أَبْطَرَ فلانـاً ذرعَهُ) ئـەرکێکی خسـتە سـەر شـانی فلان کەنەتوانێ ئەنجامی بدا.

البطرير: چەقە چەناوی دەمدرێژی بـێ حەیاو رۆچوو لە گومراییدا.

اَلْبَطِير: پزیشکی ئاژەڵ.

اَلْبَطاریـة: پیـل، بـاتری ٥ خـەزانێکی بچـوکەو چـەن شـتێکی تـێ هاخندراوە کیمیا ئاسا کـاری خۆیـان دەکـەن تـەیاری کارەبـائی وەبـەر دەهێـنو لـەکاتی پێویسـتدا هەڵدەگرێ ٥ چەند جۆرێکی هەیە.

تَبَطْـرَقَ: بـە لارو لەنجـەو مـراوی ئاسـا رۆیشت.

البُطارق: پیاوی درێژ داوەڵ.

البطريـق: لـوت بـەرزو لـەخۆ رازیو بـەفیز ٥ باڵنـدەی قەڵـەو گۆشـتن ٥ سـەرکردەیەکی رۆمانـەکان بـووە ٥ لێـزانو کارامـا لەشـەڕدا ٥ سـەرۆکی سـەرەك ئوسـقوفەکانی مەسـیحی ٥ زانـای جولەکـە ٥ جـۆرە باڵندەیـەك باڵی کورتنو گۆشتنە، لە دەشتەکانی باشورو لەدەم دەریاکان زۆرە.

البَطْـرَكُ: پێشـەوای نەصـرانییەکان ٥ سـەرۆکی سـەرانی ئوسـقوفەکان ٥ زانای جولەکە، (ك: بطارك، بطاركة).

بَطَـشَ بـە بَطْشـاً: بەشێوەی تونـدو تیـژ پرکێشی کردێ. قورئان دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ﴾.

بَطَشَ بالشّيء: بە توندو تـۆڵی گرتـی ٥ لـە ریوایەتدا هاتووە (فاذا موسى بـاطش بجانب العرش).

بَطَشَ عليه: هەڵمەتی بردە سەر.

بَطَشَ في العلم بباع بسيط: بوو بـە دەریـای زانیاریو زانست (هو باطِشٌ وبطـاش وبطيش).

بـاطَشَ فـلان فلانـاً مباطشـة وبطاشـاً: فلانکـەسو فـلان هەریەکـەیان بـەلاماری ئـەوی تـری دا، هەریەکـەیان لـە عاسـت خۆیـەوە دەستی درێژکرد بۆئەوەی پەلاماری ئەوی تر بدات.

بَـطَّ الـدمل ونحـوه: کوانەکـەی دڕی، دومەڵەکەی دەرکرد.

بَطَّطَ: بازرگانی بە مراوی کـرد، مـراوی کردنـە کـاڵای کـڕینو فرۆشـتن ٥ ئەوەندە ماندوو بوو بڕستی لێبڕا.

بَطَّطَ العَجِينَ: هەویرەکەی پان کـردەوە، درێژی کردەوە.

**البَطاطُ**: ئەو كەسەی مەنجەڵی رون تێدا هەڵگرتن دروست دەكا ٥ ئەوكەسەی بازرگانی بەوجۆرە قاپو قاچاغەوە دەكا.

**البَطَّةُ**: جۆرێكە لە پەلەوەر دەشوبهێتە مراوی وەلێ لەو باڵو ملی درێژترە ٥ كورتەو تۆكمەیە.

**البَطِيطُ**: درۆزن، سەرسوڕمان ٥ پێڵاو بەبێ مل.

**المِبَطُّ**: ئەو كێردو چەقۆیە كە دومەڵی پێ شەق دەكرێ، (ك: مِباط).

**المِبَطَّةُ**: بەمانا (المِبَطُّ)دێ.

**البطاقة**: پارچە وەرەقەیەكی بچووكە لە كاغەز یان لە شتی تر هەندێ شتی تایبەتمەندی لەسەر دەنووسرێ.

**البطاقة الشخصية**: پەڕەیەكە یان (پەڕاویلكەیەكە) ناوی تاكەكانی خێزانی تێدا دەنووسرێ یان هی هەندێكیان‌و بەگوێرەی پێویست‌و بەڵگە نامەیەكی رەسمی بڕوا پێكراوە، (ك: بطائق، بطاقات.)ە.

**بَطَلَ الشَيْءُ بُطْلاً وبُطولاً وبُطلاناً**: شتەكە بەفیڕۆ چوو، فەوتاو وەرنەگیرایەوە، دەگوترێ: (بَطَلَ دمُ القتيل) خوێنی كوژراوەكە بەفیڕۆ چوو هەركاتێ تۆڵە لەبكوژەكەی نەكرایەوە بە كوشتنەوە یان بەخوێن وەرگرتن ٥ ئەوشتە فاسید بوو، بڕیارەكەی هەڵوەشایەوە، حوكمەكەی پوچ بووە ٥ دەگوترێ: (بَطَلَ البيعُ) (بطل الدليلُ) (هو باطل).

**بَطَلَ العاملُ**: كرێكارەكە بێ كار مایەوە ئیشی دەست نەكەوت.

**بَطِلَ حديثه بطالَةً**: قسەكانی قەشمەری‌و گاڵتە بوون.

**بَطُلَ بَطولةً**: ئازابوو، پاڵەوانییەتی نواند ٥ (هو بَطَلٌ)، (ك: أبطالٌ)ە.

**أبْطَلَ**: شتی بەتاڵ‌و بێ بناغەی هێنایە ئاراوە.

**أبْطَلَ في حديثه**: بەمانا (بَطِلَ)ەیە.

**أبْطَلَ الشَيْئ**: شتەكەی پوچ كردەوە، هەڵیوەشاندەوە ٥ دەگوترێ: (أبْطَلَ البيعَ، والحكمَ والدليلَ والعملَ) لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿ولا تُبطلوا أعمالَكم﴾.

**بَطَّلَ العاملَ**: كرێكارەكەی لەكار خست ٥ (بَطَّلَ العملَ) وازی لێ هێنا.

**تَبَطَّلَ**: خۆی ئازاكرد، خۆی بە ئازاو ورە بەرز نیشان دا ٥ شوێن رێبازی پوچ‌و سەرگەردانی كەوت.

**تَبَطَّلَ القوم**: شتی بەتاڵ‌و پوچیان خستە ئاراوەو كاریان پێكرد.

**الأُبْطُولَةُ**: ئەوشتەیە لە پشكنین‌و فەحص كردندا دەرنەچێت (ك: أباطيلَ).

**الباطلُ**: بەمانا (الأبطولة)دێ ٥ لەزاراوەی شەرع زان‌و یاسا ناساندا شتێكە بناغەی نەبێ‌و لەبنەڕەتدا

پوچ بێ بە پێچەوانەی (فاسِد) کە بناغەی هەیەو هەندێ مەرجی پێویستی تێدانین.

البُطْمُ: قەزوان ٥ دەنکە سەوزە ٥ لە پێری فستەقە ٥ درەختەکەی لە چوار مەتر بۆ هەشت مەتر بەرزدەبێتەوە ٥ لە کێوو کەژ دەڕوێ، قەزوانەکەی بەناسکیو بەرەقی دەخورێ درەختەکەی بەکوردی پێی دەگوترێ: دارەبەن، بنێشتیشی لێ دەکرێ، لە کوردستانو ولاتی شامو گەلێ شوێنی تر دەڕوێ.

بَطَنَ الشَّيءُ بطوناً: شتەکە نهێنی بوو ٥ (بَطَنَ من فلان وبه) بوو بە پێری ئەوو پشتگیری لەو کرد، (بَطَنَ الوادي وَالبَيتَ بَطناً): کەوتە ناو قەدی دۆڵەکە یان ناوەڕاستیماڵەکەوەو هاتوچۆی تێدا کرد ٥ (بَطَنَ الأمرَ والرجلَ) لەکارەکەی کۆڵییەوە پیاوەکەی پشکنیو ناوەڕۆکی زانی، کابرای ناسیو نهێنییەکەی زانی ٥ لە ورگی کابرای دا ٥ دەگوترێ: (بَطَنَهُ الداءُ) ورگی تووشی نەخۆشی بوو.

بَطَنَ بَطَناً: سک ئێشەی تووش بوو.

بَطِنَ: کەیفخۆش بوو، تەڕ دەماخ بوو، ماڵو سامانی زۆر بوو دەوڵەمەند بوو.

بَطُنَ: ورگی گەورە بوو ٥ (بطُنَ المكانُ) شوێنەکە دوور بوو.

بُطِنَ: سکی نەخۆش کەوت، سک ئێشەی گرت، (هو مبطون).

أبْطَنَ الثوبَ: گیرفانی بۆ کراسەکە کرد ٥ دەگوترێ: (أبْطَنَ فلاناً): فلان کەسی بەسەر نهێنییەکانی دا ئاگادار کردەوە.

بَطَّنَهُ: لەورگی دا، (بَطَّنَ الثوبَ) گیرفانی بۆ کراسەکە کرد.

تبَطَّنَ الوادي والكلأ: چووە ناو شیوەکە ناو پاوانەکەو پێیدا گەڕا ٥ (تَبَطَّنَ الأمر وفلاناً) لە شتەکەی کۆڵییەوەو ناوەڕۆکی زانی، ئاگاداربوو بەسەریدا.

استَبْطَنَ الوادي ونحوه: چووە ناو شیوەکە.

اسْتَبْطَنَ أمره: نهێنی ئیشی خۆی زانی.

اسْتَبْطَنَ الأمر: کارەکەی لە دڵی خۆیدا شاردەوە.

الأبْطَنُ: دەمارێکە لە قاچی پێشەوەی ئەسپدا.

البـاطِنُ: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خودا، واتە زاناو ئاگادار بەسەر هەموو نهێنیو شاردراوەکاندا.

الباطن من كل شيئ: ناوەڕۆکی ئەوشتە (الباطن من الأرض) شوێنی نەویو چاڵ، (ك: أبطنة وبواطن)ە.

الباطنة من الرجل: نهێنییەکانی پیاو.

الباطنية: گروپێکن لە شیعە پێیان وایە شەریعەت روی ئاشکراو دیوی نهێنی هەیە، بەتەئویلو راستەو پاستەکردن دەزاندرێ.

البِطانُ: پشتێنێکە لەسەر گۆشتی سك دەبەسترێ ٥ دەگوترێ: (فلان عريض البطان رخي البال) فلان کەس پشتێنی پانەو دڵی ئارامە.

البِطانة: دیوی ناوەوەی پۆشاك، پێچەوانەی دیوەکەی دەرەوەی ٥ نهێنی ٥ دۆستو نزیکی پیاو کە نهێنیو پەنا مەکییەکانی ئاشکرا بکا ٥ لە زانیاری پزیشکیدا (البطانة) بریتییە لەو پەردە (طلائية): کە هەموو (أوعية) خوێنییەکانو لەمفاوییەکانی داپۆشیوە لە ناوەوە، (ك: بطائن)ە.

اَلْبَطْنُ من كل شيئ: دیوی ناوەوەی شت ٥ سك ٥ یەکجار منداڵبوون، هێلکەکردن، بەروبووم دەرکردن ٥ دەگوترێ: (نشرت المرأة بطنها) ئافرەتەکە منداڵی زۆر بوون.

اَلْبَطَنُ: سك ئێشە.

البِطْنَان من اَلشَّيْئ: ناوەڕاستی شت.

البِطْنَةُ: زۆر خواردنو گەدە پڕبوون لە خۆراك.

البَطِينُ: پڕبوو، دەگوترێ: (كيس بَطِينٌ).

البُطَيْنُ: مەنزڵێکە لە مەنزڵەکانی مانگ ٥ سێ کوچکەی سێ ئەستێرەی بچووك: کە سێ گۆیەك پێك دێنن ٥ کلۆرایی بچوك ٥ ئەو دوو کلۆراییە بچوکەی لای خوارووی دڵ کە خوێنیان تێدا کۆدەبێتەوەو لەوێوە پاڵی پێوە دەنرێ بۆ ناو دەمارەکان.

المِبْطَان: ورگ زل ٥ زۆر خۆر.

اَلْمُبَطَّنُ: ئەوەی گەدەی بچووك بێ ٥ سك بچکۆلە ٥ قەد باریك ٥ ئەسپێك سكو پشتی سپی بێ باقی جەستەی هەر رەنگێك بێ.

الباطية: کوپەی گەورە لە شوشە یان شتی تر کە بۆ مەیو شەراب بەکاربێ، (ك: بواطِ).

بَظِـرَ بَظَـراً: لە ناوەڕاستی لێوی سەروی لویەکی لێ هاتبێ ٥ دەگوترێ: (هو أَبْظَرُ وهي بَظْراءُ).

البُظَارة: ئەو لووەیە کەلە گوانی مەردایە ٥ میتکە، قیتکە لە شەرمگای ئاژەڵدا هەروا لەهی ئافرەتیش دا.

اَلْبَظْرُ: بەمانا (البُظارة)دێ.

تَبَظْرَمَ: لێوی سەروی بەرزکردەوەو لە رقا چرچاندی.

تَبَظْرَمَ: بەمانا (بَظْرَمَ)دێ ٥ هەروا بەمانا ئەحمەقیو نەفامییە.

بَظَّ العازفُ العودَ بظاً: کەمانچە ژەنەکە دەستی دایە کەمانچەکەی بۆئەوەی بیژەنێ.

أَبَظَّ فلانٌ: فلان قەڵەو بوو، (بظالَحْمُهُ بَظْواً وبُظُواً) گۆشتی گرت گۆشتن بوو.

بَعْبَعَ الماءُ: ئاوەکە قلپە قلپی کرد لەکاتی هاتنە دەرەوەی لە گۆزەو تەنەکەو

شتی وا ٥ (بَعْبعَ الرجل) پیاوەکە خێرا قسەکانی کردن‌و پێوەرۆیی.

**البَعْبَعُ:** لاسایی کردنەوەی ئاوە کەلە زەرفەکەی دێتەدەرەوە.

**بَعَثَهُ بَعْثاً وبِعْثَةً:** بەتەنیایی ناردی ٥ دەگوترێ: (بَعَثَ الیه لَه) ناردی، رەوانەی کرد.

**بَعَثَ فلاناً من نومه:** فلانکەسی بەخەبەر هێنا، لەخەو راستی کردەوە.

**بَعَثَ الله الخلق بعد موتهم:** پەروەردگار دوای مردن ئادەمیزادەکانی زیندوو کردنەوەو بڵاوەی پێکردن بۆ بەهەشت‌و دۆزەخ.

**بَعَثَ البعیرَ:** گوریسی پێ بەستنەوەکەی کردەوەو حوشترەکەی بەرەڵا کرد.

**بَعَثَ فلاناً علی الشَيْئ:** فلانکەسی هەڵنا بۆکردنی ئەوشتە.

**بَعَثَ علیهم البلاءَ:** بەڵای بەسەردا دان.

**ابْتَعَثَهُ:** بەمانا: (بعثه)ی ٥ لە حەدیث دا هاتووە دەفەرموێ: (أتانی اللیلةَ آتیان فابتعثانی) لەخەو راستیان کردمەوە.

**انْبَعَثَ:** هەڵساو راپسکوت ٥ (انبعثَ فی السیر) بەخێرایی رۆیی.

**انْبَعَثَ لحاجته:** بۆی راپسکوت.

**تباعث القومُ علی کذا:** خەڵکەکە هەندێکیان داوایان لە هەندێکیان کرد بۆ کردنی فلان شت. یەکتریان هەڵنا بۆکردنی.

**تَبَعَّثَ:** راپسکوت، سور بوو لەسەر ئەنجامدانی فلان کار.

**الباعث:** ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خودا.

**بُعَاثُ:** شوێنێکە لە نزیک شاری مەدینە، دوا شەڕی نێوان ئەوس‌و خەزرەج لەو شوێنە کرا لەسەردەمی جاهیلیدا.

**البَعْثُ:** بوژانەوە، زیندو بوونەوە، رۆژی قیامەت‌و ژیانەوە.

**البَعْثُ:** نێردراو، شاندو رەوانەکراو چ تاك بێ چ کۆ.

**اَلْبَعْثَة:** کۆمەڵێکی پێکهێنراوە بۆ ئەنجامدانی کارێکی تایبەتی کاتێ رەوانە دەکرێن، هەیە بیعثەکەی سیاسییە، هەیە بۆ مەبەستی خوێندنە... هتد.

**بَعْثَرَ الشَيْئَ:** شتەکەی پەرت‌و بڵاوە پێکرد (بعثر المتاعَ) هەندێکی هەڵدانەوە بەسەر ئەوانی کەی دا دان.

**بَعْثَرَ المخبوءَ:** شتە شاردراوەکەی دەرهێنا ٥ لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿اذا بعثر مافی القبور﴾.

**بَعَجَ البَطْنَ بعجاً:** سکی هەڵدڕی‌و ریخۆڵەکانی دەرکەوت.

**بَعَجَ الأرض:** زەوی هەڵدڕی ٥ دەگوترێ: (بَعَجَ الأرض أباراً) بیری زۆری لە زەوییەکەدا لێدا (بَعَجَ المکانَ) لە ناوەڕاستی زەوییەکەدا رۆنیشت، وەستا ٥ (هو باعج وبعیج).

بَعَّجَ البطنَ: بۆ موبالەغەیە واتە زۆری هەڵدڕی یان زۆری هەڵدڕین ٥ (بَعَّجَ المطرُ الأرضَ) باران زەوی هەڵدڕی، چونکە زۆر بە لێزمە باری.

إنْبَعَجَ: بەرفراوان بوو، ئەملاو ئەولای ئاوەڵا بوون ٥ شەق و پەق بوو.

إنْبَعَجَ السحابُ: هەور بارانێکی زۆری باراند ٥ (انْبَعَجَ فلان بالحديث): فلان کەس کەوتە قسەو درێژەی بە قسەکانی دا.

تَبَعَّجَ: بەمانا (إنْبَعَجَ)دێ.

بَعِدَ بَعَداً: پێچەوانەی نزیکە ٥ لەناو چوو ٥ لە لاوانەوەدا زۆری گوت دوور مەکەوەرەوە.

بَعُدَ بُعْداً: بەمانا (بَعِدَ) هاتووە ٥ (هو بعيد) ٥ (بَعُدَ بە) دووری خستەوە ٥ بەهیلاکی برد، تێداچوو.

أبعَدَ فلانٌ: زۆر دوور کەوتەوە ٥ لەسنوور دەرچوو، زێدە ڕەویکرد.

أبعَدَ في الأمر: لەکارەکەدا ڕۆچوونی ئەنجامدا.

أبعَدَ الشَيْئَ: شتەکەی دوور خستەوە.

باعده مباعدةً وبعاداً: بەمانا (أَبْعَدَهُ)دێ، هەروەها بەمانا خوای لێ دوورخستەوەو ستەمی لێکرد.

باعد بين الشيئين: دوو شتەکەی لێك دور خستنەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فقالوا ربنا باعد بين أسفارنا﴾.

بَعَّدَه: بەمانا (أبْعَدَهُ)دێ.

ابْتَعَدَ: بەمانا (بَعُدَ)دێ.

تباعد: بەمانا (أبْعَدَ) هاتووە دەگوترێ: (تَبَاعَدَ عنه ومنه).

تَبَعَّدَ: بەمانا (تباعَدَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَبَعَّدَ منه وعنه).

استَبْعَدَ: دوور کەوتەوە، (إسْتَبْعَدَ الشَيْئَ) شتەکەی بە دوور لەقەڵەم دا ٥ دووری خستەوە.

اَلْأَبْعَدُ: وشەیەکە لەجیاتی ناوە لەکاتی زەم کردندا دەگوترێ: (أهلك الله الأبْعَدَ) لە حەدیث دا هاتووە دەفەرموێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (د.خ) وتی: (ان الأَبْعَدَ قد زنى) مەبەستی خۆی بوو.

بَعْدُ: پێچەوانە (قَبلُ)یە ٥ زەرفێکی ناسنوور دارەو موبهەمە تائیضافە نەکرێ ماناکەی دیاری نادا.

اما بَعْدُ: وشەیەکە بەزۆری لە وتاردا بەکار دەهێنرێ ٥ نیشانەی ئەوەیە وتاربێژ لە باسێکەوە دەچێتە سەر باسێکی تر، هەر بۆیە بەم وشەیە دەگوترێ: (فصل الخطاب) ٥ (وبَعْدُ) بەمانا (أمَّا بَعْدُ)وە ٥ وەلێ بەئەندازەی (أما بعد) بەهێز نییە.

البُعْدُ: نێوان دووری شتێك لە شتێکی دیکە ٥ دەگوترێ: (بُعْداً لە:) دووری لە ڕەحمەت بۆی و هیلاك و تێدا چوون بەشی ئەویێ ٥ دەگوترێ: (إنە لـذو بُعْدٍ) واتە خاوەن ڕاوو

بۆچونێکی قوڵو حەزمو خۆگرییە.
بَعْدَكَ: وشەیەکە بۆ ئاگادار کردنەوە، واتە: ئاگاداری دواوەت بە.
البعید: دوور: دەگوترێ: (أقام غیر بعید) کەمێك مایەوە.
بَعَرَت الشاة والناقة بَعْراً: کشپلی کرد ٥ مەڕەکەیان حوشترەکە کشپلی کرد.
بَعَرَ الشَّیْئَ: کشپلی پێدادا، بۆی هاویشت.
أبْعَرَ الأمعاءَ: چی لەریخۆڵەیدا بوو دەری هێنا.
باعَرَت الدابةُ حَالِبَها مباعرة: ئاژەڵەکە کشپلی بە دۆشەرەکەدا کرد.
البُعَارُ: نەبقی گەورە.
البَعْرُ: کاوێژ کراوەی ئاژەڵ ٥ قشپلی ئاژەڵی کاوێژکەرەوە، جگە لە رەشە وڵاخی ماڵی.
البعیر: هەر حوشترێك بەکەڵکی سواری بێ، بەکەڵکی ئاوسبوون بێ، ئەمەش کاتێکە تەمەنی بگاتە چوار ساڵ.
المِبْعَرُ، المِبْعَرَة: شوێنی هاتنە دەرەوەی کشپل.
بَعْزَقَهُ بعزقةً: لەشوێنی نەگونجاو لێکی بڵاوکردەوە، وردو هاڕی کرد.
تَبَعْزَقَ: پەرتو بڵاوبۆوە.
بَعْصَ الشَّیْئَ بعصاً: شتەکە تێکچوو، پەلەقاژەی کرد.
تَبَعْصَصَ: لەناو باوەشو دەستدا پەلەقاژەی کردو ویستی خۆقوتار بکا وەکوو ئەوە کەروێشك کە دەیگری دەیەوێ خۆرزگار بکا.
البُعْصُوصُ: لە ئادەمیزاددا ئێسقانێکی پچوکە لەنێوان دوو سمتیدا.
بَعَضَهُ البَعُوضُ بعضاً: مێشوولە گەستی.
بَعَضَ الشَّیْئَ: شتەکەی پارچە پارچە کرد.
بَعِضَ المكانُ بَعَضاً: شوێنەکە مێشوولەی زۆر بوو.
أبْعَضَتِ الأرضُ: زەوییەکە مێشوولەی زۆر بوو.
بَعَّضَ الشَّیْئَ: شتەکەی پارچە پارچە کرد.
تَبَعَّضَ الشَّیْئُ: شتەکە کەرت کەرت بوو.
بَعْضَ الشَّیْئِ: بەشێك لە شتەکە جا زۆربێ یان کەم.
البعوضُ: مێشولەو مێشو مەگەزی تری زیانبەخش.
بَعَطَ: زێدەڕۆیی کرد لە نەفامیو کاری خراپەو هەڵسو کەوتی ناشیرین.
بعطَ الحیوانَ: گیانلەبەرەکەی سەر بڕی.
أبْعَطَهُ: ئەرکێکی خستە سەر شانی کە ناتوانێ ئەنجامی بدا.
بَعَّ المطر والسحابُ بَعّاً: ئاوی بارانو هەورەکە بە رێژنەو لنگێزە رژایە سەر زەوی.
بَعَّ الماءَ بَعّاً: زۆری ئاو پێداکرد (البُعَاعُ) زۆرینەی ئاو لە هەورا ٥ کاڵاو کەرەسە.
بَعَقَ الوابِلُ بعْقاً وبُعاقاً: رێژنەبارانی دڵۆپە

گـەورە لـەناکاوێك کرایـەوە ٥ (بعـق الحيـــوان والإنســـان بُعاقـــاً): گیانلەبەرەکــە یــان ئادەمیزادەکــە دەمـی کـردەوە، تـا هێـزی تێدا بـوو نەڕاندی.

بَعَقَ عن الشّيء: پەردەی لەسەر هەڵماڵی ٥ (بَعَقَ المطرُ الشـديد الأرضَ) بارانەکـە بـە خـوڕەمو لێزمەکـە زەوییەکـەی دڕی.

بَعَــقَ البِئــرَ: بیرەکـەی هەڵکەنـد ٥ (بَعَــقَ الجَمَلَ) حوشترەکەی سەربڕی.

بَعّقَ: بۆ موبالەغەیە.

ابتَعَقَ في الكـلام: لـە قسەکانیدا تـوڕەو سەر کێش بوو.

إنــبعَقَ: شـەق بـوو (البعَــقَ الســحاب بـالمطر) هەورەکـە بـە بارینی بـاران شەق بـوو ٥ (البعَقَ في الكلام) بـەمانا (إبْتَعَقَ) هاتووە.

تَبَعّـقَ المطـرُ: بـە خـوڕەم بارانەکـە بـاری، (تَبعّقَ في الكلام) بەمانا (البَعَقَ) هاتووە.

البــاعِقُ: بـارانی ناوەخـتو چـاوەڕوان نەکراو کەبە ڕێژنەو دڵۆپەی گـەورە ببــاریَ ٥ هــەروا بــەمانا لافــاوی هەرەسهێن دێ.

بَعَکَهُ بالسّيْفِ بَعْکـاً: بەشمشـێر لـەملاو لـەولای دا ٥ (بَعِـكَ جســمه بَعْکــاً): جەستەی ئەستوورو نەکلەوەت بوو.

البعکوکـــاء: یــەکتر هێنــانو بــردنو شەڕو هەرا.

البَعْکُوکَة: کۆمەڵێك لە ئـادەمیزاد یـان جەلـەبێك حوشـتر لـە فـەرەبالغیو تێکرژاندا بـێنو بچـن ٥ شوێنەواری خــێڵو هــۆز لــە هۆبــەو گونــدو هەوارەکانیانـدا ٥ ناوەڕاستی خـانوو کـەپرو ساباتو رەشماڵ ٥ (بعکوکـة الصيفَ والشتاء) گەرمـەی گـەرمای هـاوین یـان کـاتی سەهۆڵ بەنـدانو جەرگــەی ســەرمای زســتان، (ك: بعاکيك)ە.

بَعَلَ بعلاً وبعولةً: هاوسـەرگیری کـرد، ژنـی هێنا یان شوی کرد، دەگوترێ: (بَعَلَ الرجل وبَعَلَتْ المرأة).

بَعَلَ عليه: فـەرمانی پێکـرد، لێـی توڕەبوو خۆی بەسەرەوە بادەدا.

بَعِلَ بـامره بَعَـلاً: بـە کارەکـەی واقـی وڕمـا توشی سەر سوڕمان بوو.

باعَــلَ مباعلــة وبعــالاً: ژنــی هێنــا، هاوســـەری پەیـــداکرد ٥ یـــاریو دەستبازی لەگەڵ ژنەکەیدا کرد.

باعَلَ القومُ قوماً أخرين: هەنـدێك لـەو هۆزو قەومـە ژنیـان لـە هەنـدێکیان خواست.

ابتعلـت المـرأة: ئافرەتەکـە گوێڕایـەڵی مێردەکەی بوو.

تباعـل الزوجـان: ژنو مێردەکـە یـاریو دەستبازیان کرد.

تبعلــت المـــرأة: ئافرەتەکــە ئــەرکی سەرشــانی بەرامبــەر مێردەکــەی

بـەجێهێنا ٥ دەگـوترێ: (ابعلـت زوجَها).

**اسْتَبْعَلَ**: ژنی هێنا.

**اسْتَبْعَلَ النباتُ**: ڕووەکەکە بەبێ نەرك‌و ماندوو بوون لـە ڕەگەکانیـەوە ئـاوی خـواردەوە پێویسـتی بـە ئـاودانی خاوەنی نەکرد.

**البَعْلُ**: مێـرد ٥ ژن ٥ تەپۆڵکەو بـەرزایی زەوی کە ئـاوی جۆگا نەیگرێتـەوە، تـەنیا بە ئاوی باران ئاوبدرێ ٥ کشتوکاڵێك بـەبێ ئـاودێریکردنی لـە ڕەگەکانیـەوە ئـاو بخواتـەوە ٥ خـاوەن شـت‌و لێپرسـراوی، (ك: بِعَالُ وبُعولُ وبعولة).

**بَعْل**: ناوی بتێکە عەرەبەکان لەپێش هاتنی ئیسـلامدا پەرستشـیان بـۆکردووە ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿أَتَـدْعُونَ بَعْـلاً وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ﴾.

**البَعْلَةُ**: ژن ٥ خێزان.

**البَعِيمُ**: پەیکەری لەدار تاشراو، پیاوێك زمـانی تێکـەڵ‌و پێکـەڵ بـێ‌و لـە دەمەدەمێ‌و چەلەحانێ دا تێبشکێ، نەتوانێ بەجوانی وەڵام بداتەوە.

**بَعَـا الشَّـيْءَ**: بـە ئەمانـەت‌و خـوازراو ئەوشتەی وەرگرت.

**أبْعَاهُ**: بە ئەمانەت پێیدا.

**استبعاه**: بە ئەمانەت وەریگرت.

**بَغْـبَغَ النـائمُ**: نوسـتووەکە پرخـە پرخـی هات، هەناسەی لە لوتیەوە دا.

**بَغْبَـغَ في الكـلام**: لـە قسـەکردندا ڕەوان نـەبوو قسـەکانی تێکـەڵ‌و پێکـەڵ‌و بێ سەرو بەربوون.

**بَغْبَغَ في السير**: لەڕۆیشتن دا پەلـەی کـرد (بَغْبَغَ الشَّيْءَ) شتەکەی زێر پێیدا.

**البَغْباغُ**: لاسایی کردنەوەو گێڕانـەوەی دەنگە.

**البُغْـبُغُ**: بیرێـك ئاوەکـەی نزیـك بـێ لـە لێوارەکەی.

**بَغَتَـهُ بَغْـتاً وبَغْـتَةً**: لـەنکاو ڕووبـەڕوی بووەو تەریقی کردەوە.

**باغَتَـهُ مباغَتَـةً وبِغاتـاً**: موفاجەئـەی کردو لەنکاو ڕووبەڕوی بووە.

**بَغِثَ لونه بَغَثاً وبُغْثَةً**: پەڵەی سپی‌و ڕەشی تێدا بوون ٥ (هو أبْغَثَ وهي بَغْثاء).

**البُغَـاثُ**: باڵندەیەکـە ڕەنگـی بەڵەکـە قـەبارەی بچـوکە لـەپێری بـازو هەڵۆیە بەلام لە فڕیندا تەمبەڵە.

**البَغْـثاء**: ڕەشـە خـەڵك‌و کۆمەڵـگای ئادەمیزادو هەمەجۆر.

**البَغيثُ**: گەنمی خراپ.

**تَبَغْدَدَ**: خـۆی کرد بـە بەغـدایی، خـۆی پاڵ بەغداد دا ٥ خۆی وەکوو ئـەهلی بەغدا لێکرد.

**تَبَغْدَدَ عليـه**: خـۆی بەسـەردا ڕانوانـد، خۆی بەسەردا ڕاوەشاند.

**بغداد**: پایتـەختی حکومـەتی عێراقـەو پێشی دەگوترێ: (مدينة السـلام) لەسـەر شـەتی دیجلـە هەڵکـەوتووە، ئـەبو جەعفـەری مەنصوری عەباسی بنیاتی ناوە.

بَغَرَ الريحُ بغوراً: رەشەبا هەڵیکردو باران باری.

بَغَـرَ المـاءُ الأرضَ بَغـراً: ئاوەکـە کـەمێك زەوییەکەی پاراو کرد ◦ بورەی کرد بۆئەوەی نەرم بێتەوەو بیکێڵێ.

بَغِـرَ بَغـراً: تینـووی بـوو ئاوەکـە تـێراوی نەکرد.

البَغَـرُ: دەردێکـە تینوایـەتی زیـاد دەکـاو بـــەناو تینوایەتییەکـــەی کـــەم نابێتەوە ◦ ئاوی پیس بوو.

البَغْرَةُ: کشتو کاڵ کەدوا باران بـارین بکـرێ، گڵەکـەی بەتـەڕیو شـێداری دەمێنێتەوە هەتا لەزەوی دەردێ.

بَغَـزَت الدابـةُ بغـزاً: وڵاغەکـە سمکۆڵی کردو لە ڕۆیشتنندا گورج بوو.

بَغَـزَ فـلان الدابـةَ: فلانکـەس ئـاوزەنگی لەوڵاخەکــــە دا ◦ بـــەقاچ لێیــــدا بۆئـەوەی خێـرا بـڕوا ◦ (بَغَزَ الشيءَ بالسكين) شتەکەی بەکێرد هەڵدڕی.

بَغَشَتْ السـماءُ بَغْشـاً: ئاسمـان بـارانێکی کـەمی بارانـد ◦ دەگـوترێ: (بَغَشَـت السـماءُ القـومَ والأرضَ) ئاسمـان ڕیشـنە بـارانێکی بەسـەر خـەڵكو زەویدا باراند.

بَغَش الماءُ ونحوه في الكـرة: تـەپو تـۆزو شـتی وەهـا لـە کولانەکـەوە هاتـە ژوورەوە.

بَغَشَ الصبي إلى أمه: منداڵەکە گریا بۆلای دایکیو هانای بۆ برد.

البُغَاشَـة: حەڵوایەکـە لـە ئـاردو ڕۆنو پەنیر یان قەشدە دروست دەکرێ.

البَغْشَةُ: بارانی کەمو نم نم.

بَغَـضَ الشـيءَ بُغضـاً: شـتەکەی بوغزانـدو ڕقی لێبووەوە ◦ (هو باغض وبغوض).

بَغِـضَ الشـيءَ بُغـضاً: شـتەکە بـوو بـە بوغزێندراو ڕق لێ هەڵساو.

بَغُـضَ الشـيءَ بغاضـةً وبغضَـةً: بـەمانا (بَغِضَ)یە.

أبْغَضَهُ: ڕقی لێ هەڵسا، ناخۆشی ویست.

باغَضَهُ: پاداشی دایەوە بە ڕق لێبوونو بوغزاندن لە تۆڵەی بوغز.

بَغَّضَهُ اليه: وای لێکرد ناخۆشی بوێو زۆری ڕق لێبێ.

تبـاغَضَ القـومُ: خەڵکەکـە هەنـدێکیان هەندێکیانی ناخۆش ویست.

تَبَغَّـضَ اليـه: ڕقو قـاری خـۆی بـۆ دەربڕی.

البَغْضاءُ: ئەوپەڕی ڕقو قینو قاڕ.

بَغَصَ الدم: خوێن وروژاو سەر ڕێژی کرد.

بَغِلَ بُغُولَةً: بێ عەقڵ بوو.

بَغَّـلَ القَـومَ: ژنـی لەوقەومـە هێنـاو زیانی بە نەژادو نەوەیان گەیاند.

البَغَّالُ: ئەو کەسەی سەرپەرشتی وڵاغ بکا.

البَغـــلُ: هێسـتر؛ دایکـی ماینـەو بـاوکی گوێدرێژە، (ك: أبْغَالُ).

بَغَمَت الظبيـة بُغامـاً وبُغومـاً: ئاسکەکە بە دەنگێکـی نـەرم بـۆ بێچـووەکەی

بارِانـدی، بەهـەموو خـاوەن دەنگێـك دەگـوترێ: (بَغَـمَ صَـوتُه) ٥ دەنگـی نەرمو لەسەرخۆ بوو.

**بَغَـمَ** الحـديث لفـلان: قسـەكەی بـۆ فـلاَن كـەس روون نـەكردەوە (هـو بـاغم)، (ك: بواغم).

**البُغَامُ**: دەنگی ئاسك ٥ باراندنی ئاسـك، كارمامز.

**البَغْـــوُ**: میـوە پـێش گەیشـتنی ٥ گـوڵی درەختـــی چـــقڵاوی وەكـــوو زیو شـــیلانو درِو درەختـــی تـــری لەوجۆرە.

**بغـــی** فـلان بغيـاً: فلاَنكـەس لـە سـنوور دەرچـوو ٥ لـە قورئانـدا دەفـەرموێ: ﴿فَـإِن بَغَـتْ إِحْـدَاهُمَا عَلَـى الْـأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ﴾ فيتنەو ئـاژاوەی نايـەوە، پابەنـدی ياسـاو قانوون نـەبوو ٥ بـە ئـافرەتی داوێـن پـيس دەگـوترێ: (بغـــت المـــرأة) ئافرەتەكە بەد رەوشت بوو.

**بغـی** الشّـیْءَ بُغْيـةً: داوای ئەوشـتەی كـرد، خواستی ٥ دەگوترێ: (بَغَيْتُ لك الأمر) و (بغيتـــك الأمـــر) بـــەزۆری كـــەبۆ داواكـــردنو خواســـتن بـــەكاربێ دەگوترێ: (إبتغی) واتە: دەبرِێتە بابی (افتعال)و فەرمانی لێ دروست دەكرێ.

**أبْغاهُ الشَّيْءَ**: يارمەتيدا لەسەر داواكەی ٥ دەشگوترێ: (أَبْغِنِي ضَـالتي): يارمـەتيم بدە بۆ دۆزينەوەی گومبوەكەم.

**باغت** المرأة مباغاةً وبغاءً: بەمانا (بَغَتْ) دێ.

**ابْتَغَـی الشَّـیْءَ**: داوای شـتەكەی كـردو هـــەوڵی دەســـتەبەر كردنـــی دا ٥ قورئان دەفـەرموێ: ﴿يبتغـون فضـلاً من الله ورضواناً﴾.

**إنْبَغَى**: وا پێويست بوو، وا بـاش بـوو ٥ دەگـوترێ: (ينبغـی لفـلان ان يفعـل كذا) واباشە فلاَنكەس ئەو كارەبكا ٥ (مـا ينبغـي لفـلان أن يفعـل كـذا): پێويست ناكا فلاَن كەس ئەوە بكا ٥ جوان نييە وابكا ٥ نابێ بيكا وەكوو قورئان دەفەرموێ: ﴿ماكان ينبغی لنا أن نتخذ من دونك من أولياء﴾.

**تباغی القومُ**: خەڵكەكە هەندێكيان بەسەر هەندێكياندا دەست درێژی كرد.

**تَبَغَّـی الشَّـیْءَ**: زێـدەرِەوی كـرد لـە داواكردنی شتەكە دا.

**الباغة**: مادەيەكی صەناعييە لە وردەی سليلۆزی كافور دروست دەكرێ، لە دروسـتكردنی فليمـی فوتوغرافيـدا بـــەكاردێ ئامـــادە باشـــی لـــەرادە بەدەری تێدايە بۆ سوتان.

**البـاغی**: سـتەمكاری بـەفيزو لوتبـەرز، سنور شكێنو يـاخی بـوو، (ك: بغـاة) دەگـوترێ: (فئة باغيـة) لـە حـەديثی پێغەمبەردا دەفـەرموێ: (وَيْلَ عمار، تقتله الفئة الباغية).

**البَغْـــيُ**: ســتەم ٥ دەرچــوون لەياســا ٥

لوتبەرزیو خۆ بەزلزانی ٥ زێدەرۆیی سنور شکاندن ٥ رزینی برینو هەوکردنو تێکچوونی ٥ دەگوترێ: (بدیء الجرحُ علی بغی) برینەکە لەسەرەوە گۆشتەوەزونی هێنایەوەو لەناوەوە پیس بووە کێمی کردووە.

البَغِيُّ: ئافرەتی داوێن پیس کە لەشفرۆشی بکا.

البُغْيَةُ والبِغْيَةُ: داخوازیو ئاوات ٥ دەگوترێ: (لِيَكُنْ بغيَتُكَ ثوابَ الآخرة) یان (لِيَكُنْ بُغْيَتُكَ الحق) ٥ هەروا دەشگوترێ: (هو ابن بُغْيَةٍ) ئەوە لە تۆوی حەرام وەدی هاتووە.

بَقْبَقَتِ القِدرُ بقبقةً: دیزەکە قلپە قلپی کرد، دەنگی قلپە قلپی کولینی دیزەکە هات.

بَقْبَقَ الماءُ عند نزوله في القلة ونحوه: ئاوەکە لەکاتی هاتنە دەرەوەی لە جەرەکە قلپە قلپی کرد.

بَقْبَقَ الرجلُ: پیاوەکە زۆری قسە کرد ٥ (بقبق علينا الكلامَ) قسەی پرو پوچو بێ‌مانای بەسەردا فرێ داین.

البَقْبَاقُ: دەمو لێو.

بَقَرَ البطنَ ونحوه: ورگی هەلدری.

بَقَرَت الفتنة القومَ: فیتنەو ئاشووب ئەو هۆزەی پەرتو بلاو کرد ٥ لە حەدیثی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: (ستاتي على الناس فتنةٌ باقرةٌ تدع الحليم حيرانَ).

بَقَرَ الأرضَ: زەوییەکەی پشکنیو شوێنی ئاوەکەی دۆزییەوە.

بَقَرَ المسألة: لە مەسەلەکەی کۆلیەوە ٥ دەگوترێ: (بقر في بني فلان) لەکارو باریانی کۆلیەوەو حالو وەزعی ئەوانی زانی.

بَقِرَ البطنُ: سکی هەلدرا ٥ هەروا دەگوترێ: (بَقِرَ الرجلُ) پیاوەکە گا کیوی بینینو لەنکاو چاوی پێکەوتنو واقی ورماو عەقلی تێك چوو.

انْبَقَرَ: هەلدرا (تَبَقَّرَ) هەلدرا.

تَبَقَّرَ في الكلام: زۆری قسە کردنو زۆری درێژە پێدا.

تَبَقَّرَ في العلم والمال: زانیاریو مالو سامانی خۆی پەرەپێدا، زۆری کرد.

الأُبَيْقِرُ: پیاوێکە نە خێری هەیە نە شەڕ نە پیاوەتی پێ دەکرێ نە شەڕی لێ چاوەڕوان دەکرێ ٥ رەگێکە لە مۆقی چاودا ٥ کۆمەلی حوشترو شوانەکانیان.

البَقَرُ: رەشە ولاخ بەهەموو جۆرەکانیەوە بە مالیو کێوییەوە.

بَقَرُ الماء: ماسییەکە دەشوبهێتە رەشە ولاخ.

البَقَّار: بەخێوکاری رەشە ولاخ (شوانی گاران).

البقير: حوشتری ئاوسی وەها سکی هەلبدرێو بێچووەکەی دەربکەوێ ٥

بێچـوەکە بێتـەدەر بـەپز دانـەوە ٥ کراسـێکە پەخەکـەی سەرانسـەر دەکرێتەوە، قۆڵی نییە.

البَقْسُ: درەختێکە دەشوبهێتە درەختی ئاس دارەکـەی رەقو سـەختە بـرێ ئـامێری جۆراو جۆری لێ دروست دەکرێ.

بُقْسُمَاط: ناوە بۆ جۆرێك نان.

بَقَـطَ متاعَـهُ بَقْطـاً: کـەلو پەلـەکانی کۆکردنەوەو بەستنی.

بَقَـطَ الرَجُـلَ: بـاغێکی دا بـە پیاوەکـە بۆئەوەی بـە سێیەك یـان بـە چوار یەك بەخێوی بکا.

بَقَّطَ: پەلەی کرد ٥ (بَقَّطَ الجبـل) چووە سەر کێوەکە.

تَـبَقَّطَ الخَبَـرَ: وردە وردە هەواڵەکـەی وەرگرت.

اَلْبَقْطُ: کەلو پەلی ناومالْ ٥ کۆمـەڵێك لـە خەڵك.

الـبَقَطُ: ئـەو میوەیەیـە لـەکاتی رنـینو چـنینی درەختەکـەدا هەڵـدەوەریو دەکەوێتە سەر زەوی.

بَقِعَ الجلدُ بَقَعاً: پێستی جەستەی پەڵە پەڵە بـوو، رەنگێکـی تـری تێکـەڵاو بـوو ٥ دەگوترێ: (هو أبْقَعُ وهي بقعاء).

بَقِـعَ المُسْـتَقِي: ئـاوی بەسـەر جەسـتەی خۆیـدا کـرد ٥ چـەند شوێنێکی لـە جەستە تەڕبوو.

بَقَّعَـهُ: جەسـتەی پەڵـە پەڵـە کـرد ٥ دەگـوترێ: (بَقَّـعَ المطـرُ الأرضَ) بارانەکـە هـەموو وڵاتـی نەگرتـەوە پەڵە پەڵە لێی باری.

بَقَّـعَ الصـبغُ الثـوبَ: بۆیەکـە هـەموو کراسەکەی رەنگ نەکرد.

تَبَقَّعَ: پەڵە پەڵاوی بوو.

اَلْاَبْقَعُ: بەڵەك ٥ بەردە سیخڕۆ.

الباقِعـةُ: بـەڵای گـەورە، زۆرزانو وریـا ٥ دەگوترێ: (رجل باقِعَة) پیاوێکی وریـاو فێڵـزانو هەمیشـە بـەئاگاو حـەزەرە. (طائر باقِعَة) باڵندەیـەکی وریـا کـە ئـاو دەخواتــەوە خێــرا خێـرا بۆئــەم لاو ئەولای خۆی دەڕوانێ.

البَقْعَاء: زەوی کە بـەردی پچوك پچوکی تێـدا بـن ٥ دەگـوترێ: (سـنة بَقْعَـاءُ): سـاڵێکە هەنـدێ بـەروبوومی باشـەو هەنـدێکی خراپـە ٥ هـەم هەرزانییـە هەم گرانی.

البَقْعَـةُ: پارچـە زەوییەکـە بەهەنـدێ تایبەتمەنـــدی لـــە زەوییـــەکانی دەوروبـــەری جیابکرێتـــــەوە ٥ پارچـەیەك لـە رەنـگ پێچـەوانەی رەنگەکانی دەوروبەری بێ.

البقيع: وڵاتێکی مـەزراو بـەر فـراوانو درەختـی جـۆراو جـۆری تێـدا بـێ ٥ گۆڕسـتانێکە لـە مەدینـە نزیـك مزگەوتی پێغەمبەر (د.خ).

بَقَّ الرجـل بقـاً: پیاوەکـە زۆری قسـەکردن بە چاكو بەخراپ.

بَقَّ المرأة: ئافرەتەکە منداڵی زۆر بـوون ٥ (بَقَّتِ السماءُ): ئاسمان بارانی بارانـد بە خوڕەو لێزمە.

بَقَّ المكان: شوێنەکە مێشوولەی زۆربوو.

بَقَّ الجرابَ: کوندەکەی دڕی، چی تێدابوو دەری هێنا.

بَقَّ الكلامَ: بە دەنگی بەرز قسەی کرد ٥ (بَقَّ الخبرَ) هەواڵەکەی بڵاو کردەوە.

بَقَّ المالَ: ماڵو سامانەکەی بڵاوە پێکردو لەدەستی دا.

أبَقَّ الرجلُ والمرأةُ والسماءُ والمكان: بەمانا (بَقَّ)ەیە.

بَقَّ خيراً أو شراً: زۆری خێر یان شەڕ.

بَقّقَ المكانُ: بەمانا (بَقَّ)یە.

البَقّاقُ: کاڵای خراپی ناو ماڵ.

البَقُّ: پانو پۆرو بەرفراوان ٥ ئاشکراو عەیان ٥ مێشولەو هەر باڵندەیەکی لەو جۆرەبێ.

البَقّاق: زۆر بڵێ.

المِبَقُّ من الرجال: پیاوی زۆر بڵێو چەقە چەناو.

المِبَقّةُ: ژنی زۆر بڵێو چەقە چەناو.

بَقَلَ الشيْءُ بقلاً: دەرکەوت (بقلت الأرضُ): زەوی گژو گیای خۆی رواند ٥ (بقل المرعى) پاوانو لەوەڕگاکە سەوز بوو.

بَقَلَ وجه الغلام: دەمو چاوی ئەو کوڕە مووی لێ دەرکەوتن، ریشی هات.

بَقَلَ الماشِيَةَ: گژوگیای بۆ ئاژەڵەکان کۆکردەوە.

أبْقَلَ: بەمانا (بَقَلَ) هاتووە.

أبْقَلَ القومُ: خەڵکەکە گژوگیایان دەست کەوت ٥ ئاژەڵەکانیان لەناو گژوگیادا لەوەڕاند.

بَقّلَ الشجرُ: لە ئەملاو ئەولای درەختەکەدا گەڵای سەوزی بەهار دەرکەوت کە دەشوبهێتە نینۆکی باڵندە ٥ (بَقّلَ الماشيةَ) گژوگیای دەرخواردی ئاژەڵەکانیدا ٥ (بَقّل النباتَ) ئەو روەکەی بە بەقل حیساب کرد.

ابتَقَلَتِ الماشيةُ: لە گژوگیادا ئاژەڵەکانی لەوەڕان.

ابْتَقَلَ القومُ: ئەو هۆزە بەقلیان دا بە ئاژەڵەکانیان، ئاژەڵەکانیان لەناو گیای بەقلدا لە وەڕاند.

تَبَقَّلَتِ الماشيةُ: ئاژەڵەکان بەقلیان خواردو قەڵەو بوون.

تَبَقَّلَ الرجلُ: پیاوەکە چووە دەر بۆ بەدەستهێنانی بەقل.

الباقلاء: پاقلە (گیایەکە بەرەکەی دەکوڵێندرێو دەخورێ)

الباقلى: بەمانا (الباقلاء)ە.

الباقول: گۆزەیەکە بێ دەسک، (ك: بواقيل)ە.

البَقْلُ: روەکێکە ئادەمیزاد دەیکاتە بژێوی خۆی یان بەشێکی لێ هەڵدەبژێرێو خواردەمەنی لێ دروست دەکا، (ك: بقول)ە.

البَقّالُ: بەقاڵ، سەوزەو میوە فرۆش.

المَبْقَلَةُ: شوێنی بەقل.

بقلاوة: پاقلاوە.

**تَبَقَّمَتِ الغَنَمُ**: مەڕوبزنەكان بێچوەكانیان لە سكیانا زل بوون‌و قورس بوون‌و نەیانتوانی لە ئاغەڵ‌و شوێنی خۆیان هەڵسن.

**اَلْبَقَّمُ**: گیایەكی دەرمانییە پزیشك سوودی لێوەردەگرن، لە بنەڕەتدا گیایەكی هیندییە.

**بقی الشّيءُ بقاءً**: بەردەوام بوو جێگیربوو (بَقِيَ من الشّيءِ) زیادەبوو لێی ٥ لێی مایەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وذروا مابقي من الربا﴾ ٥ ئەو سوودەی وەرتان نەگرتووە وازی لێ بێنن.

**اَبْقى على الشّيءِ**: پارێزگاری شتەكەی كرد ٥ دەگوترێ: (أبقى على فلان) بەزەیی بە فلان كەسدا هاتەوەو سۆزی بۆ دەربڕی ٥ هەروا دەگوترێ: (أبقَتِ الخيلُ): ئەسپەكەی هەندێ توانای ڕۆیشتنی خۆی هێشتەوە هەموو هێزو توانای خۆی بەكارنەهێنا ٥ (أبقت الأرضُ) زەوییەكە هەموو ئاوەكەی هەڵنەمژی (أبقى الشّيءَ) شتەكەی وەكوو خۆی هێشتەوە.

**بَقّاه**: وازی لێ هێناو تەركی كرد.

**تَبَقّى منه**: لێی مایەوە، لێی زیادبوو ٥ (تَبَقّى الشّيءَ) هەوڵیدا ئەوشتە بهێڵێتەوە.

**استبقاه**: ویستی بیهێڵێتەوە ٥ دەگوترێ: (استبقى أخاه) چاوپۆشی لە هەڵەی براكەی كرد بۆئەوەی برایەتی‌و خۆشەویستییان بەردەوام بێ.

**الأبقى**: بەردەوام‌و بەردەوام تر: لە قورئان دەفەرموێ: ﴿والآخرة خير وأبقى﴾.

**الباقي**: بەردەوام‌و نەگۆڕاو ٥ ناوێكە لەناوە جوانەكانی خودا.

**الباقية**: ماوەو پەزمەندە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَهَلْ تَرَى لَهُم مِّن بَاقِيَةٍ﴾ ٥ (الحياة الباقية) ژیانی دوارۆژ.

**البُقْيا**: هێشتنەوە.

**البَقِيَّةُ**: پاشماوەی شت ٥ ماوەو پەزمەندە كراو.

**بَكَأَتِ البئرُ بَكْئاً**: بیرەكە ئاوەكەی كەم بوو ٥ (بكأ الحيوان الحلوب): ئاژەڵەشیردەرەكە شیری كەمبوو.

**بَكُؤَ الرجُلُ بكاءةً وبُكْئاً**: پیاوەكە قسەی كەم بوو، قسەی كەمی كرد ٥ (هو بكيء)، (ك: بكاءٌ) ٥ (هي بَكيءُ وبكيئة).

**اَبْكَأَ فلانٌ**: فلان كەس خێرو بێری كەم بوو.

**بَكبَكَ الشّيءَ**: شتەكە هەژاندی ٥ هەندێ لەشتەكانی بەسەریەك دا دا.

**البَكْبَكَةُ**: هاتن‌و ڕۆیشتن‌و قەرەباڵغی.

**بَكَتَهُ بَكْتاً**: لێیدا، بە هەڵس‌و كەوتێكی ناجوان بەرەنگاری بووە ٥ بەبەڵگە بۆڕی دا، سەری كوتایەوەو سەرزەنشتی كرد.

بَكْتَةُ: بۆ موبالەغەیە لە (بَكْتَةُ).
بَكَرَ بكوراً: بەیانی زوو لەماڵ دەرچوو ◊ پەلەی کرد زوو ڕۆیی.
بكرت الشجرةُ: درەختەکە زوو بەری پێگەیاند.
بَكِرَ بَكَراً: پەلەی کرد ◊ (أبْكَرَ) بەمانا (بَكَرَ)ەیە.
باكَرَهُ: دەست پێشخەری بۆکردو بەیانی زوو چوو بۆی.
إبْتَكَرَ: زۆری لەخۆی کرد بەیانی زوو دەرچوو.
إبْتَكَرَت المرأةُ: ئافرەتەکە یەکەم منداڵی کوڕ بوو.
ابتكر الفاكهة: نۆ نوخشەی میوەکەی وەرگرت ◊ (إبتكر الشَيْءَ) شتەکەی داهێنا.
الابكار: سەرەتای بەیانی تاکاتی ڕۆژهەڵاتن.
الباكور، الباكورة: نۆ نوخشەی میوە ◊ عەجەلەکاری لە هەموو شتێکدا.
البكارة: پەردەی کچێنی ئافرەت پێش ئەوەی شوبکا.
اَلْبَكْرُ: حوشتری تازە پێگەیشتوو جوانوە حوشتر، (ك: أبكر)ە ◊ بۆ مێینە دەگوترێ: (البَكْرَةَ) لەپەندی پێشینانداهاتووە دەڵێ: (جاءوا على بَكرةِ أبيهم) واتە: هەموویان هاتن.
اَلْبِكْرُ: نۆبەرەی هەموو شتێك ◊ یەکەم منداڵ بۆ باوكو دایك چ نێر چ مێ ◊ کچوڵە ◊ کوڕ کەژنی نەهێنابێ ◊ هەر کردەوەیەك کە لەوەپێش نەکرابێو نموونەی نەبێ ◊ دەگوترێ: (نار بكر) ئاگرێك لە ئاگری تر وەرنەگیرابێ ◊ (وطعنة بكر) برینێکی بێ وێنە ◊ (خل بكر) سرکەیەکی بەهێزو کەسکون.
البكرة: غەرغەرە ◊ پارچە دارێکی خڕی ناو کلۆرە کندرو دەزوی لەسەر هەڵدەکرێ.
البُكرةُ: سەرەتای ڕۆژ ◊ بەیانی تا ڕۆژهەڵات ◊ ڕەشە خەڵکی عەرەب بە سبحەینێ هەمووی دەڵێن: (بكرة) (باچر).
المِبْكارُ: کەسێك خوی بەوە گرتبێ هەموو ڕۆژێ بەیانی زوو لە ماڵ دەربچێ یان کارێك ئەنجام بدا.
بَكَسَ خصمَهُ: دوژمنەکەی خۆی بۆڕدا بەسەریدا زاڵ بوو.
بَكَشَ العقدة: گرێکەی کردەوە ◊ دەگوترێ: (بكش عقال بعيره) گرێی گوریسی حوشتر بەستنەوەکەی کردەوە.
البَكّاشُ: چاو بەستکارو فێڵەزانو دەستبڕ.
بَكَعَهُ بَكْعاً: بە توندی لێیدا، بەهەڵسو کەوتو قسەی ناشیرین ڕوبەڕوی بۆوە.
بَكَّ الشَيْءَ بكّاً وبَكّةً: کوتاییو ونجڕ ونجڕی کرد، دەگوترێ: (بَكَّ عنقه)

ملی شکاند، (بك الرجلَ) پیاوەکەی چەماندو ژێرباری کرد لەپۆتی داو شکاندی، کەسایەتی روشاند ٥ (بَكَّ الدابةَ) باری قورسی لەولاخەکە بارکردو بەزەخت لێی خوڕی.

**تَبَاكَ الجمعُ:** هەندێکیان پاڵە پەستۆی هەندێکیاندا.

**اَلْبَاكُ:** ئەحمەق و زۆر بلێ و چەقە چەناو کەسێك جوداوازی نێوان چاك و خراپ و راست و ناراست نەکا.

**بَكَّةَ:** مەککە، (شاری مەککەی پیرۆز).

**بَكَلَ الشَّئَ بَكْلاً:** شتەکەی تێکەڵ و پێکەڵ کرد، قسەکەی بە پێچەوانەوە گێڕایەوە.

**بَكَّلَ:** بۆ موبالەغەی (بَكَلَ)ەیە ٥ دەشگوترێ: (بَكِّلَ علینا حدیثە) قسەکانی لێ چەواشە کردین و تێکەڵ و پێکەڵی کردن.

**تَبَكَّلَ في الكلام:** قسەکانی تێکەڵ و پێکەڵ کردن (تَبَكَّلَ في مشیە) لەرۆیشتن دا خۆی راوەشاندو فیزی کرد.

**البَكَّالَةُ:** خواردەمەنییەکە لە ئاردو قاوت و ئاوو رۆن دروست دەکرێ.

**اَلْبَكْلُ:** دەسکەوتی شەڕ.

**اَلْبِكْلَةُ:** شێوەو روخسارو سەرو شکڵ.

**البكیلة:** بەمانا (البكالة) هاتووە.

**بَكِمَ الرجل بَكَماً:** پیاوەکە نەیتوانی قسە بکا، لاڵە، بە سروشت زمانی ئاخاوتنی نیە ٥ وادەبێ بە کەسێك دەگوترێ: (بَكَمَ) کە ناتوانێ بەجوانی رای خۆی دەربڕێ ٥ (هو أبكم وهي بكماء).

**بَكُمَ بُكامةً:** لە قسەکانی بڕییەوە جا بەئەنقەست یان نەیتوانی درێژە بە وتارەکەی بدا.

**بَكَیَ بَكْیَ وبُكاءَ:** دوو چاوی بەهۆی خەمەوە فرمێسکیان باراند ٥ دەگوترێ: (بَكى المیتَ وعلیه وله.) بۆ مردووەکە گریا، لاواندیەوە ٥ کەسێکیش زۆر بگری پێی دەگوترێ: (بَكِیٌّ) و (بَكَّاء).

**أَبْكاه:** وای لێکرد گریا (بَكَّاه) گریاندی.

**تَباكی:** خۆی گریاند.

**إسْتَبْكاهُ:** وەکوڵی گریانی هێنا.

**التَّبْكَاءُ:** زۆر گریان.

**البلاتین:** مادەیەکە فلزی بەنرخەو رەنگی زیوی هەیە.

**البلازما:** بەشێك لەخوێنی رۆیشتوو.

**بَلْبَلَ المتاعَ بلبلةً وبلبالاً:** کاڵاکەی پەرت و بڵاو کردەوەو تەفرو تونای کرد.

**بَلْبَلَ القومَ:** هۆزو خێڵەکەی خستۆتە نێو تێکرو تێکوشیوەوە هەریەکەیان رایەکی هەیەو لە ئاوازێك لێدەدا.

**بَلْبَلَ فلاناً:** فلان کەسی خستە ناو خەفەت و دڵە راوکێ و پەژارەوە.

**بَلْبَلَ اللهُ اَلْسِنةَ اَلْخَلْقِ:** خودا زوبانی خەڵکی جودا جودا کردووە.

بوقال
مبضع
مبشرة
برميل
برنيطة
برواز
برمانية
بربة
بركان
مبراة
بارومتر
بطة
البطين الأيسر
البطين الأيمن
بكرة
بطارية كهربائية
مبرومة
بزرة
برنس
بريمة
بزال
بكرة
بركار
بكلة
بطاطا صينية
بقدونس
بركية
بطباط
بطاطا
بقس
بقم
بطاطا حلوة
بطيخ
بصل الفار
بغونيا
بسلّ
بصلة
بزاقة
باشق
بطة
بعوضة
بطيخ اصفر
بقر هندي
بقرة
بقة
بطريق
بقر الماء

تَبَلْبَلَ: بۆ موطاوەعەیە.

اَلْبَلْبَالُ والْبَلْبَالَةُ: ئەوپەڕی غەمو ناڕەحەتیو دڵە ڕاوکێ.

اَلْبُلْبُلُ: بولبول باڵندەیەکی پچوکو دەنگ خۆشە دەنگ خۆشییەکەی بە نموونە دەهێندرێتەوە ٥ بە لولەی مەسینەش دەگوترێ: بولبول، (ك: بَلابِل).

اَلْبُلْبُولُ: باڵندەیەکی ئاوییە لەبرێ وەرزی ساڵدا لەشاری (دمیاط)ی میصر زۆر دەبێ.

بَلَتَ بَلْتاً: دابڕا.

بَلَتَ الرجلُ: پیاوەکە لە قسەکردن کەوت ٥ (بَلَتَ الشَّيْءَ) شتەکەی بڕیەوە، پچڕاندی، دابڕی.

بَلِتَ: بەمانا (بَلَتَ) دێ.

بَلُتَ بَلاَتَةً: فەصیح بوو (هو بليت وهي بليتة).

أَبْلَتَ الرجلُ: پیاوەکە بەبەڵگە دەم کوتی کردو نەیهێشت قسە بکا.

أَبْلَتَ فلاناً يميناً: فلانکەسی سوێنددا.

تَبَلْتَعَ: خۆی بە لێزانو نەجیبو وەجاخزادەو قسە ماقوڵ زانیو لافی هۆشیاری عاقڵمەندی لێدا.

بَلَجَ الصبح بلوجاً: بەیانیدا، گزنگی بەیانی دەرکەوت ٥ (بَلَجَ الحقُّ) حەقو ڕاستی دەرکەوت ٥ (بَلَجَ البابَ) دەرگاکەی کردەوە.

بَلِجَ وَجْهُهُ بَلَجاً: لە خۆشیاندا دەمو چاوی گەشایەوە.

بَلِجَ صدرُهُ: سنگی فراوان بوو ٥ (هو أبلج وهي بلجاء).

أَبْلَجَ: بوو بەخاوەنی ڕوناکی ٥ (أبلج الصبح) بەیانی دەرکەوت.

أَبْلَجَ الحقُّ: حەق ئاشکرا بوو.

ابْلَجت الشمسُ: خۆر دەرکەوت ٥ (أَبْلَجَ الأمر): ئیشەکەی ڕون کردەوە.

ابْتَلَجَ، إنْبَلَجَ، تَبَلَّجَ: بەمانا (بَلَجَ)ەیە.

اَلْبُلْجَةُ: ڕوناکی خۆر لەکاتی گزنگی بەیاندا ٥ سپیایەتی نێوان دوو برۆ، سپیایی نێوان زوڵفو گوێچکە.

بَلَحَ بَلْحاً وبلوحاً: ماندوو بوو عاجزبوو.

بَلَحَ البئرُ: ئاوەکەی نەما ٥ (بَلَحَ بشهادته:) شایەتییەکەی شاردەوە.

أَبْلَحَت النخلة: دارخورماکە خورماکانی پێوەینی مزربوو.

أَبْلَحَ الأمر فلاناً: فلانکەسی ماندوکرد، دەسەوەسانی کرد.

بالَحَ القَوْمَ: بەربەرەکانی کردن بەناحەق بەسەریاندا زاڵ بوو.

بَلَّحَ: ماندوو بوو لەکارەکە دابڕا.

تبالَحا: ئینکاری یەکتریان کرد.

اَلْبَلَحُ: بەروبوومی خورما هەتا سەوز بێو پێنەگەیشتبێ.

بَلِخَ بَلَخاً: فیزی نواند، خۆی بەزلزانی، شانازی کرد بە خراپەکاریو بێدینی ٥ (هو أَبْلَخُ وهي بَلْخَاءُ).

تَبَلَّخَ: تەکەببوری کرد.

تَبَلَّخَ: قەبە بوو، گۆشتی زۆر بوو.

بَلَدَ بالمكان بَلوداً: ئەو شوێنەی کردە نیشتمانو وڵاتی خۆی.

بَلِدَ بَلَداً: تێگەیشتنی کەم بوو، نیشاتو هێزی لاوازبوو ٥ گەردن کەچ بوو ستەمی قبوڵ کرد.

أبْلَدَ: پاڵی لێدایەوە کارێکی بۆخۆی ئەنجام نەدا ٥ بێ عەقڵو کاڵفام بوو ٥ (أبْلَدَ بالمكان) ئەو شوێنەی کردە وڵاتی خۆی.

أبْلَدَ فلاناً البَلَدَ: ئەو وڵاتەی خستە ئەستۆی فلان کەس ٥ بە تۆپزی لەوێندەرێی نیشتەجێی کرد.

بَلَّدَ: لەکارەکەیدا کەمتەرخەم بوو وازی لێ هێنا ٥ لەبەر لاوازی کەوتە سەر زەوی ٥ (بَلَّدَ الفرسُ) ئەسپەکە لە غاردانیدا پێش نەکەوت.

بَلَّدَ السحابُ: هەورەکە بارانی نەباراند ٥ (بَلَّدَ فلان) فلان کەس نەجوڵا.

تَبَلَّدَ: گێلو کاڵفام بوو ٥ خۆی بەگێل خستە ناوەوە.

البَلَدُ والبَلْدَة: شوێنێکی سنووردار (شارەوانی دیاربێ) شوێنی بەرفراوان پێی دەگوترێ: (البَلَد) لە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالْبَلَدُ الطيب يخرجُ نباته باذن ربه﴾.

ألْبَلَديّ: ئەوکەسەی پاڵ شار دەدرێ، واتە: شارەستانی.

البلدية: شارەوانی (دەزگایەکی رەسمی دەسەڵات پێدراوە کارو باری شارو سنورەکانی لەئەستۆ دەگرێ).

البليد: کەسێکە لە زیرەکی بێ بەش بێو کارو باری خۆی پێ هەڵنەسوڕێ.

بَلْدَحَ: ماندو کول بوو نەیزانی رێبازی راستی خۆی بگرێتە بەر ٥ وادەی داو نەیبردە سەر، خۆی تەمبەڵی هەڵبژاردو پاڵی لێ دایەوە.

تَبَلْدَحَ: وادەی داو نەیبردە سەر.

البَلْدَحُ: ئافرەتی قەڵەو زەبەللاح.

بَلْدَمَ: لەترسان خوستی لەخۆی بڕی.

البَلْدَمُ: گەروو هەرچی پەیوەندی بە گەرووەوە هەیە لە بۆری هەناسەو ئەوشتانە ٥ شمشێری کولو نەبڕ.

بَلْوَرَهُ: کردی بە بلورات ٥ مەسەلەکە یان فکرەو بۆچوونەکەی پاڵفتە کردو گرێ کوێرەکەی تێدا نەهێشت.

تَبَلْوَرَ: بۆ موطاوعەی (بَلْوَرَ) هاتووە.

البَلُّورُ، البِلَّوْرُ: بەردێکی سپی شەففافە ٥ جۆرێکە لە شوشە.

البَلاَّسُ: پەلاس؛ جۆرە پۆشاکێکی زبری ئەستوورە.

أبْلَسَ: لەبەر شەرم کردنو واق ورمان یان بێ بەڵگەیی زمانی گیراو قسەی پێنەکرا.

البَلَسُ: جۆرە هەنجیرێکە.

البُلُسُ: نیسك.

البَلَسَانُ: درەختێکە گوڵێکی سپی پچوکی لە شێوەی هێشوو هەیە ٥ لە

پێڕی درەختە بخوریییەکانە، لەبڕێ جۆرەکانی ئەو درەختە ڕۆنێکی بۆنخۆش دەردەهێندرێ لەناوچەی (عين شمس)ی قاهیرە دەڕوێ.

بَلْسَمَ: سەری داخست، دەمو چاوی گرژو مۆن بوو.

تَبَلْسَمَ: بەمانا (بَلْسَمَ)ەیە.

اَلْبَلْسَمُ: جۆرە درەختێکە (یان بڵێ پێڕی ئەو درەختانەیە) کە لەلق و قەدەکانیان برینداربکرێ بنێشت و لینجاییەك دەردەدەن بۆ بواری پزیشکی سودی لێ وەردەگیرێ، ئەم جۆرە درەختە بە زۆری لە وڵاتە گەرمە سێرەکاندا دەڕوێ ٥ درەختی دارە بەن دار قەزوان لەو پێڕەیە.

اَلْبُلْسُنُ: نیسك.

اَلْبَلْشَفیة: ڕێبازێکی شیوعییە پێی وایە محاڵە کۆمەڵگا یەکسەر لە یاسای سەرمایەدارییەوە بازبدا بۆ یاسای شیوعی، بەڵکو پێویستە قۆناغێکی گواستنەوەو (إنتقالی) هەبێ تێیدا یاسای هەرەوەزی پەیڕەو بکرێ.

بَلَصَهُ من المال: هیچی ماڵو سامان بۆ نەهێشتەوە هەمووی بۆخۆی برد.

بَالَصَهُ: هەڵمەتی بۆ برد.

بَلَّصَهُ: بەمانا (بَلَصَهُ)دێ.

تَبَلَّصَ الشَّيْءَ ولَه: بەنهێنی داوای لێکرد بە نهێنی بەدوایدا گەڕا بۆنەوەی بیدۆزێتەوە.

اَلْبَلاَّصِيُّ: جەرڕەیەکە دوو قولفەی هەیە بۆنەوەی ئاوو شلەمەنی تری پێ بگوێزرێتەوە ٥ وا دەبێ وشەکە سوك دەکرێ (یا)کەی لێ دەکرێتەوە دەگوترێ: (اَلْبَلاَّصُ).

بَلَطَ الدارَ بَلْطا: خانووەکەی ڕەصیف کرد (بەردی لە تەختی خانووەکەدا ڕیزبەند کردوو ڕایخست).

بَلَطَ الأرضَ أو الحائِط: تەختی زەوییەکە یان دیوارەکەی ڕێك خست، ڕاستەو پاستەی کرد.

اَبْلَطَ الرجلُ: پیاوەکە پاڵی لێ دایەوەو تەمبەڵو تەوەزەل بوو دەستی بۆ کارێك نەبرد ٥ مایە پوچ بوو ئیفلاسی کرد هیچی نەما.

اَبْلَطَ الدارَ: بەمانا (بَلَطَ)دێ.

اَبْلَطَ المَطَرُ الأرضَ: بارانەکە زەوییەکەی شتەوە تەپو تۆزی پێوە نەهێشت گەیاندییە سەر ساخیو ڕەقایی.

اَبْلَطَ اللِّصُّ فلاناً: دزەکە هیچی بۆ فلان کەس نەهێشتەوە هەمووی برد.

بَالَطَ في أمرِهِ: لەکارو باری خۆیدا زێدە ڕۆیی کردو زۆر تێکۆشا.

بَالَطَ فلاناً: وازی لەفلانکەس هێناو هەڵات ٥ زۆرانبازی لەگەڵ کردو چەمبەرەیان تێك وەرهێنا ٥ شەڕی لەگەڵ کرد.

بَلَّطَ: لە ڕۆیشتنداماندوو بوو.

بَلَّطَ الدار والأرضَ والحائِطَ: ڕەصیفی کرد، ڕێکی خست.

**بَلَّطَ أُذُنَهُ**: پەلە پیتکەی لە گوێچکەیدا ئازاری پێگەیاند.

**تَبَالطوا بالسيوف**: بەپێوە شەڕە شمشێریان کردو بەرەنگاری یەکتر بونەوە.

**السَّلاَطُ**: جۆرە بەردێکە زەوی پێ دادەپۆشرێ دیواری پێ ڕێك دەخرێ دیکۆری پێ دەکرێ ◦ (بەردی حەلان بەردی مەڕ مەڕ) جۆرێکە لەو بەردە.

**البَلاَطُ من الأرض**: زەوییەکی ساغو ڕەق کە بارانو لافاو تەپو تۆزی پێوە نەهێشتبێ.

**السَّلاَطُ**: باڵە خانەی پاشاو دارو دەستەکەی.

**البَلْطُ**: برمەند، ئاسنێکە، کارتیخێکە کاری تیژکردنەوەو خرکردنو ڕاستەو پاستەکردنی پێ ئەنجام دەدرێ.

**اَلبَلْطَةُ**: جۆرە پاچێکە داروشتی لەوجۆرەی پێ دەبڕدرێ.

**اَلبُلْطِيُّ**: ماسییەکە لە پێڕی (بوڵتیەکان) بە توێکڵێکی برزانگی یان شانەیی جەستەی داپۆشراوە ◦ لە ڕوباری نیلو هەندێ دەریاچەی میصرداو ئاوە شیرینەکانی شامدا هەیە.

**البلوط**: دار بەڕو دار وێڵ، (وێوڵ) درەختێکی گەورەیە قەد ئەستورە لە پێڕی درەختی بەڕواوییە، لەکوێستانی گەلاڵەی شینکایەتی زۆرە.

**بَلْطَحَ**: لەسەر پشت لەسەر زەوی ڕاکشا.

**بَلَعَ الماءَ والريقَ — بَلْعاً**: ئاوەکەی خواردەوە، تفی قوت دا.

**بَلِعَ**: بەمانا (بَلَعَ)ەیە.

**اَبْلَعَهُ الشَّيْئَ**: وایکرد پیاوەکە شتەکە قوت بدات، تینی بۆ هێنا بەزۆر خواردنە تاڵەکەی پێ قوتدا.

**اَبْلِعْني ريقي**: کەمێك مۆڵەتم بدەرێ.

**بَلَّعَ الشيبُ في رأسه**: پیری لەسەرو ریشیدا دەرکەوت.

**اِبْتَلَعَهُ**: بەمانا (بَلَعَهُ)دێ.

**تَبَلَّعَهُ**: بەمانا (بَلَعَهُ)دێ.

**تَبَلَّعَهُ الشيب في رأسه**: پیری لەسەریدا دەرکەوت.

**البالوعە**: بەلوعەی ئاو، (ك: بواليع وبلاليع).

**اَلبُلَعُ من الناس**: زۆر خۆر ◦ (وسعدٌ بَلَعٌ) مەنزڵێکە لە مەنزڵەکانی مانگ.

**البُلْعَةُ**: قومە ئاو ◦ وەجبە دەرمان.

**البَلاَّعَة**: بەلوعەی ئاو.

**البَلُوعُ**: حەبو دەرمانێك قوت بدرێ ◦ زەرفو حاجەتی پانو پۆڕ هەرچی تێی بهاوی قوتی دەدا.

**اَلبُلْعُمُ والبُلْعُومُ**: ڕێڕەوی خۆراك لە گەروودا ◦ ڕێڕەوی ئاو لەناو زەویدا، (ك: بلاعم وبلاعيم).

**بَلَغَ الشجرُ بَلوغاً وبلاغاً**: وەختی ڕنینو چنینی بەروبوومی درەختەکە هات ◦ (بَلَغَ الغلام) کوڕەکە باڵغ بوو، پێگەیی.

**بَلَغَ الأمر**: کارەکە بە کۆتا گەیی.

**بَلُغَ بلاغةً**: زمانی ڕەوان بوو قسەو وتاری

شیرین‌و خۆش بوو دەگوترێ: (هو بليغ وهي بليغة)، (ك: بُلغاء) ٥ وادەبێ دەگوترێ: (بَلُغَ الكلامُ) قسەکەی بەلیغ‌و ڕەوانە.

أبْلَغَهُ الشيْءَ: ئەوە شتەی گەیاندە شوێنی خۆی.

بَالَغَ فيه مبالغةً وبلاغاً: هەوڵی تێکۆشانی تێدا کردو زێدەڕۆیی لەهەوڵ‌و تەقەلاکانیدا کرد.

بَلَّغَ الشيب في رأسه: پیری لەسەر دەرکەوت.

بَلَّغَ الفارسُ: سوارەکە دەستی جڵەوی درێژکرد بۆئەوەی ئەسپەکە زیاتر غاربدا.

تَبَالَغَ فيه الهمُّ والمرضُ: غەم‌و نەخۆشی ئەو گەیشتە ئەوپەڕی.

تَبَالَغَ في كلامِهِ: بەزۆر ویستی زمان ڕەوان بێ‌و وتەکانی بەلیغ بن.

تَبَلَّغَ بكذا: ئیکتیفای پێکرد ٥ (تبلَّغَ الشَّيْءَ) بەزۆر ناڕەحەتی‌و هەوڵدان بۆی پێگەیی ٥ کۆڵی نەدا تا بەدەستی هێنا.

البلاغ: پێ ڕاگەیاندن وەکوو: (هذا بلاغ للناس) یان ئەوشتەیە کە بەهۆیەوە دەگەیە مەبەست ٥ دەگوترێ: (في هذا الأمر بلاغ) لەم کارەدا کیفایەتە چیدی پێویست نییە ٥ هەروا وشەی (البلاغ) بریتییە لە بڵاوکراوەیەك بەیانێك کە دەخوێندرێتەوەو خەڵك پێی دەزانن.

البلاغة: ئەوەیە مەبەستەکە جوان رابنوێنێ‌و قسەکانیش کاریگەربن ٥ لەلای زانایانی بەلاغە ٥ ئەوەیە وتارەکە لەگەڵ داخوازی حاڵ‌و مەقام یەك بگرێتەوەو رستەکانیشی فەصیح‌و ڕەوان بن.

البُلْغَةُ: ئەوەیە پێداویستی جێبەجێ بکاو لێی زیاد نەبێ ٥ جۆرە پێڵاوێکە لە وڵاتی مەغریب.

التَّبْلِغَةُ: حەبلێکە لە دۆڵچە دەبەسترێ تا دەگاتە ئاوی ناوبیرەکە.

البلوغ: باڵقی ٥ پێگەیشتنی کۆئەندامی زاوزێ لە پیاوو ئافرەتدا.

الْمَبْلَغُ: سەرەنجام‌و کۆتایی، دەگوترێ: (بَلَغَ مَبْلَغَ فلان، بلغ مبلغ الرجال) ئەندازەیەك لە ماڵ‌و سامان.

السَّبَلْغَمُ: بەڵغەم، تێکەڵەیەکە لە تێکەڵەکانی جەستە، ئیفرازاتێکە لە ڕێگەی قورگەوە دێتە ناو دەم.

بَلَقَ السيلُ الأحجار بلْقاً وبلوقاً: لافاوەکە بەردەکانی ڕادان.

بَلَقَ البابَ: دەرگاکەی هەموو کردەوە.

بَلِقَ الفرسُ ونحوه بَلَقاً وَبُلْقة: ئەسپەکە بەڵەك بوو توکی جەستەی پەڵەی ڕەش‌و سپی تێدان دەگوترێ: (هو أبْلَقُ وهي بلقاء).

الْبَلَقَ: خێمە، ڕەشماڵی دروستکراو لە موو.

بَلِقَ الرجلُ: سەرسام بوو نەیزانی چی بکا.

بَلُقَ الفرسُ، بُلَقاً وبُلْقَةً: بەمانا (بَلِقَ) دێ.

**أَبْلَقَ الفحْلُ**: ئەسپەکە وەچەو نەوەکانی بەڵەك بوون.

**بَلَّقَ ظهره بالسوط**: پشتی بە گورزو شورك دابڕی.

**إِنْبَلَقَ البابُ**: دەرگاکە کرایەوە.

**إِبْلَوْلَقَ لَوْنُهُ**: ڕەنگی بەڵەك بوو.

**اَلْبَلَقُ**: ڕەش‌و سپی لە ڕەنگدا.

**بَلِقَعَ البَلَدُ**: وڵات چۆڵ بوو هیچی تێدا نەما لە دیاردەی ئاوەدانی.

**اَلْبَلْقَعُ**: وڵات‌و زەوی خاڵی لە هەموو شتێکی دیاردەی ژیان ٥ دەگوترێ: (مکان بلقع) و (طریق بلقع)، (ك: بلاقع).

**بَلَّ من مرضه بلاً وبَلَلاً وبلولاً**: لەنەخۆشییەکەی چاك بۆوە تەندروستی هاتەوە باری جارانی.

**بَلَّ الريحُ بلولاً**: بایەکە شەونمی لەگەڵ خۆی هێنا.

**بَلَّ الشَّيْءَ بالماء ونحوه بلاً وبَلَلاً وبلالاً**: شتەکە شەونمی لێدا شەونماوی کرد.

**بَلَّ الرجل بَلَلاً**: پیاوەکە لە کێشەو ململانێدا زمان پیس‌و جنێو فرۆش بوو.

**أَبَلَّ العودُ**: چڵە دارەکە ئاوی لێ هاتە خوار (أَبَلَّ المريضُ) نەخۆشەکە چاك بوو.

**أَبَلَّ فلاناً**: ڕێکەوتی فلانی کرد بەشێوەی زمان پیس‌و جنێو فرۆش.

**بَلَّلَهُ بالماء**: شەونماوی کرد.

**اِبْتَلَّ**: تەڕ بوو، فلان کەس لە نەخۆشییەکەی ڕەها بوو ٥ وەزع‌و حاڵی باش بوو.

**تَبَلَّلَ**: بەمانا (إِبْتَلَّ)یە.

**البالَّةُ**: شەونم‌و خێرو فەڕ.

**البالول**: ئاو (اَلْبِلاَلُ) بەمانا ئاوە ٥ هەرشتێك گەرووی پێ تەڕبکرێ.

**البُلاَلَةُ**: شەونم (اَلْبُلَّةُ) بەمانا (البلالة)یە ٥ تەڕو تازەیی ڕوخساری گەنجی ٥ دەوڵەمەندی دوا هەژاری ٥ دەگوترێ: (ريح بلّة) واتە: بایەکە شێدارە، تەڕی پێوەیە.

**اَلْبُلَّةُ**: خێرو فەڕ ٥ تەندروستی خۆشگوزەرانی ٥ زمانڕەوانی‌و قسە شیرینی.

**اَلْبَلِيلَةُ**: گەنمە کوتاو (گەنم یان زورات دەکرێتە ئاوەوەو دەکوڵێندرێ‌و دەخورێ.)

**بَلِمَ بَلَمَةً**: لێوی ئەستوور بوو.

**أَبْلَمَ الرجلُ**: پیاوەکە بێ دەنگ بوو ٥ لچی ئەستوور بوو.

**بَلَّمَ**: بەمانا (أَبْلَمَ)یە ٥ (اَلْأَبْلَمُ) لیچ ئەستوور.

**البِلامُ**: لغاو، (ئاسنێکە دەکرێتە دەمی ئەسپەوە بۆ ژێر بارکردنی.)

**اَلْبَلَمُ**: بەلەم ٥ (البَلاّن): حەمام، گەرماو، ناتری گەرماو.

**اَلْبَلاّنَةُ**: ئەوکەسەی لە گەرماودا خزمەت دەکا (ناتری گەرماو).

أَلْبَلَــنطُ: بــەردێکی روخامییــە وەڵێ ئەوەندە قورس‌و پتەو نییە.
بَلِهَ بَلَهاً وبلاهــةً: عــەقڵی زەعیفـو کەمـە ٥ بێ ئاگای‌و کەم هۆشی بەسەریدا زاڵە ٥ دەگوترێ: (هو أبله وهي بلهاء).
تَبَالَــهَ: خــۆی بــەبێ عــەقڵ‌و گێــل نیشاندا.
تَبَلَّهَ: بەمانا (بَلِهَ)مبە ٥ رێگای لێ گووم بوو توشی ناخۆشی بوو.
الأَبْلَـه: دەگـوترێ: (عـیش أبْلَـه) ژیـانی خـۆش‌و نـاز پـەروەردەیی، (شـباب أبله) گەنجی نەفامی ناز پەروەردە.
بَلْهَ: (اسم فعل) فـەرمان دەگەیـەنێ، واتـە: وازی لێ بێنە.
البلهارســیا: نەخۆشــییەکە تووشــی ئـادەمیزادو ئـاژەڵ دەبـێ لـە کیسـە خوێنییەکانــــدا دەژی‌و دەچــــێتە میزەڵدانــەوە، زانایــەکی ئــەڵمانی کـەناوی (بلـهارس) ئـەو فایرۆسـەی دۆزیوەتەوە.
بلاه بلواً وبلاءً: بەتاقی کـردەوە ٥ (بـلاه الســفرُ) سـەفەرەکە مانـدووی کـرد، برستی لێ بڕی.
بَلِــــيَ الثــــوبُ وبــــلاءً: کراســـەکەی (پۆشـاکەکەی) رزی ٥ (بلــي الـدارُ) خانوەکە فەوتاو شوێنەواری نەما.
أَبْلَى في الأمر: هەوڵ‌و تەقەلای تێدا داو زۆری زێدە رۆیی لەکارەکەی دا کرد.
أبْلَى فلانـاً: فلانکەسی بـەتاقی کـردەوە ٥ دەگــوترێ: (أبــــلاه عــــذراً) زۆری عوزروبیـانووی بۆهێنایـەوە هـەتارازی کردە (أبلى الثوبُ)کراسەکەی کۆن کرد.
بــالی فلانـــاً وبـــە: زۆر گرنگــی دایــە فلانکەس.
بَلَّى الثوبَ: کراسەکەی کۆن کرد ٥ (بَلَّى السفرُ فلانـاً) سـەفەرەکە فلانکەسـی ماندوکرد.
إبْتَلاهُ: بەتاقی کردەوەو ناسی.
الـبلاءُ: ناخۆشـی‌و چـورتمێکە تووشـی ئادەمیزاد دەبێ بۆنەوەی دەربکـەوێ تاچـەند خـۆڕاگرو پشـوو درێـژە ٥ هــــــــەوڵ‌و تێکۆشــــــــانی زۆرو لەرادەبەردەر لەکارێك دا.
البلوى: بەمانا (البلاء) هاتووە.
البَلِــيُّ: کەســێکە بــەلای گــەورەی بەسەردا هاتبێ.
أَلْبَلِيَّةَ: بەلا ٥ لەسەردەمی پێش ئیسلام دا بەوحوشـترەش گـوتراوە (أَلْبَلِيَّــة) کەخاوەنەکـەی مردبـێ‌و بردبێتیـان لەســەر قەبرەکــەی بەســبیتیانەوە تامندار بۆتەوە.
أَلْبَمُّ: ژنی ئەستوری عودو کەمان.
بَنَّجَهُ: بەنجی کرد.
أَلْبَــنْجُ: گیایەکـە لـەپێری گیـاو گـزی دەرمانــە خــواردنی ئــادەمیزاد گێژدەکات، لەپێری بازنجانەکانە.
أَلْبَنَدُ: ئـالای گـەورە ٥ لـەزاراوەی یاسـاناسـان دا خاڵێکی تـەواوو سـەر بەخۆیـە لـەقانون.

**اَلْبَندَرُ**: شوێنی راوەستانی گەمیٔ لەمینادا بۆئەوەی باری لیٔ دابگیریٔ یان لیٔی باربکریٔ ٥ بەشارێکی گەورەش دەگوتریٔ کەهەندیٔ گوندو شارۆچکەی پێوە بەسترابنەوە.

**بَنْدَقَ الشَّيْءَ**: ئەوشتەی کردە بوندوقیە.

**البُنْدُقُ**: جۆرە درەختێکە لەپێری درەختە بتولییەکانە، هەندیٔ جۆری دەروێندرێن بۆبەرەکەی، هەندێکی دەروێندریٔ بۆ جوانکردنی باخ‌و رێگاو بان ٥ هەروا (البُندق) ناوە بۆگوللەو ساچمە لەقەبارەی دەنکە بوندق دا لەشەڕو راوەشکاردا دەهاوێژریٔ.

**البُنْدقِيّ**: زێری ولاتی بوندەقە ٥ (جۆرە ئالتونێکە لەولاتی بوندوقەی ئیتالیا دەردەهێندریٔ).

**البُنْدقِيَّةُ**: لولەیەکی ناو کلۆرە وەکوو لوولە تاپڕو ساچمە زەن بوندقی پیٔ دەهاوێژریٔ بۆراوە پەلەوەرو ئەو جۆرە شتانە ٥ ئامێرێکی ئاسنینە گولەی رەصاصی پیٔ دەهاوێژریٔ.

**البندولُ**: بەندۆڵ (بەندۆلی سەعات).

**بنزهير**: لەولاتی میصر بەلیمؤی ترش دەگوتریٔ.

**البِنْزِينُ**: بەنزین (شلەمەنییەکی گڕگرتووە بەهۆی پالاوتنی نەوتەوە پەیدا دەبیٔ، بەزۆری بۆکارپیٔکردنی ئەومەکینانە بەکاردیٔ کەلەناوەوە ئاگرەکەیان گەشەبکەن بۆ زۆر نەخۆشی کیم‌و زوخاوی سودی هەیە).

**البنسلينُ**: دەرمانێکە ناهێڵیٔ جەراثیم گەشەبکەن بۆ زۆر نەخۆشی کێم‌و زوخاوی سودی هەیە.

**اَلْبِنْصَرُ**: قامکی نێوان قامکی ناوەراست‌و قامکە بچکۆلە.

**اَلْبَنْطُ**: یەکەیەکی دیاریکراوە لەزارەوەی چاپ‌و چامەنی دا ئەندازەی حەرفەکانی پیٔ دیاری دەکریٔ ٥ لەزاراوەی بازارو بازرگانەکانی ولاتی میصردا بەشێکە لەسەد بەشی پارەی رییالٚ.

**اَلْبَنَفْسَجُ**: رووەکێکی گولاوی یە لەپێری (فیولا) بۆجوانی‌و بۆگوڵەکانی دەچێندریٔ، بۆنی خۆش‌و عەتراوی یە.

**بَنَّقَ عَمَلَهُ بَنْقاً**: ئیش‌و کاری خۆی بەشێوەی رێك‌و پێك‌و پلان بەرێوەبرد، دەگوتریٔ: (بَنَقَ الغَرْسَ) بەریز نەمامەکانی چەقاند.

**بَنَّكَ الخَدَمُ**: خزمەتچی یەکە نهێنی یەکانی ناومالٚی بلاٚو کردنەوە بۆخەلکانی دەرەوەی خێزانی باس کردن.

**تَبَنَّكَ بالمكان**: لەوشوێنە نیشتەجیٔ بوو جێگیر بوو، دەگوتریٔ: (تَبَنَّكَ فِي عِزِّه) لەعیززو شکۆمەندی خۆی دا راوەستا.

**البَنك**: بانق؛ فەرمانگەیەکە هەڵدەستێ بەپارەوەرگرتن‌و پارەدان بەچەند شێواز مامەڵە لەگەڵ خەڵك دەکا.

**بنكنوت**: بریتییە لەوپارچە کاغەزانەی خەڵك مامەڵەیان پێدەکەن لەشوێنی زێرو زیو ٥ وەکوو ئێستا باوە خەڵك‌و حکوومەت زێرو زیو پەزمەندە دەکەن‌و دایدەنێن لەجیاتی ئەوان دینارو لیرەو ریاڵ‌و تمەن‌و دۆلار ..هتد بەشێوەیەکی تایبەتی‌و نموونەیی چاپ دەکەن‌و مامەڵەی پێ دەکەن.

**البنكامُ**: سەعاتی رەمل.

**بَنَّ بالمكان بنّاً**: لەوشوێنە مایەوە وەگری بوو.

**أبَنَّت الدابةُ**: کارو بارکێشی حوشترەکەی ماندو کردو لەشوێنی خۆی کەوت.

**أبَنّتِ السحابة**: هەورەکە چەند رۆژێك بارانەکەی بەردەوام بوو.

**بَنَّنَ الماشية**: ئاژەڵەکەی بەستەوە دایبەست بۆئەوەی قەڵەوبێ.

**البنان**: چاوە قامك ٥ ناوی باخێکە لە (الزّهر).

**البِنُّ**: چینی بەزو پیو ٥ هەرکاتێ ئاژەڵێك قەڵەو بوو دەگوترێ: (تراكبَ جسمها بناً على بنٍّ): تەبەقە لەسەر تەبەقە بەزو پیو لەجەستەیدا سواری یەك بووە.

**البُنُّ**: دەنکی درەختێکە کەلەحەبەشەو چەند شوێنێکی تر دەڕوێ، ئەو دەنکانە دەبرژێن‌و دوایی دەهاڕدرێن‌و شەرابی بەئاگا کەرەوەیان لێ دروست دەکرێ، پێی دەگوترێ: (قاوە).

**البُنِّيُّ**: جۆرێکە لەماسی سپی بەزۆری لەروباری نیل دا هەیە ٥ پشتی زەردی مەیلەو زەیتونی یە، سکی رەنگی زیوی یە، باڵەکانی رەنگ پرتەقاڵی مەیلەو سوورە، پێشەوەی خڕو دەمی بچکۆلەیە لەهەردو تەنیشتی زەیدەیی یەك هەیە بۆزێدە هەست کردن ٥ جەستەی زۆری چقڵ تێدان.

**بَنَى الشَّيْءَ بَنْياً وبناءً وبنياناً**: دیوارەکانی بەرز کردنەوە.

**بنى مَجْدَهُ**: شکۆمەندی‌و پیاوەتی خۆی بنیات نا.

**بنى السفينة**: کەشتی یەکەی دروست کرد.

**بنى بزوجته**: ژنەکەی گواستەوە لەگەڵیا چووە پەردەی زاواو بۆکێنییەوە.

**بنى على كلامه**: پشتی بەقسەکەی بەست‌و شوێنی کەوت.

**أبْنى فلاناً**: دەسەڵاتی پێدا بۆئەوەی خانووەکەی دروست بکا.

**أبْنى بزوجته**: ژنەکەی گواستەوەو لەگەڵی دا چووە پەردەی زاواو بوکێیەوە.

**إبْتَنى**: بەمانا (بنى) یە.

إبْتَنى الرجلُ: ئەوپیاوە کوڕی بوون، چەند کوڕێکی هەیە.
إنْبَنَى: خانوەکە دروست بوو ٥ (بۆ مطاوعەی (بنی) هاتووە).
تَبَنِّيْ الجِسمُ: جەستەی تێکسمڕاو گۆشتن بوو (لبنی فلاناً) فلانکەس فلانی کردە کوڕی خۆی.
اسْتَبْنَتِ الدارُ: خانوەکە روخاو پێویستی بەتازە کردنەوە هەیە.
الإبن: منداڵی نێرینە.
إبن الحرب: پیاوی ئازا ٥ (ابن الليل وابن الطريق): دزو جەردە ٥ (ابن السبيل): رێبوارو کاروانچی ٥ (ابن آوى) چەقەڵ ٥ هەروا (ابن عرس)و (ابن لبون)و (ابن مخاض) ... هتد.
الأبناءُ: کوڕەکان، کوڕگەل ٥ وەچەو نەوەی هۆزێکی فارس کەلەیەمەن دا ژیاوە و لەگەڵ عەرەب دا ژن‌و ژنخوازییان کردوە.
إبْنُمُ: لۆغەتێکە لە (ابن) پیتی نونەکە بەسەرو ژێرو بۆر دەخوێندرێتەوە.
البانية: پەراسویەکە لەپەراسوی سنگ ٥ بناغەی خانوو ٥ یەك قاچی ئاژەڵ ٥ دەگوترێ: (ألقى فلان بوانيه) لەو شوێنە مایەوەو جێگیر بوو، داسکناو چەسپا ٥ (ألقى البَلَدُ بوانِيَهُ) وڵاتەکە خێرو بێری خۆی بەسەر دانیشتوانەکان دا رشت.
البِنَاءُ: خانوو باڵەخانە، (ك: أبنية) یە ٥ بەلای نەحوییەکانەوە بریتیە لەوە کۆتایی وشە یەك جۆر سەرو ژێرو بۆری هەبێ‌و گۆڕانی بەسەر دانەیە، هەرچەندە هۆکاری گۆڕانیش هەبن.
البِنَايَةُ: وەستایی دیوار دانان ٥ خودی باڵەخانەو دیوارەکە.
البنتُ: کچ، منداڵی مێینە، (ك: بنات).
بنات الصدر: غەم‌و نارەحەتی ٥ (بنات الدهر) بەڵاو چورتم ٥ (بنات النعش) دوو کۆمەڵە ئەستێرەن کۆمەڵێکیان گەورەو کۆمەڵێك بچوك.
اَلْبَنَّاءُ: کەسێکە پیشەکەی وەستایی دیوارکردن بێ.
البَنَّاءون الأحرار: رێکخراوو کۆمەڵێکی نهێنی بوون، پەیڕەوو پرۆگرامێکی وردی ناوخۆیی خۆیان هەبوو، ئەندامەکانیان زۆر هاوکاری یەکتریان دەکردو بەتەنگ یەکەوە بوون هەرچەندە گەل‌و نەتەوەو زێدو بنەماڵەیان جیاواز بوو، ئەمانە لەسەدەی چواردەهەم دا رێکخراوێکی توندو تۆڵیان پێکەوە ناو بەجیهان دا بیرو باوەڕی خۆیان بڵاو کردەوە، رێکخراوەکەیان ناو نا (الماسون)و پرۆگرامەکەیان بریتی بوو لە (ماسونیەت).
البنوة: چاوگی (ابن)ە واتە کوڕیەتی، کوڕبوون.
البُنْيان: دیوار، بناغەی دیوار.

**البُنيَـةُ:** ديوار، بناغەی دیـوار، پێكهاتـەی دیوار، ئەو پەیكەرەی خراوەتە سەریەك ٥ (البِنْية) هەمان مانای هەیە.

**البَنيَّـــةُ:** هەرچـــی دیـــوار بـــێ، هەركەرەســـەیەك بكـرێ بـەدیوار ٥ كەعبەی پیرۆز.

**البُنيَّـــةُ:** رێچـــكەو لارێ كەلەرێگـــەی گەورە دەبنەوە.

**اَلْمَبْنَاةُ:** بـەمانا (البناءَ)ە ٥ حەصیر یـان پارچە خێمەو لبادێكە كە بازرگان كالآكـانی خـۆی پـێ دادەپۆشـێ ٥ (حروف المبـاني) ئەوپیتانـەی وشـەی لـێ پێك دێ.

**بَهَأَ** بـه بَهْئـاً وبُهُـوءاً: وەگری بـوو پێوەی راهـات، ئـارەزوی نزیكبوونـەوە بـوو لـێی.

**بَهِئَ** به بهئاً وبهـاءً: وەگـری بـوو بـەدیتنی گەشایەوە.

**البهائیـــة:** تـــاقمێكن درێـــژە پێـــدەری رێبازی (البابیه)ن لەسەردەستی میرزا حسـێن كـەنازناوی (بهـــاء الله)یـــە، دروسـت بـوون ٥ لافـی جیهانگـەری لـێ دەدەن لـەبیرو بـاوەڕو دینـداری دا، ئارمـــــایی یـــــەكی ئـــــاییینی مەسیحییان پێوە دیارە.

**بَهَتَـهُ الشَّـيْئُ بَهْتـاً:** شـتەكە سەرسـامی كرد توشی سەرسوڕمانی كرد.

**بَهِتَ** فلاناً بهتاً وبَهْتَةً وبُهتاناً: بوختـانی بـۆ فلاّنكەس هەڵبەست.

**بَهِـتَ الرجـلُ بَهتـاً:** پیاوەكـە بـە بەڵــكە بۆڕدراو رەنگـی گـۆڕا، رەنگـی سیس بوو.

**بُهِـتَ الرجـلُ:** بـۆڕ دراو بەبەڵگـە سـەری سوڕماو هیچی بۆنـەگوترا ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ﴾.

**باهَـــتَ فلانـــاً:** بـــەبوختان پـــێكردن روبـــەڕوی فلاّنكـــەس بـــووە ٥ دەگـوترێ: (فـلان یباحـث فَیُباهِـتُ) فلاّكـــەس قســـەدەكا هـــەمووی بوختانە.

**تباهت القومُ:** خەڵكەكە هەنـدێكیان بـۆ هەندێكیان بوختانی هەڵبەست.

**البَهْتُ والبُهتانُ:** درۆی هەڵبەستراو.

**اَلْبَهِتَةُ:** بەمانا (اَلْبُهتان)ە.

**بَهْتَرَ بَهْتَرَةً:** درۆی كرد.

**بَهَتَ إليـه بهتـاً:** بـەرو گوشادییەوە بـەرەو پیری چوو.

**اَلْبُهْتَــةُ:** روخۆشـیو جـوان بـەپیرەوە چون ٥ گای كێوی.

**بَهَجَـهُ الشَّـيْئُ بَهْجـاً:** شـتەكە كـەیف خۆشی بەسەردا رژاند.

**بَهِجَ الشَّيْئَ بَهَجاً وبَهَجَةً:** جوانو قەشـەنگ بـوو، كـەیفخۆشو تـەڕدەماخ بـوو (بَهِجَ فلانٌ) كەیف خۆش بـوو، خـۆی رازاندەوە ٥ گەشاوەو جوان بوو.

**أبْهَجَتِ الأرضُ:** گژوگیاكەی جوان خـۆی نوانـدو رازایـەوە ٥ (وأبْهَــجَ فلانـــا) بەمانا (بَهَجَهُ)یە.

**باهَجَـهُ:** قسـەی خۆشـی لەگـەڵ كـردو

شادمانی بێبەخشی ◦ لەجوانیو رازاوەیی دا بەرامبەری کرد دەگوترێ: (باهجت المرأة بِزَبْها) ئافرەتەکە لەجوانیو رازاوەیی دا هاوشانی هاوەڵەکەیەتی.

**بَهُجَ الشَّيْئُ:** شتەکەی جوان کردو رازاندییەوە.

**إِبْتَهَجَ بالشيئ ولَـهُ:** بەوشتە تەواو دڵخۆش بوو کەیفی هاتێ.

**تَبَاهَجَ بفلان:** بەروخۆشیو پێکەنینەوە پێشوازیی لەفلان کرد.

**استَبْهَجَ بە:** بەدیتنی کەیف خۆش بوو گەشایەوە.

**المِبْهاجُ:** دڵخۆشکەرە ◦ فێنکایی هێنەر بۆ دڵو دەرون، ئافرەتی تازەپێگەییشتوی جوانو رازاوە.

**بَهْدَلَ في مشيته:** بەگورجی رۆیی، گۆشتی سەر سنگی وەلەرزەکەوت.

**البَهْدَلُ:** بێچوی کەمتیار ◦ باڵندەیەکی سەوزە.

**البَهْدَلَـةُ:** بناغەی مەمك ◦ پارچە گۆشتێکە لەمل دا لەژور بینەقاقا.

**بَهَرَهُ بهراً وبهوراً:** ماندوی کرد تاتوشی هەناسە برکێ کرد.

**بَهَرَ الاناءَ:** پری کرد (بَهَرَ الشَّيْئُ فلاناً) ئەوشتە فلانکەسی سەرسام کرد.

**بَهَرَ القمر النجومَ:** مانگ بەروناکی خۆی ئەستێرەکانی داپۆشین.

**بَهَرَتِ الشمسُ الأرضَ:** روناکی خۆر هەموو زەوی داگرت.

**بَهَرت فلانَةُ النساءَ:** فلان ئافرەت لەجوانی دا باڵا دەست بوو بەسەر هەموو ئافرەتەکان دا.

**بَهَرَ فلان نظراءَهُ:** فلانکەس هاوەڵەکانی خۆی سەرسام کردو بەسەریان دا زاڵ بوو.

**بُهِرَ:** هەناسە برکێ پێکەوت بەهۆی ماندو بوونەوە.

**أَبْهَرَ:** کەوتە نیوەڕۆ ◦ ژنێکی جوانو نەجیب زادەی مارەکرد ◦ شتێکی سەیری خستە ئاراوە ◦ رەوشتو ئەخلاقی گۆڕا ◦ هەر رۆژەو جۆرە هەڵسو کەوتێکی هەیە ◦ دوای هەژاری دەوڵەمەند بوو.

**باهَرَهُ مباهرة وبهاراً:** شانازی بەسەراکرد.

**إِنْبَهَرَ:** هەناسە برکێ پێکەوت ◦ بەدرۆ لافی شتێکی لێ دا.

**إِبْتَهَرَ في الشَّيْئ:** زێدەڕەوی لەشتەکەدا کرد ◦ هەموو توانای خۆی تێدا بەتاقی کردەوە.

**إِبْتَهَرَ:** بۆ موطاوعەی (بَهَرَ) هاتووە.

**تَبَهَّرَ:** روناکی کرد (تَبَهَّرَ الإناءُ) زەرفەکە پڕ بوو.

**إِبْهارَ النهارُ أو الليلُ:** کات بوو بەنیوەڕۆ یان نیوەشەو.

**ابهارَ علينا الليلُ:** شەومان درێژ بوون.

**الأَبْهَرُ:** جۆرێکە لەپەڕی باڵندە ◦ پارچە زەوییەك لافاو نەیگرێتەوە.

**الأبهران:** دوشا ڕەگە دەماری سەرەکی

خوێن کەخوێن دەبەن بۆ (أذين)ی لای راستی دڵ.

البَهَارُ: هەرشتێك کەجوان و درەوشاوەبێ ٥ پەڵەی سپی لەنەسپ دا ٥ گوڵە بەهارە کەلەوەرزی بەهاردا دەڕوێ.

البُهَارُ: کۆڵ و بار ٥ زەرفێکە وەکوو مەسینە ٥ چۆلەکە بەهەشتی ٥ جۆرە ماسییەکە لەپێری (القرضية) درێژە جەستەی بە توێکڵی شانە ناسایی بچوك داپۆشراوە.

البَهْرُ: فەوتان ٥ سەرسوڕمان ٥ دەگوترێ: (بَهْراً له) واتە: داوەشان و تێداچون بۆ ئەو ٥ سەر سوڕمان بۆ ئەو.

البُهْرُ: هەناسە بڕکێ لەبەر ماندوبون ٥ پارچە زەوی پان و پۆڕ (ليلة البُهر) شەوێکە روناکی مانگ ئەستێرەکانی داپۆشیبێ.

البَهْرَةُ: ئاشکرا ٥ دەگوترێ: (فعل ذلك بَهْرَة) بەئاشکرا ئەوەی کرد.

البُهرَةُ: ناوەڕاستی شت ٥ پێڕێك لەشیعەی ئیسماعیلین لەخۆرئاوای هیندوستان و خواروی پاکستانی خۆرهەلات دا دەژین.

البَهِيرَةُ: ئافرەتی رەسەن و خانەدان ٥ دەگوترێ: (فلانة بَهيرَة فهيرَة).

بَهْرَجَ الشَّيْئَ: شتەکەی والێ کرد هەموو کەس بتوانێ سودی لێ وەرگرێ، دەگوترێ: (ماء مُبَهْرَج) ئاوێکە هەموو کەس دەتوانێ بچێتە سەری و بەشی خۆی لێ هەڵێنجێ ٥ (مكان مُبَهْرَج) شوێنی گشتی و هەموانی ٥ هەرکەسێ بیەوێ دەتوانێ بچێتە ناوی، (واتە پاوان نیە).

بَهْرَج فلاناً: تاوانی خراپەکاری لەسەر فلانکەس لابرد.

بَهْرَجَ الكَلامَ وغَيْرَهُ: قسەکەی بەهەڵبەستراو لەقەڵەم دا.

تَبَهْرَجَ: بوو بە موباح بۆ هەموو کەس.

البَهْرَجُ: شوێنی گشتی یان شتی بەرەڵا بۆ هەموو کەس ٥ شتی بەتاڵ و بێ بناغە و ناشەرعی.

بَهْرَمَ الشَّيْئَ: بەرەنگی گوڵە عوصفور (کە ڕەنگێکی سورە) ڕەنگی کرد.

تَبَهْرَمَ: رەنگی گوڵە عوصفوری گرت.

بَهْرامُ: مەریخ.

اَلْبَهْرَمُ: روەکی گوڵە عوصفور ٥ کەنیسبەتی بۆلادەدەن دەڵێن (لون بهرماني).

بَهَزَهُ بَهْزاً: مستە کۆڵەی لەسنگی دا ٥ بەهێزو زەخت پاڵی پێوەنا پاشەو پاش کشاندیەوە.

اَبْهَزَهُ: بەمانا (بَهَزَه) یە.

باهَزَهُ الشَّيْئَ: پێشبڕکێی بۆلاشتەکە کرد.

تَبهَّزَتْ أشياءَ كثيرةَ: زۆرشتم بەدی هێناون.

بَهَسَ بَهْساً: نازابوو، ورەی بەرزبووە.

تَبَيْهَسَ: لەرۆیشتن دا لارو لەنجەی کرد.

**اَلْبَهْسُ**: دەومی تەڕو تازە؛ دەوم میوەیەکە بەئەندازەی سێوێکی گەورە، پێستێکی ئەستوری سوری هەیە درەختەکەی لەپێڕی درەختی خورمایە پێی دەگوترێ: (شجرة الدوم).

**البَیْهَسُ**: شێر ٥ پیاوی ئازا ٥ ئادەمیزادی لارو لەنجەکەر ٥ دەگوترێ: (رجل بَیْهَسٌ وإمرأة بَیْهَسٌ)، (ك: بیاهِسُ).

**اَلْبَیْهَسِیَّةُ**: تاقمێکن لەخواریجەکان شوێن رێبازو بیرو بۆچونی ئەبوبەیهەسی کوڕی هەیضەمی کوڕی جابیر کەوتون.. وتویانە ئیمان بریتیە لەدان پیانانی زانیاری دەربارەی خوداو پەیامی پێغەمبەر (د.خ) وەلێ لەگەڵ تاقمی (قەدەری) یەکان یەکدەگرنەوە لەوەدا کەدەڵێن: ئادەمیزاد بۆخۆی کردەوەی خۆی بەدی دێنێ.

**بَهَشَ بَهْشاً**: خۆی ئامادەکر بۆپێکەنین، خەریکە پێبکەنێ.

**بَهَشَ الی الشَّیْءَ وبه**: شتەکەی پێ خۆش بوو، بەویستی ئەوبوو.

**بَهَشَ عنه**: لێی کۆڵیەوە.

**اِبْتَهَشَ**: کەیف خۆش بوو دەمو چاوی گەشایەوە.

**تباهَشَ الرجلان**: هەریەکە لەو دوپیاوە کاکۆڵی یەکتریان گرت.

**تباهَشَ الرجلان بعصا ونحوه**: ئەو دوو پیاوە خۆیان ئامادەکرد بۆ شەڕو بەرامبەری بەقەلانگو گۆچان.

**اَلْبَهْشُ**: روخساری گەشاوە ٥ دەومی تەڕو تازە ٥ (دەوم: جۆرە میوەیەکە لەولاتی میصرو هەندێ ولاتی تر هەیە) سەیری وشەی (الدوم) بکە.

**بَهِصَ بَهصاً**: تینوی بوو (أبْهَصَهُ عن کذا) لەوشتە گێڕایەوە.

**بَهْصَلَ الرجلَ**: پیاوەکەی روت کرد، ماڵو سامانەکەی لێ ستاند.

**تَبَهْصَلَ**: روت بوو پۆشاکی لەبەر دا نەما ٥ جلەکانی داکەندن کردنی بەقومار.

**بَهَضَهُ الحِمْلُ بَهْضاً**: بارەکەی قورس بوو برستی لێ بری.

**أبْهَضَهُ الحِملُ**: بەمانا (بَهَضَهُ)یە.

**اَلْمَبْهُوضُ**: کەسێکە زیاد لەتواناى خۆی ئەرکی خرابێتە سەر.

**بَهَظَ**: قورسو گرانو ناخۆش بوو.

**بَهَظَهُ بَهْظاً**: بارەکەی گران بوو برستی لێ بری (بَهَظَ قِرْنَهُ) بەسەر بەرامبەرەکەی دا زاڵ بوو.

**أبْهَظَهُ الحِملُ**: بارەکە قورس بوو برستی لێ بری.

**أبْهَضَ حوضَهُ**: حەوزەکەی پڕکرد.

**الباهظ من الأمور**: کاری گرانو ناخۆشو لەتوانادا نەبوو.

**بَهِقَ بَهَقاً**: نەخۆشی بەڵەکی توشی پێستی بوو دەگوترێ: (هو أبْهَقُ وهي بَهْقَاءُ)، (ك: بُهْقٌ).

اَلْبُهَاقُ: نەخۆشییەکە رەنگی سروشتی پێست لادەباو پەڵەپەڵەی سپی تێدا دەردەکەون.

اَلْبَهَقُ: بەمانا (البهاق)ە.

تَبَهْكَنَتِ المرأة في مِشيتها: ئافرەتەکە بەئەسپایی‌و لەسەرەخۆ رۆیی، بەنازو فیزەوە هەنگاوی هەڵێنا.

اَلْبَهْكَنُ: لاوی تازەپێگەیشتوی جەستە نەرم‌و نیان ٥ (إمرأة بَهْكَنَةٌ) ئافرەتی نەرم‌و شل‌و تازە پێگەیشتوو.

بَهَلَهُ بَهْلاً: ئیهمالی کرد، وازی لێ هێنا ٥ دەگوترێ: (بَهَلَ الناقة) وازی لەسەرپەرشتی کردنی لەوەڕانی حوشترەکە هێنا ٥ بەرەڵای کرد بۆخۆی بلەوەڕێ.

بَهَلَهُ: نەفرینی لێ کرد ٥ لەحەدیثی پێغەمبەردا (د.خ) هاتووە دەفەرموێ: (من ولي من أمور الناس شيئاً فلم يعطهم كتاب الله فعليه بهلة الله).

بَهِلَ بَهلاً: بەبێکارو ئیش رۆییشت، بێ چەك بوو چەکی نەما ٥ (بَهِلَتِ المرأةُ) ئافرەتەکە بێوەژن بوو مێردی نەماو منداڵیشی نییە.

اَبْهَلَهُ: بەمانا (بَهَلَهُ)یە ٥ دەگوترێ: (أبْهَلَ الراعي رعيته) شوانەکە ئاژەڵەکانی ئیهمال کردن لێیان گەڕا بۆخۆیان چۆن دەلەوەڕێن‌و لەکوێ دەلەوەڕێن کاری بەسەریانەوە نەبوو ٥ یان فەرمانڕەواکە وازی لەجەماوەرەکە هێناو گوێی نەدانێ هیچ رێنومایی‌و لێ پێچینەوەی لەگەڵ نەکردن.

بَهَلَ الأرض: دوای ئەوەی زەوییەکەی تۆو کرد ئاوی تێکرت.

باهَلَ بعضهم بَعْضاً: خەڵکەکە کۆبووەوە بۆ موباهەلەکردن‌و داواکردنی ئەوە کە خودا نەفرینی بکا لەوانەیان کەستەمکارن لەحەدیثی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: (من شاء باهلته، ان الحق معي).ئەوەی دەیەوێ‌و ئامادەیە، شەڕەنەفرینی لەگەڵ دەکەم، بێگومان حەق لەگەڵ منە.

اِبْتَهَلَ الى الله: لەخودا پاڕایەوە، زۆری دوعا کردن ونوزایەوە.

اِبْتَهَلَ القومُ: خەڵکەکە شەڕەنەفرینیان کرد.

تباهَلَ القومُ: بەمانا (ابتهلوا)دێ.

تَبَهَّلَ القوم: بەمانا (تَبَاهَلُوا)دێ.

اِسْتَبْهَلَهُ: بەمانا (بَهَلَهُ)دێ.

أَبْهَل: درەختێکی بچوکی هەمیشە سەوزە دەشوبهێتە درەختی عەرعەر.

اَلْبَهْلُ: شتی بەرەڵاکراو بێ شوان‌و سەرپەرشتیار ٥ کوژراوی بێ رێز ٥ دەشگوترێ (سارَتْ على البَهْلِ) واتە: پەردەی حەیاو حورمەتی دڕاند، ئەوئافرەتە سنوور شکێنی کردو تەواو خۆی بەرەڵا کرد.

البَهْلُولُ: پیاوماقوڵی رێزدار کە هەموو

رەوشتی جوانی تێدان ٥ پیاوی قسە خۆش‌و دەم بە پێکەنین‌و قسە نەستەق.

البهلوان: پاڵەوان‌و یاریزان لەجۆرە یارییەك دا وەکوو ڕۆیشتن بەسەر حەبلی ڕایەڵکراودا.

أبْهَمَ الأمر: کارەکە لێڵ‌و نادیار بوو، ڕون‌و ئاشکرا نییە.

أبهمَ الأمر: کارەکەی چەواشەکردو شێواندی ڕاستییەکانی شاردنەوە.

أبْهَمَ القفلَ ونحوه: قفڵەکەی داخست‌و ناتواندرێ بکرێتەوە کەس نازانێ بیکاتەوە.

أبْهَمَ فلاناً من الأمر: فلانکەسی لەسەرکار لابردو لەوئیشە دووری خستەوە.

تَبَهَّمَ علیه الأمر: ئیشەکەی لێ شێواو ئاڵۆز بوو.

اسْتَبْهَمَ فلانٌ: فلانکەس کارەکەی لەسەر تێکەڵ‌و پێکەڵ بوو.

اسْتَبْهَمَ الأمر: کارەکەی لێ شێواو لێی عاصی بوو.

اسْتَبْهَمَ علیه الکلامُ: قسەکردنی لێ‌عاصی بوو زمانی گیراو هیچی بۆنەهات.

الإبهامُ: قامکە گەورەی دەست‌و قاچ.

الأبْهَمُ: ئادەمیزادی بێدەنگ‌و کەم دوێ ٥ بێزمان، ئاژەڵ، گیانلەبەر جگە لەئادەمیزاد.

البَهْمَةُ: بەرخۆلە چ نێر چ مێ، (ك: بِهَامُ).

البُهْمَةُ: بەردی ڕەقی لوس‌و پتەو ٥ کاری ئاڵۆزو تەم‌و مژاوی ٥ پیاوی ئازاو سەرکەوتو کەوا بکا دوژمنەکەی هۆی سەرکەوتنەکانی نەزانێ ٥ ئەو شەوانەی مانگیان تێدا دەرناکەوێ، (ك: بُهَمٌ).

اَلْبَهِيمُ: ڕەش ٥ (لیل بهیم) ئەوشەوانەیە لەنێوارێوە تابەیانی مانگیان تێدا دەرناکەوێ ٥ (لون بهیم) ڕەنگێکە ڕەنگی تری لەگەڵ نەبێ (یەکڕەنگی سادەبێ) (صوت بهیم) دەنگێکە ڕەجعەو لەرانەوەی تێدانەبێ.

البَهِيمَةُ: هەموو گیانلەبەرێکی چوار پێ لەوشکانی‌و دەریادا جگە لەدرندە، (ك: بَهَائِم).

المُبْهَمُ: ئەوشتەیە بەهەستەکان هەستی پێ نەکرێ ئەگەر لەهەست پێکراوان بێ، بیروهۆش نەیدۆزێتەوە ئەگەر لەبواری عەقڵکاری دا بێ.

المُبْهَمُ من الأشياء: ئەوشتەیە نیشانەیەکی پێوە نەبێ پێی جیا بکەینەوە لەشتی تر.

المُبْهَمُ من الأجسام: بێدەنگ‌و بێ قسە.

المُبْهَمُ من الکلام: قسەو ڕستەیەك ماناکەی ڕون‌و ئاشکرا نەبێ.

المُبْهَمة من الأسماء: بەلای نەحوییەکانەوە ئەو ئیسمانەن بەتەنیا بۆخۆیان ماناکەیان دیارنیە وەکوو ئیسمی ئیشارەو ئیسمی موصول‌و ضەمیرەکان.

البَهْنَانـة: ئـافرەتى قالـب سـووكى قسـە خۆش‌و لەسەرەخۆ.
بَهْنَسَ فِي مشـيه: لارو لەنجەی کـرد، خـۆی بادا.
تَبَهْنَسَ: بەمانا (بَهْنَسَ)یە.
اَلبَهْنَسُ: شێر، (ك: بهانس)ە.
بها الشَّيْءُ بهاءً وبهاءةً: شـتەکە جـوان بـوو فـۆز بوو (بها فلانـاً) بـالاّ دەسـت بـوو بەسەر فلان دا.
بَهِيَ بهاً وبهاءة: بەمانا (بَهَا)یە.
بَهِيَ البَيْتُ: ماڵەکـە خـاڵى بـوو، خانووەکـە کەسى تێدا نەما.
بَهُوَ بَهاءةً وبهَاءً: شوێنەکە بەرفراوان بوو.
أَبْهى: جـوان‌و فـۆز بـوو (أَبْهـى الشَّيْئَ) شتەکەی چۆڵ کرد دەگـوترێ: (أَبْهى البَيْتَ) خانووەکەی چـۆڵ کـرد (أَبْهـى الخيل) پشتى ئەسپەکەی چۆڵ کرد.
باهاه: شانازی بەسەردا کرد.
بَهى البَهْوَ: ئیشەکەی بەرفراوان کرد.
اِبْتَهى: شانازی کرد.
تبـاهى القـومُ: خەڵکەکـە شـانازییان کردن هەریەکەیان بەجۆرێك خـۆی هەڵدەنایەوەو خۆی هەڵدەکێشا.
البَهْوُ: گوشادی‌و ویسعەت لەهـەر شـتێ دا بـێ ٥ دەگـوترێ: (هـو مـن بهـو مـن العَيْش) لەگوزەرانى خۆش دایە.
بَهْوَ البيت: پێش ماڵ ٥ بەردەرگا ٥ شوێنى تایبـەتى بـەپیرەوە چـوونى میـوان، (ك: أبهَاءٌ).

البها والبهاءُ: جوانى‌و شۆخى‌و شەنگى ٥ دیمەنـى جـوان ٥ بریسکەی بۆیـەو بۆیاخ.
بـاءَ بالشـيء واليـه بـوءً وبـواءً: شـتەکەی گێڕایەوە، گەڕانەوە، بۆ لای گەڕایـەوە ٥ قورئان دەفـەرموێ: ﴿وَبَآؤُوا بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ﴾ دەگوترێ: (باءَ به واليـه وبمـا عليـه) هـەڵى گـرت، دانـى پێـدا نـا ٥ درکانـدى، (باءَ فلان بفلان): فلانکـەس لە شوێن فلان کوژرایەوە.
أبـاءَ الشَّـيءَ: گێڕایـەوە، شـتەکەی گەڕاندەوە بۆ شوێنى خۆی
أبـاءَ فلانـاً منـزلاً: شـوێن‌و جێگـای بـۆ فلان ئامادە کردو دایمەزراند.
أباءَ فلاناً: فلانکەسى هەڵنا بـۆ ئـەوەی دان بەڕاستى یەکان دابنێ.
أباءَ فلاناً بفلانٍ: لـە تۆڵـەی فلانەکـەس دا فلان کوژرایەوە
بـاوَأَه: خوێنەکـەی فـلان هاوشـانى خوێنى فلان بوو
بَوَّأَ الرجـلُ: پیاوەکە هاوسـەری بـۆ خـۆی پەیدا کرد
بوَّأَ فلانـاً منـزلاً: فلانکەسـى لـە مـەنزڵ دا نیشتەجێ کرد.
بوَّأَ المنزلَ: مـەنزڵ و شـوێنى حەوانـەوەی بۆ ئامادەکرد
بَـاوَأَ القتـيلان في القصـاص: ئـەو دوو کوژراوە لە تۆڵەدا هاوشان بون.
تَبـوَّأَ المکـانَ وبـه: ئـەو شوێنەی کـردە

نیشتمانی خۆی، تێیدا دابەزیو جێگیر بوو.
استباءَ المكانَ: بە مانا (تَبوَّأ) هاتووە.
استباءَ فلاناً بفلان: فلان لە شوێنی فلان کوژرایەوە.
اَلْبَاءُ: مارەبڕین، گرێبەستی مارەبڕین ٥ جوتبوون ٥ (جماع).
الباءَةُ: گرێبەستی مارە بڕین ٥ جوتبون (جماع) ٥ لە حەدیث دا هاتووە ٥ دەفەرموێ: (من استطاع منكم الباءة فَلْيَتَزَوَج) هەرکەسێ لە ئێوە توانای ژنهێنانی هەیە باژن بێنێ.
البَوَاءُ: هاوشان، دەگوترێ: (فلان بواء فلان) فلان هاوشانی فلانە لە تۆڵە ستاندنەوەدا ٥ وەلام، دەگوترێ: (بواء واحد) یەك وەلام، تەنها وەلامێك.
البيئة: شوێن‌و دەوروبەر، حاڵ‌و وەزع دەگوترێ: (بيئة طبيعية، بيئة اجتماعية، بيئة سياسية).
المُبَاءَةَ: مەنزڵ‌و شوێنی حەوانەوە ٥ دەگوترێ: (هو رحيب المباءة) دەست‌و دڵ فراوان‌و چاکە کارو ناسراوە.
**بَابَ** لە بَوْباً: بوو بەدەرکەوانی.
بَوَّبَ البَابَ: دەرگای بۆ دروست کرد (بَوَّبَ الكِتَابَ) کتێبەکەی باب باب کرد.
تَبوَّبَ الباب: بەمانا (بَوّبَهُ)دێ.
البَابُ: دەرگا، ئەو شوێنەی لێوەی دەچیە ناوماڵ.
البابُ من الكتاب: بەشێك لە کتێبەکە، کۆمەڵێك مەسەلەوباس کە پەیوەندییان بەیەکترەوە هەبێ.
البابي: پاڵدان‌و نیسبەتدانە بۆ لای (باب) هەروا ناوە بۆ (الوريد البابی) کە شادەمارێکی گەورەیە لە هەموو قەناتە هەزمییەکانەوە خوێنی بۆ دێ‌و تێیدا کۆدەبێتەوەو دەچێتە ناو جەرگەوە ئەمجار لەوێوە دابەش دەبێتەوە.
البابية: سەیرو سەمەرە ٥ گروپێکی بەناو موسوڵمانن زۆر شتی تازە قەڵاو بیدعەتیان خستۆتە ناو ئایینەکەیانەوە ٥ لەسەدەی سیانزەهەمی زایینی دا لە وڵاتی فارس گروپەکەیان دامەزراوەو پاڵ میرزا علی محمد دەدرێن.
البواب: پیشەی دەرگاکردن.
البَوّاب: دەرگەوان، پارێزەرو چاودێری دەرگا ٥ ئەو کونەی لە نێوان ریخۆڵە گەورەو ریخوڵەی دوانزە گرێ دا هەیە.
البَوَّابَةُ: دەرگای سەرەکی باڵەخانەو مزگەوت‌و ئەو جۆرە شتانە.
البوتاسيوم: بوتاسیوم، (عونصورێکی فلزی نەرمە).
البُوتَقَةُ: بۆتە، ئەو ئامێرەیەی ئالتونی تێدا دەتوێننەوە.
**باثَ** بوثاً: لێ ی کۆڵیەوە ٥ دەگوترێ: (باثَ عَنّه) وردوهارو تەفرو تونای کرد (باثَ التراب) گڵ‌و خۆڵەکەی دەرهێنا ٥ (باثَ المكانَ) زەوییەکەی

هەڵکەندو گڵی تری تێکرد.

**أباثَـهُ:** لێـی کۆڵییـەوە: (أَبَـاثَ عنـه) بەهەمان مانا.

**ابتاثَـهُ:** بـەمانا (أَبَاثَـه)یـە دەشـگوترێ (ابتاث عنه).

**اسـتباثه:** دەریهێنـا، خسـتیه ڕو ٥ دەگـوترێ: (اسـتباث فلاناً) ئـەوەی لەدەرونی فلان دا بوو وروژاندی.

**باجَ البرقُ بَوْجاً وبَوَجاناً:** بروسکە رونـاکی دا یـان جـار دواجـار روناکیەکـەی دوبارە بۆوە.

**بـاجَ فـلانٌ:** دەمو چـاوی گەشـایەوە، پـاش ئەوەی روخساری چرچو چرژا بـوو سـەر لـەنوێ تـەڕو تـازەیی لێـوە دەرکەوتەوە ٥ هاواری کردو قیژاندی ٥ دەگوترێ: (هو بائج وبَوّاج): ماندو بوو برستی لێ برا.

**باجَ فلاناً بائجة:** فلانکەس بروسکە لێـی دا ٥ بەڵای توش بوو دەگـوترێ: (باجت عليه بائجة) بەڵای بەسەر هات.

**باجَ الشرُّ النـاسَ:** شـەڕو نەگبـەتی هـەموو خەڵکی گرتەوە.

**بَـوَّجَ الـبرقُ:** بـەمانا (بـاجَ)دێ ٥ (بَـوَّجَ فلان): هاواری کرد.

**انباجَ البَرْقُ:** بەمانا (باجَ)دێ ٥ (انباجت البائجـة) بـەڵانازڵ بـوو ٥ دەگـوترێ: (انباجـت علـيهم البـوائجُ) بـەڵایان بەسەردا باری.

**تبَوَّجَ البرق:** بەمانا (باج البرق)دێ.

**البائج:** ئارەقی ناوەوەی ران و رەفیسـکە یان ئارەقی هەموو جەستەیە.

**البائجـة:** بـۆ مێینـە بـەکاردێ ٥ هـەروا بـەمانا پانتـایی لمبەڵانـە ٥ بـەڵاو ناخۆشی و چورتم، (ك: بوائج).

**الباجُ:** رێگای راست ٥ دەگوترێ: (جعـل الكلامُ باجاً واحـداً) یـەك مانـای بـۆ رستەکە دیاری کـرد ٥ (النـاس بـاج واحـد) ئـادەمیزاد یەکسـانن، جوداوازییان تێدانیە، (ك: أبواج).

**بَاجَ بوجاً:** دەرکەوت ٥ (بَـاجَ فـلانٌ بالسِـرِّ) فلانکەس نهێنییەکەی ئاشکرا کرد ٥ دەگوترێ: (هو بائج وبئوج).

**بـاحَ خصنـمَهُ:** بەرامبەرەکـەی بـۆڕداو بەسەری دا زاڵ بوو.

**أبَاحَـهُ:** دەری خسـت ٥ حـەڵاڵی کـردو رەهـای کـرد ٥ دەگـوترێ: (أَبَاحَـهُ الشـيء) بڕیـاری دا ئەوشتە رەوایـە بکرێ بخورێ.

**اسـتباحَهُ:** بـەلای زانایـانی ئوصـولی فیقهەوە حوکمێکە داخوازی ئەوەیـە ئادەمیزاد سەرپشکە لەنێوان کردن و نەکردنی دا.

**الإباحيـة:** رەهـابوون لەسـنووری یاسـاو رەوشـت ٥ گـروپێکن ئـەوەرەت دەکەنـەوە کـە ئـادەمیزاد توانـای ئەوەی هەبێ خۆی بپارێزێ لەشتە ئـەی لـێ کراوەکـان و ئەنجامـدانی فـەرمان پێکراوەکـان ٥ ملکایـەتی

تاكه كەس رەت دەكەنەوەو داخوازی ئەوەن ملكایەتی‌و ئافرەت هەموانی بێ ژن‌و مێردایەتی نەمێنێ.

الباحة: گۆڕەپان، پانتایی ٥ خورمای زۆر ٥ (باحة الماء): زۆرینەی ئاو، ئەستورایی ئاو.

باخَ بَوْخاً وبُؤوخاً وبَوَخاناً: هێدی بۆوە داسكنا.

باخت النار، وباخ الحَرُّ والغضب والحمى والحرب: دامركایەوە.

باخ فلان: فلان ماندو بوو برستی لێ برا، رق‌و قینی نیشتەوە.

باخ اللحمُ: گۆشتەكە بۆنی كرد، بەكەڵكی خواردن نەما.

أباخ النارَ: ئاگرەكەی كوژاندەوە ٥ (أباخ الفتنة والحرَ) فیتنەو شەڕو ئاشوبەكەی كوژاندەوە.

أباخ عن نفسه من الظهيرة: مایەوە تاگەرما كز بوو، سێبەر داهات.

البُخُ: تێكەڵ بون‌و بەسەریەكدا ترشان.

البودقة: بۆتەی لەقاڵب دانی ئاڵتون.

البوذية: ئاینێكی بەربڵاوە لەهیندوستان‌و خۆرهەڵاتی دووردا (بوذای هیندی) ساڵی (٥٦٤ پ.ز– ٤٨٣ پ.ز) دایهێناوە.

بَارَ الشَيْءُ بَوْراً وبواراً: شتەكە تێداچوو فەوتا ٥ بێ نرخ بوو لەكاركەوت ٥

بارتِ الأرضُ: زەوییەكە ئاوەدان نەبوو ٥ یان بەبەیاری مایەوە، بۆئەوەی لەساڵی داهاتوودا زەرع بكرێ.

بار العملُ: كارەكە جێی خۆی نەگرت، مەبەستەكەی نەپێكا، دەگوترێ: (هو بائر)، (ك: بَوْر وبُور).

بَارَ الشَيْءُ: بەتاقی كردەوە.

أبارە: فەوتاندی لەناوی برد ٥ (ابتارە) بەمانا (بَارَە)دێ.

الباریاء: حەصیر (الباريّ) بەمانا (الباریاء)دێ.

البارِيّة: بەمانا (الباریاءُ)دێ.

البَوارُ: زەوی بەیار نەكێڵدرابێ‌و زەرع نەكرابێ ٥ یان زەوییەك بە بەیاری هێڵدرابێتەوە بۆئەوەی لەساڵی داهاتوودا زەرع بكرێ.

البُورُ: زەوییەك بەكەڵكی هیچ نەیە.

البوريّ: حەصیر ٥ جۆرە ماسییەكە بەزۆری لەنزیك گوندی بورەی ولاتی میصر هەیە.

البُورقُ: خوێیەكە زۆر بەئاسانی لەناوی گەرمدا دەتوێتەوە بەڵام لەناوی ساردا درەنگ دەتوێتەوە.

بازَ بَوْزاً: لەشوێنێكەوە گواستیەوە بۆ شوێنێكی تر.

البـاز: جۆرێكە لەهەڵۆ بۆ راوكردن بەكاردەهێندرێ، دوای ئەوەی لەسەر ئەوكارە رادەهێندرێ، (ك: أبواز، وبيزان)ە.

البُوز: دەم‌و دەورو بەری دەم (ك: أبواز).

باسَهُ بَوْساً: ماچی كرد.

**بَـاشَ الرجـلُ بَوْشـاً**: پیاوەکـە هاوکـاری دەنگە دەنگ‌و هات‌و هاواری کرد.

**بَـاشَ القـومُ**: جەماوەرەکـە زۆر بـوو تێکیانـەوە هاویشت‌و دەستیان کـرد بەهات‌و هاوارو قیرەو هەرا.

**بـاشَ الشَّـئُ**: شـتەکەی تێکـەڵاوی شـتی ترکرد.

**باوشَهُ**: بەشتێك ئاماژەی بۆکرد.

**بَوَّشُوا**: زۆربون‌و تێکەڵ بەیەکتر بون.

**إنبـاشَ مـن کـذا**: قێـزی لـەوجۆرە شتانەکردەوە.

**تباوشا**: بەردو تیریان لەیەکتر گرتن.

**تَبَوَّشُوا**: بەمانا (بَوَّشوا)دێ.

**اَلْبَـوْشُ**: کۆمـەڵێك خـەڵك تێکـەوەبهاون‌و بـێن‌و بچـن ٥ غـەوغاو قـیرەو هـات‌و هاواربکەن، (ك: أبْواش)ە.

**البَوْشِيُّ البُوشِيُّ**: هەژاری خێزان زۆر.

**بَـاصَ بَوْصـاً**: دورکـەوتـەوەو بەناخۆشـی پـێی گەیشت.

**بـاصَ فـلان**: فلانکـەس هـەڵات‌و خـۆی حەشاردا.

**بَـاصَ فِي السَّـيْرِ**: زێـدەرۆیی کـردو زۆری هەوڵدا زوو بگاتە جێ.

**باصَ فلاناً**: پێش فلانکەس کەوت‌و بۆی دەرچوو ٥ پەلەی لـێ کرد نەیهێشت لەکارەکە وردبێتەوە بزانێ چۆنە.

**بَـوَّصَ**: رەنگـی رون بـووە ٥ (بَـوَّصَ الفَـرَسُ) ئەسـپەکە لەمەیـدانی غارکردن پێشکەوت.

**اِنْبَاصَ**: وێك هاتەوەو قەبارەی بچوك بووە.

**اِسْتَبَاصَهُ**: پێشی کەوت.

**البَوْصُ**: رەنگ‌و روخسار، (ك: أبواص).

**البُـوْصُ**: بـەمانا (البَـوْصُ)دێ ٥ روەکێکـە لەروەکـەکانی زەلکاوەکـان قـەرەباڵغ موعەمەمـەر لەشـێوەی قەفـەزاژو جەنگەڵ دا، (ك: أبواص).

**البُوصِيّ**: جۆرێکە لەکەشتی.

**باضَ بَوْضاً**: دەم‌و چاوی جوان‌و رازایەوە دوای ئـەوەی پەڵـە پەڵـەی رەشـی پێوەبوون.

**باضَ بالمکـان**: لەوشـوێنە مایـەوەو جـێگیر بوو.

**بَـاطَ بَوْطـا**: دوای دەسـەڵاتداری‌و شـکۆمەندیی زەلیـل‌و دامـاو بـوو، دوای دەوڵەمەندیی هەژار بوو.

**بـوط**: روەکێکـە لـەزەلکاوە قـەرەباڵغ‌و ئاوەدانکراوەکان دا هەیە ٥

**بَاعَ الرجـلُ بَوْعـاً**: پیاوەکە دەستی بـڵاو کـردەوە ٥ دەگـوترێ: (بـاعَ بمالـهِ) لـەماڵ‌و سـامانی خـۆی بەخشـی‌و دەستبڵاویی کرد.

**بَـاعَ فِي سـيرە**: لـە رۆیيشـتنەکەی دا هەنگاوەکانی درێژ کردنەوە.

**بَـاعَ الشَّـئَ**: شـتەکەی بـەباڵ پێـواو مەزنـدەی کـرد ٥ هـەروا دەگـوترێ: (بـاعَ الطريـقَ) بەهەـنگاوی درێـژ رێگاکەی بری.

بَوَّعَ في سيره: هەنگاوی درێژو خێرای هاویشتن.
اِنْباعَ: درێژ بووە، دەگوترێ: (انباعت الحَيَّةُ) مارەکە دوای ئەوەی پاپۆکەی بەستبوو خۆی راست کردو خۆی درێژ کرد بۆئەوەی هێرش بەرێ.
اِنْبَاعَ الرجلُ: پیاوەکە بازی هاویشت (انْبَاعَ المُقاتِلُ مِنَ الصف) پێشمەرگەکە هێرشی برد ٥ (انْبَاعَ لَهُ في السلعة) لەمامەڵە کردن‌و فرۆشتن دا چاو پۆشی کرد.
اِنْبَاعَ الماءُ: ئاوەکە بوو بەپرژو تکەو بڵاوبووە.
تَبَوَّعَ: درێژ بووە ٥ (تَبَوَّعَ الرجلُ) پیاوەکە دەستی یارمەتی درێژ کرد ٥ (تَبَوَّعَ للخير) بۆخێرکردن‌و بەخشین بەدڵسۆزی یەوە لێ برا.
البائع: کار ئاسك، بێچوە ئاسك ٥ فرۆشیار.
الباعُ: مەسافەی نێوان هەردو بەرەدەستەکە رایان دێری بۆراست‌و چەپ ٥ دەگوترێ: (فلان طويل الباع) واتە بالای بەرزە ٥ (وطويل الباع في كذا) لەوشتەدا دەست رۆیشتوو بالادەستەو گەیشتۆتە ئەوپەڕی سنوور.
الباعة: بەردەم دەرگا، بەردەرگا ٥ (البَوْع)و (البُوع) بەمانا (الباعَ)دێ ٥ ئێستەقانێکە لەدواقامکە گەورەی دەستەوە دەست پێ دەکا.
البَوَّاعُ: صیغە موبالەغەیە.
أباعَ على فلان: هێرشی ناڕەوای کردە سەر فلان.
تَبَوُّغَ: وروژاو هەڵچو، تورەبوو دەگوترێ: (تَبَوَّغ به الدمُ) خوێنی راساو زەختی بەرزبووەو مرد.
تَبَوُّغ الشَّرُّ: شەڕو ئاژاوە کە بەربڵاو بوو زۆر شوێنی گرتەوە.
تَبَوَّغ بخصمه: بەسەردوژمنەکەی دا زاڵ بوو.
البَوْغاءُ: گڵ‌و خۆڵ بەگشتی ٥ گڵێکی هێندە ورد کە دەستی بۆبەری وە حەواکەوێ ٥ ئادەمیزادی خوێڕی‌و هەتیو مچەو ئەحمەق ٥ بۆنی خۆش.
بَاقَ بَوْقاً وبُوقاً: فاسید بوو فەوتا ٥ گوم بوو.
باقَتِ السفينة: کەشتی‌یەکە نقوم بوو.
باق الرجلُ: پیاوەکە درۆی کرد، فیتنەو ئاشوبی هێنایە ولاتەوە، کێشەو نیزاعی خستەوە.
باق بفلان: بەنهێنی سەرەتاتکەی لەفلانکەس کردو لەشوێنێکی نادیارەوە چاودێری کرد.
باقت الداهيةُ فلاناً: فلانکەس بەلاو کارەساتی توش بوو.
باق فلاناً وعليه: غەدری لەفلانکەس کرد ٥ دەگوترێ: (باقوا عليه) واتە گەلەکۆمەکیان لێ کردو بەناحەق

کوشتیان ٥ (باق الشَّيءَ) شتەکەی دزی.
بَوَّقَ في البوق: فوی بەکەڕەنا (زوڕنـا)دا کرد.
بَوَّقَ الکلامَ: قسەکانی ڕازاندنەوە.
انباق: بەتەوژم هـەڵقولا ٥ (انباق علیهم الدهرُ) زەمانە ستەمی لـێ کردن.
تَبَـوَّقَ الوبـاء في الماشـية: نەخۆشـییەکە بەناو ئاژەڵەکان دا بڵاو بووە.
تَبَـوَّق الرجـلُ: پیاوەکـە درۆی کـرد، بوختانی هەڵبەست.
البـائق مـن المتـاع: کـاڵای خـراپو بـێ نرخ.
البائقة: بـەڵاو کارەسـات ٥ شـەڕو هـەرا، (ك: بوائق).
البـاقـة: دەسـکێك لـەگیاو گـژ، سـواڵێك لەگەنمەو وێنجەو گوڵەگەنمو جۆ.
التبوقُ من کـل شـيئ: بـەهێزو تـەوژم، دەگوترێ: (هذا بَوْقٌ من المطر) ئەمـە تاوەبـارانێکی بەلێزمـەو خـوڕەمو بەهێزە.
البُوق: ئـامێرێکی کلۆرە فـوی پێدادەکرێو دەنگی لـێ دێ وەکوو سمشاڵو بلوێرو زوڕنا .. ٥ هتد ٥ دەگوترێ: (هذا بُـوق فـلان) ئـەوە پڕوپاگەندەکەری فلانـە، بەنارەوا مەدحی چاکەو پیـاوەتی ئـەو دەکـا، بووەتـە زوڕنـا ژەنـی خـەڵك ٥ شتی بەتاڵو بێ بناغـەو هەڵبەسـتراو، شـایەتی بـەدرۆ ٥ کەسـێك نهێنـی نەپارێزێ، (ك: أبواق، وبیقان).

البُوقَـةُ: تاوەبـارانی بـەخوڕمو لێزمـە، (ك: بُوَق، بوقات).
البَوَّاقُ: زوڕنا ژەن، کەرەناڵیدەر.
بَاكَ البَعِيرُ بَوْكاً وبئوكاً: حوشترەکە قەڵەو بوو ٥ (بـاك الأمـر) کارەکـە تێکـەڵو چەواشە بوو.
بَـاكَ فلانـاً بَوْكـاً: خـۆی تێهەڵخوشـاندو پاڵەپەستۆی لەگەڵ کرد.
بَـاكَ القـومُ رأيهـم: ئـەو کۆمەڵـە بـیرو بۆچوونەکانیان بەبنبەست گەیشتو ڕێگـــە چـــارەی کێشـــەکەیان بۆنەدۆزرایەوە.
بَاكَ الشَّيئَ: نەخشکاری لەشتەکەدا کردو هەڵیکۆڵی.
بَاكَ المتاعَ: کاڵاکەی کڕی.
بَاكَ عَيْنَ الماءِ: ئاوی کانیەکەی بەداروشتی وا شڵەقاند بۆنەوەی بێتەدەر.
بَـاكَ بُنْدَقَـةَ المِسْكِ: پارچـە میسکەکەی لـەناو دەسـتەکانی دا هـەڵگلۆفت بۆنـەوەی بۆنەکـەی بڵاوبێتـەوە ٥ دەگـوترێ: (هـو بائِـك)، (ك: بُـوَّك، وَبُيَّكٌ) (وهي بائكة)، (ك: بَوائك).
بَاوَكَهُمْ: بەهۆی هاوسێیەتیو هاوڕێتی یەوە تێکەڵاویان بوو.
انباك الأمر عليه: کارەکەی لـێ چەواشە بـوو نـەیتوانی ڕێگـا چـارەی بـۆ بدۆزێتەوە.
البائكـة: دارخورمـای گـەورەو ڕەگـە داکوتراوی بەهێز.

**البَوكاء**: تێکەڵ بون.

**البوكة**: ئادەمیزادی قسەخۆش، قۆز ٥ لارو لەنجەکەرو بەفێر.

**بـال بَـوْلاً**: میـزی کـرد، هەرچـی میـزی ناومیزەڵـدانی هەیـە دەری کـرد ٥ (هو بائل، وبَوّالٌ).

**بالَ فلان**: فلاّن گەرای خستەوە، منداڵی بوون.

**بَالَ الشَحْمُ**: بەزەکەتوایەوە.

**أبَالَـهُ**: میـزی پـێکرد ٥ میـزی پـێ بەخودا کرد.

**بَـوَّلَ**: بـەمانا (بـالَ)هـاتووە ٥ (تَبَـوَّلَ) بەمانا (بَالَ)دێ.

**استبالَهُ**: میزی پێکرد، وای لـێ کـرد میز بکا ٥ دەگوترێ: (استبالَ الطبیب المـریض) پزیشـکەکە داوای میـزی نەخۆشەکەی کرد بۆ پشکنین.

**البـالُ**: حـاڵو وەزع ٥ شـتی گـرنگ‌و بـەنرخ ٥ دەگـوترێ: (أمـر ذوبـال): کارێکی گرنگەو بەهەند وەردەگیرێ ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان رخي البال، نـــاعم البــــال): فلاّنکــەس گوزەرانخۆش‌و دڵ ئارامە.

**البـالُ**: هیـواو ئـاوات ٥ پـاچ ٥ ماسـی سەرگەورە.

**البالة**: شریف یان گوێنییەکی گەورەیە بەپەستان لۆکەو پۆشاك‌و شتی وای تــێ دەهــاخنن‌و بەتــەل‌و قەیــد دەپێچرێتەوە.

**البُوّال**: نەخۆشییەکە نەخۆشەکە زۆر میزدەکا ٥ میزەچڕکە.

**البَوْلُ**: میز، شلەمەنییەکە گورچیلە دەری دەداو لەمیزەڵـــدان کۆدەبێتــــەوە تادەیکاتە دەرەوە.

**البُوَلَةُ**: کەسێك زۆر میز بکا ٥ (المبـال) ئەوشـــوێنەی میزەکـــەی لێـــوە دەردەچێ.

**المَبْوَلَـةُ**: هەرشـتێك ببێتـە هۆکـاری میزکردنی زۆر وەکوو خواردنـەوەی بیرەو خواردنی شوتی ...هتد.

**المِبْوَلَةُ**: ئەوشتەی میـزی تـێ دەکرێ ٥ ئاودەست.

**البُومَةُ**: کوندەبەبو، باڵندەیەکە زۆرتـر بەشــەو دەردەکــەوێ، بەنیشــانەی نەگبـەتی‌و شـوم دادەنـرێ، بـەزۆری حـەزی لەوێرانـەو چـۆڵەوانی یـە ٥ روخسـارو رەنگـی ناشـیرین‌و دەنگـی ناخۆشە.

**باَـهُ بَوْنـاً**: لـەپیاوەتی مەردایـەتی دا بەسەری دا باڵا دەست بوو.

**البانُ**: جۆرە درەختێکە قەدەکـەی مـام ناوەندیـە نـەرمو شـلکە ئـافرەتی قیت‌و قۆزو جوانی پێ دەشوبهێنرێ لەبالاّبەرزی‌و شلکی دا.

**اَلْبِـران**: کۆڵەکـەی رەشمـاڵ، سـتونی خێمە، (ك: أبونة، بون بُوَن)

**البَـوْن والبُـونُ**: نێـوانی دوشـت دەگـوترێ: (بینهما بون بعید) مەسافەی نیوانیـان دورو درێژە.

**بـاهَ فـلان بَراهـاً**: فـلان جـارز بـوو (بـاه الحيوان) ئاژەڵەکە کزبوو.

**بـاهَ لَـهُ بَرْهـاً**: وەهـۆش خۆهاتـەوەو تێـی گەیی.

**باه فلاناً**: نەفرینی لەفلانکەس کرد.

**اسـتبان السـيلُ الشـجرة**: لافاوەکـە درەختەکـەی لەشـوێنی خـۆی جولاند.

**أُستُبِيهَ الرجلُ**: پیاوەکە شێت بوو.

**اَلْبَـاهُ**: مـارەبڕین ◊ جوتبـون ◊ (الباهـة) بەمانا (اَلْبَاهَ)دێ.

**اَلْبُوهُ**: باڵندەیەکە لەکوندە بەبو بچوکترەو لەو دەچێ، هەروا بە (باز) دەگوترێ کەپەری باڵەکانی هەڵوەرن.

**البوهـة مـن الرجـال**: پیـاوی لاوازی بەتـەماع وتـرزل ◊ (البوهـة) ئەوپەرویـە یـان ئـەو خوریـەی بەشـەدەگرێ بۆئـەوەی بکرێتـە لیقـەی نـاو شوشـە مەرەکـەب ◊ هەروەها ئەو پەڕۆو پوش‌و پەلاش‌و خۆڵەوردەی با ڕای‌دەدا.

**البَوُّ**: بێچوە حوشتر ◊ پێستی بێچوە حوشتر پڕدەکـرێ لـەکاو پـوش‌و پـەلاش لەحوشـترەکە نزیـك دەکرێتـەوە بۆئەوەی شیر بداو بدۆشرێ.

**البَوِيـة**: بۆیـە، مادەیەکـە خـانوو دەرگـاو پەنجەرەو شتی وای پێ بۆیە دەکرێ.

**بَـابَ فـلان بَيْبـاً**: فلانکـەس جۆگـای هەڵکەند.

**البيبُ**: جۆگای ئاو تا دەگاتـە ئەسـتێرو حەوزەکـە ◊ هـەروەها نـاوە بـۆ ئـەو کونـەی لـەلای خـواروی حەوزەکـە دروسـت دەکـرێ بۆئـەوەی ئاوەکـەی لێوە بڕوا بۆدەرەوە.

**اَلْبِيبَةُ**: بەمانا (اَلْبِيبُ) هەروا ئامێرێکە گیـا طیبـاقـی تێـدا قـانگ دەدرێ بۆئـەوەی بەدوکەڵەکـەی مێشـوله بتەکێنەوە.

**بات فلانٌ بَيْتاً وبياتاً ومبيتـاً ومباتـاً وبَيْتوتـة**: فلانکـەس شـەوی بەسـەرداهات‌و مایەوە، جانوستبێ یان نەنوستبێ.

**بـات الشَّـيْئُ**: شـەوی بەسـەردا تێپـەڕی ◊ دەگوترێ: (خبز بالت وشراب بالت).

**بات فلانٌ**: فلانکەس ژنی هێنـا ◊ (بـات في مکان کذا) شەو لەوشوێنە مایەوە.

**بات يفعل کذا**: بەشەو ئەوکارە دەکا.

**أباته**: شەو هێشتیەوە ئیزنی نەدا.

**بَيَّـتَ البَيْـتَ**: خـانووی دروسـت کـرد ◊ (بَيَّـتَ الشَّـيْئَ) شـەو هێشـتیەوە ◊ بەشەو دروستی کرد، شەوپیلانی بۆ دارشت ◊ شەو نیـازی کردنـی کـرد ◊ پێغەمبـەر (د.خ) دەفـەرموێ: (لاصيام لمن لم يبيت الصيام).

**بَيَّـتَ رأيَـهُ**: بـیرو بۆچـونەکەی لەکـەوو بێژنگ دا.

**بَيَّـتَ القَـوْمَ**: شـەو لـەناکاو هێرشـی بـۆ بـردن‌و چـووە سـەریان زیـانی پێگەیاندن.

بَيَّتَ النخلةَ: لق و پۆپ و چقڵ و هەژگەڵی لەدارخورماکە لێ کردەوە.

تَبَيَّتَ: بۆ موطاوعەی (بَيَّتَ) هاتووە.

تَبَيَّتَ الطعامَ: خواردنەکەی بەشەو پێش نوستن خوارد.

تَبَيَّت الرَجُلَ عن حاجته: نەیهێشت پیاوەکە بەشەو پێداویستی خۆی جێبەجێ بکا، بووە لەمپەڕ لەبەردەمی دا.

البَيَاتُ: نیوەشەو، دەگوترێ: (أتاهم الأمر بياتاً) لەناکاو لە کاتی نیوەشەودا بەڵایەخەی گرتن.

البَيَاتُ الشتوي: حاڵەتێکە یارمەتی روەك و گیانلەبەر دەدا بۆئەوەی لەوەرزی ساردی زستان دا بتوانن بەهێدی و ئارامی هەڵبکەن.

البَيْتُ: خانوو ماڵ، شوێنی تێدا حەوانەوە ◊ تەختی ماڵ ◊ کەعبەی پیرۆز، (بيت الله) : مزگەوت (بيت الرجل) خێزانەکەی (بيت الشعر) شیعری خاوەن وەزن و قافیە کەپێك هاتبێ لەصەدرو عەجز (بيت القصيد) جوانترین دێڕی قەصیدە ◊ مەبەستی سەرەکی لەقسەو گفت و گۆ ◊ دەگوترێ: (جاري بيت بيت) جیرانەکەم ماڵم بەماڵیەوەیەتی، (ك: أبيات وبيوت).

البيتُ: بڕێو (البيتة) شێوەی مانەوە، خانوو.

البَيُوتُ: ئەوکارەی خاوەنەکەی گرنگی پێ دەداو شەونخونی بۆدەکا.

البَيُّوتَةُ: ئەوددانەن کەناکەون.

بَيَّحَ بالأمر: بەنهێنی هەواڵی پێ گەیاند.

البيحانُ: ئەوکەسەی نهێنی خۆی دەدرکێنێ.

باد بيداً وبياداً وبيوداً وبيدودة: تێداچوو کۆتایی پێ هات.

بادت الشمس: خۆرئاوابوو.

أباده: لەناوی برد، فەوتاندی.

البَيْدُ من الطعام: خواردنی خراپ.

البيداء: ساراو چۆڵەوانی، (ك: بيد).

البَيْدانةُ: کەرەکێوی.

بَيْدَ: ئیسمە بەمانا (غير) هاتووە بەمانا (من أجل)یش هاتووە ◊ پێغەمبەر فەرمویەتی: (أنا افصح العرب بيداني من قريش ونشأت في بني سعد).

المُبِيدُ: فەوتێنەری جڕو جانەوەر ◊ مادەیەکە جڕو جانەوەر دەکوژێ و بەکتریاو جەراثیمەکان لەناودەبا.

بَيْدَرَ الحنطة ونحوها: گەنمەکەی لەسەر خەرمان دا کۆکردەوە.

البَيْدَرُ: خەرمان، کۆمەڵە گەنمی سورکراو دوای گێرەکردن، (ك: بيادر).

البيدق: شارەزاو چاوساغی ڕێبواران ◊ سەربازی پیادە.

البُيْذَقُ: بەمانا (البيدق)دێ.

تَمَّ على الأمر تمّاً: بەردەوام بوو لەسەر کارەکە ٥ (تَمَّ العَيْنَ عنه) بە نوشتە چاوەزاری لەسەر لابرد.

أتَمَّتِ الحامِلُ: ئافرەتە سك پڕەکە کاتی منداڵبوونی نزیك بووە ٥ مانگ و ڕۆژی سکپڕی تەواوکرد (هي مُتِمٌّ).

أتَـمَّ النَبْـتُ: ڕووەکەکە بەرزبووە گوڵەکانی دەرکەوتن.

أتَمَّ القمرُ: مانگ بوو بەمانگی شەوی چواردەو خشت بوو خۆی ڕازاندەوە.

أتَمَّ الى موضع كذا: بۆلای فلان شوێن چوو کردی بەئامانجی خۆی.

أتَمَّ الشَيْءَ: شتەکەی تەواوکرد.

أتَمَّ فلاناً: پاچی دابە فلان بێلی دابە فلان.

تَمَّمَ على الجريح: برینداره‌کەی کوشت.

تَمَّـمَ علـى الجنـد والطـلاب: سەربازو قوتابیەکانی سەرژمێر کردن بۆئەوەی بزانێ ژمارەیان چەندەو کێ ئامادەیەو کێ نادیارە.

تَمَّمَ الصبيَّ: نوشتەو جادووی بەسەر منداڵەکەوە کرد.

تتامَّ القومُ: خەڵکەکە هەموویان هاتن و تەواو بوون.

إستَتَمَّ الشَيْءَ: شتەکەی تەواوکرد.

استَتَمَّ النعمـة بالشـكر: داوای کرد بەشوکرو سوپاس نیعمەتەکانی تەواوبکا.

التَّتِمَّةُ: تەواوکەر، هەر شتێك شتێکی تری پێ تەواوبێ.

التَّمَامُ: تەواوی شت ٥ (ليلة التمام) شەوی چواردە لەمانگی قەمەریدا کە مانگ خشت دەبێ و کامڵ خۆی دەنوێنێ و دەبێتە (بدر) دەگوترێ: (بدر تَمامٌ).

ليـل التمـام: درێژترین شەو لەساڵدا کەشەوی یەڵدایە.

التَّمَامـة: باقی ماندەی شت ٥ (تِمَامة الشَيْءِ) تەواوکەری شت.

التُّمُّ: شتی تەواو ٥ پاچ ٥ بێل و پێمەڕە، (ك: تِمَمٌ تِمَمَةٌ).

التُّمَمُ: نەوشتەی کامڵ و تەواوبێ.

تمـيم: خێڵێکی عەرەبن لە خێڵەکانی وڵاتی نەجد.

التَّميمَةُ: نوشتەو دوعایە دەکرێتە مل بۆ بەرگری لە چاوەزار، (ك: تَمائم).

المُتَمُّ: کۆتایی دەماری ناوك.

تمـوز: مانگی دەی حیسابی سوریانی و مانگی حەوتی ڕۆمی.

تَمِهَ اللَّحْـمُ واللبنُ ونحوهمـا تَمَهـاً وتَماهةً: گۆشتەکە یان شیرەکە بۆگەنی کرد، کەڵکی نەما.

المِتْمَـاهُ مـن الماشية: ئەو ئاژەڵەیە کە دوای دۆشین شیرەکەی دەبزرکێ.

تَنَأَ بالمكان تنوءً اوتناءةً: لەو شوێنە مایەوە ٥ دەگوترێ: (تنأ على الأمر وفيه) بەردەوام بوو لەسەر کارەکەیی و تێیدا کارابوو.

التـانُبولُ: ڕووەکێکە لەپێڕی فولفول،

گەڵاکەی دەجوریٚ پیٚی دەگوتریٚ: کولەکە هیندی.

التِّنبالُ: کورت، (ك: تنابيل وتنابله)ميە.

التِّنْبالةُ: بەمانا (التِّنبال) دیٚ.

اَلتُّنْبَلُ: تەمبەڵو تەوەزەل.

التُّنْبُولُ: بەمانا (التِّنبال) دیٚ.

تَنْتَلَتِ البيضةُ: هیٚلکەکە پیس بوو، کەڵکی نەما خویٚنی تیٚکەوت.

تَنْتَلَ الرجلُ: پیاوەکە چڵکن بوو دوای ئەوەی خاویٚن بوو. دوایئەوەی بە عاقڵو زیر دەهاتە پیٚش چاوو خۆی نەحمەق کرد.

التُّنْتالُ: کورت، (ك: تنابيل)ە ٥ (التِّنتالة) بەمانا (التِّنتال) دیٚ.

التُّنْتَلُ والتُّنْتِلُ: بەمانا (التِّنتال) دیٚ.

تَنْتَن: وازی لە دۆستەکانی هیٚناو کەوتە گەڵ خەڵکانی تر.

التُّنْتَنَةُ: ئاشقبەندیٚکە چەند جۆریٚکی هەیە ئافرەتان بۆ جوانی بەسەر جلەکانیاندا دەیدورون.

التُّنُوبُ: درەختیٚکە لە پیٚری درەختی سنەوبەر.

التُّنُوج: جۆرە درەختیٚکە لە پیٚری سنەوبەرەکان.

تَنَخَ بالمكان تنوخاً: لەو شویٚنە مایەوە، دەگوتریٚ: (تَنَخَ على الأمرِ وفيه) لەسەر ئەو کارە بەردەوام بوو تیٚیدا قاڵ بوو.

تَنِخَ تَنَخاً: تووشی بەدخۆراکی بوو گەدەی ترشاو تەبیعەتی تیٚکچوو خەریك بوو بڕشیٚتەوە.

أَتْنَخَهُ الطعامُ: زۆرخۆری تووشی توخمەو ئینتەلای کرد.

تانَخَهُ في الحرب ونحوها: ورەی بەرزکردەوەو لەشەڕدا دامەزراوی کرد.

تَنَّخَ بالمكان: بەمانا (تَنَخَ) دیٚ.

التنانير: تەنوور دروستکەر.

التنور: فڕنی نان تیٚدا برژاندن تەندووری نانکردن، (ك: تنانير).

التُّنْسُ: یاری تیٚنس، یارییەکە لەنیٚوان دووکەسدا دەکریٚ لە نیٚوانیاندا شەبەکەیەك هەیەو تۆپە ریشەکە لەنیٚوان هەردووکیاندا دەهاویٚژریٚ بەشتیٚکی تایبەتی.

التُّنُوفَةُ: ساراو بیابانیٚك کە بیٚ ئاوو بیٚ هاو دەنگ بیٚ، (ك: تنالف).

التُّنوفِيَّةُ: بەمانا (التنوفة) دیٚ.

التُّنكةُ: تەنەکە، زەرفیٚکە لە صەفیح ٥ جۆریٚکی تری حەوجوشیٚکە قاوەی تیٚدا دەکولیٚندریٚ.

التُّنُّومُ: درەختیٚکە بەردارە بەرەکەی بەزۆری ئاسكو نوماعە دەیخۆن.

أَتَنَّ: دورکەوتەوە، (أَتَنَّ المرضُ الصبيَّ) نەخۆشی نەیهیٚشت منداڵەکە گەشە بکا.

تانَّ بَيْنَهُمَا: بەراوردی کرد لەنیٚوانیاندا، بەیەکی گرتنو بەرامبەری کردن.

**التِّنُ:** هاوشانو بەرامبەر، کەس، (ك: أتنان)ە.

**التِّنِنُ:** گیانلەبەرێکی ئەفسانەییە هەم پیرۆو خشۆکە هەم باڵدارە، چنگی گیانلەبەری شیریی هەیە، باڵی هەڵۆی هەیە، کلکی ماری هەیە ۵ لەهەندێ لە وڵاتان دەکرێتە رەمزێکی نەتەوەیی لە قاچو دەستیدا چوار نینۆکی تیژو رێك هەیە نینۆکی پێنجەم لە لەپی دەستیدایە ۵ سەری توکنە ۵ ماری گەورە، ئەژدیها.

**تُهْ تُهْ:** لاسای کردنەوەی دەنگێکە ۵ تێرا خورینی حوشترە، بانگکردنی سەگە.

**تَهْتَهَ:** لەقسەکانیدا (تُهْ تُهْ)ی دووبارە کردەوە بەهۆی زمان تورییەوە ۵ لەچوار چێوەی شتی بەتاڵو پوچدا سوڕایەوە.

**التَّهَاتِهُ:** هەرشتێك بێبناغەوتوڕەهات بێ.

**اَلتُّهْتَهَةُ:** تاکەکەی (تَهاتِهَ) ۵ یان زمانی تور بێو کەم لەقسەی حاڵی بێ.

**التَیْهُورُ:** شەپۆلی بەرزبووەوەی دەریا ۵ نێوان سەرانسەری کێوو دۆڵو لای خوارووبان ۵ هەر شوێنێك پێ دەشت بێ ۵ هەر شوێنێك بەهۆی گێژەڵوکەو زریانەوە لافاوە زیخو لمی تێدا پەیدا ببێ ۵ پیاوی سەرگەردانی خاوەن ترو فیز، (ك: تیاهیر، تیاهر).

**تَهِمَ اللَّبَنُ واللحمُ تَهَماً:** گۆشتەکە بۆگەنی کرد، شیرەکە بزرکاو بۆنی کرد، (تَهِمَ الرجلُ): پیاوەکە بۆنی ناخۆشی لێهات ۵ نەتوانایی و تەمبەڵی لێ دیاریدا.

**تَهِمَ البعیرُ:** حوشترەکە لەوەری پاوانەکەی بەلاوە خۆش نەبوو بۆزۆ بوو ۵ تووشی نەخۆشی (حەروو) بوو کزو لاوازبوو.

**تَهِمَ الحَرُّ:** گەرما تاوی ساندو هەوای شەماڵ کەم بوو.

**أَتْهَمَ:** هاتە وڵاتی تیهامە (أتْهَمَ البَلَدَ) شارەکەی پێ ناخۆش بوو ئاوو هەواکەی پێ نەکەوت.

**تاهَمَ:** هاتە وڵاتی تیهامە.

**تَتَهَّمَ:** بەمانا (تاهَمَ) دێ.

**تِهَامَةُ:** زەوی وڵاتێکی نزماییە، کەوتۆتە نێوان کەناری دەریاو کێوەکانی حیجاز بەلای یەمەندا، (ك: تهائم)ە.

**التُّهَمُ:** ئەو زەوییەی رووی لەدەریایە.

**التُّهْمَةُ:** شاری تیهامە ۵ گومان.

**المِتْهَامُ:** ئەو کەسەیە زۆر هاتووچۆی شارو وڵاتی تیهامە بکا.

**تَابَ تَوبَةً ومتاباً وتابةً:** لەتاوان پەشیمان بۆوە.

**تَابَ اللهُ علی عبده:** خودا یارمەتی بەندەکەی خۆی دا بۆ تۆبەکردنو وازهێنان لە گوناه، (العبد تائب) (واللهُ توّاب).

**استتابَهُ**: داوای تۆبەکردنی لێکرد.

**التَّوبَةُ**: دان پیانان‌و پەشیمان بوونەوەو وازهێنان لەتاوان‌و سوربوونە لەسەر ئەوە کەلە داهاتوودا ناگەڕێتەوە بۆسەری.

**توت**: یەکەم مانگی ساڵی قیبطی‌یەکانە.

**التُّوتَ**: جینسی درەختێکە کەلەپێڕی (القراصیة)یە بۆ مەبەستی سوود وەرگرتن لەبەرەکەی دەروێندرێ‌و بەخێو دەکرێ، بەرەکەی خۆراکی ئادەمیزادە، سوود لەگەڵاکەشی وەردەگیرێ ە کرمی ئاوریشمی پێ بەخێو دەکرێ ە جۆرەکانی زۆرن.

**التوتیاءُ**: بەردێکە دەهاڕدرێ‌و دەکرێ بەکل‌و چاوی پێ دەڕێژرێ.

**المُتْوَتَةُ**: زەوییەکە درەختی تووتی زۆر لێ هەبێت.

**تَوَّجَـهُ**: تاجی لەسەرکرد ە ڕەشی کردەوە، (تَتَوَّج) بۆ موطاوەعەی (تَوَّجَهَ) دێ.

**التائج**: خاوەن تاج ە دەگوترێ: (إمام تائج) واتە پێشەوایەکی خاوەن تاج.

**التَّاجُ**: جۆرە کڵاوێکە دەخرێتە سەری پاشاو مەلیکەکان بەرواڵەت لە زێڕو جەواهیرات‌و شتی بەنرخی تر دروست دەکرێ، (ك: تیجان) و (أتواج)ە.

**التَّاجِیّ**: شارەگ‌و دەماری تاجی ە کە دەمارێکە لەشێوەی تاجدا تەغزییەی دڵ دەکا.

**التَّوریج**: لە زانیاری ڕووەك دا توێکڵی ناوەوەی گوڵە.

**التویجیة**: پارچەیەکە لە توێکڵی ناوەوەی گوڵ.

**تَاحَ له الشَّیْئُ تَوْحاً**: بۆی دەستەبەر بوو بۆی هەڵسوڕا.

**تَارَ الماءُ تَوراً**: ئاوەکە ڕەوان بوو، جاری بوو.

**تیر الرَّجُلُ**: تار لێیدا.

**أتار الیه الرّمی**: چەند جارێك تیرەکەی بۆ ئاراستە کردەوە دەگوترێ: (أتار الیه النظر) دوبارە سەیری کردەوە.

**تاوره**: جار لەدواجار بۆی گەڕایەوەو سەیری کردەوە.

**التارة**: کات‌و زەمان.

**التَّورُ**: سەفیرو نماینەدە لەنێو گەل‌و نەتەوەدا ە قاپێکە ئاوی تێدا دەخورێتەوە، (ك: أتوار)ە.

**التوراة**: نامەی ئاسمانی کەبۆ حەزرەتی موسا نێردراوەو تایبەتە بە بەنو ئیسرائیلییەوە.

**التورة**: ئافرەتی خزمەتچی‌و کارەکەر کەبەناو شەیدا یان دابگەڕێ.

**تاف بَصَرَهُ توفاً**: هەمیشە سەیری ئەوشتەی کرد.

**تاف بصره عنه**: چاوی لێلاداو چیدی سەیری نەکرد.

**التافة**: عەیب ە زێدە ە پێویستی ە دواکەوتن.

**التَّوفَـةُ**: بـەمانا (التافـة) دێ ٥ بـەمانا تاوانو هەڵە دێ.

**تـاقَ تُوْقـاً وتوقانـاً وتُؤوقـاً وتياقـةً**: حـەزی لێکرد، سۆزی بۆیبوو.

**تـاق الى الشـيء توقانـاً**: ویستی ئەوشـتە بکات.

**تـاق عليـه**: سـوربوو لەسـەر رێـكو پێـك کردنـی ئـەوکارەو چاکسـازی لـە ئیشەکەیدا.

**تاق منه**: لێی ترسا ٥ (تاق مـن المـرض) لـە نەخۆشییەکە چاك بووە.

**تتوّق الى الشيئ**: حەزی لەوشتە کرد.

**تَالَ تُوْلاً**: چارەسەری سیحرو جادووەکـەی کرد.

**تَـــالَ بــــه**: تێشـکا، ئـازارو مەینـــەتی پێکەیەندرا.

**التَّالُ**: بێچووە هەنگ، پورە هەنگ.

**التُّولَـةُ**: سیحرو جـادو، مورویکـه ئـافرەت بـــەکاری دەهێنـــێ بۆئـــەوەی لای مێردەکەی خۆشەویست ببێ.

**التُّولـة**: بـەمانا (التُّوَلـةُ) دێ ٥ بـەلاو کارەساتی سامناك.

**التُّويلَـةُ**: کۆمـەڵێك ئـادەمیزاد بـەماڵو خانوو منداڵەکانیانەوە.

**تَوَّمَ الصَّبيَّ**: گوارەی لەگوێی منداڵەکـە کرد.

**التُّوَمَـةُ**: گـوارەی گـوڵ گـەورە ٥ دانـەی لونلویی بچکۆلە کەلە زیو دروست بکرێ ٥ هێلکەی نوعامە، (ك: تُوَم وتوم)ە.

**أُمُّ تُومَةَ**: بە صەدەف دەگوترێ.

**تـاوَنَ الصَّـيدَ ولَــه**: چاوبەسـتی لــە نێچیرەکە کرد، جارێك لەم لاوە بۆی چوو جارێکیتر لەولاوە بۆی هات.

**التُّونـة**: ماسـییەکی گەورەیـە، وادەبـێ شـەش مـەتر درێـژدەبێ گۆشتەکەی بەتازەیی‌و بەخوێ کراوی دەخـورێ ٥ وادەبێ لـەناو رۆن زەیت دا سـوور دەکرێتەوە.

**تَاهَ في المفازة تَوْهاً وتوهـاً**: رێگای لێ گـووم بوو.

**تـــاهَ في الأرض**: بـــەناو زەوی دا رۆیـــی بەسەر گەردانی ٥ لەناوچوو ٥ خـۆی بـــەزل زانـــی ٥ عـــەقڵو هۆشـــی تێکچوو.

**تَوَّهَهُ**: رێگای لێ گووم کـرد ٥ فەوتانـدی ٥ سەرگەردانی کرد.

**التَّـــوَّهْ**: سـەر لێ تێکـدەر ٥ دەگـوترێ: (فلاةٌ تُوَّة)، (ك: أتواه).

**التَّوُ**: تاك، تەنیا ٥ دەگوترێ: (وجَّهَ مـن خيله بألف تَوّ) واتـه بەهـەزار کـەس: بەهەزار تاك ٥ دەگوترێ: (جاء تـوّاً) راستەوخۆ هاتو هیچ پێچو پـەنای نـــەکردن ٥ گوریســـێك کـــە پتەوییەکەی دوو چەندانە ببێتەوە.

**التَّوُّ**: ساتێك لەشەو یان لە رۆژ.

**تَوَى البَعِيرَ تَيّاً**: بەداخ حوشترەکەی نیشانە کرد.

**توِيَ المالُ تَوىً**: ماڵەکە بەفیرۆچوو هیوای گەڕانەوەی لێ ناکرێ.

تَـوِيَ الانسـان: ئادەمیزادەکـە لەناوچـوو فەوتا.

أتـوى مَالَـهُ: مـاڵو سـامانەکەی بەفیڕۆداو فەوتاندی.

التَّـوِي: داخێکـە سور دەکرێتـەوە بـە رانـی ئاژەڵەکـە یـان بـەملی یـان بـە گوێچکەیدا دەنرێ ٥ لەسـەر شێوەی صەلیبە.

التَّواءُ: بەمانا (التِوى) دێ.

المَتْوَاةُ: شوێنی بەهیلاکچوونو فـەوتان ٥ هۆکـاری فـەوتان هـەر بۆیـە دەگـوترێ: (الشُـحُ متـواة) بـەخیلی فەوتێنەرە.

تي: ئیسمی ئیشارەیە بۆ تاکی مێینە.

تَـاح لـه الشّـئُ يَتِحـاً: شـتەکە بـۆی دەستەبەربوو.

تاح له الأمرُ: بەسەر کارەکەی باڵا دەست بوو ٥ (تاح في مِشيته) لارو لەنجـەی کرد.

أتَاحَـهُ: ئەنـدازەی گـرتو خـۆی بـۆ ئامادەکرد.

التَّيحانُ والتَّيحّان من الرجال: پیاوێکی وایـە خـۆ لەشـت هەڵـدەقورتێنێو لـەناکاما تووشـی بـەڵاو کارەسـات دەبـێ ٥ کەسـێکە تووشـی زۆر کـاری گەورەو سامناك دەبێ ٥ بـە ئەسـپی خۆشڕەویش دەگوترێ.

التَّياحُ من الخيل: ئەسپێکە لە ڕۆیشتنندا سـەر کـەشو خـاوەن نیشـاتە خـۆ بەملاو بەولادا دەدا.

المِتْياحُ: پیاوێ کە زۆر عـەجولو جـەو جولکـەربێ، خـۆ تێهـەڵقووتێن بـێ خۆ لەو کارانە هەڵقورتێنێ کە هیچ پەیوەنـدییان بـەوەوە نییـە ٥ هـەر وابەکاری مەزندەگراویش دەگوترێ.

المِتْيَحُ: کەسێك خۆ لەکاری لابەلاو شتی وا هـەڵقورتێنێ کـە پەیوەنـدی بـەوەوە نیـە ئـیتر دەکەوێتـە ناوکێشەو سـەر ئێشەو چورتمەوە ٥ هـەروا بـە ئەسـپی سـەرکەشو تەیاحیش دەگوترێ.

أَلتَّيـدُ: هێـدیو هـێمن ٥ دەگـوترێ: (تَيْدَكَ يـا هـذا) لەسـەر خۆبە پەلە پەل مەکە ٥ دەگوترێ: (تَيْدَ ك فلاناً) لەگەڵ فلان کەس هێدیو هێمن بە.

أَلتَّيـرُ: ئیرکـە ٥ ئـەو دارە ئەستوورەیە کـە ئەمسـەرو ئەوسـەری دەخرێتـە سەر دیوارو ئەمجار لایـەکی دارەکـان دەخرێتە سەرئەو.

التَّيَارُ: جەو جولێکی سەرانسەرییە لـە ئـاوی دەریـا لوشـەکاندا بـە رێـرەوی هەڵکردنی جۆرەکانی (با) کاریگەری تێدەکـەوێ ئـاوی گـەرم دەبیا بۆلای ئاوە ساردەکانو بە پێچەوانەوەش ٥ تــەوژمی هــەڵڕژانی ئــاو لــە بەرزاییەوە بەرەو خوار ٥ دەگوترێ: (فرس تَيّارٌ) ئەسـپێکە لـە ڕۆیشتندا وەکـوو شـەپۆلی ئـاو دەڕوا ٥ هـەروا سـەرگەردانی بـە فیـزو تـڕ زل ٥ لـە زانسـتی سروشـتدا: سـەیالێکی

کەهرەبایيە لـە قـەبارەی کارەبا گەیەنەردا دێوو دەچێ.

**تاز تَیزاً وتیزاناً:** توندو پتەو بوو (تاز السهمُ فـي الرمية) تیرەکـە لـە کەوانەکـەدا وەلەرزەو جمەو جوڵ کەوت.

**تـاز فلانـاً تیـزاً:** بەسـەر فلان کەسدا بالا دەست بوو.

**تایزه:** بەسەریدا بالا دەست بوو.

**تَتَیَّزَ فی مشیته:** لە رۆیشتندا هەڵبەزو دابەزی کرد.

**تِـسْ تِـسْ:** دەرکردنـی نێریـە قەرمیـەو تێراخورپینیەتی.

**تاس الجَدْیُ تَیْساً:** بێچوە بزنەکە بوو بە نێرییە قەرە.

**تیستِ العنز تَیْساً:** بزنەکە شاخەکانی وەکوو شاخی نێریە کێوی لێهات لە درێژیدا.

**تایَسَهُ:** پاڵە پەستۆی دا.

**تَیَّسَ فَرَسَهُ:** جوانو ئەسپەکەی راهێناو ژێرباری کرد، (تَیَّسَ فلاناً عـن کـذا) رەدی دایـەوەو قسـەکانی پـوچ کردنەوە.

**تتـایَسَ المـاء:** شـەپۆلی دەریـا کـە شـەرە قۆچیان کرد.

**استَتْیَسَتِ العنز:** بزنەکە وەکوو نێریـە قەرەی لێهات.

**التَّـیْسُ:** نێرینـەی بـزنو ئاسـكو حەیوانـە کێوی ئەگـەر تەمـەنی لـە سـاڵێك تێپـەڕی، (ك: تیـوس وأتیـاس وأتْیُس وتِیَسة) ٥ (لحية التيس) ریشە نێـری: گیایەکـە رەگـەکانی دەکوڵێندرێو دەخورێ.

**المَتْیُوساءُ:** کۆمەڵی نێریە قەرەکان.

**تـاعَ الجَمَـدُ ونحـوه تَیْعـاً وتَیَعـاً وتَیَعانـاً:** بەسـتەڵەكو سـەهۆڵەکە توایـەوەو رۆیی.

**تـاعَ المـاءُ ونحـوه:** ئاوەکە بەسـەر زەویـدا بڵاوبۆوە.

**تاعَ الدمُ والقيءِ:** خوێنەکە یان رشانەوەکە هاتە دەر.

**تاع السنبل:** سونبولەکە هەنـدێکی وشـك بووەو هەندێکی بەتەڕی مایەوە.

**تـاع بالشّـيءِ:** ئەوشـتەی بەدەسـتی خـۆی گرت.

**تاع الى الشَّيءِ:** حەزی لەوشـتە کـرد (تـاع الى فلان): پەلە لە فلان کـەس کـراو بـەردرا ٥ (تـاع السـمنَ ونحـوه) رۆنەکەی بە پارچە نانێك هەڵگرت.

**تاع الطريق:** رێگاکەی بڕی.

**أتـاعَ فـلان:** فلانکەس رشایەوە، (أتـاع قَیْئَـهُ ودَمَـهُ): خوێنەکـە یـان رەشـوەکەی هێنایـە دەرێ ٥ (أتـاع القيءَ): خواردنەکەی هێنایەوە.

**تایع على السرّ:** پـری بەشـەڕدا کـردوو بەپەلە بوو بۆ هەڵگیرسانی.

**تَیَّعَ بالشّيءِ:** شتەکەی بەدەست گرت.

**تَیَّعَ السَّمنَ:** رۆنەکەی توانـدەوەو رەوان بوو.

**تتايَعَ الجملُ في مشيته:** حوشترەکە لە رۆیشتن دا شانەکانی خۆی جولاندن.

**تتايَعَ السكرانُ:** سەرخۆشەکە خۆی تێ فڕێدا.

**تتايَعَ فلان:** بە سوربوونەوە بەرەو پیری شەڕچوو حەزی لێ بوو.

**تتايَعَ في الأمر:** لەکارەکەدا ڕۆچوو، ئیلحاحی زۆری کرد.

**تتايَعَ للقيام:** خۆی ئامادەکرد بۆ هەڵسان.

**الأتْيَعُ:** ئەو کەسەی پەلەبکا بۆ ئەحمەقی و نەفامی ٥ (الأتيع من الأماكن) ئەو شوێنەیە تراویلکە بەسەریا رابورێ.

**التَّاعةُ:** کڵۆ فرۆ (کڵۆ فرۆی گەورە).

**التَّيْعُ:** ئەو شلەمەنییەیە کەبەسەر زەویدا رەوان ببێ.

**التَّيعَةُ:** چل سەر بزن و مەڕ، ئەندازەی زەکات (نیصابی زەکات).

**التَّيِّعُ:** ئەوکەسەی پەلە بکا بۆ شەڕو ئاژاوە.

**التَّيْعانُ:** بەمانا (التيع) دێ.

**التَّيْفُودُ:** گرانەتا نەخۆشییەکی گواستراوەیە، واتە نەخۆشییەکە لەم نەخۆشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ یەکێکی تر.

**التيفوس:** تایەکە (نەخۆشییەکە) پلەی گەرمی جەستە بەرز دەبێتەوە، جارجار نەخۆشەکە بێ هۆشی بەسەردا دێ ٥ هەندێ پەڵە لەسەر پێست دروست دەکا.

**تيل:** ڕوەکێکە لەپێری (الخبازية)یە لە لاسکەکەی حەبل و گوێنی دروست دەکرێ.

**تام ئيماً:** گۆشە گیربوو وازی لەخەڵك هێنا.

**تام الهوى والحبيب فلاناً:** عەشق و سۆزو خۆشەویستی دڵ و دەروونی فلانکەسی داگرت و کردی بەبەندەی خۆی و عەقڵ و هۆشی برد.

**أتامَ:** مەڕێکی سەربڕی.

**تَيَّمَهُ الهوى والحبيب:** عەشق و خۆشەویستی و دڵداری، عەقڵ و هۆشی بردووە ٥ (أتامَ) بەمانا (أتام) دێ.

**التَّيْمُ:** کۆیلە ٥ بۆیە عەرەب دەڵێن: (تيم الله، تيم اللات).

**التَّيْماءُ:** سارای پان و پۆڕ، دەگوترێ: (أرض تيماء): ساراو چۆڵەوانییەکی کوشندەو بەهیلاکبەرە ٥ ناوێکیشە بۆ ئەستێرەی (الجوزاء).

**التَّيْمَةُ:** مەڕێك لەماڵەوە بەخێو بکرێ و شیرەکەی لەماڵەوە بدۆشرێ ٥ نوشتەو میروی شین بۆ دەفعی چاوەزار ٥ مەڕێك لەکاتی برسیایەتیدا سەر ببڕدرێ ٥ هەر مەڕێك لە چل سەر زیاتر بێ.

**التين:** هەنجیر.

**التين الشوكي**: هەنجیری درکاوی (شەوکی).

**التيّان**: هەنجیر فرۆش.

**المتانة**: زەوییەك هەنجیری زۆربێ.

**اَلْمَتْيَنَةُ**: بەمانا (المتانة) دێ.

**تاه تَيهاً وتيهاناً**: فیزو لوتبەرزی نواند.

**تاه في الأرض**: ڕێگای لێ گوومبوو، بەسەرگەردانی ڕۆیشت.

**تاه بَصَرُهُ**: بەردەوام سەیری ئەوشتەی کرد.

**تاهَ بَصَرُهُ عنه**: چاوی لێ هەڵبوارد.

**أتاهَهُ**: ڕێگای لێ گووم کرد.

**تيّهَهُ**: بەمانا (أتاهه) دێ.

**تيّه الشيئ**: شتەکەی لێ گووم بوو.

**تيّه نفسه**: خۆی سەرگەردان کرد.

**الأتيه (بلد أتيه)**: وڵاتێکی نەدۆزراوەیە کەس شارەزای نابێ.

**التِّيهُ**: ساراو بیابانێك نیشانەی تێدا نەبن ە دەگوترێ: (ارض تيه) زەوییەکی سەر گەردانکەرە.

**التيهاء**: بەمانا (التيه) دێ.

**التَّيهان**: من الرجال: پیاوی ئازاو چاو نەترس.

**التيهان من الجمال**: وشتری سەر ڕەق کە لغاو نەدا.

**التَّيهّان**: پیاوی ئازا واتە بەمانا (تيهان) دێ.

**المتاهة من الأرض**: بەمانا (التيه) دێ.

**المَتْيهةُ من الأرض**: بەمانا (التيه) دێ.

**المتيه من الرجال**: پیاوی زۆر گومڕاو سەر لێ شێواو.

**التيوقراطية**: جۆرێکە لەیاسای بەڕێوە بردن کە فەرمانڕەوا دەسەڵاتی ئایینی و دونیایی هەبێ.

**الثاء**: پیتی چوارەمە لە ریزبەندی پیتەکانی هیجاء.

**تَثَاءَبَ**: باوێشکی دا.

**تَثَأَب**: بە ئەنقەست باوێشکی دا ٥ لێکۆڵینەوەی لە هەواڵەکەدا ئەنجام دا.

**الثُؤَباءُ**: باوێشک، جم و جوڵێکی دەموچاوە بەبێ ئیختیار لەکاتی لەش داهێزان و تەمبەڵی و خەوهاتندا توشی ئادەمیزاد دێ.

**الأَثْأَبُ**: درەختێکە لە شێوەی درەختی هەنجیردا، لەشیوو دۆڵەکانی بادیەدا دەروێ.

**ثَأثَأ** الغضبُ: رق و کینەکەی نیشتەوە (ثَأثَأَ عن الشيء) هەوڵیدا ئەو شتە دەستەبەربکا دوایی بۆی دەرکەوت و وازی لێ هێنا ٥ (تَثَأثَأَ) بۆ موطاوەعەی (ثَأثَأ) هاتووە.

**ثَأثَأ** مِنهُ: لێی ترسا.

**ثَئِدَ** النَبتُ وَالمَكَانُ ثَأَداً: روەکەکە یان شوێنەکە شەوداوی بوو.

**ثَئِدَت اللَيلَةُ**: شەوەکەی سارد بوو (ثَئِدَ الإنسَان) ئادەمیزادەکە سەرما خوردەبوو (ثَئِدَ الفَخِذُ): سمتی خڕ کردن و بەگۆشت پڕ بوونەوە.

**الثَأَدُ**: سەرما ٥ شەونم ٥ خاك ٥ روەکی تەڕو تازەو ناسك.

**الثَأدَاءُ**: ئافرەتی گێل و ئەحمەق.

**الثَأدَةُ**: ئافرەتی گۆشتن و قەڵەو.

**ثَأَرَ** القَتِيلَ وبِهِ ثَأراً: تۆڵەی کوژراوەکەی ستاند ٥ دەگوترێ: (ثَأرَ الثَأرَ): فریای تۆڵەستاندنەکە کەوت ٥ (ثَأَرَ القَاتِلَ) تۆڵەی لە بکوژەکە کردەوە ٥ (ثَأرَ بِفلان) رازی بوو تۆڵە لە فلان بسێنێتەوە ٥ دەگوترێ: (ثَأرَ حَمِيمَهُ وبِحَمِيمِهِ) بکوژی خزمەکەی کوشتەوە ٥ (مَثؤورَ وَمَثؤور مِنهُ): تۆڵە لێسەندراوەیە ٥ (مَثؤور وَمَثؤور بِهِ) تۆڵە بۆکراوەیە.

**أثأرَ**: فریای تۆڵە ساندنەوەکە کەوت.

**إثَّأرَ**: بەمانا (أثأر) دێ.

**استَثأر**: هانای بردو داوای کرد تۆڵەی خزمە کوژراوەکەی بۆ بسێننەوە.

**الثَائِر**: کەسێکە هەموو هەوڵ و تەقەلایەکی بخاتە گەڕ بۆ تۆڵە ستاندنەوە لە بکوژ.

**الثَأرُ**: خودی ئەو خوێنەی کە وەردەگیرێ ٥ بکوژی خزم.

**الثَأر المُنِيمُ**: ئەو تۆڵەیەیە یان ئەو خوێنەیە کە بۆ خوێنگرەکە دەستە بەر بوو پێی رازی دەبێ و دادەسەکنێ و وازدێنێ، (ك: أثآرَ وثَآرات) وا دەبێ هەمزەکە سوك دەکرێ دەبێتە (ثارات).

ثَالَ لَـهُ المرضُ: نەخۆشی بالوکەی تـوش بوو.
تَثَألَّ جَسَدُهُ: بالوکە لەسەر جەستەی دەرکەوت.
الثُؤلُـولُ: بالوکـە، بلـۆقی بچـوکی رەق‌و خڕەخڕەن لەسەر پێست پەیدا دەبن بە ئەندازەی نۆك‌و بچوکتر، (ك: ثآليلُ)ە.
ثَـأَيَ الخَـرزَ ثأيـاً: میروەکـەی کـون کـرد، دەگوترێ: (ثَأيَ الأدِيمَ) پێستەکەی کون کرد.
ثَئِيَ الخرز ثَـأيٍ: نێوان کونی میروەکان هەڵوەشـاو ئـاوەڵا بـوو، کوونەکـە فراوانتربوو.
الثَّـأيُ والثَّـأي: پێـوە چـوون لێـك هەڵوەشـــان ە زەعیـــف بـــوون، شوێنەواری بـڕین، دەگوترێ: (رَأبَ الثَّـأيَ ورَتقـهُ) شـوێنی برینەکـەی سـاڕێژکردو گۆشـتە رزیوەکـەی لێ بووە.
إثبَاجَّ السقاء ونحوه: گۆزەکە ، کوندەکە ، تەنەکەکە پڕ بوو
إثبَاجَّ الرَجُلُ: پیاوەکە قەڵەوو کەتە بوو گۆشتەکەی داچۆڕا.
ثَبَّ ثبّاً: لە سەرئەژنۆ دانیشت وەکوو چۆن بۆ تەحیات دادەنیشێ.
ثَبَتَ ثَبَاتاً وَثُبُوتاً: جێگیر بوو، دەگوترێ: (ثبت بالمكان) تێیدا جێگیربوو.
ثَبَـتَ الأمـرُ: کارەکـە راسـت دەرچـوو چەسپا.
ثَبُـتَ ثباتـةً وَثُبولَـةً: دامـەزراو خۆڕاگربوو ە دەگوترێ: (فلان ثابت القلـب) فلانەکـەس دڵ دامـەزراوو ورە بەرزە (فلان ثابت القدم).
أثبَـتَ الجَـرَادُ: کوللەکـە کلکـی لـە زەوی چەقاند
أثبَتَ الأمرَ: کارەکەی چەسپاندو رێکی خست،
أثبَـتَ الكِتَـابَ: کتێبەکـەی تۆمـارکرد (أثبَـتَ الحَـق) بەڵـگەی راسـتی خستەڕو.
أثبَـتَ الشَّـيْئَ: ئـەو شـتەی بەتـەواوەتی زانی راستییەکەی پێکا.
أثبَـتَ فلانـاً: فلانەکەسـی بەنـدکرد، قورئان دەفـەرموێ: ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ ..﴾ ە لـە چـیرۆکی وتوێـژی قورەیشـدا دەربـارەی پێغەمبـەر هـاتووە (اذا أصبَحَ فأثبتوه بالوثاق).
ثَبَّتَ الشَّيْئَ: بەمانا (أثبته) دێ.
ثَبَّـتَ فلانـاً: لـەکاتی تەنگانـەدا ورەی فلانکەسـی بـەرز کـردەوە لەسـەر مەبەسـت‌و ئامـانجی خـۆی جـێگیری کـرد ە قورئـان دەفـەرموێ: ﴿يُثَبِّتُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ﴾.
تَثَبَّتَ فِي الأمـر والـرأي: لەسـەرەخۆ بـۆ کارەکە چوو پەلـەی لـە ئەنجامـدانی دا نەکرد.
استَثْبَتَ فِي الأمر والرأي: بـەمانا (تَثَبَّت) دێ.

الثُّبَات: لەگلو گۆکەوتن، دەگوترێ: (داء ثبات) دەردێکە ئادەمیزاد لەگلو گۆدەخا.

الثِّبَاتُ: ئەو حەبلو پەتەیە بارو بارگەنەی پێ دەبەسترێ زینو کورتانی وڵاغی پێ قایم دەکرێ.

الثَّبْتُ: پیاوی ئازای ورە بەرزو خۆڕاگرو چاونەترس ٥ ئاقڵمەندی راستگۆو خاوەن وادەو پەیمان ٥ دەگوترێ: (فلان ثبت الخصومة) واتە لەکاتی کێشەو شەڕیش زمانی هەڵنەناکاو قسەی ناشیرینی لێ نابیسترێ.

الثَّبَتُ: بەڵگەو دەلیل ٥ پەڕەیەك بەڵگەی تێدا تۆماربکرێ.

ثَبَتُ الحَدَث: ئەو دەفتەرو پەڕاوەیە کە ریوایەتو مەتنی ئەو حەدیثانەی تێدا تۆمار کراوە کە حەدیث گێرەوەکە ریوایەتی کردوون، هەروا ناوی مامۆستاکانیشی تێدا تۆمار کراوە ٥ پێرستی کتێب ٥ (رجل ثَبَتٌ): پیاوێکە بڕواپێکراوە، قسەکانی وەردەگیرێن، (ك: أثبات)٥.

المُثْبَتُ: کەلامێکی موثبەتە نەفی نییە.

رجل مُثْبَتٌ: پیاوێکە نەخۆشی لەقاچی خستووە لەسەرجێ کەوتووە.

ثَبَجَ الرَّجُلُ ثبوجاً وَثَبَجَاً: پیاوەکە لەسەر نوکە پەنجەی قاچەکانی هەڵتروشکا.

ثَبَجَ السَّلامَ وَالخَطَّ: قسەو نووسینەکانی تێکەڵو پێکەڵ کردو رونی نەکردنەوە.

ثَبِجَ ثَبَجَاً: ناوقەدی ئەستور بوو، دەگوترێ: (هُوَ أَثْبَجُ، هي ثَبْجَاءُ)

ثَبَّجَ الرَّاعِي بالعَصَا: شوانەکە گۆچانەکەی خستە دوا خۆیەوەو هەردوو دەستی خستنە سەری.

الثَّبَجُ: ناوقەدی شت کە ئەستور بێو بەرز بێتەوە، (ك: أثباج)٥ ٥ هەر لەم بارەوەیە دەگوترێ: (ثَبَجُ البَحر وثَبَجُ الصَدر وثَبَجَ الظهر) ٥ هەروا ناوە بۆ باڵندەیەك کە شەوانە دەناڵێنێ.

الثَّبَجَةُ: مام ناوەندی لە نێوان باشو خراپدا.

إثْبَجَرَ الرَّجُلَ: پیاوەکە هەڵسڵەمێیەوەو بەشۆکا لەکاتی ترسانیدا.

ثَبَرَ فلان ثَبْراً وَثُبُوراً: فلانکەس فەوتاو لەناو چوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا وَادْعُوا ثُبُورًا كَثِيرًا﴾.

ثَبَرَ الشَّيْءَ: شتەکەی لەناو برد (ثَبَرَ فلاناً): ناهومێدی کردو دەری کرد.

ثَبَرَ عَنِ الشَّيْءِ: لەو شتە حەبسی کردو نەیهێشت دەستی بیگاتێ ٥ دەگوترێ: (هو مثبور) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا فِرْعَوْنُ مَثْبُورًا﴾.

ثَبَرَ الْبحرُ: دەریا شەپۆلی هاویشت.

ثَبِرَت على الأمر: بەردەوام بوو لەسەر کارەکەو وازی لێ نەهێنا.

**ثَبَّرَه عَنْ الأمر:** لەو کارەی مەنع کرد و نەیهێشت خەریکی بێ.

**تثابروا في الحرب:** تێکرا هێرشیان بردو شان بەشانی یەکتر جەنگان.

**الثِبَارُ:** دەگوترێ: (هو علی ثبار أمر) ئەو لەسەر چاودێری فەرمان‌و حوکمەکانیەتی.

**الثُّبْرَةُ:** جۆرە گڵێکە وەکوو قسڵ وایە، لە نێوان دوو توێی چینەکانی زەوی دایە ○ هەرکاتێ رەگی دار خورما گەیشە ئەو توێژە دەوەستێ‌و چی دی رۆناچێ. ○ هەروا ناوە بۆ عەمباراوێك لە کێودا ناوی زۆری تێدا کۆدەبێتەوە.

**ثَبَطَ علی الأمر ثَبْطا:** لەسەری وەستاو نەیتوانی چیدی هەنگاوبنێ ○ دەگوترێ: (ثَبَطَهُ علی الأمر) لەسەر ئەو کارە وەستاندی.

**ثَبَّطَ فلاناً عَنْ الشَيئ:** فلانەکەسی دەستەوەسان کردو هێواشی کردەوە، تەمبەڵ‌و تەوەزلی کرد، لاوازو قونگرانی کرد نەیتوانی کارەکە ئەنجام بدا ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَكِن كَرِهَ اللّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ﴾.

**تَثَبَّطَ:** مۆڵەتی داو چاوەڕوانی کردو گیرو گرفت هاتنە پێشی.

**ثَبَقَتِ العَيْنُ ثَبْقاً:** چاوەکە فرمێسکی هاتنە خوار (ثَبَقَ النَهرُ) چەمەکە لێوان لێو بوو لە ئاوو ئاوەکەی بەخێرایی پێدا رۆی.

**ثَبَنَ الثَوْبَ:** قەراغی کراسەکەی نوشتاندەوەو دوری.

**ثَبَنَ في الثوبِ:** هەندێکی لە کراسەکەی هەڵدایەوە بەدەستی گرتی‌و کردی بە بەرکۆش‌و هەندێ شتی تێکرد.

**ثَبَنَ الشَيئَ:** شتەکەی کردە بەرکۆشەکەیەوەو هەڵی گرت.

**أثْبَنَ في ثوبِهِ:** لە کراسەکەی بەرکۆشی دروست کرد.

**الثِبَانُ:** ئەو بەشەی لە کراسەکە دەکرێ بە بەرکۆش‌و شتی تێدا هەڵدەگیرێ.

**الثُبْنَةُ:** ئەو سوزگی‌و سەلەو بەچنەیە کە میوەی تێدا هەڵدەگیرێ.

**الثَبِينُ:** بە مانا (الثِبان) دێ.

**الْمَثْبَنَةُ:** کیسەیەکە ئافرەت ئاوێنەو ئامێری ئارایشی خۆی تێدا هەڵدەگرێ.

**ثَبى الشَيْئَ ثَبْياً:** شتەکەی کۆکردەوە.

**ثَبى المرأ:** پیاوەکە پابەندی پلانی باوکی بوو شوێن پێی ئەوی هەڵگرت.

**ثَبى الجمعَ أو الجيشَ:** خەڵکەکە یان جەیشەکەی پۆل پۆل کرد.

**ثَبى المالَ:** پارێزگاری ماڵ‌و سامانەکەی کردو کۆی کردەوە، گەشەی پێ کرد.

**ثَبى الشَخصَ:** چەند جار وەصف‌و ئەنای ئەو شەخصەی لە ژیانی دا دوبارە کردەوە.

**ثَبى الله النعمَ للشخص:** پەروەردگار نازو نیعمەتی خۆی بەسەر ئەو شەخصەدا رشت.

الثُّبَـةُ: كۆمـەڵو پیرێـك ٥ بەتایبـەتی كۆمـەڵێك سوارچـاك، (ك: ثُبـــون، ثُبـــات) ٥ لـە قورئانـدا دەفـەرموێ: ﴿فَانفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ انفِرُواْ جَمِيعًا﴾.

ثَتَمَ بما في بطنه ثَتماً: ئەوەی لـە سكیدا بـوو دەری هاویشت.

ثَتَمَ الخَرْزَ: مورووەكـەی شـكاندن لەكـەڵكی خستن.

اِنْثَتَمَ: بۆ موطاوەعەی (ثَتَمَ) هاتووە.

إنْثَتَمَ الرجلُ: پیاوەكە بە وتەی ناشیرین دەمی كرایەوە.

تَـثَـتَّمَ: بەمانا (انْثَتَمَ)دێ.

تَثَـتَّمَ الثـوبُ: كراسـەكەی درِا شـیتاڵ شیتاڵ بوو.

تَثَتَّمَ اللحمُ: گۆشتەكە دارزاو هەڵوەری.

الثَّتى: توێكڵەخورماو خورمای خراپ، وردەكـاو خشـتو خـۆڵو خاشـاك ٥ هـەموو شـتێك كـە دەكـوترێو ورد دەكرێ.

الثَّـــتاةُ: تـوێكڵی خورمـــاو خورمـــای خراپ.

ثَجْثَجَ الماءُ: ئاوەكـە رەوان بـوو هەڵرژایـە خوارێ.

ثَجَّ المَاءُ ثَجُوجاً: ئاوەكە رەوان بوو هەڵرژا.

ثَـجَّ المَــاءَ ثَجّــاً: ئاوەكـەی رژانـدو رەهای كرد.

الثَّجــاجُ: ئـاوی بـەخورەمو هـەڵرژاو لەبەرزاییـەوە، قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاء ثَجَّاجًا﴾.

الثَّجَّةُ: باغو باخچەیەك حەوزی ئـاوی تێدابێو شوێنی وای تێدابێ ئاویـان تێـدا پەزمەنـدە بكـرێ ٥ چـاڵو چوێڵییەك بـارینی بـاران بـەخورەم دروستی بكا.

الثَّجـــوجُ: بـــەمانا (الثَّجـــاج) دێ ٥ دەگوترێ: (عين ثجوج).

الثجـيج: لافـــاو ٥ دەگـوترێ: (اكـتظ الوادى بثجيجه).

المِثَجّ مِـنْ المطـر: بەمانا (الثجـاج) دێ ٥ وتـــار بێـــژی دەمو گفـــت جـــوانو شـــیرینو قســـە رەوان ٥ (الحســـن) دەربارەی ئیبنو عـەباس دەڵێ: (انـه كان مِثَجّاً).

ثَجَرَ التمرَ ثَجْـراً: خورماكەی تێكەڵاو بـە تلپـــە دۆشـــاوی خورمـــای كـــاڵو نەگەییو كرد.

ثَجِرَ الشيئُ ثَجَـراً: شتەكە ئەستوورو پـان بوو ٥ دەگوترێ: (هوثجر واثجرُ).

ثَجَّـــرَ الشَّـــيئَ: شـتەكەی پـان كـردەوە، بـەرفراوانی كـرد ٥ دەگـوترێ: (لي لحمـه تثجير): لە گۆشتەكەیدا نەرمییەك هەیە.

الاثْجَرُ: تیری ئەستوری بنك كورت، (ك: ثُجْرٌ).

الثَّجْرُ: شتی ئەستورو پان (خەبەلۆسە).

الثُّجْرَةُ: ناوەڕاستی شـت ٥ دەشـتاییەكی نزم لـە زەوی (چـاڵایی) دەوروبـەری قوڵكـەی گـەردن ٥ پەڵـە پەڵـە گیای لێرەو لەوێ.

**الثَّجِيرُ**: تلپەی هەرشتێك كە بگوشرێ وەكوو تلپەشوكی ترێ.

**المُثَجَّرُ**: لە خەیزەران ئەو جۆرە خەیزەرانەیە كە ناوەكەی گلۆربێ.

**ثَجِلَ ثَجَلاً**: گەدەی گەورە بوو، ورگی داچۆڕاو شوڕ بۆوە.

**ثَجِلَتِ المزادةُ**: كوندەكە كشاو بەرفراوان بوو (هو أثجلُ وهي ثجلاء).

**ثَجَّلَ الشَّيْءَ**: شتەكەی گەورە كرد قەبارەی پێ دا.

**الأثجَلُ مِنْ الليلِ والوادي**: ناوەڕاست، بەشی زۆری شەوەكە، بەشی زۆری دۆڵەكە.

**ثَجَمَهُ ثجماً**: خێرا سەرفی كردو پاڵی پێوە نا ٥ گەڕاندییەوە.

**ثَجِمَ ثجماً**: بەگورجی گەڕایەوە.

**أثْجَمَ**: (أثجمت السماءُ) ئاسمان بەخوڕەم بارانی باراندو بەردەوام بارانی باراند.

**ثَجَّمَتِ السماء**: بەمانا (أثجمت) دێ.

**ثَخْثَخَ**: دەنگی گڕبوو قرخەقرخی هات.

**الثَخْثَخَةُ**: دەنگێكە گڕو ناخۆشە.

**ثَخُنَ ثُخُونَةً وثخانةً**: ئەستورو رەقو نەكڵەوەت بوو دەگوترێ: (هو ثخينٌ).

**أثخَنَ في الأمر**: زێدەرەوی لە كارەكەدا كرد، دەگوترێ: (أثخَنَ في العَدُوِّ) زێدەرەوی كرد لەشەڕكردنو زیانگەیاندن بە دوژمن.

**أثخَنَ في الأرض**: زێدەرۆیی كرد لەشەڕكردن لەگەڵ دوژمنەكانی دا.

**أثخَنَ فلاناً الأمْرُ**: گەلەكۆمەكی لە فلانە كەس كردو بەسەریدا زاڵ بوو ٥ دەگوترێ: (أثخَنَهُ الهم والمرض والجراحُ).

**أثخَنَ الشيءَ معرفةً**: ئەو شتەی بەتەواوی زانیو بەباشی بۆی ئاشكرا بوو.

**اسْتَثْخَنَ مِنْهُ الشَيْءُ**: بەمانا (أثخَنَ) دێ ٥ دەگوترێ: (استَثخَنَ مِنهُ النَوم والمرضُ والاعياءُ).

**الـتَخَنُ**: لەش داهێزران و تەمبەڵیو قونگرانی بەهۆی نوستنەوە یان ماندوبوونەوە یان نەخۆشی.

**الثَخَنَةُ**: بەمانا (الثَخَنُ) دێ

**ثَدَقَ المطرُ ثَدْقاً**: بارانەكە بە خوڕەم هەڵڕژاو باری ٥ دەشگوترێ: (ثَدَقَ السَّحَابُ): هەورەكە بارانی بەخوڕەمی باراند.

**ثَدَقَ الوادی**: شیوەكە ئاوی پێدا جاڕی بوو. (ثَدَقَ بَطْنَ الشاة): ورگی مەڕەكەی هەڵدڕی.

**ثَدَقَ الخَيْلَ**: ئەسپەكەی بەرەڵا كرد.

**إنْثَدَقَ بَطْنُهُ**: ورگی داكەوت، شۆڕ بۆوە.

**ثَدَّمَ الابريقَ**: چاپاڵێوی لەسەر مەسینەكە (قۆریەكە) دانا.

**الثِدامُ**: چاپاڵێو (پاڵێوەر).

**ثَدِنَ اللَّحْمُ ثَدَناً**: گۆشتەكە بۆنی گۆڕا.

**ثَدِنَ فلان**: فلانكەس گۆشتی زۆر بوو قەڵەو بوو، قورس بوو.

**ثَدِنَ الرَجلُ**: پیاوەکە گۆشتی زۆر بوو، قەڵەو بوو ٥ گۆشتەکەی داچۆڕا (هو مُثدَّنٌ).

**ثُـدِّنَت المـرأة**: ئافرەتەکە گۆشتن بوو قەڵەو بوو بەشێوەیەکی ناقۆلا.

**ثَدا ثَدْواً**، ثدواً: تەڕی کرد ئاورشێنی کرد.

**ثَـدِيَ ثَـدَىً**: تـەڕ بـوو ٥ (ثـديت المـرأة) ئافرەتەکـە مـەمکی گـەورە بـوو، دەگوترێ: (هي ثدياءُ).

**ثَـدَّاه**: خـۆراکی پێـدا، شـیری مـەمکی دەرخوارد دا.

**الثَّـدْيُ**: بـەرز بوونـەوەی دو مەمکـە لەسـەر سـینگی پیـاو یـان ژن ٥ بـە سروشت مەمکی ئافرەت شیری تێدا کۆ دەبێتـەوە وەکـوو چـۆن گـوانی ئـاژەڵو هەنـدی گیانلەبـەری تـری شـیردەر شـیر لـەگوانیان دا کـۆ دەبێتەوە، (ك: أثْدٍ وثُدِيّ).

**ثَرِبَـــهُ ثَرْبَـــاً**: سەرزەنشـــتی کـــردو بەتاوانەکانی لەکەداری کرد.

**ثَــرِبَ المــریضَ**: کـراسو پۆشـاکی لەبـەر نەخۆشەکە داکەند.

**أثْـرَبَ الکَـبشُ**: بەرانەکـە پیـوو بـەزی زۆر بوو

**اثْــرَبَ فــلان**: فلانکــەس بەخشــشو عــەطــای کــەم بــوو ٥ بەشــوێن بەخشینەکەیدا منەتی کرد.

**الثَّـرَبَ فلانـاً**: لۆمـەی فلانکەسـی کـرد بەهۆی تاوانەکانیەوە لەکەداری کرد.

**ثَرَّبَ**: شتەکەی لە کەڵك خستو تێکەڵ بەشتی تری کرد

**ثَـرَّب فلانـاً، وعلیـه**: لۆمـەی فلانکەسـی کرد بە تاوانەکانی لەکەداری کـرد ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿لاَ تَثْرِيـبَ عَلَيْكُمُ﴾

**الثَّـرْبُ**: بـەزو پیـوێکی تەنکـە گـەدەو ریخۆڵـەکان دادەپۆشـێ، (ك: أثـرب وثُروب).

**ثَرْثَرَ فِي الشَّيْ**: شتەکەی زۆر تێك هەڵداو تێکەڵاوی کـرد ٥ دەگـوترێ: ( ثَرْثَـرَ فِي الأكل والكلام وهو ثرثار).

**ثَرْثَرَ الشَّيْءَ**: شتەکەی تەفرو تونا کرد.

**الثرثار**: زۆر بلێ، کەسێکە زۆر قسـەبکا بەبێ پێویست

**ثَـرَدَ الخُبزَ ثـرداً**: نانەکـەی کـەرت کـەرت کردو بەشورباو تـەڕی کـرد (نانەکـەی تێکوشـی) ئاشپەزەکە پێـی دەگـوترێ: (ثارد) نانەکە (مثرود) یان (ثريـد) بـە کوردی (تێکۆشاو یان تریت).

**ثَـرَدَ الذبیحـةَ**: ئاژەڵەکـەی بـە بـەرد یـان نێسقان یـان شـتێکی کول سەربڕی، گیـانی دەرچـواند بـەبێ ئـەوەی قورگی هەڵبڕێ.

**ثَـرَدَ الثـوبَ**: کراسـەکەی لـەخم هەڵکێشا رەنگـــی کـــرد (عائشـــە (خ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: (فَأخـذت خِمـاراً لها قد ثردته بزعفران).

**ثَـرد المطـرُ الأرض**: بارانەکـە کـەم بـارێ

کەمێك زەوی رشاندو وەستایەوە.

ثردت شفتُه: لێوی قەڵشت قەڵشت بوو.

ثرد الرجل من المعركة: پیاوەکە بە برینداری لەشەڕەکە هاتەدەرو گیانی تێدا مابوو.

اثرد الخبز: بەمانا (ثردە) دێ.

الثرد: بارانی کەم نمە باران.

الثَّريدُ: تێکوشاو (نانی وردکراو بکرێتە ناو شورباوە) کەفی مەیو شەراب.

المِثراد: ئامێرێکە ئازەڵی پێ دەکوژرێتەوە..

المثردة: کاسەو قاپی تێکوشاو (تشریب).

ثَرَّ السائل ثراً وثروراً: شلەمەنییەکەی زۆر بوو لێشاوی هێنا ٥ دەگوترێ: (ثَرَت البِئرُ والسَّحَابَة والعين) ئاوی بیرەکە زۆر بوو، هەورەکە بەخورەم بارانی باراند، چاو فرمێسکی زۆری هەڵڕشتن.

ثَرَّت الشاة والناقة: مەڕەکە حوشترەکە شیری زۆر بوو.

ثَرَّ الطِعنة: برینەکە خوێنی زۆر لێ هات.

ثَرَّ الشَّيئَ: شتەکەی وردکردو لەناوی برد دەشگوترێ: (ثَرَّتِ السحابة ماءَها): هەورەکە بارانەکەی رژاند.

ثَرَّرَ المكان: شوێنەکەی ئاو رشین کردو شێ دار بوو

الثَّرُّ من الخيل: ئەسپی خۆشڕو بەراپەڕ.

الثُرعُلَةُ: پەرو پۆڵی ملی کەڵەشێر

الثُرعَامَةُ: کەپرو کۆخیلکەی رەزەوانو باخەوان.

ثَرِمَهُ ثَرماً: بەدەمی کێشاو ددانی شکاند، لەریشەوە ددانی دەرهێنا.

ثَرِم ثرماً: ددانی شکا ٥ لەبنەوە دەرهات ٥ (هو أثرم): ئەو پیاوە ددان کەلە ددان شکاوە (هي ثرماء) بۆ ژن. لە حەدیثدا هاتووە دەڵێ: (نهی أن يضحي بالثرماء)، پێغەمبەر (د.خ) نەهی کردووە کە ئاژەڵی ددان کەلو ددان دەرهاتوو بکرێتە قوربانی.

اثْرَمَهُ: بەمانا (ثرمە) هاتووە.

إنْثَرَمَ: بوو بە ددان کەل.

إنْثَرَمَ ثَنِيتُهُ: هەندێ لە ددانی شکاو کەل بوو.

الأثرم: لە عیلمی (عروض)دا ئەوەیە قەبضو خەرمی تێدا کۆبێتەوە.

الأثرَمَانُ: شەوو رۆژ، زەمانەو مردن.

ثَرمَدَ الطعامَ: خواردنەکەی بەخراپی ئامادەکرد نەیزانی چاکی لێنێ.

ثَرمَلَ الطعامَ: خواردنەکەی بەجوانیو رێكو پێکی نەخوارد دەستو پەنجەی خۆی تێ هەڵکێشان.

ثَرمَلَ عَمَلَهُ: کارەکەی بەخراپی ئەنجام دا دڵسوزیو دەست رەنگینی تێدا نەکرد.

الثُرمَلَةُ: دێڵەرێوی ٥ چاڵایی ناوەڕاستی لێوی سەرەوە.

ثريوم: عونصوریکی فلزییە رەنگی سەنجابییە.

ثَرا المالُ ثراءً: ماڵەکە گەشەی کرد زیادبوو.

**ثرا القومُ نظراءهم:** ئەو كۆمەڵو تاقمە بەسەر هاوشانەكانیاندا سەركەوتن لە ژمارەو دەوڵەمەندیدا بالادەست بوون.

**ثری المطرُ التراب ثرياً:** باران زەوییەكەی تەڕو شێداركرد.

**ثری الأمرُ فلاناً:** ئەو كارە فلانەكەسی تەمبێ خواردو كرد لەسەر رەقی خۆی وازی هێنا.

**ثَرِيَ ثراءً:** ماڵو سامانی زۆر بوو (هو ثر وثريّ وثروان).

**ثَرِيَ بكذا:** ماڵو سامانی بەو شتە زۆر بوو، لە خەڵكی بێ ئاتاج بوو.

**ثَرِيَ الأرض ثرىً:** زەوییەكە شێی هێنایەوەو نەرم بوو، (هي ثرية وثرياء).

**ثَرِيَ بالشيء:** بەشتەكە كەیف خۆش بوو.

**أثری:** دەوڵەمەند بوو.

**أثری الأرض:** زەوییەكە گڵی زۆر بوو.

**أثری المطرُ:** بارانەكە زەوییەكەی شێدار كردو شەونمی لێ پەیدا بوو.

**أثری مابين الرجلين:** ئەو دوو پیاوە پەیوەندی دۆستایەتییان بەردەوام بوو.

**ثرّی الرجلُ:** پیاوەكە دەستی لەسەر گڵ دانا.

**ثرّی فلاناً:** فلانكەسی ئاوپرژێن كرد.

**ثرّی الله القوم:** پەروەردگار ئەو قەومەی زۆركرد

**ثرّی الرجلُ المالَ:** پیاوەكە ماڵو سامانەكەی زۆر كرد.

**الثَّرَی:** زەوی ٥ شەونم ٥ گڵ ٥ بەخشش.

**الثراء:** زۆر بوونی ماڵو سامان.

**الثروة:** زۆری ماڵو سامانو زۆری ئادەمیزاد ٥ پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی (ما بعث الله نبيا بعد لوط الا في ثروة في قومه).

**الثروة (في علم الاقتصاد):** هەر ماڵو سامانێك بكرێتە مڵكو نرخدار بێو چەندییەتی دیاربێ.

**الثروة القومية:** كۆمەڵی هێزە بەرهەم هێنەرەكانی دەوڵەت.

**الثريا:** كۆمەڵێك ئەستێرە لە شكڵی كەڵەگادا خۆ دەنوێنن وشەی النجم بومتە ناو بۆیان ٥ جۆرە گڵۆپێكی كارەباش هەیە پێی دەگوترێ: (ثريا).

**المثراة:** زۆركەر، دەگوترێ: (هذا مثراة للمال) ئەوە ماڵو سامان زۆر دەكا.

**ثطّ ثطا وثطوطا:** موی ریشی یان موی برۆی تەنك بوو ٥ ورگی گەورە بوو، جمو جوڵی كەم بوو (هوثطّ).

**ثطا الصَّبِيّ ثطا وثطاءً:** منداڵەكە بەئەسپایی یەكەم هەنگاوی هەڵێنا ٥ دەگوترێ: (هو يمشي الثطا) ئەوە وەكوو منداڵ دەڕوا.

**ثَعَبَ الماءَ والدمُ ونحوهما ثعباً:** فیچقەی بە ئاوەكەیان بەخوێنەكە كردو جاریی بوو ٥ پێغەمبەر دەفەرموێ: (يجی الشهيد يوم القيامة وجرحه يثعب دماً).

إنْثَعَبَ الماءُ والدَّمُ ونحوهما: ئاوەکە رۆیی، فیچقەی کرد ٥ خوێنەکە هەڵڕژا.
إنْثَعَبَ المطرُ: باران بەخوڕەم باری.
الأثعُوبُ: هەرشلەمەنییەك بە تەوژم بڕوا بەسەر زەویدا.
الثَّعْبُ: شوێنی پێدا ڕۆیشتنی ئاو لەناو شیودا، ڕێڕەوی ئاو، (ك: ثعبان).
الثعبان: ناوێکی گشتی یە بۆ هەموو گیانلەبەرێکی خشۆك درێژ بێ‌و بێ قاچ بێ.
ثعبان السمك: جۆرێکە لەپێری خشۆکەکان.
الثُّعْبَةُ: جۆرێکە لەسەر مازەڵە یان قۆری پێیدەگوترێ (سام أبرص) سەرو ملی سەوزە، چاوی دەرپەڕیون، توشی هەرکەسێك بێ دەم دەکاتەوە ٥ لە گازندە ژەهراوییە پیسەکانە ٥ هەر شوێنێك بگەزێ زۆر بەزەحمەت چاك دەبێتەوە، (ك: ثُعَبٌ)٥
الثعوب: سفرا، تێکەڵەیەکە جەستە دەری دەدا، جۆرەکانی زۆرن.
المَثْعَبُ: پلوسك، شوێنی ئاوپێدا ڕۆیشتن لە حەوزو عەمباراو، (ك: مثاعب).
ثَعْثَعَ الرجلُ: پیاوەکە لە قسەکانیدا پیتی (ث)ی زۆر بەکارهێنا، زمان قسك بوو ٥ چەند جارێك یەك لەدوای یەك ڕشایەوە.
الثَّعْثَعُ: لوئلوو ٥ صەدەف ٥ خوری سوور.

ثَعْجَرَ الماءَ ونحوه: ئاوەکەی بەسەردا ڕشت ٥ ئاوی ڕشت.
إِثْعَنْجَرَ الماءُ والمطر والدمعُ: ئاو هەڵڕژا، باران هەڵڕژا فرمێسك دابارین ٥ دەگوترێ: (إثْعَنجَرَتِ العين دمعاً والسحابة قطراً).
إثْعَنجَرَتِ الجَفْنَةُ: مەنجەڵەکە پڕبوو لە ترێت ٥ مەنجەڵەکە ڕۆناوەکەی لەسەرەوە ڕژاوە ٥ بیرەکە پڕبوو ئاوەکەی سەرڕێژی کرد.
المُثْعَنْجِرُ: لافاوی گەورە ٥ ناوەڕاستی دەریا ٥ پێغەمبەر لە حەدیثێکدا دەفەرموێ: (يحملها الأخضر المثعنجر).
الثَّعْدُ: خورمای تازەپێگەیشتوو، ئەو هێشوە خورمایەی سەرانسەری پێگەیشتبێ‌و زێڕەوەی بەرسیلەبێ ٥ پاقلەی تەڕو تازە ٥ کەف‌و ڕۆن ٥ دەگوترێ: (ثری ثعدٌ)، هەروا دەگوترێ: (ماله ثَعْدٌ ولا معدٌ) نەکەم نە زۆر هیچی نیە.
ثَعِرَ ثَعَراً: پێستی بالوکەی زۆر لێ پەیدا بوو ٥ شوێن هەواڵەکان کەوت‌و لەگێڕانەوەکەیاندا درۆی کرد.
أثْعَرَ: بە دوو هەواڵەکان داچوو لەگێڕانەوەیان دا درۆی کردن.
الثَّعْرُ: ئەو شلەمەنییەیە کە لە درەختی (السَّمر) دەچۆڕێ وەکوو بنێشت، کەلە دارەبەن دەچۆڕێ، ئەو شلەمەنیە داچوڕاوە ژەهرێکی کوشندەیە، ئەگەر بکرێتە چاوەوە

ئــــازارێکی وای لێ پەیـــدا دەکـــا دەیکوژێ، (ك: أثعار).

**ثَعْرَ الأَلفُ**: لـوت شەقار شەقار بـوو ٥ لـە لــوتی دا پیتکـە پیتکـەی سـپی لێ پەیدا بوو.

**الثعارِيرُ**: قەڵشان‌و شەقار بونێکە لەناو لوتدا پەیدا دەبێ ٥ ڕەوکێکە وەکوو هیلیون دەچێ.

**الثُعْـرُورُ**: پیـاوی کورتـە بـاڵای ئەسـتور (کوڵەبنە) ٥ دەنکی سپی کە لەلوتـدا پەیدا دەبن ٥ جۆرە کاڵەکێکی مەیلەو درێـژە، (ك: ثعـارير)ە ٥ لـە حـەدیثـی پێغەمبەردا هاتووە دەڵێ: (يخـرج قـوم من النار فينبتون كما تنبت الثعارير).

**ثَعِطَ** الماء واللحم ثَـعْطا: ئاوەکە ، گۆشـتەکە تام‌و بونیان گۆڕا.

**ثَعِطَ الجلدُ**: پێستەکە بۆگەنی کردو شـەقار شەقار بوو.

**ثَعِطَ الشفة**: لێوەکە هەڵاوساو قەڵشا (هـو ثعِـطٌ وهـي ثَعِطـة) ٥ هێلکەکـە پیس بوو پێی دەگوترێ: (ثَعِطَةٌ).

**ثَعَّطَهُ**: شکاندی‌و وردی کرد.

**الثَعِـيطُ**: وردە لمب‌و وردە گڵ کـە (بـا) دەیهێنـــێ‌و لـــە پـەناو پاسـاردا کـۆ دەبێتەوە.

**ثَعَّ ثَعّاً**: ڕشایەوە.

**انْثَعَّ القَيْـئُ** مـن فيـه: ڕشولە دەمـی بـە تەوژم دەرچوو

**انْثَعَّ الدمُ** مـن الأنـف والجُرْحِ: خـوێن لـە لوتی یان لە برینەکە دەرچوو.

**ثَعِلَـتْ اسـنانُه ثَعَـلاً**: ددانـی سـواری یـــەکبوون‌و کەوتنـــە ســـەریەك ٥ دەگوترێ: (هي ثعلاء)، (ك: ثُعَلٌ).

**ثَعِلَ السِّنُّ**: ددانی ناڕێك‌و پێك بوون.

**ثَعِلَ ذات الضرع**: ژمارەی گوانەکانی زیـاد لە ئاسایی بوون.

**أَثْعَلَ القوم علينا**: خەڵکەکە پێچەوانەی مەبەست‌و ویستی ئێمە جوڵانەوە.

**أَثْعَلَ الأمرُ**: کارەکە ئاڵۆز بوو وای لێهات نازانرێ چۆن چارەسەری بکرێ.

**الأَثْعَـلُ**: کەسـێکە ددانـی سـواری یـەك بووبن‌و ددانی ڕێك نەبن ٥ پیاوێکی گـەورەو نـاودار کـە زۆر پیـاوەتی لێ بووەشێتەوە، (ك: أثاعل).

**ثُعَالَةُ**: عەلـەمی جنسە بۆڕێوی ٥ تـری ڕێویلە ٥ لەوەڕی وشك.

**الثُعْـلُ**: ددانـی زێـدە کـە لـە پشت ددانـە ئاساییەکەوە هاتبـێ. گوانی زێـدە لـە گوانـدێنی حوشـترو ئـاژەڵی شیر دەری تـر ٥ ئـادەمیزادی بـەخیل‌و چـروکی هەتیومچە ٥ گیانلەبەرێکی بچکۆلەیە کرمێـك لـە حـەوزو بـەرمیلی ئـاودا پەیـدا دەبـێ کـە بۆگـەن دەکـاو پـیس دەبێ، (ك: ثعلول)ە.

**الثُعلُـولُ**: ددانـی زێــدە ٥ گوانــدارێك گوانی زێدەی هـەبێ ٥ پیـاوی تـوڕەو تەوسن، (ك: ثعاليل)ە.

**الثُعـولُ مـن الجيـوش**: کــە ژمــارەی تاکــەکانی زۆر بــێ ٥ گیانلەبـــەری

گواندار کە گوانی زێدەی هەبێ.
الْمَثْعَلَةُ: خاكو ولاتێك رێوی زۆربێ، (ك: مثاعل).
ثَعْلَبَ المكانُ ثَعْلَبَةً: ئەو شوێنە رێوی زۆر بووە.
ثَعْلَبَ الرجلُ: ئەو پیاوە ترسنۆك بوو وەكوو رێوی رفتاری كرد هەر خۆهەلكێشانو فرتو فێڵی هەبوو
تَثَعْلَبَ الرجلُ: بەمانا (ثَعْلَبَ) دێ.
الثَّعْلَبُ: پێری گیانلەبەری رێوی ناسایە، وەكوو نموونە دیاری دەكرێ بۆ فرتو فێڵ ○ قەراخی رمب خوار تیژایی نووكەی ○ بەچكە كە لەدایكی دابڕێ ○ پلوسكو شوێنی دەرچوونی ئاو لەحەوزو عەمباراو، (ك: ثعالب)○.
الثَّعْلَبَةُ: دێڵە رێوی ○ نەخۆشییەك كە تووكی جەستەو قژی سەر بڕوتێنێتەوە.
الثُّعْلُبَانُ: نێرە رێوی ○ پیاوی ئازاو زیرەكو لێهاتوو.
الثَّعْلَبِيَّةُ: باز هاویشتنی ئەسپە بەشێوەی رێوی.
ثَعَبَ الشاةَ ونحوها ثَعْباً: مەڕەكەی سەربڕی ○ حوشترەكەی سەربڕی.
ثَعَبَ الرجل بالرمح: بەرمب لەپیاوەكەی داو برینداری كرد.
تَثَعَّبَتِ اللثةُ بالدم: پوكەكە خوێنی لێ هات، خوێنی بەربوو.
الثَّعْبُ: هەر شتێك توندبێو بتوێتەوە وەكوو سەهۆڵ، رۆن، ئاسن، زیو ○ ئاوی پاشماوەی لافاو كە لەچاڵو چۆێڵدا دەمێنێتەوە لە سێبەری كێودا بێ، (ك: أثغاب وثغبان)○
ثَغْثَغَ الطفل في الشيئ: منداڵەكە پێش ئەوەی ددانی بڕوێن بە پوكەكانی ئەو شتەی گەست، پێی رۆگەزی.
ثَغْثَغَ المتكلم كلامه وفي كلامه: قسەكەرەكە قسەكانی بەرەوانی نەكرد ○ زمانی تێكەڵ پێكەڵ بوو، پاسای قسەكردنی رێكو پێك نەبوو.
ثَغَرَ الجِدارَ ونحوه ثَغْراً: كەلێنێكی لەدیوارەكەدا كرد.
ثَغَرَ فلاناً: ددانەكانی فلانی شكاندن (ثَغَرَ سِنَّهُ) ددانی كێشا.
ثُغِرَ الغُلام ثِغْراً: ددانی پێشەوەی منداڵەكە كەوتن
اثَّغَرَ الغلامُ: منداڵەكە ددانی حەوت ساڵەی كەوتن ○ ئبراهیمی نەخەعی دەڵێ: موسوڵمانانی پێشوو وایان پێ باش بوو (أن يعلموا الصبي الصلاةَ إذا إثَّغَرَ): منداڵەكانیان فێری نوێژبكەن كاتێ ددانی حەوت ساڵەیان دەكەوت.
الثَّغْرُ: كەلێنێكە لەسەرانسەری كێوەكاندا بەدی دێ ○ شوێنێكە ترسی ئەوە هەبێ دوژمن لێیەوە هێرش بێنێ ○ بۆیە بەوشارەی دەكەوێتە سەردەریا دەگوترێ: (ثَغر)، (ك: ثغور)○
الثُّغْرَةُ: كەلێن، كەل، بەندەن ○

کەلەبەری کێو ە قولکەی گەردن.

**ثَغِمَ اللَّون ثَغَماً**: رەنگەکە سپی بوو وەکوو گوڵی درەختی ثوغام.

**ثَغِمَ الکلبُ**: سەگەکە هاربوو زیانە خرۆبوو.

**أثغَمَ الوادي**: دۆڵەکە درەختی ثوغامی لێ ڕوا.

**أثغَمَ الرأسُ**: موی سەری وەکووگوڵی درەختی ثوغام سپی بوو.

**أثغَمَ الطعامُ الآکِلَ**: خۆراکەکە بخۆرەکەی توشی قەڵەوی‌و تەمبەڵی کرد.

**ثاغَمَها**: سەرزەنشتی کرد.

**الثَّغامَةُ**: درەختێکە بەرەکەی‌و گوڵەکەی سپین لەبەرزایی کێوەکان دەڕوێ ە کەوشك دەبێ زیاتر سپی دەبێ، (ك: ثَغام)ە.

**ثَغَتِ الشاةُ ونحوها ثُغاءً**: مەڕەکە باڕاندی.

**أثغى الشاةَ ونحوها**: مەڕەکەی واڵێ کرد بارە بارِ بکا.

**الثّاغي**: مەڕ ە دەگوترێ: (ماله ثاغ ولا راغ) نەمەڕی هەیە نە حوشتر ە هیچی نییە.

**الثّاغية**: مەڕ، دەگوترێ: (ماله ثاغية ولا راغية) نە مەڕی هەیە نە حوشتر.

**ثَفا القِدْرَ ثَفْناً**: هەڵچونی مەنجەڵەکەی دامرکاندەوە، کوڵەکەی شکاندەوە.

**الثُّفاءةُ**: دەنکە خەردەل.

**ثَفَدَ الثَّوبَ وغيره**: ناواخنی لە پۆشاکەکە کرد.

**الثّفافيدُ**: ناواخنی کەواو چاکەت ە هەوری سپی کە هەندێکیان دەکەونە سەر هەندێکیان.

**أثفَرَ الدابَّةَ**: وڵاغەکەی بە پاڵوەکەی بەستەوە، لە دواوە لێی خوڕی، دەگوترێ: (أثفَرَهُ بَيْعَةَ سوءٍ).

**ثَفَّرَ الدابةَ**: لەدواوە وڵاخەکەی لێ خوڕی.

**إستَثفَرَ ثوبَهُ، وبه**: داوێنی کراسەکەی کۆ کردەوەو لەناوڕاستی خۆی قایمی کردو بە پشتێنەکەیەوە بەستی خۆی ئامادەکرد بۆ زۆرانبازی.

**إستَثفَرَتِ الحائض**: بەڕۆیەکی پانی لەنێو ڕانی خۆی رابردوە بەپشتێنەکەیەوە بەستیەوە، لە حەدیث دا هاتووە: (أنه أمر المستحاضة أن تستثفرَ) پێغەمبەر فەرمانی بە ئافرەتی بێ نوێژکرد کە بەڕۆیەك بە ناوڕانی خۆیان بەرن‌و بەپشتینەکەیانەوە قایمی بکەن وەکوو دایبی.

**الثَّفَرُ**: قایشێکە لەلای دواوەی زین شەتەك دەدرێ‌و بەبن کلکی وڵاغەکەدا دەبرێ‌و لە هەردوو سەرەوە بەزینەکەوە بە کورتانەکەوە قایم دەکرێ، بەکوردی پێی دەگوترێ پاڵو.

**الثُّفْرُ**: بۆ درندەو خاوەن چنگ‌و نینۆك: زێیە (فەرجییەتی)، (ك: الثفور وثُفار).

الثُفـروقُ: قونچكى دەنكە خورما، ئەوشتەى پەيوەندى ناوكە خورماكەو قونچكەكە دەستەبەردەكات ٥ ئەو لقە دارخورمايەيە كە دواى رنين چنينى هێشوە خورماكان هەندێ دەنكە خورما وەكوو پاشەرۆك بەسەر درەختەكەوە دەمێننەوە، (ك: ثفاريق)٥.

ثَفَلَ الماءُ ونحوه ثفلاً: قوراوو خەستايى ناوەكە ژێركەوتو ئاوە صافەكە سەركەوت.

ثَفَلَ الرحى: كەوڵە ئاردى بۆ ئاشەكە راخست لەخوار بەرداشەكەوە كەوڵەكەى راخست بۆ ئەوەى ئاردەكە بچێتەسەرێ.

ثَفَلَ الشئَ: يەكجار ئەو شتەى بلاو كردەوە، پەرتەوازەى كرد.

أثفَلَ الماءُ ونحوه: بەمانا (ثَفَلَ) دێ.

ثافَلَ القومُ: خەڵكەكە گەيشتن بە خواردەمەنيەكە.

ثَفَّلَ الرحى: لەخوار بەرداشەكەوە كەوڵە ئاردەكەى راخست.

تَثَفَّلَ الشئَ: شتەكەى وەكوو كەوڵە ئارد لەخوار خۆيەوە راخست.

تَثَفَّلَ فلاناً عرق سوء وبه عرق سوء: دەمارێكى خراپى تێدا بوو بەهۆى ئەو دەمارە خراپييەوە ئەخلاقى جوانو سەخاوەتو بەخشندەيى لەدەستدا.

تَثَفَّلَ فلاناً: سەر فلانە كەس كەوتو بەسەريدا زاڵ بوو

تَثَفَّلَ المصارعُ قرنَهُ: پاڵەوانەكە هاوشانەكەى خۆى بۆڕ داو ژێر خۆيدا.

الثافِلُ: ئەو كەوڵەيە ئەو پارچە قوماشەيە لەژێر بەرداشى ئاشدا لەكاتى باراش هاڕيندا رادەخرێ بۆ ئەوەى ئاردەكەى لەسەر كۆ ببێتەوە ٥ لەحەديثدا هاتووە دەفەرموێ: (وتدقهم الفتنُ دق الرحى بثفالها): فيتنەو ئاشوب بەسەرياندا دەبارێو دەيانكوتێ وەكوو چۆن ئاش هاڕاوى خۆى دەكوتێو بەسەر كەوڵەئاشەكەدا دايدەبارێنێ ٥ بەرداشو دەستاڕى ژێروى ئاش، (ك: ثُفُل).

الثَفالُ من الدواب وغيرها: پيرۆى تەمبەڵ ولاغى گرانرۆ ٥ كە بەزەبرو زەنگ نەبێ رانەپەڕێ.

الثُفُلُ: ئەو كەوڵو قوماشەيە لەژێر دەستاڕو بەرداشدا رادەخرێ لەكاتى هاڕينى گەنمو جۆدا ٥ ئەو خشتو خۆڵەيە لەژێر ئاودا كۆدەبێتەوە ٥ تلپە شوكو تلپى هەرشتێك بگوشرێ ٥ لەلاى عەرەبە سارانشينەكان بەخواردنێك دەگوترێ: شيرو ماست نەبێ ٥ وەكوو دانەوێڵەو نانو خورما ٥ پێغەمبەر فەرمووى: (من كان معه

ثُفــلٌ فَلْيَصْــطَنِعْ) هــەر کەســێك دانەوێڵەی هەیە یان نانی هەیە یان خورما با خواردن ئامادە بکا.
ثَفُنَتْ يَدُهُ ثَفَناً: دەستی هاوسان‌و وازی لە کارکردن هێنا.
ثَفُنَتْ الدابةُ: وڵاغەکە بندەستی‌و ئەو شوێنەی دەکەوێتە سەرزەوی لەکاتی پاڵکەوتن‌و بیخدانی دا ئەستور بوو خاراو رەق بوو.
أثْفَــنَ العمــلُ يَــدَهُ: کـارکردن دەسـتی خارانــدن‌و پێسـتی بـەری دەسـتی ئەستورکردو وشکی کردەوە.
ثـافَنَ الرَّجُـلَ: خۆی لـە پیاوەکـە نزیـك کردەوەو هاورێیـەتی کـرد تـا نهێنـی ئیشــو کارەکـانی زانـی‌و لــەنیازو مەبەستەکانی حاڵی بوو.
الثَّفِنَـةُ: ئـەژنۆ، ئـەو بەشـەی لـە جەسـتەی وڵاغ لــەکاتی پاڵکــەوتن‌و بیخــدانی دا دەکەوێتـــە ســـەر زەوی‌و دەخـــاری‌و ئەستور دەبێ ٥ بە عەلی کوڕی حوسەین دەگــوترێ: (ذو الثَّفِنـــات) چـــونکە ناوچەوانی بەهۆی سوژدەبردنی زۆرەوە خارابوو رەق بوبوو.
ثَفَاه ثَفْياً: بەشوێنی داهات، شوێنی کـەوت (ثَفَا القومَ) خەڵکەکەی دەرکرد.
أثْفَــى القِــدْرَ: ســێ کوچــکەی بــۆ مەنجەڵەکە ئامادەکرد.
ثَقَبَــتِ النــارُ ثقوبــاً وثِقَابــةً: ئاگرەکــە هەڵگیرسا، کڵپەی کرد.
ثَقَبَ الزندُ ونحوه: چەرخەکە، ئەستێیەکە بریسکەی لێ دەرکەوت.
ثَقَبَ الكوكبُ ونحـوه: ئەسـتێرەکە روناکی دا، تاریکی شەوی کونکرد.
ثَقَــبَ الــذِكرُ: باســەکە دەنگــی دایــەوەو مەشهوربوو
ثَقَبَــتِ الرائحــةُ: بۆنەکـە بـڵاو بـووەوە مونجی دایەوە
ثَقَــبَ رأيُــهُ: رایەکــەی پەســەند بــوو، مەبەستەکەی پێکا.
ثَقَبَ العودُ: پەلە دارەکە ناوی تێچوو نەرم بوو.
ثَقَبَ الناقةُ: حوشترەکە شیری زۆر بوو.
ثَقَبَ الشَّيْئَ ثَقْباً: شتەکەی کونکرد دڕاندی.
ثَقُبَ الشَّيْئُ واللونُ: ئەو شتەی درەوشایەوە سورایی زۆر بوو سورهەڵگەڕا.
أثْقَــبَ النــارَ: ئاگرەکـەی هەڵـگیرساند (أثقــب الزنــدَ) چـەخماخەی لێ داو پریشکی دەرکەوت.
ثَقَبَ العُودُ: دارەکە ئاوی هەڵمژی ئاوی تـێ زیيا.
ثَقَــبَ الطــائرُ: باڵندەکـە لـە هـەوادا بـەرز بووەوە بۆ حەوا.
ثَقَبَ النار: ئاگرەکەی هەڵگیرساندو خۆشی کرد.
ثَقَبَ الشيبُ فلاناً وفيه: فلانەکەس پیری لێ دەرکەوت ٥ دەگوترێ: (ثَقَبَ الشيبُ الشَّــعْرَ): پــیری لــە مووەکــانی جەستەی دیاری دا.
انْثَقَبَ: بەمانا (إنْخَرَقَ)دێ ٥ کـونی کـرد دڕاندی.

تَثَقَّبَ: بەهۆی رزین‌و بێ کەڵك بوونی دڕاو هەڵوەری.

تَثَقَّبَ النار: ئاگرەکەی هەڵگیرساند.

الأَثقـوب: بـەو کەسـە دەگـوترێ: خـۆ لەهەموو شتێك هەڵقورتێنێ

الثِّقابُ: دەنکە شقارتە کە ئـاگری پـێ دەکرێتەوە.

الثَّقْـبُ: کـونی ئەمـدیواودیو، (ك: أثقـب وثقوب وأثقاب).

الثُّقْبَةُ: بەمانا (الثقب)دێ، (ك: ثُقَبٌ)ە.

الثُّقَابـةُ: ئامێرێکە بـۆ کونکردنی شت بەشێوەی کونی کەوانەیی (دڕێل).

الثَّقوب: بەمانا (الثَّقاب) دێ.

المُثَقَّـبُ: رێبـازی گـەورە کـە خـەڵکی بـــەهۆی پێداڕۆیشـــتنی زۆر بـــە پیادەڕەویی دروستی دەکەن.

المِثْقَاب: ئامێرێکە ددانـی تیـژی پێچاو پێچـی بەقەراغەکانیـەوە هـەن بـۆ ئەنجامدنی کونی کەوانەیی.

المِثْقَـبُ: ئـامێری کـونکردن ◊ رێبـازی نێوان کوفەو مەککە، (ك: مثاقب).

ثَقِفَ ثَقْفاً: زیرەك‌و وریا بوو.

ثَقِفَ الخلّ: سرکە کـە تیـژی‌و ترشـییەکەی زیاد لەئەندازە بوو زمان دەسوتێنێ ◊ (ثَقِـفَ العلـمَ والصـناعةَ) زانیـاری‌و پیشەسازی چاك فێربووەو بەجوانی ئەنجامیان دەدا.

ثَقِـفَ الرجـلَ في الحـرب: لەشـەڕا فریـای پیاوەکە کەوت.

ثَقِـف الشـيَ: فرسـەتی لەوشـتە هێنـا ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ﴾

ثَقُفَ الخلّ ثقافةً: بەمانا (ثَقِفَ) دێ.

ثَقُـفَ فـلان: فلانەکـەس لێهـاتوو کارامـا دەرچوو.

ثاقَفَهُ مثاقفة وثِقافاً: کێشەی لەگەڵدا کردو بەچـەك بەرامبـەریی کـرد ◊ بەگاڵتـەو سـوحبەت بەربـەرەکانی کـرد بـۆ ئـەوەی دەری بخا کە لێهاتوو کارامایە.

ثَقَّـفَ الشَّيْءَ: خـوارایی‌و ناڕاسـتییەکانی لەو شتە ڕاست کردەوەو رێکی خست.

ثَقَّفَ الانسان: ئادەمیزادەکەی پەروەردە کردو تەربیـەی داداو فێـری زانسـتی کرد.

تَثـاقَفُوا: ئـەو کۆمەڵـە یـەکتریان فێـری زانین‌و دەست ڕەنگینی کرد.

تَثَقَّفَ: بۆ موطـاوعـەی (ثَقَّفَـهُ) هـاتووە دەگـوترێ: (تَثَقَّـفَ علـى فـلان وفي مدرسة كذا).

الثَّقَافَـةُ: زانـین‌و زانیـاری‌و کارامـایی لەفەننەکانـدا.

الثُّقَافَةُ: ئامێرێکە لە دار یان لـە ئاسن رمبـی پـێ ڕاستەوپاسـتە دەکـرێن، چـالایی کەڵکـەکانی پـێ ڕاسـت دەکرێنەوە، (ك: الثِقَفَ وثُقُف)ە.

الثِّقَافة: یاریکردن بە شمشێر.

ثَقَلَ الشيءَ بيده ثَقْلاً: شتەکەی بـە دەست هەڵسەنگاندو کێشەکەی دیاری کرد

٥ (ثَقَلَ غيره في الوزن) له كێشدا لەكەسانی دی قورس تربوو، ئەوشتە لەشتی تر قورس تربوو.
**ثَقُلَ ثِقَلاً وثقالةً:** پارسەنگی درایەوە، قورساییەکەی لەوی تر زیاتر بوو.
**ثَقُلَ الأمرُ:** کارەکە زۆر گران‌و ناخۆش بوو.
**ثَقُلَ الرجلُ:** پیاوەکە عاقڵ‌و دامەزراو بوو.
**ثَقُلَ المريض:** نەخۆشەکە نەخۆشییەکەی تینی بۆ هێناو کوشندەبوو.
**ثَقُلَ يده، ثَقُلَ سمعه، ثَقُلَ لسانه:** دەستی، گوێچکەی، زوبانی کزو لاواز بوو وەکوو پێویست کاریان نەکرد.
**ثَقُلَ عن حاجتي:** لەکارەکەی مندا تەمبەڵی کرد.
**ثَقُلَ الشيئ أو الأمر على النفس:** نەفسی ئەوشتە یان ئەوکارەی بەلاوە ناخۆش بوو.
**ثَقُلَ الحامِلُ:** ئافرەتەکە سکپڕیەکەی دیاریداو دەرکەوت.
**ثَقُلَت النبات:** ڕوەکەکە لاسکەکانی تێراوبوون.
**أَثقَلَتِ الحامل:** ئافرەتەکە سکپڕیەکەی دیاریداو دەرکەوت ٥ (هي مثقلٌ) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا أَثقَلَت دَّعَوَا اللَّهَ رَبَّهُمَا﴾.
**أثقَلَ فلاناً:** کۆڵێکی گرانی لەکوڵی فلانەکەس نا ٥ دەگوترێ: (أثقَلَهُ الغُرْمُ) و(أثقَلَهُ الوزر) و(أثقَلَهُ النوم) و(أثقَلَهُ المرضُ فلاناً): سواری شانی بوو بەسەری دا زاڵ بوو.
**ثَقَّلَهُ:** قورسی کرد (ثَقَّلَ الحرف في الكلمة): پیتەکەی قورس کرد لە وشەکەداو تەشدیدی خستەسەر.
**ثَقَّلَ على فلان:** لەسەر فلانەکەس گران‌و ناخۆش بوو.
**تثاقَلَ عليه:** بەقورسایی خۆی خۆی خستەسەر
**تثاقَلَ عن الأمر:** لەکارەکەدا تەمبەڵی نواندو قونگران بوو زوو ئەنجامی نەدا.
**تثاقَلَ الى المكان:** لەو شوێنە پالی لێدایەوەو پێی راهات‌و تێیدامایەوە.
**اثّاقَلَ:** بەمانا (تثاقَلَ) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿ اثَّاقَلتُمْ إِلَى الأرض﴾.
**اسْتَثْقَلَ الشيْئُ:** شتەکە قورس بوو
**اسْتَثْقَلَ في نومه:** خەوی لێ کەوتوو خەوی خۆش بوو
**اسْتَثْقَلَ فلاناً:** فلانکەسی بەرەزا قورس لەقەڵەم دا.
**الثاقل:** قورس ٥ کەسێك نەخۆشی لەجێی خستبێ.
**الثقال:** قورس، (ك: ثقلٌ)٥.
**الثُقالة:** ئەو شتە قورسەیە دەخرێتە سەر کۆمەڵێ پەڕەو کاغەزی سەرمێز لە فەرمانگەکاندا بۆ ئەوەی پەرت‌و بلاو نەبنەوە.
**الثِقْلُ:** ثقلُ الشيء: قورسایی شت‌و کێشی ٥ باری قورس ٥ هەرشتێك لەسەر دڵ

گران بێ وەکوو قەرزو تاوانو ئەو جۆرە شتانە، (ك: أثقال)ە ٥ (أثقال الأرض) ئەوەی لەناو سکیدا حەشاردراوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَخرَجَتِ الأرض أَثقَالَهَا﴾.

**الثَّقَلُ**: کالاّو شتو مەك ٥ شتی بەنرخو عەنتیکەو گرنگ: پێغەمبەر دەفەرموێ: (أني تارك فيكم الثَّقَلَين كتاب الله وعترتي).

**الثَّقَلاَنُ**: بەرەی ئادەمیزادو جندۆکە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿سَنَفرُغُ لَكُمْ أَيُّهَا الثَّقَلَانِ﴾.

**الثَّقَلَةُ**: قورسایی ٥ ئالۆشیو ناڕێكو پێکی تەندروستی جەستە ٥ کالاّو شتو مەك.

**الثَّقِيلُ**: قورسو گران، (ك: ثقلاء وثقال) ٥ جۆرێکیشە لە دەنگو ئاوازی گۆرانی.

**المثقالُ**: ئەندازەیەکی زۆر بچووك (مثقال الشيء) ئەوەندەی شتەکە لەکێشدا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَظلِمُ مِثقَالَ ذَرَّةٍ﴾ لە زاراوەی کێشو تەرازودا کێشو چەندییەتی میثقالێ درهەمێكو سێ بەش لە حەوت بەشی دیرهەمێکە (٧/٣)، (ك: مثقيل)ە.

**مثاقيل**: ئەركو خەمو خەفەت ٥ دەگوترێ: (القى عليه مثاقيله) ئەركو خەمو خەفەتی خستە سەرشانی.

**الْمُثْقَلَةُ**: ئەو ئامێرەی زەوی پێ دەكوترێتەوەو دەپەسێورێتەوە.

**ثَكِلَ الوَلَدَ أو الحَبيبَ ثَكِلاً وثُكْلاً**: منداڵەکەی یان خۆشەویستەکەی لەدەست داو بۆی گریا (بەزۆری بۆ ئافرەت دەگوترێ) ٥ لە رستەدا بەم جۆرە فەرقی نێرینەو مێینە دەکرێ ٥ بۆ پیاو دەڵێی (هو ثكل وثكلان)، بۆ ئافرەتیش: (هي ثاكلة وثكلى) ٥ لە میانەی دوعاکردن لە یەکێك دەگوترێ: (ثكلته أمُهُ).

**أثكلتِ المرأةُ**: ئافرەتەکە بەردەوام بوو لە گریانو شینو رۆرۆدا.

**أثكلها الله**: خودا منداڵەکەی لێ ستاندەوە.

**الثُّكلُ**: لەدەستدانی خۆشەویستە.

**الثَّكولُ**: ئەو ئافرەتەیە شین بۆ منداڵە مردووەکەی بکا.

**الثُّكْنَةُ**: لیواو سوپای جەنگاوەران ٥ شوێن حەوانەوەی سوپا، (ك: ثُكَن وثكنات).

**ثَلَبَ الشَّيْءَ ثَلْباً**: دەلاقەی لەشتەکە کرد کونی تێکرد.

**ثَلَبَ فلاناً**: رەخنەی لە فلاّنەکەس گرت بە کەم بایەخی دانا.

**ثَلَبَ المَتاعَ**: کالاکانی هەڵەوگێرکرد

**ثَلَبَ جلدُهُ ثَلَباً**: پێستی وێك هاتەوە تێچوو

**ثَلَبَ القدمُ**: قاچەکە قڵیشی تێکەوت

**ثَلَبَ الثوبُ**: پۆشاكەكە چڵكن بوو.

جَحَمَ النار جَحْماً: ئاگرەکەی کردەوە.

جَحَمَ الرجل عينه: چاوی کردنەوەو ناقوچێنەوە ◦ دەگوترێ: (عين جاحمة).

جحمت النار جَحْماً وَجُحْماً، وجُحوماً: ئاگرەکە زۆر بوو پەرەی سەندوە بلێسەیدا.

جَحَمتِ العينان: وێڕای گەورەیی چاوەکان سوراییان زۆر بوو ◦ (هو أجْحَمُ وهي جَحماء)، (ك: جحم).

أجْحَمَ عنه: وازی لێ هێنا ◦ (أجحم الرَّجُلَ وغيرَهُ): خەریك بوو پیاوەکە بفەوتێنێ.

جَحَّمَهُ بعينه: چاوی تێ بڕین‌و زۆری سەیر کردو چاوی لێ لانەدا.

تَجاحَمَ: تەنگی پێ هەڵچنراو کەوتە تەنگانەوە ◦ بەخەم‌و خەفەت‌و رژدی‌و چروکی خۆی خواردەوەو ناوسکی هەڵقرچا.

تَجحَّمَ: بەمانا (تجاحم) دێ.

الجاحِمُ: پشکۆ ئاگری زۆر گەش‌و زوو هەڵگیرساو ◦ شوێنی زۆر گەرم (جاحم الحرب) ناو جەرگەی شەڕ ◦ گەرمەی جەنگ لەپەندی پێشینانداهاتووە (بين الرَّغيف وجاحم التنور).

الجحام: نەخۆشییەکە توشی چاوی ئادەمیزاد دەبێ چاوی دەهاوسێ ◦ هەروا دەردێکە سەگ دەیگرێ دەردە سەگی پێ دەگوترێ، چارەسەری ئەوەیە ناو چەوانی سەگەکە داغ دەکەن.

الجَحْمَةُ: ئاگری بلێسەدار قرچەقرچ کەرو سامناك (الجُحْمَةُ) بەمانا (الجَحْمَة) دێ.

الجَحيمُ: بەمانا (الجَحْمَة) دێ ◦ ناوێکە لەناوەکانی دۆزەخ ◦ قورئان دەفەرموێ: ﴿قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَانًا فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ﴾.

الجَحْمَرِشُ من النساء: ئافرەتی کەتەو زەلام ◦ پیرەژنی بەساڵاچو ◦ وشتری بەساڵاچو، (ك: جحامر)◦.

جَحَنَ جَحْناً: پێداویستی ماڵ‌و منداڵەکانی دەستەبەر نەکرد جا یان لەبەر هەژاریی یان لەبەر رژدی.

جَحِنَ جَحَناً وجحانةً: خوراکەکەی خراپ بوو، توشی بەدخۆراکی بووە، گەشەکردنی زۆر سستە ◦ (هو جَحِنٌ) ئەو کورتە باڵایە ◦ لە پەندی پێشینانداهاتووە دەڵێ: (عجب من ان يَجِيءَ من جَحَنٍ خَيْرٌ) زۆر سەیرەو جێگای سەرسوڕمانە کە خێر لەکورتە باڵا دەست بکەوێ.

أَجْحَنَ على عياله: بەمانا (جَحَنَ) دێ.

جَحَّنَ: بەمانا (جَحَنَ) دێ.

الجَحِنُ: شەتڵەگیای تینوی لاواز.

جحا بالمكان جَحْواً: لەو شوێنە مایەوە (جَحَا الشيء): لە بێخ شتەکەی دەرهێنا.

اجْتَحى الشَّيْئَ: شتەکەی لە بێخ دەرهێنا.

جُحَا: پیاوێکە زۆر روداوی سەیری پالْ دەدرێن و بۆ پێکەنین دەیانگێڕنەوە ناوەکەی (أبو الغُصْن دجَين بن ثابت)ە.

جَخَّ برِجْلِهِ جَخاً: بەقاچی تەپو تۆزی بەرپاکرد.

جَخَّ في صلاته: لەسوژدەدا گەدەی لە رانی جیاکردەوە دوو بالی لەکەلەکەی خۆی دوور خستنەوە ٥ لە حەدیثدا هاتووە دەڵێ: (أنه كان اذا سجد جَخَّ).

جَخَّ برجله جَخْواً: بەقاچی تەپو تۆزی بەرپاکرد

جخا الكوزَ: گۆزەکەی قلْب کردەوە.

جَخَّى الشَّيْخ: پیرەمێردەکە پشتی کۆم بوو.

جخَّى الرجل في سجوده: پیاوەکە لەسورژدەکەیدا هەردوبالی لەکەلەکەی دوور خستنەوە.

جَخَّى على المِجْمَرَ: لەسەر ئاگردانەکە بوخاری پەیداکرد ٥ لەبەردەوامبوون لەسەرکارەکەی وازی هێناو لای دا.

جَخَّى الليلُ: شەوەکە رۆیی ٥ (جَخَّى النجوم) ئەستێرەکان بەرەو ئاوابوون رۆیشتن.

جَخَّى الكوزَ: گۆزەکەی لارکردەوە.

تَجَخَّى الكوزَ: گۆزەکە لاربووە ٥ (تَجَخَّى الرجل على المِجْمَرِ): پیاوەکە لەسەر ئاگردانەکە بوخاری دروست کرد.

جَدَبَ المكانُ جدباً: شوێنەکە وشك بووە چونکە ئاوەکەی لێ لادرا ٥ ئەو ئاوەی لەوەپێش دەهاتە سەری لێی برا.

جَدَبَ الشَّيْئَ: رەخنەی لە شتەکە گرت و زەمی کرد.

جَدِبَ المكانُ جَدَباً: بەمانا (جَدَبَ) دێ ٥ (هو جدب وجدبة وجَدُوبٌ).

اجْدَبَ المكانُ: شوێنەکە وشك بوو ٥ دەگوترێ: (اجْدبت السنة) ساڵەکە قات و قڕی بوو (أجْدَبَ القومُ): نەتەوەکە توشی بەلای گرانی و قات و قڕی هاتن ٥ لەپەندی پێشینانداهاتووە دەڵێ: (من أجْدَب إنْتَجَعَ).

اجْدَبَ الأرض: زەوییەکەی بەوشکی و بێ ئاوی بینی.

اجْدَبَ فلاناً: فلانکەسی لەو شوێنە دانا بەلام دڵی نەیگرت و پێی خۆش نەبوو هەرچەندە زەوییەکە بەپیت و بەرەکەت بوو.

جادبت الأبلُ العامَ: ساڵ ساڵی گارانە حوشتر نەبوو، وشك بوو لەوەڕنەبوو وای لێهات حوشترەکان چیلکەو چەوێلی لەوەڕی کۆنیان دەخواردو پوش و پەلاشی پەناو پاساریان دەخوارد.

تَجدَّبَهُ: بەناخۆشی زانی و پێی ناخۆش بوو.

الأجْدَبُ من الأمكنة: زەوی وشك کە ئاوی بۆ نەیەو بارانی لێ نەبارێ، (ك: جُدُبٌ).

**المِجْدابُ**: زەوییەك كە چاوەڕوانی ئەوەی لێناكرێ بەروبوومو دانەوێڵەی لێ بەرهەم بهێنرێ، (ك: مَجَاديب).

**اجْتَدَثَ**: گۆڕی دیاریكرد، هەڵی كەند

**الجَدَثُ**: گۆڕ، (ك: أجداث) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ﴾.

**الجَدْجَدُ**: زەوی تەختی سەخت.

**الجُدْجَدُ**: گیانلەبەرێكە وەكوو كوللە بەشەو دەجریوێنێ ٥ بالوكەیەك لەچاو بێتەدەر، (ك: جَداجد).

**جَدَحَ السَّويقَ وغيره في الماء ونحوه جَدْحاً**: قاوەتەكەی تێكەڵاوی ناو كردو تێكی هەڵدا بە كەوچكی دوفاقە.

**جَدَحَ الشرابَ**: شەرابەكەی بە كەوگیر تێك هەڵدا.

**جَدَّحَهُ**: بەمانا (جَدَحَهُ) دێ.

**المِجْدَحُ**: تەختە دارێكە بەسەرەكەیەوە دوو پارچە داری تێككیراو پێوەی پەیوەست كراوە ٥ ماستاوو شەرابو ئەو جۆرە شتانەی پێ تێك هەڵدەدرێ، (ك: مجاديح)ە.

**جَدَّ جَدّاً**: گەورەو شكۆمەندە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾.

**جَدَّ في الأمر**: كۆششی كرد هەوڵی دا.

**جَدَّ الشيئَ جَداً وجداداً**: شتەكەی بڕیەوە ٥ دەگوترێ: جَدَّ النخلَ: بەری دار خورماكەی لێ كردەوە، هێشوەكانی بڕین.

**جَدَّ بالشيئ جداً**: پێی گەیی.

**جَدَّ الثديُ والضرع جدداً**: مەمكەكە یان گوانەكە وشكی كرد شیری تێدانەما ٥ دەگوترێ: (جَدَّت الشاةُ ونحوها: مەڕەكە شیری كەم بو گوانەكانی وشك بوون، (هي جَدَّاءُ)، (ك: جُدٌّ).

**جُدَّ**: بەختو شانسی هەبوو (هو مجدود).

**أجَدَّ فلان**: فلانكەس كەوتە هەوڵدانو تێكۆشانو گرنگی دان بە كارەكانی ٥ ڕێگای دەشتو راستی گرتەبەر ٥ (أجَدَّ في الأمر) لەكارەكەدا دڵسۆزی نواندو كۆششی كرد.

**أجَدَّ الطريقُ**: ڕێگاكە تەخت بوو، كۆسپو تەگەرەی تێدانەمان.

**أجَدَّ النخلُ**: خورماكە كاتی رنینی هات.

**أجَدَّ الشيئَ**: شتەكەی هێنایە دیو بەرهەمی هێنا.

**أجَدَّ ثوباً**: كراسی تازەی لەبەركرد ٥ لە پەندی پێشینەندا هاتووە: (أَبْلِ وأجدَّ وأحمد الكاسي) پۆشاك كۆن دەكەمو تازە لەبەر دەكەمو سوپاسی خودا دەكەم.

**أجَدَّ السَّيْرَ**: پەلەی كرد لە رۆیشتندا.

**أجَدَّ أمره**: كێشەو نیزاعی لەگەڵدا كرد.

**جَدَّدَ الشيئَ**: شتەكەی تازە كردەوە دەگوترێ: (جَدَّدَ العهدَ) پەیمانو بەڵێنی تازە كردەوە.

**جَدَّد ثوباً**: كراسەكەی بە تازەیی لەبەر كرد.

تَجَدَّدَ الضرعُ: گوانەکە شیری لەبەر رۆیی، شیری تێدانەما.
إستَجَدَّ الشَّيْئُ: شتەکە تازە بووەوە.
إستَجَدَّ الشَّيْئَ: شتەکەی پەیدا کردو تازەی کردەوە.
الأجدُّ من الأعوام: وشکەساڵ، ساڵی بێ بارانی.
الأجدَّان: شەوو رۆژ.
الجادة: ناوەراستی رێگاو شەقامەرێ، رێگای سەرەکی، ئەو رێگایەی تولەرێی دێنەوەسەر، (ك: جَوَادّ).
الجَدَادَ: کاتی رنینی خورما.
الجُدَادة: تێك هاڵانو تێك چرژانی لقو پۆپی دارخورماو شتی تر.
الجَدُّ: باوکی باوك (باپیر) باوەگەورە ٥ باوکی دایك، (ك: أجداد وجدود وجدودة) ٥ رزقو رۆژی ٥ پلەو پایەو رێزی لای ئادەمیزاد ٥ قەراخی چەمو روبار ٥ شانسو بەخت ٥ لەپەندی پێشینانندا هاتووە (جدّك يرعى نَعَمَكَ) شانسو بەختت چاو دێری نیعمەتەکانت دەکا.
جدّ الحِنطة: روەکێکە شکڵو شێوەی لەهی گەنم دەچێ ٥ دەڵێن: ئەم رووەکە لەبنەرەتدا گەنم بووەو گۆرانی بەسەردا هاتووە.
الجِدّ: روبەری زەوی ٥ کەناری روبار ٥ئەوپەری شتە دەگوترێ: (فلان محسن جِدًّا)، (هذا خطر جد عظيم).

الجُدُّ: لایەکی شت ٥ قەراخی روبار.
الجُدُّ من الرجال: پیاوی خاوەن شانسو بەخت، (ك: جُدُون).
الجَدَدُ: زەوی تەختو بێ کەندو لەند.
الْجَدَاء من الأبل والغنم: ئەو حوشترو مەرەیە گوێی براب‌ێ.
الجداء من السنين: ئەو ساڵە یە کەم بارانبێ.
الجَدَادُ من المفاوز: ئەو دەشتو سارایەیە بێ ئاوبێ.
الجُدَّادُ: هەرشتێك تێکهاڵیو باوەش بەیەکدا کا لەلقو پۆپی دەرختو لەگوشو حەبل.
الجُدةُ: کەناری روبار ٥ بەشێك لەشت کە رەنگی جیا بێ لەبەشەکانی تر ٥ دەگوترێ: (جُدّة السماء) و (جدّة الجبل) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾ ٥ هەروا دەگوترێ: (جَدّة الحمار): بەزۆری ئەو پەڵەی جەستەی گوێدرێژ کە رەنگی جیادەبێ دەکەوێتە پشتی.
الْجِدةُ: روبەری زەوی ٥ ملەوانکەیە کە دەکرێتە ملی سەگ، (ك: جِدَدٌ).
الْجُدِّيُّ من الرجال: پیاوی بە بەختو شانس.
الْجَدِيدُ: روبەری زەوی، (ك: أجدّة وجُدُد وجُدَد).
الجديدان: شەوو رۆژ.

الجديدة: بۆ مێینەیە.
جديدتا السَّرج والرَّحل: ئەولبادو قوماشە نەرمەیە بەبەری زینەکە یان کورتانەکەوە دەلکێنرێ.
اَلْمُجَدَّدُ من الثياب: ئەو پۆشاکەیە خەتی جیا جیای تێدابن.
جَدَرَ الجُدريُّ في البدن جَدْراً: ئاوڵەکە لەجەستەی دەرکەوت.
جَدَرَ النبتُ: رووەکە کەسەری لەخاك دەرهێنا سەرەتای بەهار.
جَدَرَ عُنُق الحمار جدوراً: ملی گوێدرێژەکە هاوسا.
جَدَرَ الرّجل: پیاوەکە خۆی پاڵ دیواردا، خۆی لەپەنادیوارەکە شاردەوە.
جَدَرَ الشَّيْءَ جَدْراً: دیوار (شورای) بۆ شتەکە کرد.
جَدِرَ جَدْراً: ئاوڵەی توش بوو.
جَدِرَ ظَهْرُهُ: پشتی ئاوڵەی لێ دەرکەوت.
جَدِرَت يَدُهُ: بەهۆی کارکردنەوە دەستی بلۆقیان کرد.
جَدُرَ بكذا ولـه جدارةً: شیاوی ئەومیە، جێی خۆیەتی ئەوە بۆ ئەو بێ ٥ (هو جدير)، (ك: جدراء).
جَدَّرَ النبتُ: رووەکەکە سەری دەرهێنا.
جُدِرَ: ئاوڵەی توش بوو (هو مجدور).
أجْدَرَ النّبتُ: بەمانا (جَدَرَ) دێ ٥ دەگوترێ: (أجْدَرَت الأرض) زەوییەکە گیای لێ روا.
أجْدَرَ الشجَرُ: درەختەکە بەرو بوومەکەی دەرکەوت بە ئەندازەی دەنکە نۆك دەبێ.
جَدَّرَ النَّبْتُ: بەمانا (جَدَرَ) دێ.
جَدَّرَ البناءَ: باڵەخانەکەی رابەست.
جُدِّرَ: ئاوڵـەی لێ هـات، توشی نەخۆشی ئاوڵە بوو ٥ (هُوَ مُجَدَّرٌ).
اجْتَدَرَ الجِدار: دیوارەکەی هەڵچنی.
الجِدارُ: دیوار، (ك: جُدُرٌ)، لەقورئان دا هاتووە: ﴿أَوْ مِن وَرَاء جُدُرٍ﴾.
الْجَدْرُ: دیوار، (ك: جدران) ٥ بناغەی دیوار ٥ لەحەدیثدا هاتووە دەڵێ: (اسقِ أرضَك حتى يبلغ الماء الجَدْرَ) زەوییەکەت ئاوبدە تا ئاوەکە دەگاتە دیواری سیاجەکە ٥ یان بناغەی دیوارەکە.
الجُدَرُ والَجُدَرُ: هاوسانێکە لە قورگدا پەیدا دەبێ ٥ یان بەهۆی لێدان و بریندار بوونەوە پەیدا دەبێ.
الجَدَرَةُ: دەنکی ئەو مادەیەی کە خورمای پێ موتوربە دەکرێ ٥ تەویلەو ئاغەڵی مەڕو بزن.
الجُدَرِيُّ: نەخۆشییەکی پێستە لەم نەخۆشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ هی تر، پێستەکە بلۆق بلۆق دەوستێ و کێم دەکاو دوایی تۆێکڵەکەی رەق هەڵدێ.
الجدير: شوێنێك بە دەوریدا دیوار دەکرێ.

الجديرة: ئاغەڵو گەوڕ کە بە وشکە کەڵەك بکرێ ٥ سروشت.
المِجْدَارُ: دار ئاوەڵ، دانانی باڵتۆیەك یان هەرشتێکی تر لەناو کشتوکاڵدا هەڵدەدرێ بۆ ئەوەی درندەو گیانلەبەران سڵی لێ بکەنەوە.
الْمَجْدَرَةُ: زەوییەکی ئاوەڵاوی ٥ شیاوو لایەق ٥ دەگوترێ: (هذا الأمر مجدرة لذلك) و(مجدرة منه) شیاوی ئەوەیە.
المجدور: شیاو ٥ دەگوترێ: (انە لَمَجْدُورٌ ان یفعل کذا) ئەو شیاوی ئەوەیە فلان کاربکا.
جَدَسَ الأثرُ جدْوساً: لەئەو روداوە یان ئەو باسەی کۆڵیەوە.
جَدَسَ الشَّیْئُ: شتەکە وشك بووەوە رەق هەڵهاتو پتەو بوو.
جَـدَسَ الأرض: زەوییەکە بە بەیاری مایەوەو بەکشتوکاڵو ئەمام تێدا چەقاندن ئاوەدان نەکرایەوە (هو جادس وهي جادسة)، (ك: جوادیس).
جَدَعَـهُ جَدْعاً: لوتی بڕی، یان لایەکی لوتی بڕی ٥ لە پەندی پێشینانداهاتووە (لأمر ماجَدَعَ قصیرٌ أنفه) بەنموونە دەهێندرێتەوە بۆ کارێك هۆکارەکەی شاردراوەبێ.
جَدَعَـهُ: بەندی کردو خستیە چوار چێوەی بەندیخانەوە.
جَدَعَ عیالَهُ: پێداویستی ژیانی ماڵو منداڵی کەم کردەوە، بەباشی بەخێوی نەکردن.
جَـدَعَ الصَّبيُّ: خوراکی خراپی دا بە منداڵەکە.
جَدِعَ جَدْعاً: ئەندامێك لە ئەندامەکانی جەستەی بڕدرا (هو أجدع وهي جدعاء)، (ك: جُدْعٌ).
جَدِعَ الغلامُ: منداڵەکە خۆراکەکەی خراپ بوو.
أجْدَعَـهُ: بەمانا (جَدَعَ) دێ ٥ (جَدَّعَ فلانـاً): بەفلانکەسی گوت لوتت بەبڕین چێ.
جَدَّعَ النَّبـاتَ: رووەکەکەی هەڵپاچی رێکی خست، وەچەی کردو وشکەڵی کرد.
تجادعـا: ئەو دوو کەسە دژایەتی یەکتریان کردو کەوتنە بەربەرەکانی یەکتری.
الجُدَاعُ مِنْ الکلأ: لەوەڕو ئالفی قورسو خراپ.
الجَدَعـةُ: شوێنی بڕینی ئەندامی جەستەکە، ئەو بەشەی ماوەتەوە لە ئەندامە بڕاوەکە.
جدف الطائر جدفاً وجدوفاً: باڵندەکە فڕی، باڵە کورتیلەکانی بۆ دواوە جوڵاند.
جَدَفَ الرجل في سیره جَدْفاً: پیاوەکە لەرۆیشتنەکەیدا باڵی هاویشتن، دەستی هێنانو بردن.
جَدفت المرأة: ئافرەتەکە هەنگاوی کورتی هەڵهێنا، لەرۆیشتنندا شەقاوی پانی نەهاویشتن.

**جَدَفَ الظَّبيُ:** ئاسکەکە بازی کورتی دا.
**جَدَفَ الحادی:** گۆرانی بێژی حوشترەکان (حودیـــه خوینەکــــه) لـــەکاتی گۆرانییەکەدا دەنگی نووسا.
**جَـدَفَ الســماءُ بـالثلج:** ئاسمـان بـەفری باراند.
**جـــدف المـــلاحُ الســـفينة وبالســـفينة:** کەشـتییەوانەکە کەشـتییەکەی بـە سەوڵەکە لێخوڕی
**جدف الشَّئَ:** شتەکەی بڕی، بڕییەوە لێـی کردەوە.
**جُـدِفَتْ يـده:** دەسـتی بڕایـەوە ٥ (فـلان مجدوف علیه عیشه): فلانکەس ژیانی کولەمەرگییە، ژیانی تەنگی هەیە.
**أجدفوا:** گرد بوونـەوە کردیانـە هـاوارو دەنگە دەنگ.
**جَدَّف بالنعمة:** کوفرانی نیعەمەتی کـرد ناشـکوری کـرد ٥ پێغەمبـەر (د.خ) فەرموویـەتی (لاتجـدِفوا بنعمـة الله) بەرامبـــەر نیعمەتـــەکانی خـــودا ناشکوری مەکەن.
**الأجدف:** کورتە باڵا.
**الجداوف:** ئاوهەڵکێش ئامێرێکـە ئـاوی پـێ بـەرز دەکرێتـەوە بـۆ زرعـاتو کشتوکاڵ (ناعور).
**الجَـــدَفُ:** شـــەرابی دانەپۆشـــراو، یـــان هەرشتێك دەمـی زەرفەکەی قـەپات نـــەکرابێ ٥ خشـــتوخاڵو کـــەفو تڵپەی لەشەراب گیرابێو فڕێ درابێ ٥ گۆڕ ٥ کویەکەی (أجداف)٥.
**الجَدَفَـــةُ:** جەڵـــەب ٥ دەنـــگو خشـــبەو خرمەو تەپەی کاتی ڕاکردن.
**المِجْـــدافُ:** بـــاڵی باڵنـــدە، ســـەوڵەی بەلەمـــەوان (دارێکـی درێـژە، بـەلای سەریەوە شەپکە دارێکی پـان هەیـە، کەشتی پێ لێ دەخوڕدرێ.
**جَدَلَ** الغلام وولد الظبية وغيرها جـدولاً: منداڵەکـە هێـزی پەیـداکرد سـەرپێ کەوتو دوای دایکی کەوت.
**جَدَلَ الشَّئَ:** شتەکە پتەو بوو.
**جَدَلَ الحَبْلَ جدلاً:** پەتەکەی باداو گشتی کرد زۆر تێـك باڵـدرا ٥ دەگـوترێ: (رجـل مجـدرل الخلـق): پیاوێکی تونـدو تۆڵە (جاريـة مجدولـة الخلـق) کـەنیزەکێکی ئەندام جوانو ڕێك پێکە.
**جَدَلَ الرجلَ:** پیاوەکـەی خستو بـە زەوی دادا ٥ لـــە دەمـــەدەمێو کێشـــەدا بەسەریدا زاڵ بوو ٥ دەگوترێ: (هـو جَدِل ومِجدلٌ ومِجْدال).
**جَدِلَ الشَّئَ:** شتەکە باش بەسـتراو تونـدو قـایمو قـوڵ کـرا، پتـەوبوو ٥ (هـــو أجْـدَلُ وهـي جـدلاء) ٥ دەگـوترێ: (ساعد أجدل) و(ساق جدلاء) و(درع جدلاء)، (ك: جدل).
**أجْـدَلَت الظبيـة:** ئاسکەکە بێچووەکەی لەتەکدا ڕۆیی.
**جادلَـه مجادلـة وجِـدالاً:** کێشـەی لەگەڵدا کـردو موناقەشـەی کـرد ٥ قورئـان

دەفەرموێ: ﴿وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾.

جَدَّلَهُ: کوشتی، خستی، شەهیدی کرد (المُجَدَّلُ) شەهیدکراو.

إجْتَدَلَ الغُلامُ: منداڵەکە گەورە بووەو لەگەڵ دایکیدا دەڕوا.

إنجدلَ: شەهید بوو کوژرا ◦ (بۆ مطاوعەیە).

تجادلا في الأمر: نیزاعیان بەرپاکرد کەوتنە کێشەو نیزاعەوە.

تجدّلَ: کوژرا، شەهید بوو (بۆ مطاوعەیە).

الأجْدَلُ: بازو هەڵۆ، (ك: أجادلَ) ◦ لە حەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (یهوی هوی الأجادل) وەکوو هەڵۆ دادێتەشت.

الأجدليّ: بەمانا (الأجدل) دێ.

الجَدَالُ: خورما کە دەنکەکانی سەوزدەبن‌و خڕۆکەدەبن.

الجَدَالَةُ: زەوی، یان زەوییەکە لی وردی تێدا بێ.

الجدّالُ: ئەو کەسەی خورمای کاڵ‌و نەگەیبو دەفرۆشێ ◦ ئەو کەسەی کۆتر لە قەفەسدا بەند دەکا.

الجَدَلُ: ڕێبازێکی موناقەشەو دەمە دەمێیە لە نێوان دولایەن‌و زیاتردا هەریەکەیان بەڵگەی خۆی دێنێتەوەو دەیەوێ بەڵگەی بەرامبەری پوچ بکاتەوە، لەلای زانا مەنطیقیە موسوڵمانەکان بریتیە لە قیاس‌و بەرامبەریکردنێك کە پێکدێ لەشتی سەلمێندراوو مەشهور.

الجَذْلُ: ئەندامی جەستە ◦ ئێسقانی ساغ، (ك: أجدال وجُدُول)◦ ◦ لە حەدیثی عائیشەدا هاتووە دەفەرموێ: (العقيقة تُقْطَعُ جدولاً لايكسرلها عظمك).

الجِدْلُ: بەمانا (الجَدْل) دێ.

الْجَدْلَةُ: دەسکەوان ◦ ئەو ئامێرەی لەناو شتێکی قوڵدا لەناو سندۆڵدا شتی پێ ورد دەکرێ.

الْجَدَلي: ئەو کەسەی نیسبەت بە جیدال‌و موناقەشە بدرێ ◦ لەلای زانایانی عیلمی مەنطیق ئەو کەسەیە جەدەل بەکار دێنێ ◦ هەرواناوە بۆ کوترێك تازە پەرو باڵی لێ هاتبن نەتوانێ باش بفڕێ.

الجدليون: ئەوانەی کە لەجەدەل‌و دەمەدەمێدا بەناوبانگن وەکوو سەوفەسطائییەکانی یۆنان موعتەزیلەکانی موسوڵمانان.

الجديل: هەوساری توندو پتەو لەچەرم یان لەموو ◦ ڕێشمەو مێش تەرێن.

الجديلة: قەفەزێکە لە دار دروست دەکرێ بۆ کۆترو کەو ◦ هۆزو عەشیرەت ◦ ناوچە ◦ حاڵ‌و ڕێبازو بیرو بۆچون ◦ دەگوترێ: (ركب جديلة رأيه): پەیرەوی بۆچون‌و عەزیمەتی خۆی کرد.

المجادلة: لەزانستی دانوسانو گوفتوگۆدا، موناقەشەو دەمەدەمێیە بۆ دەرخستنی راستیو بۆڕدانی بەرامبەر.
المِجْدَلُ: باڵەخانەی بەرز، (ك: مجادل)ە.
الجُدامُ: بنکی لقە دارخورما.
الجُدامــة: ئــەو گوڵــە گەنمــەی ورد نەکرابێ.
الجُداميــةُ مــن النخــل: ئــەو دەرەختــە خورمایەیە کە لقو پۆپی زۆر بن.
الجَدَمــة: (الجَدَامَــةُ) ئــافرەتو پیــاوی کورتــە بــاڵا، (ك: جَــدَمٌ) ە تــوێکڵی سەرەوەی دەنکە دانەوێڵە.
الجَدْوَلُ: جۆگای ئاو (جۆگەو جۆبارێکی بچوکە لـەزەوی هەڵدەکەنـدرێ بـۆ ئەوەی ئاوی پێدا ببرێ بۆ ئـاودێری زرعاتو باغ ە چەند هێڵێکی راست بکێشرێنو ئەوجا بەچەند هێڵێکی تــر بــبڕدرێن بــۆ ئــەوەی چــەند خانەیــەکی چوار گۆشـە پێـك بــێ ئەمجار لەناو چوار گۆشەکاندا شتی مەبەســت بنووســرێ دەگــوترێ: جــەدوەلی زەرب، جــەودوەلی کــار، جەدوەلی حسیاب، جەدوەلی دەرس.
جدا فلاناً وعليه جدواً وجداً: بەشی فلانـی دا، داوای خێرو سوودی لێ کرد.
جداه جدياً: داوای سودو نەفعی لێ کرد.
أجدى الشَّيْئُ: شتەکە سوودی هەبوو.
أجدى فلان: فلان باران لێی دا، بە باران تەڕ بوو.
أجدى الجرحُ: برینەکە خوێنی لێ هات.

أجــدى عنــه: بــێ ئاتــاجی کــرد ە پێداویستیەکانی بۆ دابین کرد
أجْدى فلان: بەشی فلانکەسی دا.
جــدّى الرَّحْــلَ والسَّــرْجَ: زێــر زیــنو پەشــتەماڵی بــۆ وڵاغەکــەی دروســت کرد، بە مەبەستی پارێزگاریکردنی پشــتی وڵاغ قوماشــێکی نــەرم دەخرێتە ژێر زینو کورتانەوە.
اجتــداه: داوای بــارانی کــرد ە داوای بەخششو عەطای لێکرد.
استجداه: بەمانا (اجتداه) دێ.
الجادي: کوللە، کە هەوڵو کۆشش دەکا بـۆ دەسـتکەوتنی هـەموو شـتێك بـۆ ئەوەی بیخوا.
الجاديّ: زەعفەران.
الجادياءُ: بەمانا (الجادي) دێ.
الجدا: بەخششو عەطا ە بـارانی گشـتی ە لەکاتی دوعاکردنی پێغەمبەر (د.خ) بۆ بـارینی باران فـەرمووی: (اللـهم اســقناغيثاً غــدقاً وجــداً طبقــاً) ە دەگـوترێ: (خيرُ فـلان جَـدا) خێـری فلانکەس گشتییە بۆ هەموو کەسە.
الجَداءُ: دەوڵەمەندیو سوودو قازانج.
الجُــداءُ: ئەنــدازەی حیســابی زەرب، دەگـوترێ ە (جداء ثلاثه في ثلاثة تسعة): ئاکامو ئەندازەی سێ جار سێ نۆیە.
الجَداية: نێرو مێ لـە بێچوی ئاسك کـە کەیشتە شەش مـانگو بـەرەو ژوور، (ك: جدايا).

**الجِدايَة**: بەمانا (الجَدايه) دێ.
**الجَـدْوى**: بـارانی گشـتی ٥ بەخشـش ٥ دەگوترێ: (شغلتني النفقة على عيـالي عن الافضال على غيري).
**الجَدْيُ**: گیسکە نێـر ٥ کـار، بێچوی بـزن، (ك: أجْدٍ، جِداء، جِدْيان) ٥ بورجێکی ئاسمانە لە تەنیشت بورجی دەلو.
**الجَدْيَةُ**: پارچە قوماشێك لـەژێر زیـن و کورتان دەکرێتە پشتی ولاغ.
**الجُـدَيُّ**: ئەسـتێرێکە نزیـك قیبلـە بـە ئەستێرەی قیبلە بەناوبانگە.
**الجَدِيَّـةُ**: خـوێنی رەوان ٥ رەنگـی دەم و چاو ٥ پارچە میسك ٥ ناوچە ٥ ژێـر زین و ژێر کورتان.
**إجْذَأَرَّ النبتُ**: رووەکەکـە روا وەلێ بـالای نەکرد.
**إجْـذَأَرَّ فـلان**: فلانکـەس هەڵسایە سـەر چۆکان بۆ جنێودان.
**جَـذَبَ الشـهْر جـذباً**: زوربـەی مانگەکـە رۆیی.
**جَـذَبَ الشَّـيْءَ**: شـتەکەی درێـژکردەوە ٥ لەشوێنی خۆی لایدا.
**جَـذَبَ المـاءَ مـن الانـاء**: بـەدەم ئاوەکـەی هەڵلوشی لەجامەکەوە.
**جَذَبَ الرَّضيعَ**: شیرەخۆرەکەی لەشیر بڕییەوە.
**جَذَبَ فلان حبـل وَصْـلِهِ**: فلانکـەس پـەتی پەیوەنـدی نێـوان خـۆی و خـزم و دۆستی پچڕاند.
**جَـذَبت المـرأة خاطِبَهَـا**: ئافرەتەکـە خوازبێنی کەرەکەی خۆی جوابکرد داواکەی رەتکردەوە.
**جَذَبت الناقةُ والاتانُ لبنها مـن ضـرعها جذاباً**: حوشـترەکە یـان دێڵەکەرەکە شیرەکەی هەڵگرتەوە، شیری نـەدا ٥ (هي جاذبة وجـاذب)، (ك: جـواذب) و (هي جذوب)، (ك: جذاب).
**جاذَبَ الشَّيْءَ**: لە شوێنی خۆی شتەکەی لادا.
**جـاذب فلانـاً الشَّـيْءَ**: لەسـەر شـتەکە کێشەی لەگەڵ فلانکەس دا کرد.
**اجتذبَ الشَّيْءَ**: کێشەی لەگەڵدا کرد.
**اجتذبَ**: درێژ بووە (بۆ مطاوعەیە).
**إنجـذَبَ القـوم في السـير**: خەڵـکەکە پەلەیان کرد لە رۆیشتندا.
**تجاذَبُوا الشَّيْءَ**: کێشەیان تێدا کرد.
**تَجَذَّبُ الشَّيْءُ**: شتەکە درێژ بووە.
**تَجَذَّبَ اللبَن**: شیرەکەی خواردەوە.
**الجاذِبـــة**: لەزانســـتی رووەکناســـیدا رووەکێکــە رونێکــی بۆنخۆشــی لێ دەردێ، گەلاکەشـــی دەجـــورێ ٥ لەزانستی ماتماتیـك دا بریتییـە لـە هێزێــك کاردەکاتــە قەبارەیــەکی خــاوەن جوڵــە لەســەر ئاسـتێك و خێراییەکی عەمودی پێ دەدا.
**الجاذبیـــة**: حاڵەتێکـە بـەهۆی هێـزی کێشـــــندییەوە قەبارەیـــــەك قەبارەیەکی تر کێش دەکا.
**الجَـذْبُ**: لـە زاراوەی صـوفیان دا دیـاردەو حاڵەتێکـــە بەســـەر نەفســـی

ئادەمیزاددا دێ بەو هۆیەوە دڵ ئاگای لە وەزعو حاڵی خەڵق نامێنێو پەیوەندی دەکا بە عالەمی باڵاوە ◊ بەلای ئەفلاتونەوە (جەزبە) خێرو بێری باڵایە ◊ هەندێ لە صوفیەکان دەڵێن: بریتیە لە سۆزو وەجد ◊ لە زانستی ڕیاضەدا (جەزب) بریتییە لە هێزێك بەهۆی ئەو هێزەوە قەبارەیەك کار دەکاتە سەر قەبارەیەکی تر بەبێ ئەوەی لە نێوانیاندا پەیوەندییەکی ئاشکرا هەبێ.

**الجَذبَةُ**: دڵی خورما، پیوی خورما، (ك: جَذَب وجِذاب).

**الجِذبَةُ**: پارچە، (ك: جَذَابٌ).

**الجُوذابُ**: خواردەمەنییەکە لە گۆشتو برنجو شەکرو بوندوق دروست دەکرێ.

**المجذُوبُ**: لە زاراوەی صۆفیاندا کەسێکە حەق کێشی کردبێ بۆ خزمەت خۆیو بەهرەو شکۆمەندی خۆی بەسەردا ڕشتبێ بەبێ ماندوبوونو خەڵوەکێشان ئەو بەهرەیەی دەست کەوتبێ.

**جَذَّ جَذّاً**: شکاندنی، بڕیەوە، دەگوترێ: (هو جذيذ ومجذوذ) ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿عَطاء غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾.

**جَذَّ الحَبْلَ وجَذّا الشَّئَ**: حەبلەکەی بڕی لێکی جیاکردەوە.

**جَدَّ النَخلَ جَذّا وجِذاذاً**: هێشووە خورماکانی هەڵبڕینو چنینی.

**جَذَّذَ**: بەمانا (جَذَّ) دێ.

**جَذَّذَ القومَ**: داوای لە نەتەوەکەی کرد شوێنی بکەون بەڵام کەسیان بەگوێیان نەکردو بەپیر بانگەوازییەکەوە نەچوون.

**إنجَذَّ**: بڕایەوە، شکا، دووکەرت بوو، کەرکەرت بوو ◊ (بۆ مطاوعەیە).

**تَجَذَّذَ**: بڕایەوەو شکا (بۆ مطاوعەیە).

**الجُذاذُ**: بڕاوە، شکێنراوو کەرتو پەرت کراو، قورئان دەفەرموێ: ﴿فَجَعَلَهُمْ جُذاذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ﴾.

**الجِذاذ**: بەمانا (الجُذاذ) دێ.

**الجُذاذَة**: وردە پارچە، ئەو پارچانەی لە بڕینو بڕینەوەی شتێك پەیدا دەبن وەکوو پارچە کاغەزو پارچە مقەباو پارچە قوماش. ◊ بەردە وردەی زێڕ، پارچە وردەی زیو ◊ ئەو پارچە وەرەقانەی کە وردە زانیاری کاتیان لەسەر تۆمارە تا دەخرێنە سەر حیساب یان دەخرێنە ناو دەفتەری سەرەکی نووسینەوەی باسەکە، (ك: جُذَاذ).

**الجَذّاءُ**: ددانی شکاو ◊ دەگوترێ: (يد جذاء) و (رحم جَذّاءُ) دەستی بڕا.

**الجُذَّة**: پۆشاکێك جەستەداپۆشێ ◊ دەگوترێ: (ما عليه جُذَّة) کراسێکی لەبەردا نییە لەشی داپۆشێ.

**الجَذِيذ**: پارچەیەك لە کەلو پەلی بێ کەڵکی شکاوو فڕێ دراو، (ك: جُذَاذ).

**المِجَذُّ**: لایەکی کلچێوك، (ك: مَجَاذ)ە.

**جَذَرَ الشَّئَ** جذراً: لە بێخ دەری هێنا.

**أجْذَرَ الشَّئُ**: بەمانا (جَذَرە) دێ.

**إنْجَذَرَ**: برایەوە، کۆتایی هات.

**الجِذْرُ**: بنەچەو بنەماو بناغەی هەموو شتێك.

**جَذْرُ** النبات: ئەو رەگو ریشەیە بەزەویدا رۆدەچێو خۆراك وەردەگرێ.

**جَـذْرُ** العـدد: لـە ژمـارەدا بـەو ژمارەیـە دەگوترێ: زەربـێ خـۆی یـان زەربـی هێزی دووەمی دەکرێ ە بۆ نموونـە جـەزری (١٠٠) سـەد ژمـارە (١٠)یـە ە جەزری (٢٥) ژمارە پێنجە، جـەزری ژمارە (٥) دوجار زەرب بکرێ (١٢٥) سەدو بیستو پێنجە.

**الجُـــذَيْرَ**: لـــە گیانلەبـــەرو رووەکـــا، پێکهاتەیـــەکی (عضـــوی) زۆر وردو باریکـە ە ریشـاڵە کلۆرێکـە کەرەگـە لەرووەکـدا پێـوەی پەیوەسـتە یـان دەمار لەگیانلەبەردا.

**المجـذور**: لـە زانسـتی ریـاضـەدا ئـەو ئەندازەیەیـە کـە دەکەوێتـە ژێـر نیشانەی جەزرەوە.

**جَذَعه جَذعاً**: شێلای، دەستی پێدا هێنا، (جـــذ ع الدابـــةَ) ئاژەڵەکـەی لـە شوێنێکی بێ لەوەر بەندکرد.

**جَذَعَ** الرجُل عيالَهُ: پیاوەکە خێرو بێری خۆی لەماڵو منداڵەکەی گرتەوە.

**جذع** بين البعيرين: هـەردوك حوشـترەکەی بەپەتێك بەستەوە.

**أجْذَعَ** الفصـيلُ وغَيْـرُهُ: حوشـترەکە بـوو بـە جەزعـە، واتـە: لـە چـوار ساڵییەوە پێی نایە پێنج ساڵییەوە.

**تَجَاذَعَ**: خۆی بەخەمبار نیشان دا.

**الجَـــذَعُ** مـــن الرجـــال: گـەنجێك تـازە پێگەیشـــتبێ ە لـــە حوشتریشـــدا ئەوەیـە چـوار ساڵی تـەواو کردبێو چـوبێتە سـاڵی پێنجەمـەوە ە لـە وڵاخەبەرزەو رەشـە وڵاخـدا ئەوەیـە دوو سـاڵی تـەواو کردبـێ، تەمـەنی چـوبێتە سـاڵی پێنجەمـەوە ە لـە مـەرو بزنـدا ئەوەیـە: هەشـتو نـۆ مـانگی تـەواو کردبـێ ە دەگـوترێ: (أعَـــدْت الأمـــر جـــذعاً) کارەکـەم گێڕایەوە بۆ سەر حاڵەتی پێشوویو سەر لەنوێ دەستم پێ کردەوە.

**أم الجَـذَع**: بـەڵاو کارەسـات ە رۆژگـارو زەمانە ە شێر.

**الجِذْع**: قەدی دار خورماو قەدی درەختـی تر، (ك: أجذاع، جذوع).

**الجِذَعُ**: پەرتو بڵاو ە دەگـوترێ: (ذَهَـبَ القومُ جِـذَ عَ مِـذِعَ) واتـە: بەهـەموو لایەکدا پەرتو بڵاوبوونەوە.

**المُجَـذَّعُ**: هـەر شـتێك بناغـەو بنـەمای نەبێو جێگیر نەبێ.

**جَذَفَ** الانسان في مشـيه والطـائر في طيرانـه جذفاً: واتە: پەلـەی کـرد ە (جَـذَفَتِ المـــرأة): ئافرەتەکـە لـە رۆیشـتندا هەنگاوی کورتی هەڵێنا.

جَذَفَت السماء: ئاسمان بەفری باراند.
جَذفَ الشَّيْءَ: شتەکەی بڕییەوە.
أجْذَفَ: پەلەی کرد ٥ (أَجَدَفَ) بەمانا (انجذف) هاتووە.
المِجْذاف: (مجـذاف السـفينة): سەوڵەی لێخوڕینی کەشتی، (ك: مجاذيف).
جَذَلَ الشَّيْءُ جُذُولاً: شتەکە ڕاست بۆوەو خۆی گرت ٥ دەگوترێ: (جَذَلَ للقوم يحاربهم) لە قەومەکە ڕاست بۆوەو شەڕی دژکردن.
جَذِلَ جذلاً: کەیف خۆشبوو (فهو جَذِلٌ وجذلانُ وهي جَذْلَى)، (ك: جُذالَى، جُذْلانٌ).
أجْذَلَهُ: کەیف خۆشی کرد.
اجْتَذَلَ: کەیف خۆش بوو.
تَجاذَلُوا: ئەو کۆمەڵە خەڵکە ڕقیان لێك هەڵگرتو دژایەتی یەکتریان کرد.
استَجْذَلَ: ڕاست بۆوەو خۆی گرت.
الجِـذْلُ: قەدی درەخت بنکی شت دوای لێبونەوەی لقەکانی ٥ لە حەدیثدا هاتووە دەڵێ: (يبصر أحدكم القذى في عين أخيه ولا يبصر الجِذْلَ في عينه) یەکێك لە ئێوە پوشکە لەچاوی براکەیدا دەبینێ وەڵێ بڕەدار لەچاوی خۆی دا بەدی ناکا ٥ هەروەها دەگوترێ: (عاد الشيء الى جِذْلِهِ) شتەکە هاتەوە سەر بنەمای خۆی ٥ هەروەها بەمانا سەری کێو هاتووە ٥ بەمانا ئەو درکە شاخو دوندانەی لێی بەرز بوونەوە هاتووە ٥ هەروەها ئاوە بۆ بڕە دارێك دەچەقێنرێ بۆ ئەوەی وشتری گڕوێ خۆی پێ بخورێنێ ٥ دەگوترێ: (انه لجِذْلُ حِكاكٍ) ئەوە بڕەداری خۆپێخوراندنە ٥ هەروا دەگوترێ: (فلان جذلُ إبلٍ أو غنم) فلانکەس بە باشی حوشتر یان مەڕو بزن بەخێو دەکا، (ك: أجذال، جذال، جُذول)٥.
جَذَمَهُ جَذْماً: بڕیەوە، (هو مَجْذوم وجذيم).
جُذِمَتْ يَدُهُ جَذْماً: دەستی بڕایەوە، یان پەنجەکانی نەماون ٥ (هو أجْذَمُ وهي جَذْماءُ)، (ك: جُذْم)٥.
جُذِمَ: نەخۆشی داڕزانی توش بووە واتە: گولی، (هو مجذوم).
أجْذَمَ يَدَهُ: دەستی بڕیەوە.
أجْذَمَ عن الشيئ: وازی لەوشتە هێنا.
أجْذَمَ عليه: سور بوو لەسەر ئەو شتە.
اجْذَمَ السَّيْرَ: بەپەلە ڕۆیشت.
جَذَمَهُ: بڕیەوە.
إنْجَذَمَ: بڕدرایەوە.
الْجُذامُ: گولی، نەخۆشییەکە گۆشتو پێستی ئادەمیزاد دادەرزێو هەڵدەوەرێ.
الجُذامَةُ من الزرع: ئەو پنچكو پرزو پاڵەیە کە لە پاش دروێنە دەمێنێتەوە.

**الجِذْمُ**: بنەماو ئەصڵ، دەگوترێ: (جِذْمُ الشجرة وجِذْمُ القوم) بنکی درەخت، بنێچەی نەتەوە ٥ (جِذْمُ الرجل) هۆزو عەشرەتی پیاو ٥ لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە (لم يكن رجل من قريش الا له جذم بمكة) هەموو پیاوێکی قورەیش بنیچەکەی لە مەککەوە بووە.

**جِذْمُ** الاسنان: بنکی ددان ٥ پوك ٥ (جِذْمُ الحائط) بناغەی دیوارو کەلاوە، (ك: أجذام، جذوم).

**الْجَذْمَة**: جومگەی دەست.

**الْجِذْمَةُ من الشيئ**: پارچەیەك بەشێك لەشت ببردرێ‌و بنکەکەی بمێنێتەوە ٥ دەگوترێ: (رأيت من يده جِذمة حب).

**المِجْذامُ**: ئەو کەسەی کێشەکان یەکالا دەکاتەوە ٥ دەگوترێ: (رجل مجذام) پیاوێکە کێشەکان یەکالا دەکاتەوە ٥ زوو خزمایەتی تێك دەداو پەیوەندییەکان دەپچڕێنێ ٥ هەروا دەگوترێ: (رجل مجذام الركض في الحرب) پیاوێکە لەشەڕدا گورج‌و گۆڵە.

**المجذامة**: بەمانا (مجذام) دێ.

**الْمُجَذَّمُ**: بەمانا (المجذوم) دێ.

**جذا جَذْواً وجُذُوّاً**: جێگیربوو راوەستا.

**جذا الرجلُ**: پیاوەکە لەسەر ئەژنۆی دانیشت ٥ لەسەر پەنجەی قاچی راوەستا.

**أجْذىَ الفَصِيلَ**: بێچوەکە لە دوگەکەی دا زۆری چەوری هەڵگرتووە.

**تجاذَى القومُ الْحَجَرَ**: ئەو کۆمەڵە دارەیان لەبن بەردەکە گیر کردوە بۆئەوەی لەشوێنی خۆی لایبەرن.

**إجْذَوْذَى**: راست بووەوە، راوەستا ٥ لەماڵەوە مایەوە دەرنەچوو ٥ لەگەڵ خێڵ کەوت‌و لەخێزانەکەی دابڕا ٥ گەردن کەچ بوو.

**الْجاذي**: دەست کورت ٥ (الجاذية): بۆ مێینە بەکاردێ ٥ هەروەها حوشترێکە کە بێچوی دەبێ شیری کەم بێ.

**الْجَذَاةُ**: بنکی درەختی گەورە.

**الجِذْوَةُ**: پشکۆی ئاگری بڵێسەدار، (ك: جِذاء وَجُذًا) ٥ لە قورئان دا هاتووە: ﴿لعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ ٥ هەروەها دەگوترێ: (جِذْوة شرٍّ): فلانکەس ئاگری شەڕە (ئاگری بن کایە).

**الجِذِيُّ**: بنەما ٥ بناغە.

**المِجْذاءُ**: (مِجْذاء الطائر): دەندوکی باڵندە.

**جَرُؤَ على الشيئ جُرْأةً وجراءةً**: پەلاماری ئەوشتەی دا ٥ (هو جريئ)، (ك: جُرَآءُ وأجْرِئاءُ).

**جَرّأهُ**: هەڵینا.

**إجْتَرأ عليه**: بوێربوو.

**تَجَرّأ**: بوێر بوو.

**الْجَرِّيئَةُ**: گەرو ٥ چۆلەکە گر ٥ تەڵەو داو بۆ گرتنی باڵندە.

الجَرِيَّةُ: گەرو.

الجَرِيئَةُ: ئافرەتی بوێر ٥ تەڵەو داو بۆ درندە (ژوورێکە لەبەرد دروست دەکرێ، بەردێك دەخرێتە سەر دیواری دەرگاکەی‌و پارچە گۆشتێك لە ژوورەکەدا دادەنرێ کە دڕندەکە دەچێتە ژوورەوە دەم دەکاتە گۆشتەکە بەردەکە بەرد دەبێتەوە دەرگاکە دەگرێ.

إجْرَأشَّ: جەستەی بەرەو تەندروستی گەڕایەوە دوای ئەوەی بێ هێزو لاواز بوو.

إجْرَأشَّ الابلُ: حوشترەکە سکی پڕ بوو قەڵەو بوو.

الجُرائِضُ: شێر ٥ ئەگەر بۆ حوشتر بەکار هێندرا مەبەست حوشتری گەورەو بەهێزە، (ك: جرالض).

جرافیت: کانێکی خەڵوزی ئاسنینە مادەی قەڵەم رەصاصی لێ بەرهەم دەهێندرێ.

الجَرَانیتُ: بەردێکی رەق‌و رەنگاو رەنگە، عەمودو کۆڵەکەی لێ دروست دەکرێ ٥ گرانیت، کاشی گرانیت.

جَرِبَ جرباً: توشی گەڕو گولی بوو خروخۆی تێکەوت، (هو أجرب وهي جرباء)، (ك: جراب وجربی)

جَرِبَ السیف: شمشێرەکە ژەنگی هێنا.

جَرَّبَه تجریباً وتجربة: چەند جارێك یەك لەدوایەك بەتاقی کردەوە خستیە ژێر ئەزموونەوە.

رجل مُجَرَّب: پیاوێکی بەتاقی کراوە لەکارەکانیدا (رجل مُجَرِّب) پیاوێکی بەتاقی کەرەوەیە، رووداوەکانی بینیوەو پێیان دا تێپەڕیوە دەزانێ کارەکان چۆنن.

التجربة في العلم: بریتییە لە ئەزمونگەرییەکی رێك‌و پێك شێوەیەکی تایبەتی‌و لەرێگەی نەخشەو پلانێکی دارێژراوە وە بۆ دەرخستنی ئاکام‌و گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو.

الجِرابُ: هەمبانە ئەو شتەی تێشووی تێ دەکرێ، (ك: أجربة و جُرُب)٥.

الجَــرَبُ: نەخۆشییەکی پێستە پێی دەگوترێ گەڕی.

الجُراب: کەشتی بەتاڵ.

الجَرْبَاءُ: مێیینەی (أجرب)٥ ٥ زەوییەکە هیچ سەوزایی تێدا نەڕوێ، بەروبومێکی تێدا نەبێ.

الجِرِبّانُ: گیرفانی کراس ٥ کالانی شمشێر، تیژی شمشێر.

الجِرْبة: شوێنی کشتوکاڵ ٥ چەرمێکە لەسەر لێواری بیر دادەنرێ بۆ ئەوەی ئاوەکەی سەرڕێژنەکا، یان دەخرێتە ناو جۆگاوە بۆ ئەوەی ئاوەکە بەرزو نزمی تێدابێ.

الجربیاء: بای شەماڵی سارد.

الجَریبُ: شوێنی کشتوکاڵ ٥ پێوەرێکە بە ئەندازەی چوار قەفیز بەکوردی پێی دەگوترێ: تەغار ٥ چەوو بەرد گلی تێکەڵ بێ، (ك: أجْرِبة وجُرْبان).

**الجُرَيْبُ:** لە زانستی ئەحیادا توێکڵێکە لەسەر شێوەی قوڵکە قوڵکە لە پێستی ئاژەڵدا.

**تَجرثَمَ الرجلُ:** پیاوەکە وێك هاتەوە، لە شوێنی خۆی دانیشت ٥ لە بەرزاییەوە بەربۆوە.

**تَجرثَمَ الشَّيْئَ:** زوربەی زۆری شتەکەی برد.

**اجْرَنْثَمَ القومُ:** خەڵکەکە کۆبوونەوەو لەشوێنێکا جێگیربون.

**إجْرَنْثَمَ الرجلُ:** پیاوەکە لە بەرزاییەوە کەوتە خوار

**الجرثومة:** بنەما ٥ ئەو پەردەیەی لەلای بنی زمانەوەیە لەکاتی شت قوتداندا ناهێڵی خواردنەکە بچێتە بۆری هەناسەوە ٥ ئەوگڵو خۆڵەیە کەلە دەوروبەری بنکی دەرختە ٥ گوندەمێرو ٥ جورثومە لە زانستی ئەحیادا بەشێکە لە ژیاندار یان روەك کەبگونجێ ژیاندارێکی تریان روەکێکی تری لێ بەرهەم بێ ٥ وەکوو هێلکوکەی زیندەوەر دەنکە تۆمی روەك.

**جَرَجَت الابلُ المَرعى:** حوشترەکە پاوانەکەی خوارد.

**جَرِجَ جرجاً:** دڵەراوکێو پەلە پەلی پێ کەوت ٥ هاتوچۆی کرد هەڵسورا.

**جَرِجَتِ الأرض:** زەوییەکە رەق بوو.

**جَرَّجَهُ:** توشی قەلەقیو دڵەراوکێی کرد.

**الجُرْجَةُ:** کیسەیەکە لە پێست دروست دەکرێ لای خواروی پانو پۆرە دەمی تەسکە تێشووی تێ دەکرێ، (ك: جُرَج)ە.

**جَرْجَرَ البعِيرُ:** حوشترەکە لەگەروی خۆیدا دەنگی دووبارە کردەوە ئامازەی بەنارەحەتی خۆی کرد ٥ (هو جرجار وجرجر وجراجر)

**جَرْجَرَ الماءُ:** ئاوەکە قلپە قلپی کرد ٥ دەگوترێ: (جرجر الشراب في الحَلْقِ).

**جَرْجَرَت النار:** ئاگرەکە لرفەلرفی هات ٥ دەنگی لێوە هات.

**جَرْجَرَ الشرابَ:** شەرابەکەی قوم قوم خواردەوە یەك لەدوایەك.

**جَرْجَرَ فلاناً الشرابَ:** قوم قوم ئاوی بەقورگی فلانکەسدا کرد یەك لەدوا یەك ئاوەکە قوڵتە قوڵتی هات.

**الجُراجِرُ:** کلۆر، (ماء جراجر): ئاوێك زۆر خورە خوری بێ.

**الجرجارُ:** دەنگی هەورە تریشقەو گۆڵە گۆڵی هەور.

**الجَرْجَرُ:** جەنجەر؛ ئامێرێکە دوای دروێنە دانەوێڵەی پێ لەپۆشو پەلاشەکەی جیا دەکرێتەوە ٥ کرشەکەی پێ ورد دەکرێ.

**الجِرْجِرُ:** دانەوێڵەیەکە لە پێری رەقەکانە وەرزانە لە شوێنی ئاوو هەوای مام ناوەندیدا دەروێ.

**جَرْجَمَ الطعام:** خواردەمەنییەکەی هەموو خوارد، (جَرجَمَ الشراب) هەموو شەرابەکەی خواردەوە.

جَرْجَمَ الرجلَ: پیاوەکەی خست بە زەویدا
جَـرْجَمَ البَيْـتَ: خانووەکـەی هەڵوەشـاند، روخاندی.
تَجَـرْجَمَ: بـۆ مـوطـاوەعـەی (جـرجم) هاتووە.
تجرجم الشَّيْءُ: شتەکە کەوتە خـوارەوە (تجرجم في الأكل والشـرب) زۆری لێ خواردو خواردەوە
تَجَرْجَمَ في مكانه: لەشوێنی خـۆی وێـك هاتەوەو دانیشت.
جَرَحَهُ جَرْحاً: بریـنداری کرد ٥ (هو وهي جريح) بۆ نێرو مێ، (ك: جرحی).
جَرَحَهُ بلسانه: جنێوی پێ دا دژی دوا.
جـرح الشـاهِدَ: شـایەتەکەی رەدکـردەوە پێی رازی نەبوو.
جرح الشَّيْءَ: شتەکەی بەدەست هێناو کەسبی کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَهُـوَ الَّـذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِالنَّهَـارِ﴾ ئەوەی بەرۆژ کردوتانە ٥ (فـلان يَجْـرَحُ لعيالـه) فلانکـەس کاسـبی بـۆ مـاڵو منداڵی دەکا.
جَرَّح جرحاً: جیراحـەی تـوش بـوو شایەتیو ریوایەتەکەی رەت کرایەوە.
جَرَّحه: زۆری بریندار کرد.
جَرَّحوه بأنيـاب وأضـراس: جنێویـان پـێ داو رەخنەیان لـێگرت.
اجترح الشَّيْءَ: شتی خراپـی نـەنجام دا ٥ تـاوانی کـرد ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ﴾
استجرحَ الشاهدُ: شایەتەکە شیاوی ئەوە بـوو تانـەی لێ بدرێو شایەتییەکەی رەت بکرێتـەوە ٥ دەگـوترێ: (کثـرت هـذه الاحاديـث واسـتجرحت): حـەدیثـەکانی رەخنـەیان لێ دەگیرێو راستەکانی کەمن.
الجـارح: کاسـبکار: دەگـوترێ: (فـلان جـارح أهلـه) فلانکـەس کاسـبکاری ماڵو منداڵی خۆیەتی
الجارحة: دەست، قاچ ٥ سەگو تاژیو باز کـە بـۆ راوکـردن راهێنـدرابن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ﴾.
الجراحـةُ: بـڕین ٥ میهنـەی ئێسـك رابەسـتنەوە ٥ بەشـێکە لـە زانیـاری تەندروستی کە پزیشك عەمـەلیات دەکا.
الجُـرْح: بریـنـداری جەسـتە، هەڵـدرانی پێست، (ك: جروح).
جَـرَدَه جـرداً: روتـی کـردەوە، تـوێکڵی سـەرەوەی لابـرد، سـپی کـرد دەگـوترێ: (جـرده مـن ثوبـه) پۆشاکەکەی لێ دارنی.
جَـرَدَ الجلـدَ: مـوو تـوکی پێسـتەکەی لێ کردەوە پێستەکەی سپی کرد.
جَرَدَ الجرادُ الأرض: کوللە بێتـان هەرچی لەسـەر روی زەوی هـەبوو لـە شـیناوەردو دەغـڵو دان هـەمووی خوارد هیچی نەهێشتەوە.

جرد السيفَ من غمده: شمشێری لەکالان دەرکێشا.
جَـرَدَ القُطـنَ: پەمۆکـەی هەڵـەجکرد، پاکیکرد.
جَرَدَ القومَ: داوای لەخەڵکەکە کرد سواڵی لێ کـردن بەشـیان نـەدا یـان بەنارِەزایی شتێکیان پێدا.
جرد ما في الخزن أو الحانوت: سەرژمێری شـتومەکی ناوگەنجینـەو حانووتەکـەی کـردو نرخەکـەی دیاری کرد.
جَـرِدَ جَـرْداً: تـوك بەجەستەیەوە نـەما هـەمووی هـەڵوەری دەگـوترێ: (هـو أجـرد)، (ك: جُـرْدٌ)ە ە لـە حەدیسدا هـاتووە: ئـەهلی بەهەشـت (جـرد مردمكحلون).
جـرِدَ المكـانُ: ئـەو شـوێنە شینایی تێـدا نـەما، دەگـوترێ: (سمـاء جـرداء): ئاسمانێکی بێ هەورە.
جَرِدَ شعر الفرس: توکی ئەسپەکە کورتـەو تەنکـە ە (فرس أجـرد) ئەسپی تـوك کورت.
جَـرِدَ الرجـلُ: ئـەو پیـاوە بـەهۆی زۆر خـواردنی کوللـە پێسـتی لـیری لێ پەیدابوو.
جَرِدَ الثوبُ: کراسەکەی کۆن بوو.
جَرَدَ الشهرُ أو اليومُ: مانگ تەواو بـوو رۆژ کۆتایی هات ە (هو اجرد وجريد).
جُرِد: بەهۆی کوللە خواردنەوە سکی ژانی کرد.
جُرِد الزرعُ: کشتوکاڵەکە کوللەی پێوەبـوو (هو مجـرود) (أرض مجـرودة): زەوی‌و زاری کولاوی ە کوللەی زۆرە.
جَرَّدَهُ: روتی کردو توێکڵی لەسەر لابـرد ە دەگوترێ: (جرَّد فلان الثـوبَ ومـن الثوب): کراسەکەی لەبەر داکەند.
جَـرَّدَ الكتـابَ: ئامـاژەو نیشـانەکانی لەکتێبەکە کردەوە.
جَرَّد الجِلْدَ: پێستەکەی کەندو مووەکانی لێ کردنەوە.
جَرَّد السَّيْفَ مِنْ غمده: شمشێرەکەی لـە کالان دەرهێنا.
جَرَّدَ القَحْطُ الأرض: بـی بـارانی‌و قـات‌و قڕی زەوی روت رەقەن کرد.
إنجردَ من ثوبه: پۆشـاکی لەبـەردا نـەما روت‌و قوت بوو.
إنجـردَ الابـلُ مـن اوبارهـا: حوشـترەکە کوڵـکی پێوەنـەما هـەمووی لێ هەڵوەری.
إنجـردت السـنبلة: گوڵەگـەنم لەقـەف دەرچوو.
إنجرد الثوبُ: کراسەکەی کۆن بوو.
إنجـرد شـعر الفـرس: تـوکی ئەسـپەکە کورت بوو.
إنجرد في سيره: لە رۆیینەکەیدا پەلەی کرد.
إنجرد به السـير: رۆیيشتنەکەی درێـژەی کێشاو پەرەی پێدا.
انجـرد الفـرس: ئەسـپەکە لەحەلەبـە دەرچوو.

تجرد من ثوبِهِ وعنه: روت بوو پۆشاكی لەبەر نەما.

الأجردُ: (فرس أجرد) ئەسپی خۆشڕەو پێشڕەو ٥ (لبن أجرد) ماستەكە توێژی لەسەرنیە ٥ (قلب أجرد) دڵو دەرونی بێ غەلو غەش.

التجريد: روتكردنەوە ٥ لێ وەرگرتنەوەی دەسەڵات.

الجارود: ساڵی گرانیو قاتو قڕی.

الجارودية: تاقمێكی شیعە مەزهەبی زەیدیو توند رەون؛ خۆیان پاڵ (أبو الجارود زیادی كوڕی المنزری هەمەدانی) دەدەن.

الجرادُ: كوللە، (جرادة) بۆ تاكی نێرو مێیان بەكاردێ.

الجُرادةُ: توێكڵی لێ كراوە.

الجرداء: مێینەی (الأجرد) ٥ (صخرة جرداء) بەردی لوسو سواوە ٥ (ناقة جرداء) حوشتری زۆرخۆر.

الْجَرَدُ من الأرض: سارایەكی پانو پۆڕی بێ گیاوو گژ.

الْجَرْدُ: مەتاڵ ئەو شتەیە لەشەڕداخۆی پێ لەچەكی دوژمن دەپارێزرێ ٥ پاشماوەی ماڵو سامان.

الْجَرْدَةُ: بوردەی كۆن (عەباكۆن) ٥ پەڕوی رزیو.

الْجَرَدُ: چەتە، رێگرێك كە رێبواران روت بكاتەوە ٥ مزگەر؛ سپیكەرەوەی حاجەتی مس.

الجَرُودُ: حوشتری زۆر خۆر

الجريدة: لقی دارخورماكە توێكڵەكەی لێ بكرێتەوە ٥ باقی ماندەی ماڵو سامان، دەفتەرو تۆمارگەی خۆراكو بژێوی سوپا كە لە دیواندا هەڵدەگیرێ ٥ رۆژنامەیەكی رۆژانەیە هەواڵو روداوەكانی ناوەوەو دەروەی وڵاتی تێدا تۆماردەكرێ، (ك: جرائد)ە.

الْمَجَرَدَةُ: شوێنی لۆكە پاككردن.

الْمُجَرَّدُ: ئەوشتەی بەزەین هەستی پێدەكرێ نەك بەحەواسەكان.

جَرْدَبَ الطعام وعليه: خۆراكەكەی هەموو خوارد ٥ بەدەستی راستی خواردیو بەدەستی چەپی خەڵكی لێ دور خستەوە ٥ (هو جردبان) لەپەندی پێشینانداهاتووە (لا تجعل شمالك جردباناً) بەكەسێك دەگوترێ كە خۆپەرست بێو هەر بەرژەوەندی خۆی مەبەست بێ.

الْجَرْدَقُ: نانی ئەستور (خەپلە) ٥ كولێرە.

الجردلُ: سەتڵ، (ك: جرادل)ە.

جَرْدَمَ فلان: فلانكەس پەلەی كرد ٥ زۆری قسەكردن.

جرْدَمَ في الطعام: بەمانا (جردب) هاتووە.

جردم الستين: لەتەمەنی شەصت ساڵی تێپەڕی.

**جردم ما في الاناء**: هەرچی لە قاپەکەدا هەبوو خواردی.
**الجَـرْدَمُ**: کوللەیەکـە سـەری سـەوزو رەشە.
**جَـرَدَت القرحـةُ جَـرَداً**: برینەکـەی شـێوا هەوی کرد.
**جَرَدَ الفرسُ**: ئەسپەکە توشی نەخۆشی هاوسانی شارەگی پاشوی بوو.
**أجْرَدَهُ الی الشَّيْئِ**: ناچاری کرد پـەنا بـۆ ئەو شتە بەرێ.
**اجْـــرَدَ فلانــاً**: فلانکەســی دەرهێنـــاو ناچـاری کـرد پـەنا بـۆ شـوێنی تـر بەرێ.
**جَرَدَ الشجرةَ**: لق‌و پـۆپی درەختەکـەی کـرد ٥ هەڵپیاچـی ٥ دەگــوترێ: (جَـــرَدَهُ الدهرُ) زەمانە لە بۆتەی داوە.
**الأجْـرَدُ**: فـەیزەن، قاچـی خـوارو خـێچ پێششەوەیان تەسك‌و دوایان پان.
**الجَرَدُ**: هاوسان‌و ئەستور بوونی شادەماری پاشوی ئاژەڵ.
**الجُرَدُ**: جرج (مشکی گەورە)، (ك: جُرْذان).
**الجَرِدَةُ**: زەوییەك مشکی زۆربێ.
**جَرَتَ الماشية جراً**: ئاژەڵەکە بەرویشتنەوە لەوەری خوارد.
**جَرَت الحاملُ**: ئافرەتە دوو گیانەکە ماوەی سك پڕبوونەکەی درێژەی کێشا.
**جَرَّ الناقة**: سواری حوشـترەکە بـوو لـەکاتی لەوەڕانی دا.
**جَـرَّ الابـل**: هێـدی هێـدی حوشـترەکەی لێ خوڕی.
**جَـرُّ الفصـيل**: سـەری زمـانی بێچـووەکەی قەلاشـتەوە بـۆ ئـەوەی شیری دایکی نەخوا.
**جَــرَّ الخيـلُ الأرض بســنابكها**: ئەسـپەکە بەقاچـی کـاری لەزەوییەکـە کـرد ٥ سمکۆڵی کرد. .
**جَرَّ على نفسه جريدة**: تاوانی ئەنجامدا.
**أجَـرَّت البِئـرَ**: بیرەکـە ئاوەکـەی کـەمی کرد زۆر داچوو بۆ قولایی.
**أجَــرَّ البَعِــرَ**: رێشـمەی حوشــترەکەی خســتە ســەر ملــی حوشــترەکەو بــەرەڵلای کـرد ٥ (أجَـرَّ الفصــيل) بێچووەکەی راکێشا.
**أجَرَّ لسانَهُ**: قسەکردنی لێ قەدەغە کرد.
**أجرَّ فلاناً الـرمحَ**: رمبێکـی لەفلانکـەس دا رمبەکەی تێدا جێهێشت.
**أجرَّ فلاناً أغانِيـهُ**: گۆرانییـەکانی فێـری فلانکــەس کــرد، بــەدەنگێك بــۆی دەگــوت ئــەمجار بــەدەنگی تــرو شێوازی تر بۆی دەگوتەوە.
**أجــرَّ فلانـــاً الــدين**: قەرزەکــەی بــۆ فلانەکەس دوا خست.
**جـارَّه**: مـاتڵی کـرد، دەسـتی دەسـتی پـێ کرد.
**جرَّره (وبه)**: رایکێشا، کێشی کرد.
**انجرَّ**: راکێشرا.
**اجترَ الـبعيَ**: حوشـترەکە کاوێـژی کـرد (اجترَ الشَّيئَ) شتـەکەی راکێشا.

إسْتَجَرَّ الفصيلُ عن الرضاع: بێچووەکە قومێکی شیر مژیو راوەستا.
إسْتَجَرَّ لفلان: ژێرباری فلانکەس بوو.
استجرّ الشَّيْئَ: شتەکەی راکێشا
الأجـــرَّان: ئـــادەمیزادو جندوکـــه ٥ دەگوترێ: (جاء بجيش الأجرَّين).
الجارَّةُ: رێگای سەر ئاو ٥ رێباز بۆ سەر کانیو بیر.
الابـل الجارّة: حوشتری بارهەڵگر ٥ لە حەدیثدا هاتووە: (لا زكاة في الابـل الجـارة) حوشـتری بـار زەکـاتی لێ ناکەوێ ٥ دەگوترێ: (لا جـارّة لی في هـذا) هـیچ بەرژەوەندییـەکم لـەم نیشەدا نییە کێشم بکا بۆی.
الجارور: چەمێکە لافاو هەڵی درێ.
الجِرارة: میهنەی جەرە دروستکردن.
الجَرّ: (هلم جرًا) قسەیەکە دەگوترێ: بـۆ درێـژە پێـدانی شـتەکەو بـەردەوام بوونی دەڵێی ساڵی یەکەم ئەوە بوو ئـەوە رویدا هـەروا پێـدا بـڕۆ ٥ هـەروەها وشـەی (الجـرّ) نـاوە بـۆ حـەبلێك هـەوجارو مزانی پێ لێـك قایم دەکرێن ٥ (حەبلی جەرەبابە).
جَـرُّ: چـالاییەك لـەزەوی ٥ لـە زاراوەی نەحویانـــدا جـــۆرە ئیعرابێکـــه (بزوێنێکه).
الجـرّاء: خـاترو خـوێش ٥ دەگـوترێ: (فعلت هذا من جرّائك).
الْجَـــرَّارُ: ســـوپای زۆر ٥ جەنجـــەر دروســـتکەر وەســـتای جەنجـــەر ٥ ئوتوموبێلێکه شتی تر رادەکێشێ.
الجـــرّارة: دووپشـــکێکی زەردی کاییـــه پیسترین ژاری هەیە.
الجَرَّةُ: جەرەی ئـاو لـەگڵ دروست دەکرێ سـەری تەسـكو بنـی پـان ٥ تەڵەیـەك بۆ گرتنی ئاسكو دەعبای لەو شێوە ٥ ئاوێکـە حوشـتر لەسـکی خـۆی دەری دێنێو جارێکی تر قوتی دەداتەوە.
الجُرَّةُ: کۆمـەڵێك ئـادەمیزاد لـە شـوێنێك بـــار دەخـــەنو دوایـــی دەڕۆن. کیسەیەکە بـۆ ئـاژەڵی کاوێـژکار وەکو مەعیـدەی ئـادەمیزاد وەهایـە ٥ ئـەو خۆراکەیە کە حوشتر لەگەدەی خـۆی دەری دەهێنێتـــــەوەو کاوێـــــژی دەکاتەوەو ئـەمجار سـەر لـەنوێ قـوتی دەداتـــەوە ٥ لەپەنـــدی پێشـــینانـدا هاتووە دەڵێ (هو لايكظم علـی جرّتـه) واتە نهێنی خۆی ناپارێزێ.
الْجُـرَّةُ: دولـك: دارێکـه لای سـەرەوەی دوفاقێکی هەیە ئاسکی پێ دەگیرێ ٥ کڵـگیرێکی ئاسـنینه لای خـواروی کونکونـه، گـەنمو جـۆی تێـدەکرێو دەخرێتـه دوا ئـامێری زەوی کـێڵان بـۆ ئـەوەی وردە وردە دانەوێڵەکـه بکەوێتە ناو زەوییە کێڵدراوەکەوە.
الجرور من الدواب: ئـەو وڵاغو ئاژەڵەیـە چـەموشو سـەرکەش بـێ ٥ هـەروا نـــاوە بـــۆ بیرێـــك ئاوەکـــەی زۆر رۆچوبێ ئاوەکەی داکەوتبێ.

الجَرِيرُ: حەبلێکە شتی پێ ڕادەکێشرێ، (ك: اجِرَةٌ).

الْجَرِيـرَةُ: تـاوان و گونـاه ٥ لەپەنـدی پێشینانـدا هـاتووە (الجريـرة تشـترك العشـيرة) ئـەم پەنـدە بەمەبەسـتی هـەڵنان بـۆ ئەمجامـدانی هاریکـاریکردنی یـەکتری لێ دەدرێ ٥ بەمانا خاترو خۆیش هاتووە دەڵێ: (فعلت هذا من جريرتك) واتە: لەبەر خاتری تۆ ئەم کارەم ئەنجامدا.

المَجَرُّ: دیرەك ، دینگە.

الْمَجَرَّةُ: کۆمەڵە ئەستێرە.

جَـرَزَ جَـرْزاً: بـەخێرایی خواردنەکـەی خوارد.

جرز الشَّيْءَ: شتەکەی بڕییەوە، لەبێخی دەرهێنا.

جَـرَزَ الشـجرة وجَـرَزَ العَـدُوَّ: درەختەکـەی لەبێخ دەرهێنا دوژمنی دوابڕاو کرد.

جرز الجرادُ الأرض: کوللە بێتـان هـەموو شیناوەردی سەرزەوی خوارد

جرَزَهم الزَّمانُ: زەمانە لەبێخی دەرهێنان.

جرَزَ فلاناً بالشتم: جنێوی پێدا.

جـرَزَت الأرض: زەوییەکـە بـوو بەسوتەمەڕو شینایی پێوە نەما.

جَرُزَ جَرازَةً: زۆر خۆر بوو یـان بـەخێرایی نانی خوارد.

أجْـرَزت الأرض: زەوییەکـە بـوو بەسوتەمەڕۆ.

جَرَّزَ اللوم: ئەو قەومە کەوتنە وڵاتێکی ڕوت و بێ کشت وکاڵ.

جَرُزَتِ الناقة: حوشترەکە لاواز بوو.

تجارزا: ئـەو دوو کەسـە خراپـەکارییان لەگەڵ یەکتر کرد.

الجارز: ئافرەتی ئـەزۆك (سـعال جـارز) کۆکەی توند.

الجـارِزَةُ: (أرض جـارزة) زەوی وشـك و سوتەمەڕۆ ڕەقەن.

الجُـرْزُ مـن السـيوف: تیغـی بڕنـدە ٥ شمشێری تیـژ ٥ (الجـرز مـن الأبـل): حوشتری زۆر خۆر.

الجَرَزُ: ساڵی وشك و بێ باران.

الجِـرْزُ: پۆشـاکی ئـافرەت لـەخوری و مـوو پێستی مەڕ ٥ فەرو.

الجُـرُزُ: زەوی ڕوت و سـوتەمەڕۆ بـێ شیناوەرد ٥ لەقورئانـدا دەفـەرموێ: ﴿أَوَلَـمْ يَـرَوْا أَنَّـا نَسُـوقُ الْمَـاءَ إِلَـى الأرض الْجُرُزِ﴾ ٥ هـەروەها نـاوە بـۆ کۆڵەکەی ئاسن (شێلمانی ئاسن).

جَرَسَ الطائر جَرْساً: باڵندەکە دەنگی لێوە هات.

جَرَسَ الكَلامَ: گۆرانی گوت و قسەی کرد.

جَرَسـت البقـرة وَلَـدَهَا: مانگاکـە بێچووەکەی لستەوە.

جَرَسَ النحلُ نور الشجرة: هەنگەکـە گوڵی درەختەکـەی لسـتەوە بـۆ ئـەوەی هەلاڵی لێ وەرگری.

جَـرَسَ الثـورُ البقـرة: کەڵەگاکـە بـە شاخەکانی لە مانگاکەیەوە ژەنی.

جَرَّسَ الدهرُ فلاناً: زەمانە فلانكەسی لە بۆتەداوە.

ناقة مُجَرَّسَةٌ: حوشترێكی رام كراوە بۆ بارو بۆ سواری.

الجارِسُ: زۆر خۆر.

الجَرْسُ: دەنگ یان نزمتر لە دەنگ واتە: سرتە.

الجَرَسُ: جوڵەو دەنگ: ئامێرێكە لەمس یان شتێكی لەو جۆرە، كلۆربێ كە بیجوڵێنێ، پارچەیەكی بچوكی تێدایە لێی دەدات دەنگی لێ دێ.

الجُرْسَةُ: هەڕەشەكردن‌و بەسەر دانەڕاندن بەكەسێك كارێكی خراپی كردبێ.

جَرَشَهُ جَرْشاً: سپی كرد، توێكڵەكەی لێ كردەوە ٥ خوراندی ٥ دەگوترێ: (جَرَش راسه بالمشط): سەری بەشانە خوراند تا هەموو چڵك‌و كرێژەكەی ورۆژاند.

جَرَشَ الجِلدَ: پێستەكەی سووەوە بۆ ئەوەی لوس ببێ.

اجترش لعیالە: كاسبی بۆ ماڵ‌و منداڵەكەی كرد.

اجترش الشَّیءَ: شتەكەی دزی.

الجُراشَةُ: ئەو خشت‌و خوڵەیە لەكاتی خواردن دا هەڵدەوەرێ.

الجَرْشُ: دەنگێكە لە ئاكامی خواردنی شتی ڕەق‌و زبردا پەیدا دەبێ.

الجِرشیّ: دەرون، دڵ‌و دەروون.

الجریش: دانەوێڵەی كەرت‌و پەرت كراو، هاڕاو ٥ (رجل جریش): پیاوێكی ورە بەرزو كاراو لێ هاتووە.

جریشام: (قانون جریشام في الاقتصاد السیاسی) یاسایەكە ئەوە دەسەپێنێ: كە پارەی قەڵب پارەی باش لەبازاڕ وەدەر دەنێ.

جَرَضَهُ جرضاً: خنكاندی (جَرَضَ فلان بریقه جرضاً): قوتی دا.

جَرَضَ بریقه جَرَضاً: بە نارەحەتی‌و خەفەتەوە قوتی دا ٥ لە قوڕگی گیرا.

جَرَضَ علیك ریقه: بەرقەوە تفەكەی قوتدا.

جَرَضَ بنفسه: خەریكبوو خۆی بخنكێنێ ٥ (هو جریض)، (ك: جَرْضی).

أجْرَضَهُ بریقه: لەخەم‌و نارەحەتی دا تف لەقوڕگی گیرا.

الجُراضُ: حوشتری گەورە ٥ یان دەم خواربوونی كاتی مردن كە مردووەكە دەمی دادەچەقێ ٥ لەپەندی پێشینانەدا هاتووە: (حال الجریض دون القریض): لەكاتی ناخۆشی‌و تەنگانەدا نەك لەكاتی شایی‌و كەیفخۆشیدا.

جَرَعَ الماءَ جَرْعاً: ئاوەكەی قوت دا.

جَرِعَ الحَبْلُ جَرَعاً: لایەنێك لە هێزەكان زاڵ بوو بەسەر هێزەكانی تردا.

جَرِعَ الماء ونحوه جَرْعاً: ئاوەكەی خواردەوە ٥ (جَرَعَ الغَیْظَ): رقی خۆی خواردەوە.

أجْرَعَ الحَبْلَ والوتر: هەندێ لە هێزەکەی زیادکرد.
جَرْعَــــةُ المـــاءَ: ئـــاوی دەرخـــواردا ٥ دەگوترێ: (جرْعَةُ غُصَصَ الغيظ): جار لە دواجار رقو کینی خۆی خواردەوە.
اجْتَرَعَ الماءَ: ئاوەکەی قوت دا بەناچاری قومقوم خواردییەوە ٥ لە قورئانـدا دەفـەرموێ: ﴿يَتَجَرَّعُـــهُ وَلاَ يَكَـــادُ يُسِيغُهُ﴾ ٥ دەگـوترێ: (تجـرَّعَ غُصَـصَ الغَـيْظِ): رقـی خـۆی جـار لـەدواجار خواردەوە.
الأجْرَعُ: زەوی رەقەڵان و درکاوی؛ واتـە: چەوو گڵ تێکەڵاوبێ و سـەخت بێ و شیناوەردی تێدانەبێ، (ك: أجارع)٥.
الرجعـاء: زەوی رەقـەڵان و سـوتەمەرۆ، (ك: جَرْعاوات)٥.
الْجَرَعَةُ: بەمانا (الأجرع) دێ، (ك: جَرَعٌ).
الجُرْعَـــةَ مـــن المـــاء: قومـە ئاوێـك پـڕ بەدەم، (ك: جُرَعٌ).
جَرَف الإنسان جرفاً: ئـادەمیزاد خـواردنی زۆربوو.
جَـرَفَ الشَّـيءَ: هـەموو شـتـەکەی رادا یـان زوربەی راماڵی.
جَـــرَفَ الســـيلُ الـــوادي: لافـاو قـەراغی شیوەکەی خوارد.
جَرَف الدهرُ القـومَ: زەمانـە ئـەو قەومـەی بەهیلاك برد.
جَرَفَ الطين: خۆڵەکەی ماڵی
جَـرَف الـبَعِيرَ: بـە داخکـردن حوشـترەکەی نیشانە کرد.
أجْرَفَ المكانُ: ئەو شوێنە لافاوی بەهێز لێی داو شتەکانی راماڵی.
اجْـرَف الرجـل: پیاوەکـە حوشـترەکانی لەگیای زۆردا لەوەڕاند.
جَرّفه، أجترفَهُ: هەموویان بەمانا (جَرَفَهُ) دێ.
إنْجَـــرَفَ: هـــەموو شـــتەکان رادران ٥ (الجـاروف): ئامێرێکـە کەناسـەکانی شـارەوانی بـەکاری دێـنن بـۆ مـاڵینی جادەو کۆڵان.
الجُراف: ئەو شتەیە هەموو شـتێك راداو لـەناوی بـەرێ ٥ دەگـوترێ: (سـيل جَرّاف)، (موت جَرّاف).
رجُلٌ جراف: پیاوی زۆر خۆر.
الجَـرْفُ: مـاڵ و سـامانی زۆر لـە هـەموو جۆرێك ٥ پاوانی جەنگە لاوی.
الجُرْفُ: لاشیو کە لەخواریـەوە ئـاو هـەڵی کۆڵیبێ ٥ بن هەڵۆڵ بوبێ.
الجُـرُفُ: بـەمانا (الجُـرْف) دێ ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿عَلَـىَ شَـفَا جُـرُفٍ هَـارٍ فَانْهَـارَ بِـهِ فِـي نَـارِ جَهَـنَّمَ﴾، (ك: أجراف، جروف)٥.
الجَرْفَـــةُ: نیشـانەیەکە لـە جەسـتەی حوشترو ئاژەڵدا.
المِجْرَفَـةُ: ئـامێری داخکـردن ٥ (بنـان مجرف) دەستو پەنجەیەك خواردنی زۆر هەڵگرێ.
المِجْرَفَةُ: بەمانا (المِجْرَف) دێ.
جَرَمَ جَرْماً: تاوانی کرد ٥ دەگوترێ: (جَرَمَ

نَفْسَهُ وقَوْمَهُ، وجرم عليهم): تاوانی ئەنجامدا.

جَرَمَ فلان لأهله: کاسبی بۆ ماڵو منداڵی خۆی کرد.

جَرَمَ الرجلَ: پیاوەکەی هەڵنا بۆ..

جَرَمَ الشَّيْءَ: شتەکەی بڕیەوە.

جَـرَمَ النخلَ ونحوه جَرَماً وجراماً: خورماکەی چنی، میوەکەی چنی.

جَرَمَ النخلُ والتمر: کاتی چنینی خورماکە هات.

جَرَّم السنة: ساڵی تەواو کرد.

اجترم لاهله: کاسبی بۆ ماڵو منداڵی کرد (إجترم الشَّيْءَ) بەمانا (جَرَمه) دێ (اجْتَرَمَ الذنبَ) تاوانی کرد.

تَجَـرَّمَ: تـەواو بـوو، بەسەرچـوو دەگوترێ: (تجرَمت السنة) ساڵەکە تەواو بوو.

تَجَرَّم عليه: تاوانێکی پاڵدا کە نەی کردووە.

جَرَم: دەگوترێ: (لاجَرَمَ) هیچ شکی تێدا نیە، (لاجَرَمَ لآتِيَنَّ).

الجَرامُ: دەنکە میوە، ناوکی میوە، دەنکە خورمای وشك.

الجِرامُ: غرام، بەشێك لە هەزار بەشی کیلۆیەك.

الجُرامة: ئەو خورمایانەی لەکاتی لێکردنەوەی هێشوەکان دەکەونە خوار ٥ خورما وشکەڵو خورمای خراپ.

الجِرْم: جەستە، قەبارە، (ك: أجرام وجُرُومٌ وجُرُمٌ)٥.

جرم الصوت: بەرزی دەنگ.

الجُرْمُ: تاوان.

الجُرْمَةُ: خورمای نەگەییو کە لێ دەکرێتەوە ٥ ئەو کۆمەڵە خەڵکەی خورما دەچنن.

الجريم: خورمای چنراو، خورمای وشکەڵ ٥ ئەو شتەی دەنکە خورمای پێ دەگوترێ ٥ تاوانی گەورە.

الجريمة: بەشێوەی گشتی کارێکی ناشایستەی وەهایە کە سزای لەسەربێ ٥ بەمانا کاسبو تێکۆشەر هاتووە ٥ دەگوترێ: (فلان جريمة اهله) فلان کاسبکاری ماڵو منداڵی خۆیەتی.

جَرْمَزَ: وێك هاتەوەو بەسەریەکدا کەوتەوە ٥ ڕوی لێ وەرگێراو خۆی لێ گیل کرد ٥ دەگوترێ: (جَرمَزَ عن الجواب) لە وەڵامدانەوە هەڵاتو خۆی لێ گیل کرد.

إجْرَمَّزَ: بەمانا (جرمز) دێ ٥ دەگوترێ: (أجْرَمَّزَ العامُ) ساڵەکە وەها بوو باران کەوتە ناوەڕاستییەوە ٥ لە ئەوەڵەوە نەباری.

تَجَرْمَزَ: کۆبووە، (تجرمَز الليلُ) شەو رابورد (تجرمَزَ عليهم) بەسەریاندا کەوتە خوار.

الجراميز: دەستو قاچی ئادەمیزاد ٥ دەگوترێ: (جمع جَرَامِيزَةُ) خۆی کۆکردەوەو گوڕی گرتو ویستی باز

بدا ◦ له حەدیثی عومەردا هاتووە: (أنه كان يجمع جراميزه ويثب على الفرس) ◦ هەروا دەگوترێ: (أخذ الشيئ بجراميزه) شتەكەی هەموو وەرگرت.

**الجُرمُوزُ**: حەوزێكە لەناو حەوشە یان لەناو باخ‌و لەبەرزییەوەیە ئاوی لەبەر دەڕوا بەملاو بەولادا، (ك: جراميز)◦ ◦ بیری هەڵچنراو ◦ خانووی بچووك ◦ بێچوە گورگی نێر.

**الجرمقانی**: تاكی (الجرامقه)یە نەتەوەیەكی غەیرە عەرەبن لەسەرتای هاتنی ئیسلامدا دابەزیونە ناو موصڵەوە.

**الجرموق**: گۆرەوی ◦ (خوفف) كە لەسەر خوففی تر لەپێ كرابێ.

**جَرَنَ** جروناً: بەو كارە راهات‌و باری پێوە گرت ◦ دەگوترێ: (جَرَنَ الكتابُ): كتێبەكە كۆن بوو.

**جَرَنَ الحَبُّ**: دانەوێڵەكەی هاڕی.

**أجْرَنَ الحَبُّ أو التمرَ**: دانەوێڵەكە یان خورماكەی خستنە سەر خەرمان.

**جَرَّن السوط**: شوڕكەكەی نەرم كردەوە.

**اجْتَرَنَ**: خەرمانی دروست كرد ◦ شوێنەكەی كردە خەرمان.

**الجارِنُ**: رێگای كوێر بووە ◦ ئامێرو كاڵای بەكار هاتوو پەككەوتە.

**الجِرانُ**: دیوی ناوەوەی ملی حوشترو ئاژەڵی تر، (ك: أجرِنَةُ وجُرُن) هەروەها بەمانا دڵ‌و دەرون دێ دەگوترێ: (ألقى فلان على هذا الأمر جِرَانَهُ): دڵ‌و دەرونی خۆی بەوكارە راهێناو باری پێوەگرت هەروا دەگوترێ (ضرب الإسلام بجرانه): ئیسلام جێگیر بوو چەسپا ◦ لە حەدیثی عائیشەدا هاتووە: (حتى ضرب الحَقُّ بجرانه): هەتا حەق بە قورسایی خۆی خۆی چەسپاند.

**الجُرْنُ**: ئەو شوێنەی دانەوێڵەی تێدا گێرە دەكرێ واتە: خەرمان یان شوێنی وشك كردنەوەی میوە واتە: مشتاخ.

**الجَرِينُ**: خەرمان ◦ مشتاخ.

**جَرَه، جَرْهَدَ، اجرهَدَ**: بەپەلە رۆیی.

**الجَرهَدُ والجُرْهُدُ**: بەپەلە ڕۆییشتو.

**جَرَى** أجرى اجراءً:

**أجْرَتِ الشجرة**: میوەكەی خڕە كەبوو.

**اجْرَت الْكَلْبَةُ**: دێڵە سەگەكە بێچوی بوون، ترەكی.

**الجِرْوُ**: هەموو شتێك بەساوایی تەنانەت هەنارو هەنجیرو كاڵەكیش: وەلێ بەزۆری ناوە بۆ توتكە سەگ ◦ بێچووە شێر.

**الجِرْوة**: مێنەی (الجِرْو)یە ◦ حوشتری كورتە ◦ هەروا بەمانا رامبوون‌و خوپێوە گرتنە.

**جري** الفرسُ ونحوه جرياناً: ئەسپەكە لە رۆییشتندا رەوتی خۆی وەرگرت.

جرت السفينة والشمس والنجوم جرياً: رۆیشت.

جری الماءُ ونحوه جرياً وجرياناً: ئاوەکە هەڵڕژا، خێرا رۆیی، لوس رۆیی.

جری الوادی فَطَمَّ علی القری: پەندێکە لێ دەدرێ بۆ روداوێك کە زۆر سامناك بێ، شتێك لەسنور تێپەڕی بێ.

جری إلی کذا: بۆ لای فلانکەس، بۆ فلان شوێن، چوو.

جری لە الشئَ جرياً: ئەو شتەی بۆ بەردەوام بوو.

جری فلان مجری فلان: حاڵو وەزعی فلانکەس وەکوو حاڵی فلانکەسی لێ هات.

أجْرَی الماءَ: ئاوەکەی بەردایەوە رۆیاندی.

أجْری السُّفینةَ: کەشتییەکەی رۆیاند.

أجری فلاناً في حاجته: فلانکەس ناردی بۆ ئیشی خۆی ٥ وتو وێژی لەگەڵ کرد.

تجاروا في الحديث: وتو وێژیانکرد، چەلەحانێیان کرد.

تجاروا في أهوائهم: لەگەڵ هەواو ئارەزوی خۆیاندا یەکانگیر بوون.

استجراه: داوای رۆیینی لێ کرد.

الإجْرِيا: شێوەو سروشت ٥ دەگوترێ: (الكرم من جِرِيَاه): دەستو دڵ فراوانی لە سروشتو رەوێتی دایە، بەشێکە لە رەوشتو پێکهاتەی.

الجَرِيُ: رۆیشتن ٥ دەگوترێ: (فرسٌ ذو أجاريّ): ئەسپێکە جۆرەها شێوە رۆییشتنی هەیە.

الاجرِيَاءُ: بەمانا (الإجريَا) دێ.

الاجْرِيَّةُ: رەوەشتو سروشت.

الجاري: بەهای وەخت، نرخی رۆژانە ٥ (الحساب الجاري) رێکەوتن نامەیەکە لەنێوان دوو لایەندا بۆ سنوردانان لەنێوان مافو ئەرکی هەر دولایەن داو دیاریکردنی تەصفییەی حیساب لە کۆتاییدا.

الجارية: کەنیزەك، چەتیو، ئافرەتی کۆیله با پیرێژنیش بێ ٥ با ٥ خۆر ٥ کەشتی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَحَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ﴾.

الجری: بای صەبا.

الجِرّاءُ: خاترو خوایش؛ دەگوترێ: (من جرائِكَ فعلت کذا) لەبەر خاتری تۆ فلانکارم ئەنجامدا.

الجَرايَةُ: منداڵی، تەمەنی پچوك، دەگوترێ: (جاريةٌ بَيِّنةُ الجرَايةِ): کەنیزەکێکە دیارە منداڵە ٥ بەمانا (وەکالەت)یش دێ.

الجِرايَةُ: وەکالەت، بریکاری ٥ حیسابی بەردەمی موچەی موچەخۆران، (ك: جرايات).

الجرايات: لەزانستی (اقتصادا) یاساو رێسایەکە ئەندازەی کاڵای سەرف بوو دیاری دەکا بۆ هەموو کەسێك ٥ (بطاقات الجرايات) لەزانستی (اقتصاد)دا چەند کارتێکن ئەوە دیاری دەکا کە هەرکەسە چەند کاڵا بکڕێ.

**الجِرْياءُ**: ڕەوشتو سروشت.

**الجَـرِيّ**: وەکیل ٥ بـۆ تـاكو كـۆو نێـرو مـێ بەكاردێ ٥ هەروا بـەمانا (نێـردراو) دێ ٥ بەمانا (کرێکار)یش دێ، (ك: أجْرِياء).

**المجرى من النهر**: دەراوی چەمو روبـار ٥ لەشـیعردا بریتییـە لـە بزوێنـی پیتـی (ڕەویـی ڕەهـا) ٥ لـە زاراوەی نەحوییانـدا بریتییـە لـەحاڵاتو چۆنیەتی کۆتـایی وشـەو ئـەحکامی ئەو حاڵاتو چونیەتیانە.

**الجِرْيالُ**: ڕەنگو بۆیەی سور.

**جَـزَأت الابـلُ جَـزْءاً وجـزوءاً**: حوشـترەکە لەجیاتی ئـاو بەشـێو تـەڕی قنیـاتی کرد.

**جَزَأ بالشيء**: بەو شتە قنیاتی کرد.

**جَـزَّأ الشَّـيْءَ**: ئـەو شـتەی دابەشـکردو یەکسان پارچەپارچەی کرد.

**أجْـزأ القـومُ**: خەڵـکەکە حوشـترەکانیان دابەشکرد.

**أجــزأت المــرأةُ**: ئافرەتەکــە منــداڵی مێینەی بوون.

**أجْـزَأ الشَّـيْءُ فلانـاً**: شـتەکەی بەشـی فلانکەسی کرد.

**أجْزٌ مَجْزِيٌّ**: کرێیەکی گونجاوە کیفایەتە.

**أجْزأ الابلَ**: لەجیاتی ئـاو شـتی شـێدارو تەڕی دابە حوشترەکانی.

**أجْزَأ السكينَ**: دەسکی بۆ کێردەکە دروستکرد.

**أجْزَأ من الشَّيْءَ جزءاً**: بەشێکی لەو شتە بۆ خۆی برد.

**أجزأ الخاتم في أصْبُعِهِ**: ئەڵقەی لەپەنجەی خۆی کرد.

**جَزَّأه**: بەشبەشی کرد.

**جَزَّأ الابلَ**: بەمانا (أجْزَأ الأبلَ) هاتووە.

**جَزَّأ الشَّعرَ**: بەمانا (أجْزَأه) دێ.

**جزَّأ السكينَ**: بەمانا (أجْزَأه) دێ.

**إجْتَزَأ به**: کیفایەتی بوو.

**الجازئـةُ مـن النَّخـلِ**: ئـەو درەختـە خورمایەیە ئاودانی پێویست نەبێ

**الجُـزءُ**: بەشـێك لەشـت ٥ ئـەو مادەیەیـە شـتەکەی لێ پێـك دێ ٥ (جـــوزئی لایتجـــزّی): بـــەلای زانایـــانی موتەکەلیمینـــەوە ئـــەو کەرتەیـــە ئەوەنـــدە بچـوك بوتـــەوە قبـووڵی کەرت کردن نەکا.

**الجُـزْأة**: بنکـی کلـك ٥ دەسـکی کێـرد ٥ دارێکە تولەمێوی لـەزەوی پـێ بلنـد دەکرێتەوە.

**الجُزْئـي**: شـتێك نیسـبەت بـدرێ بـۆلای جوزء ٥ جوزئی راستەقینە ئەوەیـە تەصـەور نـەکرێ هاوبەشـی هـەبێ ٥ وەکوو عەلی، حەسەن.

**جـــوزئی لیضـــافی**: ئەوەیـــە لـــەخۆی ڕەهـاتر هـەبێ وەکـوو ئـادەمیزاد کەبەشـێکە لـە مـەفهوومی حـەیوان وەلێ بۆ خۆشی ئەفرادی هەن.

**جَزَحــت الظبــاء جَزْحــاً**: ئاســکەکان چوونەوە ناو لانەی خۆیان.

**جَــزَحَ فــلان**: فلانکـەس بـەپیر ئیشـی خۆیەوە چو چاوەڕوانی نەکرد.

جَزَخَ لـه: بەخششی باشی پێدا ٥ بەبێ پرس کردن بەکەس بەخششی دایە.

جَزَخَ الشجرةَ: درەختەکەی راوەشاند بۆ ئەوەی گەڵاکەی بوەرێ.

جَزَرَ الماءُ عن الأرض جَزْراً: ئاوەکە رۆچوو، حەوقی خواردەوە ٥ دەگوترێ: (جَزَرَ البَحْرُ والنهرُ): ئاوەکەی حەوق بوو.

جَزَر الشَّيْءَ: شتەکەی بڕیەوە.

جَزَر الجَزورَ: کوشتییەکەی سەربڕی (هو جازر، جزار، جزير) دەگوترێ: (جَزَر العَسَلَ) هەنگوینەکەی بڕی.

جَزَر النَّخْلَ جزراً وجِزَاراً: خورماکەی بڕییەوە.

أجْزَر البعيرُ: حوشترکە کاتی ئەوەی هات ببڕدێتەوە واتە کوڵکەکەی ببڕدرێتەوە.

أجْزَرَ النخلُ: خورماکە کاتی لێ کردنەوەی هات ٥ دەگوترێ: (أجْـزَر الشَّيْخُ): پیرەمێردەکە زۆر بەساڵاچوو کاتی مردنی هاتووە.

أجْزَرَ فلاناً: مەڕێکی دا بەفلانکەس بۆ سەربڕین ٥ لە حەدیسدا هاتووە: (بَعَثَ بعثاً فمروا باعرابي له غنم فقالوا اجزرنا).

اجتَزَرَ الجزورَ: کوشتی یەکەی سەربڕی.

اجتَزَرَ القومَ جزوراً: کوشتی بۆ خەڵکەکە سەربڕی

إنجَزَرَ البَحرُ والنهرُ: شەپۆلەکەیان کشانەوە.

الجِزَارَةُ: میهنەی قەسابی، کاری حەیوان سەربڕین.

الجُزارة: سەروپێی حوشتری سەربڕاو کە دەدرێ بە کابرای قەساب لە جیاتی حوشتر سەربڕینەکە ٥ لە حەدیثی پێغەمبەردا هاتووە دەربارەی قوربانی دەفەرموێ: (لا أعطي منها شيئاً في جُزراتها) هەروا دەگوترێ (فرس ضَخْمُ الجُزارة) ئەسپێکی دەست و پەل قەوییە دەمار دەماراوییە).

الجَزْرُ: ئاژەڵ سەربڕین ٥ کشانەوەی شەپۆلی ئاوی دەریا بەهۆی کاریگەری فەراخەکانییەوە.

جزُر السباع: ئەو گۆشتەیە کە درەندەکە دەیخوا ٥ یان ئەو گۆشتەی لەبەری دەمێنێتەوە ٥ ئەو زەوی و شوێنانەیە کە نزیک دەریان و درندەی تێدا دەژی و شەپۆلی دەریاکە نایانگاتێ.

الجزور: ئەو حوشترەیە بەکەڵکی سەربڕین بێ.

الجزيرة: ئەو پارچە زەوییەیە ئاو دەورەی بداو ئاوەکە دای نەپۆشێ، (ك: جزائر، جُزُر)٥.

المَجْزَر: شوێنی ئاژەڵ سەربڕین، (ك: مجازر).

المَجْزَرَةُ: بەمانا (المَجْزَر) دێ، (ك: مَجازِر)٥.

جَزَّ النحلُ ونحوه جزّاً: دارخورماکە کاتی ئەوەی هاتووە میوەکەی لێ بکرێتەوە.

جَزَّ النَّخْلَةَ جَزّاً وجزاراً: خورماکەی لێ کردەوە.

جَزّ الصُّوفَ جَزّاً: خورییەکەی بڕییەوە.
أجَزَّ التمرُ جزوزاً: خورماکە وشك بوو.
أجَزَّ النخلُ ونحوه: بەمانا (جَزّ) دێ.
أجَزَّ القومُ: کاتی بڕینەوەی مەڕەکانیان هات.
أجَزَّ التَّمْرُ: خورماکە وشك بوو.
إجتَزَّ الصوفَ ونحوه: بەمانا (جَزّه) دێ.
إسْتَجَزَّ التمرُ والصوفُ: خورماکە، خورییەکە: کاتی بڕینەوەو لێکردنەوەیان هات.
الجِزَازُ: کاتی دروێنەو بڕینەوەی خوریو لێکردنەوەی میوە.
الجُزَازُ من کل شيئ: ئەو شتەیە لێکراوەتەوە ٥ ئەوەی زیادەیەو لەکاتی بڕینەوەدا هەڵدەوەرێ.
الجُزَازَةُ: بەمانا (الْجُزاز) دێ.
الجَزَزُ: خوری بڕدراوەو لێکراوە.
الجِزَّةُ: بەرگن: بەرگی کاوڕ لەساڵێکدا ٥ لەپەنددا هاتووە (رب جِزّة على شاة سوء).
الْجَــزُزُ: ئەو خوریو موو کوڵکو بەرگنەیە لە ئاژەڵ دەکرێتەوە.
الجَزُوزَةُ من الغنم: ئەو ئاژەڵەیە خورییەکەی لێ کرابێتەوە، (ك: جزائز).
الْمِجَزُّ: مقەست، بڕینگ ئامێری ئاژەڵ بڕینەوە، (ك: مَجَاز)٥.
جَزَعَ الحَبْلَ: گوریسەکەی لە ناوەڕاستەوە دوکەرت کرد.
جَـزَعَ الـوادي: دۆڵەکەی بڕی لەباری پانیەوە.
جَـزَعَ لـه مـن مالـه جُزْعـةً: لەماڵی خۆی بەشێکی بۆ بردا.
جَـزِعَ جَزَعـاً وجُزُوعـاً: خـۆی بـۆ بەڵاکە نـەگرتو هـاوارو دادو فیغـانی کـرد بەصەبرو خۆگر نەبوو.
أجْزَعَهُ: هەڵێنا بۆ گریانو هاوارکردنو صەبر نەگرتن.
جَزَّعَ البُسْرَ والرُّطَبَ: خورماکە ئاڵو بۆڵی تێکەوت ٥ هەندێکی گەیی.
جَزَّعَ الحَوْضُ: حەوزەکە چۆرێکی ئاو تێدا ماوە.
جَزَّعَ النّوى: دەنکەکانی پێك کێشان هەتا شوێنی لێکدانەکەیان سپی بوو دەنکەکان خاڵخاڵ بوونو وازی لێ هێنان.
جَزَّعَ فلاناً: غەمو ناڕەحەتی لەسەر دڵ لابرد.
اجتزعَهُ: پارچە پارچەی کرد.
انْجَزَعَ: لەناوەڕاستەوە کەرتی کرد دەگوترێ: (انجزع الحَبْلُ وانجزعت العصا).
تَجزَعَ الشَّيْئُ: شتەکە کەرت بوو.
تَجزَّعَ البسُر والرطب وغيرهما: خورماکە ئاڵو بۆڵی تێکەوت هەندێکی گەیی.
تَجَـزَّعَ السـيف والسـهم ونحوهمـا: شمشێرەکە شکا.
تَجزَّعَ القومُ الشَّيْئَ: خەڵکەکە ئەو شتەیان بەشبەش کرد ٥ لە حەدیث دا هاتووە: (فتفرق الناسُ إلى غُنَيْمةٍ فَتجزّعوها).

الجازع: نیرگه.
الجُزَاع: گیاییه‌كه ئاژه‌ڵ ده‌كوژێ.
الجَزْعُ: جۆرێكه له عه‌قیق ۵ هێڵی به‌رامبه‌رو
كه‌وانه‌یی ره‌نگاو ره‌نگی تێدان ۵
قولایی شیو ۵ ناوه‌ڕاستی شیو.
الجِزْعة والجُزَعَةُ: به‌شێك له‌شه‌و ۵ قه‌ده
دار (بنكی دره‌خت).
المجَزّع من اللَّحْمِ: ئه‌وه‌یه ره‌ش‌و سپی
تێكه‌ڵاو بێ.
المُجَزّع من اللحم: ئه‌وه‌یه به‌زو گۆشت
تێكه‌ڵاو بێ ۵ ئه‌گه‌ر وه‌ته‌ری عود
بێ، ئه‌وه‌یه هه‌ندێ له‌وه‌ته‌ره‌كان
باریك‌و هه‌ندێكیان ئه‌ستوربن.
جَزَف له في الكيل ونحوه جَزْفاً: زۆری بۆ
پێوا.
جازف: شته‌كه‌ی فرۆشت نازانێ
پێوانه‌و كێشانی چۆنه.
جازف بنفسه: خۆی خسته خه‌ته‌ره‌وه.
جازف في كلامه: به‌بێ تێفكرین قسه‌ی
كرد.
إجْتَزفَ الشَّيْئَ: به‌گۆتره‌كاری شته‌كه‌ی
كڕی.
الجُزاف: كاڵایه‌كه نه بزانرێ به پێوان
چه‌نده نه‌به ئه‌ژماره.
الجُزافَةُ: به‌مانا (الجُزاف) دێ.
الجِزْفَةُ: پارچه‌یه‌ك له‌شت ۵ ده‌گوترێ:
(جِزْفَةٌ من النعم وجزءفة من الشَّعْرِ):
جه‌ڵه‌به ئاژه‌ڵێك ۵ پارچه‌یه‌ك له مو.
جَزَلَهُ جزلاً: بڕییه‌وه ۵ له حه‌دیثه‌كه‌ی
خالیدی كوڕی وه‌لیددا هاتووه ده‌ڵێ:
خالید كه چو بۆ شكاندنی بتی (العزى)
۵ (فَجَزَلَها بالنين) كردی به دوو پارچه.
جَزِلَ البعيرَ: جده‌وی حوشتره‌كه برینی لێ
په‌یدا بووه چاك نابێته‌وه.
جَزِلَ الرأيُ: راو بۆچونه‌كه پوچ‌و بێ
كه‌ڵك بوو.
جَزُلَ جَزالة: گه‌وره‌و به‌نرخ بوو.
جَزُلَ اللفظ: وشه‌كه كاریگه‌ربوو.
جَزُلَ فلان: فلانكه‌س بوو به‌خاوه‌ن ره‌ئی
په‌سندو جوان.
أجْزَلَهُ: به‌مانا (جَزَلَهُ) دێ.
أجْزَلَ له العطاء: به‌خششی چاك‌و باشی
بۆ دیاری كرد.
استجزلَهُ: داوای به‌خششی لێكرد.
الجَزالُ: لێكردنه‌وه‌ی هێشووی خورما.
الجَزْلُ: شتی به‌نرخ‌و زۆر له هه‌رشتێك
بێ ۵ داری گه‌وره‌ی وشك ۵
له‌حه‌دیثدا هاتووه: (اجمعوا له
حَطَباً جزلاً) ۵ هه‌روه‌ها به‌مانا
سه‌خت‌و به‌خشنده هاتووه.
الجِزَلُ من الكلام: قسه‌ی ره‌وان‌و فه‌صیح‌و
پڕ مانا، (ك: جِزالَ).
الجَزْلَةُ: پارچه‌یه‌ك ۵ دۆدان، مه‌شكه.
الجِزْلَةُ: پارچه، (ك: جِزَلَ) له حه‌دیثدا
هاتووه له‌باره‌ی ده‌جاله‌وه ده‌ڵێ:
﴿يضرب رجلاً بالسيف فيقطعه جزلتين﴾.
جَزَمَ جزماً: خواردنێكی خوارد تێر بوو، له
شه‌وو رۆژێكدا یه‌كجار نانی خوارد.
جَزَمَ عليه: لێی بێده‌نگ بوو ۵ سوور بوو

لەسەر ئەنجامدانی ٥ ترسا ٥ نەیتوانی ئیشەکە ئەنجام بدا.

**جَزَمَ الامْرَ:** بتمانەی تێدا پەیدا کرد.

**جزم الیمینَ:** سوێندی خواردو کارەکەی رۆیاندو گەڕانەوەی تێدا نیە.

**جَزَم علیه بکذا:** لەسەر خۆی چەسپاند، بەرعودەی بوو.

**جزم النخلَ:** خورماکەی مەزندە کرد، هەر بەسەرنجدانی، ئەندازەکەی دیاریی کرد.

**جزم الکلمةَ:** کۆتایی فیعلەکەی زەنەدارکرد، پیتی لێ قرتاند.

**جزم علیه وعنه:** بەمانا (جَزَم) دێ.

**إجْتَزَمَ النَّخْلَ:** بەروبوومی باخە خورماکەی کڕی.

**إجْتَزَمَ الشَّیْئَ:** شتەکەی بڕییەوە.

**إجْتَزَمَ جِزْمَةً مِنَ المالِ:** هەندێکی لەماڵەکە هەڵگرت.

**الجَزْمُ:** لەزاراوەی نەحوییاندا بریتییە لە زەنەدارکردنی پیتی کۆتایی فیعلی موضارع یان کرتاندنی پیتی کۆتایی.

**الجِزْمُ:** بەشێك لە خورما یان شتی تر.

**الجَزْمة:** ژەمە خواردن.

**الجَزَمة:** پارچە ٥ (الجَزَمَةُ من الحیوان) جەڵە بە ئاژەڵ لە (دە) بەرەو ژوور.

**الجَزْمِیة:** ڕێبازێکی فەلسەفییە پشت بە هێزی عەقڵ دەبەستێ بۆ گەیشتن بە مەبەست.

**جَزَی الشَّیْئَ جَزَاءً:** شتەکەی بەس بوو پێویستی بەهیچی تر نەبوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْماً لاَّ تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئاً﴾ ٥ دەگوترێ: (جزی مجزی فلان): لەشوێنی فلانکەس جێگیر بوو.

**جازاه:** پاداشتی دایەوە ٥ سزای دا.

**تَجازی الدَّیْنَ:** قەرزەکەی دایەوە، یان قەرزەکەی وەرگرتەوە.

**الجازیة:** پاداش ٥ سزا.

**الجَزاءُ:** بەمانا (الجازی) دێ ٥ لە پەندی پێشینانداا هاتووە ٥ دەڵێ: (جزاء سنمار) ئەم پەندە بۆ کەسێك دەگوترێ: لەجیاتی خراپەکاری چاکەی بەرامبەر بکا.

**الجِزْیَةُ:** سەرانە؛ بڕە پارەیەکە فەرمانڕەوای ئیسلامی وەری دەگرێ لە هەندێ لەوانەی موسوڵمان نابن لەجیاتی ئەو خزمەتگوزارییەی پێشکەشیان دەکرێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾، (ك: جِزْيٌ وجزی وجزاء).

**جَسَأ جَسْأً وجسوءاً وجُسْأةً:** وشك بووە ٥ ڕەق بوو، زبر بوو، دەگوترێ: (جَسَأ النَّبتُ، جَسَأتْ یده من العمل، جسأ الماءُ).

**جَسَأ الشیخُ:** پیاوە پیرەکە گەیشتە کۆتایی تەمەنی، (هو جاسي).

**الجاسي في الرِّیاضة:** (جسم جاسيٌ): جەستەیەکە مەسافە گۆڕانکاری نەخاتە نێوان پارچە جیاوازییەکانییەوە.

الجاسياء: رەقبوون‌و پتەوی.
جَسَدَهُ جَسْداً: لە جەستەی دا.
جَسِدَ الدم: خوێنەکە وشك بوو.
أجْسَدَ الثَّوبَ ونحوه: بەرەنگی زەعفەران کراسەکەی بۆیەکرد ٥ لە حەدیشی ئەبو ذەڕدا هاتووە دەڵێ: (أن أمر أته ليسَ عليها أثر الجاسد).
جَسَّدَ الثَّوبَ: بەمانا (أجَسَدَهُ) هاتووە.
تجسَّدَ: بۆ موطاوعەی (جَسَّدَ) هاتووە.
الجِساُدُ: خوێنی پیس ٥ زەعفەران ٥ هەرشتێك رەنگی زۆر سور یان زەرد بێ.
الجُسادُ: ئازارێکە لە جەستەدا هەمووی، یان هەر لەسکدا.
الجَسَـدُ: جەستە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا﴾: لەخوار.
المِجْسَدُ: پۆشاکێك زۆر بەجەستەوە بنووسێ.
المُجَسَّدُ: دەنگێکە لەسەر شێوەی ئاوازو گۆرانی قەبارەی خۆی وەردەگرێ.
جَسَرَ جُسُوراً وجَسَارَةً: ئازابوو، ئازایە ٥ چاونەترس، بێ پەروا ئەرکی سەرشانی ئەنجام دا.
جَسَرَ القومُ: ئەو قەومە پردیان رابەست.
جَسَرَ فلان على الشَّيْءَ: فلانکەس پرکێشی ئەو شتەی کرد.
جَسَرَ الركابُ المَفازَةَ: کاروانچییەکان ساراکەیان بری.
اجتَسَرَت الركابُ المفازةَ: بەمانا (جسرتها) دێ ٥ دەگوترێ: (اجتَسَرَت السفينة البحر): کەشتییەکە دەریاکەی بری.
تجاسَرَ: بێ پەرواکارەکەی ئەنجامدا ٥ ملی خۆی بەرزکردەوەو خۆی هەڵبڕی بۆ ئەوەی چاوی لەشتەکە بێ.
تجاسَرَ عليه: خۆی بەسەردا رانواندو لوتشکێنی کرد ٥ پەلاماری دا
تجاسَرَ له العصا: بەگۆچان بۆی چوو.
الجِسْرُ: پرد، هەرشتێك بەسەریدا بپەڕیتەوە ٥ کەناری جۆگا ٥ هەرشتێك بکەوێتە نێوان دوو زەوییەوە، (ك: أجسر وجسور)ە.
الجَسْرُ: ئەندامی گەورەی جەستە.
الجَسْرَةُ: بۆ مێینەی (الْجَسْر) بەکاردێ ٥ کە نیزەکی دەست‌و پەل قەوی‌و گۆشتن.
جَسَّ الأرض جَساً: پێی لەزەوی نا.
جَسَّ الخَبَرَ: لەهەواڵەکەی کۆڵیەوەو تاووتوێی کرد.
جَسَّ الشَّيْءَ بيده: دەستی لە شتەکەدا بزانی چیەو چۆنە.
جَسَّ الشَّخصَ بعينه: زۆر بەوردی سەیری ئەو کابرایەی کرد بۆ ئەوەی بزانێ کێیەو خەریکی چییە.
اجْتَسَّهُ بيده: بەمانا (جَسَّهُ)دێ.
جَسَّ الابلُ الكلأَ: حوشترەکە دەمی بۆ لەوەڕەکە برد منەی کرد.
تَجَسَّسَ الخَبَرَ: بەمانا (جَسَّهُ) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب﴾.

**اَلْجَاسَّةُ:** هەستێکە لە پێنج هەستەکان.

**الجاسُوسُ:** کەسێکە بەدوا هەواڵو رووداودا بگەڕێ بۆ ئەوەی زانیاری بدا بەکەسانی دی، (ك: جواسیسٌ).

**الجَسَّاسُ:** صیغە موبالەغەیە ٥ شێر چونکە بەچنگی کوشتی یەکەی شەتاڵ شەتاڵ دەکا.

**الجَسِیسُ:** بەمانا جاسوس.

**اَلْمَجَسُّ:** شوێنی دەست لێدان ٥ دەگوترێ: (فلان ضیق المَجَسِّ): فلانکەس تەنگە تیزمیە.

**المِجَسُّ:** ئالەتی پشکنین.

**المجسَّة:** بەمانا (المَجَسّ) دێ ٥ هەروا بەمانا (المِجَسّ)٥.

**جَسُمَ جَسَامة:** گەورەو زەبەلاح بوو (جسیم) زلو کەتە.

**جَسَّمَ الشَّيْءَ:** قەبارەی پێدا.

**تَجَسَّمَ:** بۆ موطاوعەی (جَسَّمَ)دێ.

**تَجَسَّمَ الشَّيْءَ فِي العين:** ئەو شتە لەبەر چاوەو وێنەی لەچاودا هەیە.

**تَجسَّمَ الشَّيْءَ:** شتەکەی قەبارە دارکرد ٥ روی تێکردو بۆی چوو هەڵی بژارد.

**الجُسَامُ:** جەستە گەورە دەستو پەل قەوی ٥ (الجُسامة) بەهەمان مانا هاتووە بەڵکوو زوربەی کات بەم شێوە دەگوترێ کە (ت) پێوەیە.

**الجِسْمُ:** جەستە؛ هەرشتێك پانیو قوڵیو درێژی هەبێ ٥ هەرشتێك لە ئادەمیزادو ئاژەڵو رووەك هەستی پێ بکرێ ٥ هەر جەوهەرێکی مادی شوێنێ بگریو قورسایی‌و درێژی هەبێ.

**الجِسمان:** بەمانا (الجسم) دێ ٥ (الجسماني) پاڵدراو بۆ لای جیسم.

**الجُسْمُ:** کاری گەورە روداوی سەرنج راکێش ٥ پیاوی عاقڵ

**اَلْمُجَسَّمُ:** شتێك پانیو درێژی‌و ئەستووری هەبێ.

**الجُسَّانُ:** دەف لێدەرەکان تاکەکەی (جَاسِن)٥.

**الجُسْنَةُ:** ماسی خرو کاڵەکی.

**جَسَا جَسْواً وجُسُواً:** وشك بوو، رەق بوو، ئەستور بوو، زبر بوو ٥ ئاوەکە بوو بەسەهۆڵ ٥ پیرەمێردەکە زۆر بەساڵا چوو گەیشتە کۆتایی تەمەنی.

**جَسِيَ جسِیاً:** بەمانا (جَسَا) دێ.

**جَشَأَت نَفْسُه جشْأً وَجَشْئاً:** یەقی هێناوە یەقی هاتەوە ٥ لەترسا یان لەغەمو نارەحەتیدا هەڵچوو ٥ یان راپەرینو کەوتنە جمو جوڵو هاتوچو ٥ دەگوترێ: (جَشَأَت البِلادُ باهلها، جَشَأَت البِحارُ بأمواجها، والریاض بریاها واللیالي بظلماتها) دەری هاویشت، پاڵی پێوە نان، بڵاوی کردەوە.

**جَشَأَت المعدة:** مەعیدەی لەتێریدا یەقی هاتەوە.

**جَشَأَت الغَنَمُ:** ئاژەڵەکە قۆڕە قۆڕی لە قورگی هات.

**جَشَأَت الأرض:** زەوی هەموو روەکی خۆی دەرخست.

جَشَأ البحر: دەریا ئاوەکەی بەرزبووە.
جَشَأ اللَّيْلُ: شەو تاریك بوو.
جشا الوَحْشُ: درندە کێوییەکە راپەڕیو بازی دا.
جشا العدو: دوژمن راپەڕی بۆمان هات.
جشا القوم: ئەو قەومە لەولاتێکەوە گواستیانەوە بۆ ولاتێکی تر.
جَشا على نفسه: لەخۆیا دلتەنگ بوو.
جشا عن الطعام: تێری لەخواردەمەنییەکە خواردو پێش چاوی کەوت.
جَشَا علينا النِعَمُ: نازو نیعمەتمان بۆ پەیدا بوو.
جَشَأت المعدةُ: بەمانا (جَشَات) دێ.
إجشَأته البلادُ: ئاوو هەوای ئەو ولاتەی پی نەکەوت.
تَجَشّأت المعدةُ: بەمانا (جشات) دێ ٥ دەگوترێ: (تَجَشّأ الرجلُ): پیاوەکە پەقی هێنایەوە ٥ لەپەندی پێشینانداندا هاتووە دەلێ:
تَجَشّأ لقمانُ من غير شبع: لوقمان بەبی ئەوەی تێربێ پەقی هێنایەوە ئەم پەندە بۆ کەسێك لێ دەدرێ لافی رەوشتێك لێ بداو تێیدا نەبێ.
تَجَشّأ الفجرُ: لەکاتی بەرەبەیاندا با هەلی کرد.
الْجَشّئُ: زۆر ٥ کەوانەیەکی سوك کەزۆر بلەرێتەوە.
الْجُشَاءُ: دەنگێکە لەدەم دێتە دەرەوە لەکاتی تێر خواردندا، بەکورتی پەقدانەوە، قرقێنە.
الْجُشَاءُ من البحر والليل وغيرها: پال پێوەنان، راکشان.
الْجُشْأةُ: بەمانا (الجُشاءُ) دێ ٥ هەلکردنی با لەبەرەبەیاندا.
الْجُشَأةُ وَالْجُشْأةُ: کەسێك زۆر غەمو خەفەت بخواو ئاخو ئۆف بکا.
جَشُبَ جَشْباً: ئەستور بوو، زبر بوو.
جَشُبَ الطعامُ: خواردنەکە بێ پێخۆر بوو.
جَشُبَ الحَبُّ: دانەوێلەکەی هاڕی کردی بە بروێش.
جَشُبَ شبابَهُ: کەنجییەتی خۆی بەڕی کرد.
جَشِبَ الشَّئُ والطعامُ ونحوه: بەمانا (جَشُبَ) دێ.
جَشِبَ الرَّجُلُ: خواردنو خۆراکی زبرو کەمو کوڕ بوو ٥ لەحەدیثدا هاتووە: کە پێغەمبەر (د.خ) (کان يأكل الجَشِبَ من الطعام).
جَشُبَ جَشوبَةً وجشابَةً: بەمانا (جَشِبَ) دێ.
جَشُبَ الكلامُ: قسەکەی وشكو بی تامو زبر بوو.
الجَشُوبُ من النساء: ئافرەتی ناقۆلای کەتە.
المِجْشابُ: جەستە گەورەی ناقۆلا.
المِجْشَبُ: پیاوی کەتەو ئازا.
الْمُجَشَّبُ: ئادەمیزادی ژیان زبرو دەستکورت.
جَشَرَ الصُّبْحُ جُشوراً: بەیانی دەرکەوت بەیانی گزنگی دا.
جَشَرَ الدوابُ جَشْراً: ئاژەلەکە لە پاوانەکەدا مایەوە.

جَشَرَ عن أهله: لەخزمو خزێشی خۆی دووركەوتەوە.

جَشَرَ الدوابَ: ئاژەڵەكەی بردن بۆ لەوەرگا ٥ لەنزیك ماڵەوە لەوەڕاندنی.

جَشَرَ الشَيئَ: وازی لە شتەكە هێنا.

جَشِرَ الاناءُ جَشراً: قاپەكە، مەنجەڵەكە پیس بوو

جَشِرَ الساحِل جَشراً: قەراخ دەریاكە قوڕەكەی رەق هەڵهات وەكوو بەرد رەق بوو.

جَشَرَ الرجل والبعيرُ: پیاوەكە یان حوشترەكە توشی كۆكەیەكی وشك بوون.

جَشَّرَهُ: وازی لێ هێنا.

جَشَّرَ الاناءَ: قاپەكەی بەتاڵ كرد.

جَشَّرَ الدوابَ: بەمانا (جَشَرَ) دێ.

تَجَشَّرَ: بۆ مطاوعەی (جَشَّرَ) دێ.

تَجشَّرَ بَطْنُهُ: سكی هەڵاوسا.

الجاشِرُ: ئاژەڵی بەرەڵا بۆ كوێ دەچێ بچێ.

الجاشِريةُ: نیوەڕۆ ٥ بەرە بەیان ٥ خواردنەوە لەبەرەبەیاندا ٥ دەگوترێ: (شربة جاشرية، وشربت الجاشرية).

الجُشارُ: كۆكە، یان سینگ خورانو نیخە نیخ ٥ دەنگ گڕی.

الجَشَرُ: بەردێكی زبرە لە دەریادا لەچەوو صەدەف پێك دێ.

الجَشَرُ: بەمانا (الجَشَرُ) دێ ٥ هەروەها ئاژەڵێكە لەپاوان دەلەوەڕێو ناگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ٥ یان كۆمەڵێك ئادەمیزاد لە لەوەڕگادا بمێننەوە نەیەنەوە بۆ ماڵی خۆیان ٥ كۆمەڵێك ئادەمیزادی خوێڕی ناكەس پەچە ٥ دانەوێڵەی بەهار ٥ توێكڵی دەنكە گەنم ٥ سۆ.

الجُشْرَةُ: بەمانا (الجُشار) دێ ٥ كۆكەو هەڵامەت.

الجَشّارُ: خاوەنی ئاژەڵی وەها كە لەكێوو كەژ دەلەوەڕێن.

الجَشِيرُ: تیردان، كەشكۆڵ ٥ هەمبانە ٥ جەواڵو هۆڕی گەورە.

الْمِجْشَرُ: حەوزێك كە ئاوەكەی بەكەڵكی خواردنەوە نەیە لەبەر پیسو پۆخەڵی، (ك: مجاشر)٥.

جَشَّ القومُ جَشّاً: خەڵكەكە رۆیشتن بە كۆمەڵو بەپەلە.

جَشَّ الحَبَّ: دانەوێڵەكەی كردە بروێش ٥ (هو مجشوش وجشيش).

جشَّ الحيوان وغيرها بالعصا: لە ئاژەڵەكەی دا بەگۆچان.

جشَّ الباكي دمْعَهُ: گریاوەكە فرمێسكی هەڵوەران.

جَشَّ المكانَ: شوێنەكەی ماڵیو پاكی كردەوە.

جَشَّ البئرَ: بیرەكەی لە قوڕو لیتە پاككردەوە.

جَشَّ الصَوتُ جشَاً وجشةً: دەنگی گڕ بوو دەنگی زل بوو.

**أَجَشَّت الأرض:** گیاو گژەكەی لێك هالاّو تێكچڕژا.

**إجْتَشَّتِ الأرض:** بەمانا (أجش) دێ.

**الجَشَشُ:** دەنگی گەورەو گڕ.

**الجَشُّ:** شوێنی رەقەلاّنو بەرداوی.

**الجَشُّ من الشَّيْءِ:** ناوەڕاستی شت.

**الجُشُّ:** بەمانا (الْجَشُّ) دێ ٥ بەشێك لەشەو، (ك: جشاش).

**الْجَشَاءُ:** زەوی دەشتو نەرمەلاّن كە بەردە وردەی تێدابن بەكەڵكی ئەوەدێ درەختی خورمای تێدا بڕوێندرێ ٥ سپڵ، لەحەدیثی ئیبنو عەبباسدا هاتووە دەفەرموێ: (ما آكُلُ الجَشاء من شهوتها، لكن لِيَعْلَمَ أهل بيتي أنها حلال).

**الجُشَّان:** بەمانا (الجَشُّ) دێ.

**الجَشَّةُ:** كۆمەڵێك ئادەمیزاد بەكۆمەڵ بەرەو شوێنێك دەڕۆن.

**الجُشَّةُ:** بەمانا (الجَشَّة) دێ ٥ دەنگی بەهێز ٥ دەنگێك لە لوتەوە بێتەدەر بەمەیلەو گنی.

**الجَشيشَةُ:** بەمانا (الجشيش) دێ ٥ شتێكە گۆشت یان خورمای دەخرێتە سەرو دەكوڵێندرێ لە حەدیثدا هاتووە كە پێغەمبەر (د.خ) (أوْلَمَ على بعض أزواجه بجشيشة).

**المِجَشُّ:** بەمانا (المِجَش) دێ، (ك: مَجاشّ)٥.

**جَشِعَ جَشَعاً:** تەماعی زۆر بوو هەڵپەی كرد ٥ دادو فیغانی كرد لەئەنجامی لەدەستدانی خۆشەویستی دا ٥ ترسا ٥ لەحەدیثی (ابن الخصاصية) دا هاتووە دەفەرموێ: (أخاف إذا حضر قِتال جَشِعَتْ نفسي فكرهت الموتَ) ٥ كۆیەكەی (جشاعي، وجُشَعاء، وجشاع)٥.

**تَجاشعوا الشَّيْءَ:** لەو شتە كۆبوونەوەو چەپاویان كرد.

**تَجَشَّعَ عليه:** زۆر بەخەمیەوە بوو سور بوو لەسەر ئەنجامدانی.

**الْجَشِعُ:** ئەو كەسەیە ماڵو سامان كۆدەكاتەوە لێی نابەخشێ دڵی بڕواناداو شتێكی لێ زایە بكا ٥ بەمانا (شێر)یش هاتووە.

**جَشِمَ جَشْماً:** قەڵەو بوو، قورس بوو، (هو جَشْمٌ وجَشِيمٌ).

**جَشِمَ الأمْرَ جَشْماً:** بەنابەدڵ ئەو كارەی لە ئەستۆ گرت ٥ (هو جاشم وجشوم).

**اجْشَمَهُ أمراً:** كارێكی خستە سەرشانی.

**جَشَّمَهُ أمراً:** بەمانا (أجْشَمَهُ) دێ.

**تَجَشَّمَ الأمْرَ:** بەمانا (جَشِمَهُ) دێ.

**تَجَشَّمَ فلاناً بين القوم:** لە نێوان ئەو گەلو تاقمەدا رێو شوێنی ئەویان گرتەبەر.

**الْجُشَمُ:** قورسایی، دیرهەمی تەزوێرو ساختەچی، (ك: جُشُوم)

**الجُشَمُ:** قورسایی ٥ دەگوترێ: (ألقى عليه جُشَمَهُ) ٥ هەروەها بەمانا سینگو پەراسوش دێ.

**جَشِنَ جَشَناً:** قەڵەو بوو، زەبەللاح بوو.

الْجُشْنَةُ: باڵندەی بچوك.
جَصَّ في الرباط جصاً جصيصاً: ئاخ و ئۆفی کرد لەبەر شەتەکدانی توندی پێی و پەیوەندی پێیەوە.
جَصَّصَ الجِرْوَ: بێچووە گورگەکە چاوەکانی کردنەوەو گێڕانی.
جَصَّصَ النبتُ والتمر والزهر: رووەك، خورما، گوڵ سەرەتایان دەرکەوت گڵۆکیان کرد.
جَصَّصَ البناءَ: باڵەخانەکەی کەچکاری کرد.
جَصَّصَ الاناءَ: قاپەکەی پڕکرد.
الْجَصُّ: گەچ ٥ جۆرێکە لە کەرەسەی خانوو دروستکردن.
الجَصَّاصُ: گەچکار، ئەو کەسەی گەچەکە بەرهەم دێنێ ٥ فرۆشیاری گەچ.
الجَصَّاصة: ئەو شوێنەی گەچی لێ بەکار دەهێندری.
الجصيصةُ: رووەکێکە لە پێڕی قەرەنفەلی.
جَضَّ فلان جضاً: فلانکەس بەشێوەی فیزەوە هاتوو چۆی کرد.
جَضَضَ عليه بكذا: ئەو شتەی خستەسەر.
جَضَضَ: بازێکی توندی هاویشت.
جَضَضَ عليه: بەمانا (جَضَّ) دێ.
الجِيَضّي: رۆیشتنێکە جۆرە لەنجەو لارو خۆ بادانێکی تێدایە.
جَعَبَ الجَعْبَةَ - جَعَبَ جَعْباً: تیردانی دروستکرد، پرێسکەی دروستکرد
جَعَبَ الشَّيْءَ: شتەکەی کۆ کردەوە، هەڵی گێڕایەوە.
جَعَبَ فلاناً: فلانکەسی خستە سەر زەوی ٥ (جَعَّبَ) هەمان مانای هەیە
إنْجَعَبَ: بۆ موطاوعەی (جَعَّبَ) دێ.
الجِعَابَةُ: دروستکردنی تیردان و فیشەکدان حیرفەو میهنەی جوعبە دروستکردن.
اَلْجَعْبَةُ: تیردان، فیشەکدان، (ك: جِعَاب)٥.
المِجْعَبُ: ئەو کەسەیە خەڵك بەزەوی‌دا دەدا بەڵام کەس ناتوانێ ئەو بخاتە سەر زەوی.
اَلْجُعْبُوبُ: کورتە باڵای ناشیرین، لاوازی بێ هێزی بێ خێرو فەڕ، (ك: جعابيب)٥.
جُعْبُرَةٌ: بەعەرزی دادا خستیە سەر زەوی ٥ پیاڵەی لێو ئەستوری کوڵەبنەی وەها کە هێشتا رێك و پێك نەکرابێ.
الجَعْبري: کورتە باڵای ناشیرین و نەکڵەومت.
تَجَعْثَنَ: وێك هاتەوەو کۆ بووەوە.
الجِعْثِنُ: قەدی درەخت و رووەك، (ك: جعاثن)٥.
الجِعْثِنَةُ: ترسنۆکی تەمبەڵ، (ك: جَعَاثِن)٥ ٥ (جَعْجَعَ الجَمَلُ): حوشترەکە خرمە خرمی رۆیشتنی زیادی کرد.
جَعْجَعَ الرحی: ئاشەکە تەقە تەقی لێ هات ٥ چەقەنەی لێ دا ٥ لەپەندی

پێشینانـدا هـاتووە دەڵـێ: (أسْمَعُ جَعجعـةً ولاأرى طحينـا) بەکەسێك دەگـوترێ بـە قسـە هیچـی نەهێشـتبێتەوە هـیچ کردەوەشـی نەبێ ٥ (هو جعجاع).

جَعْجَـعَ المكـان: لـەو شـوێنە دانیشت بـە شێوەیەکی دڵەڕاوکێو نادڵنیایی.

جَعْجَعَ بـە: نارەحـەتی کـرد، جـاڕزی کـرد، دەری کرد، پەندی پێ دا.

جَعْجَعَ الابل وبها: حوشترەکانی جوڵانـدن بۆ ئەوەی پیخیان بدا یان بۆ ئـەوەی بیانکا تە تەویلەوەو دایانبکا.

جَعْجَعَ الجذور: کوشتی یەکەی سەربڕی.

تَجَعْجَعَ: بۆ مطاوعەی (جَعجَع) هاتووە ٥ خـۆی بەئـەرزدادا خـۆی لـە گـڵو خۆڵ وەردا تلاوتلی کرد لەبەر ئازار یان فێ لێهاتن یان لێدان.

الجعجـاعُ: شـوێنی تەنگەبـەرو نـاخۆشو رەقـەنو بـەردەڵان ٥ بەندیخانـە ٥ ئاوو هەوا یەك کە ئادەمیزاد نـەتوانێ خۆی تێدا بگرێو ژیانی تێدا بەسەر بەرێ ٥ شوێنی شەڕو هەرا.

الْجَعْجَـعُ: شـوێنی تەنگەبـەرو نـاخۆشو بـەردەڵان، شـوێنێك لـەزەوی چـاڵ بووبێ.

جَعِدَ الشَّعْرُ وغـيره جعـوداً وجعـادةً: قـژی کۆبۆوەو تێکباهەڵدرا ٥ قـژی کـورت بـووە ٥ دەشـگوترێ: (جعـد الخَـدُّ) کوڵمی جرچی تێکەوتن.

جَعَّدَ الشَّعْرَ وغيره: مووەکانی کۆکردنەوە.

جَعَّدَ الشَّعْرَ وغيره: بەمانا (جَعُدَ) دێ.

الجُعَـادةُ: (أبـو جَعـادة): نـاوی گورگـە، کونیەی گورگە.

الجَعْدُ: خڕ، دەگوترێ: (وجـه جَعْـدٌ) دەمو چاوی خڕو کەم گۆشتە (بعير جَعْـدٌ) حوشترێکی کوڵکنە، هەروەها بەمانا پیاوی خراپو دەست قوچاویش دێ ٥ دەگـوترێ: (فـلان جعـد اليـدين) و (جَعْد الأنامل) ٥ (رجـل جعـد القفـا) هەتیو مچەو ناکەس بەچە.

الجَعْـدَة: دانەوێڵەیـەکی خۆرسـکە (أبـو جعدة) ناوی گورگە.

جَعَـرَ جَعْـراً: تـەبیاتی وشـك بـووە ٥ (هـو مجعـار): لـە حـەدیثی ئیمـامی عومـەردا هـاتووە دەڵـێ (إنـی مجعـار البطن).

جَعَـر السَّبُعُ وکـل ذي مِخْلَـبٍ: درندەکـە پیسایی کـرد یـان هـەر درەندەیـەکی چنگو نینوکدار بێ.

تَجَعَّـرَ: حەبلەکـەی لەپشـتی خـۆی شەتەك داو چووە ناو بیرەکە.

الجـاعِرةُ: کـونی پاشـەوە (قـنگ) گـوو پیسایی هەموو درندەیـەك ٥ لاسمت کـە بەسـەر ڕانـدا دەڕوانـێ ٥ (جاعرتان) لاسمتەکان، کلۆتەکان.

جَعَـارِ: نـاوی کـەمتیارە ٥ (أم جعـار) کونیەی کەمتیارە.

الجِعَارُ: جەبلێکـە کەسێك دەڕواتـە نـاو بیر لە پشتێنی خۆی شـەتەکی دەداو

سەرەکەی تری بەدەست پیاوێکی ترەوەیە یان لە سینگێك بەستراوە بۆ ئەوەی کابرای بیرەوان نەکەوێتە خوار هەروا ناوە بۆ داخ و نیشانەکردنی ئاژەڵ لەکلۆتی دا.

**الجَعْـرُ**: قشپل ٥ گوو پیسایی درەندەی خاوەن چنگ.

**الجعراء**: کونی پاشەوە.

**الجِعْـرانُ**: (أبو جعـران): قالۆنچە ٥ (ام جعـران): بازو هەڵۆ ٥ لەلای میصرییە کۆنەکان پەیکەرێکە بۆ حەشەرەیەکی رشکەڵە لەپیری خەنافیسەکان میصرییەکان بەپیرۆزیان داناوە، پاشان تەمیمەو نوشتەیان پێدا کردووە.

**الجُعْـرةُ**: ئەو دابڕین و نەخش و شوێنکارەیە کە حەبلەکە لەناو قەدی کابرای بیرەوانی دەکا کە دەچێتە ناو بیرەکەوە ٥ جۆیەك قەصەبەکەی ئەستوربێ، گوڵەکەی گەورە بێ دەنکە جۆیەکە درێژو گەورەو سپی بێ.

**الْجَعِـرَّى**: کونی پاشەوە ٥ جۆرە یارییەکی منداڵانە بەدوانیان منداڵێك هەڵدەگرن.

**اَلْجَعَرُ**: کونی پاشەوە.

**الجُعرور**: جۆرە خورمایەکی بچوکی بێ کەڵکە ٥ دەعبایەکی بچوکە.

**جَعَسَ جَعْساً**: دایهێنا، هێنایە کایەوە.

**تَجعَّسَ**: بەمانا (جَعَسَ) دێ ٥ قسەی ناشیرینی کردن و جوێنی دا.

**الجَعسُ**: زبڵ و زاڵ سەرەنگیوێلك.

**الجَعيسُ**: کەتەو زەلام

**الجُعْسُوسُ**: کوڵەبنەو ناشیرین ٥ بێ ڕەوشت و نەکڵەوەت ٥ (بۆ نێرو مێ بەکاردێ)، (ك: جعاسيس)٥.

**اَلْجَعْشَمُ**: مام ناوەند، (ك: جعاشِم)٥.

**اَلْجُعْشُمُ**: کورتە باڵای شان و مل قەوی گردەبڕ، (ك: جعاشيم).

**الجُعْضيضُ**: ڕووەکێکە ساڵانەیە، بەکاڵی دەخورێ. بڕوانە وشەی (التِّفافُ).

**جَعَظ عليه جَعْظاً**: لەژێر کۆنترۆڵی ئەودا نەماو یاخی بوو کارو باری خۆی بەشێوەیەکی تر دامەزراندەوە.

**جَعَظَ فلاناً عن الشَّئِ**: فلانکەسی لەو شتە گێڕایەوە پاڵی پێوەنا.

**جَعِظَ جَعَظاً**: ڕەوشتی ناشیرین بوو، ڕقی هەڵسا.

**اجْعَـظَّ الرجـلُ**: پیاوەکە هەڵات و بۆی دەرچوو.

**اجْعَظَ فلاناً عن الشَّئِ**: شتەکەی لەسەر فلانکەس لابرد.

**جَعَّظَ عليه**: بەمانا (جَعَظَ) دێ.

**اَلْجَعْـظُ**: کەتەو زەلام، لوتبەرزو خۆبەزلزان لەخۆرازی و لەخۆبایی بوو ٥ لە حەدیثدا هاتووە: (ألا أنبئكم بأهل النار كل جَظٍ جَعْظٍ).

**جَعَّ فلان جَعّاً**: فلانکەس گڵی خوارد.

**جَعَّ فلاناً**: گڵی تێگرت گڵی پێ دادا.

**جَعَفَهُ جَعْفاً**: هەڵی گێڕایەوە هەڵی کەند.

**جَعَفَ فلاناً**: بە عەرزی دادا،ماڵی بەزەوی دا.

**أجْعَفَهُ**: خستی.

**اجتَعَفَ الشجرةَ**: درەختەکەی هەڵکەند.

**إنْجَعَفَ**: بۆ مطاوعەی (جَعَفَ) هاتووە.

**الجعف**: رامالەر دەگوترێ: (سیل جاعف) لافاوێکی وەهایە هەموو شتێك رادەدا.

**الجُعَافُ**: بەمانا (جاعف) دێ ٥ دەگوترێ: (سیل جعاف).

**الجَعْفُ**: کەم، دەگوترێ: (ماعنده من المتاع الاجَعْفٌ).

**الجَعْفَرُ**: چەم، روبار ٥ حوشترێك شیری زۆر بێ، (ك: جعافِر).

**الجَعْفَرِيةُ**: تاقمێکن لەشیعەی ئیمامی، شوێنکەتووی جەعفەری صادقن ٥ هەروەها پێڕێکن لە موعتەزیلەکان.

**الجَعْفِيلُ**: جینسی گیایێکە لای خواروی بەناو روەك و درەختی تردا بلاو دەبێتەوەو تییاندەهالێ تەڕاییەکەیان دەمژێ لە میصر پێی دەڵێن: (هالوك) بە کوردی خۆمان رەنگە ترتره بێ.

**جَعَلَ**: (جَعَلَ اللهُ الشَّيْءَ): خودا ئەو شتەی دروستکرد ٥ لە قورئاندا هاتووە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ﴾: تاریکی‌و روناکی بەدیهێناون، بەمانا پاشکوێ خستن دێ ٥ دەگوترێ: (لم أجْعَل حاجتك وراء ظهري) ئیشەکەتم پاشکوێ نەخستووە.

**جَعَلَ القِدرَ**: مەنجەڵەکەی بە جیعال لەسەر ئاگرەکە داگرت.

**جعل للعامل**: بۆ کریکارەکە کرێی دیاریکرد.

**جَعَلَ**: دەستی پێکرد دەگوترێ: (جَعَلَ يفعل كذا).

**جَعِلَ الماءُ جَعَلاً**: ئاوەکە قالۆنچەی زۆری تێکەوت یان زۆری قالۆنچە تێدا مردار بوونەوە.

**جَعِلَ الغُلامُ**: منداڵەکە کورتە باڵاو قەڵەو دەرچوو

**أجْعَلَ القِدْرَ**: مەنجەڵەکەی بەجیعال داگرت.

**جَعَلَ فلاناً ولَه**: کرێی بۆ فلانکەس دیاریکرد.

**جاعلَه مُجاعلَة وجعالاً**: کرێی بۆ دیاریکرد.

**اجْتَعَلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی دروست کرد، دەگوترێ: (اجْتَعَلَ في الخشب سريراً) لەدارو تەختە قەرەوێڵەی دروستکرد.

**تجاعلوا الشَّيْءَ**: شتەکەیان لەناو خۆیاندا بەشکرد.

**الجِعَالُ**: نەوکرێ‌و پاساوەیە لەبری کارومردەگیرێ یان بەرتیلە هەروەها ئامێرێکە مەنجەڵی پێ لەسەر ئاگر دادەگیرێ، دەستگرە، (ك: جُعُل).

**الجَعَالَـةُ**: ئـەو كرێيەيە يـان بەرتيلـە كـە لەجياتی كاركردن دەدرێ، (ك: جَعَائِلَ).

**الجِعَالَـةُ**: بـەمانا (الجِعـال) دێ، (ك: جَعَائِلَ)ە.

**الجُعْلُ**: بەمانا (الجعالة) دێ، (ك: جعول)ە.

**الجُعَلُ**: گيانلەبەرێكە وەكوو خونفوساء لە شوێنی شێدارو نماويدا دەژی.

**الجُعَلُ مـن النـاس**: ئـادەميزادی كولەبنـەی رەش‌و زۆر بلێ‌و نيزاعكار.

**الجَعْلَـةُ**: دارخورمـای كـورت كـە دەست نەيگاتێ.

**الجعيلة**: بەمانا (الجُعْلُ) دێ.

**جَعَمَ الرجلُ جَعْمـاً**: پياوەكـە تـەماعكاربوو زۆری هەڵپەكرد.

**جَعَـمَ الى الطعـام**: ئـارەزۆی بـۆ خۆراكەكـە پەرەی سەندو زۆری حەز لێ كرد.

**جَعَمَ البعيرَ**: دەمبەستی لـە دەمـی حوشـترەكە كرد قەپالی بۆ لەهيچ ناگيرێ.

**جَعِمَ الرجلُ جَعَماً وجَعَامَةً**: بەمانا (جَعَمَ) دێ.

**جَعِمَت الإبلُ**: حوشـترەكە هيچـی دەست نەكەوت بيخوا ئيسقانی كرۆشتن.

**جَعِـمَ**: قسـەی زبـرو نـاخۆش بـوو، دەنگـی گرو زڕ بوو.

**أَجْعَـمَ المكـانُ**: شـوێنەكە گژوگياكـەی خوراو تەواو بوو.

**اجْعَـمَ القـومُ**: ئـەو قەومـە حوشـترو ماڵاتيان توشی دەردبووە.

**اجْعَـمَ الشَّـيئَ**: ئـەو شـتەی لـەبێخ دەرهێنا.

**تَجَعَّـمَ**: تـەماعی زۆر بـوو، زۆری هەڵپەكرد.

**الجُعامُ**: دەردێكە تووشی حوشتر دەبێ.

**الجِعْمُ**: برسيەتی.

**الجِعْمِـيُّ**: ئـادەميزادی بەتـەماع‌و چاوبرسـی‌و بەهەڵپـە بـۆ مـاڵ پەيداكردن.

**الجَعُومُ**: تەماعكار لەشتێك كە تـەماعی تێا بەكار نايە ٥ ژنی برسی.

**الجَيْعَمُ**: برسی ٥ چاو چنوكێك هەرچی ببينێ حەزی لێ دەكا بيخوا.

**الْمَجْعَمُ**: پەناگا، (ك: مجاعم).

**جعا الجِعَةَ جعْواً**: بيرەی دروستكرد.

**جَعَا البَعْرَ ونحوه**: قشپلی كۆكردەوە تـا بـوو بە كۆمەڵێكی گەورە.

**الجِعَةُ**: بيرەی دروستكراو لەگەنم‌و جۆ.

**الجَعْوُ**: قوڕ ٥ ئەوەی كۆبكرێتە لە قشپل‌و تەپاڵە تا دەبێتە كۆمەڵێك.

**الجعوُ**: بەمانای (الْجِعَةُ)دێ.

**الْجَعْوَلُ**: بێچوی نەعامە، (ك: جعاول)ە.

**الجغرافية**: زانيارييەكە تێيدا لێكۆڵينـەوە دەكـرێ دەربـارەی ديـاردە سروشـتييەكانی روبـەری زەوی، باسـی كێوەكـان دۆڵـەكان دارەسـتانەكان دەشـتاييەكان، گيانلەبـەرانی مـاڵی‌و كێـوی ٥ باسـی ئادەميزدەكـان، هـەروەها باسـی ديـاردە ئادەميزادييەكانيشـی تێـدا دەكرێ.

جَفَا الزَّبدُ جَفْواً: كەفەكە بەرز بوو.
جَفَا القِدرُ: مەنجەڵەكە لەكاتی كوڵین دا كەفەكەی فڕێ دا.
جَفَا الوادي غثاءَهُ جَفْئاً: شیوەكە خشتو خۆڵی خۆی فڕێداو هەموی ڕاماڵی.
جَفَأ القِدْرَ والواديَ: خشتو خۆڵو خاشاكی مەنجەڵەكە یان هی شێوەكەی لابرد.
جَفَأ الرجلَ: پیاوەكەی بەزەویدا دا تەراحی كرد.
جَفَأ القِدْرَ: مەنجەڵەكەی سەرە نقون كردو بەتاڵی كرد ٥ لەحەدیثدا هاتووە: (أنه حرم الحمر الأهلیه فجفئوا القدور): پێغەمبەر (د.خ) گۆشتی كەری ماڵی یاساغ كرد، ئیتر خەڵكەكە مەنجەڵەكانیان سەرەو نقون كردن.
جَفَأ البَقْلَ والشَّجَرَ جَفْئاً: لە بێخەوە ڕوەكەكانو درەختەكانی هەڵكەندنو فڕێی دان.
جَفَأ البابَ: دەرگاكەی داخست.
أجْفَأت الأرض: خێرو بێری زەوی ڕۆیی‌و تێدا چوو.
اجْفَأ الواديُ والقدرُ: خۆڵو خاشاكی شیوەكە یان مەنجەڵەكە سەركەوتو سەر ڕێژی كرد.
أَجْفَأ القِدرُ الزبدَ ربه: مەنجەڵەكە كەفو چڵكی خۆی دەردا.
اجْفَأ الرجُل: بەمانا (جَفَأه) دێ.
اجْفَأ ماشیتَهُ: بە لێخوڕینو ڕێگا بڕینی زۆرو ئاڵف پێ نەدان، ئاژەڵەكانی خۆی ماندوكردن.
اجْفَأ الباب: بەمانا (جَفَأ) دێ.
إجْتَفَأ البَقْلَ والشَّجَرَ: بەمانا (جفأهما) دێ.
الجُفاءُ: ئەو كەفو خشتو خۆڵو خاشاكەیە لافاو یان مەنجەڵ دەری دەدا ٥ قورئان دەفەموێ: ﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً﴾ ٥ هەروا وشەی (جفاء) بەمانا كەشتی خاڵی دێ ٥ هەروەها پێرێكی ڕیرەوی موعتەزیلەكانن ٥ دەگوترێ: (نبذه جُفاءً) گۆشەگیری كردو لەناو هاوڕێیانی خۆی وەدەری نا.
الجِفْتُ: ئامێرێكی عەمەلیاتی پزیشكییە دوو دەسكی هەیە.
جفجف الثوب الجدیدُ ونحوه: كراسە تازەكە خزی‌و خشەی هات ٥ كراسەكە وشك بۆتەوە هەندێ شەی تێدا ماوە.
جَفجف الموكبُ: كاروانەكە بەڕێ كەوت خرمەخرمی قاچەكانیان دەبیسترا.
جفجف النَّعَمَ: ئاژەڵەكانی بەتوندی لێخوڕین كەوتنە گورگە لوقە.
جفجف الماشیةَ: ئاژەڵەكانی كوكردنەوە ٥ حەوقی كردن.
تَجَفْجَفَ الطائر: باڵندەكە خۆی فش كردەوە ٥ بەسەر هێلكەكانی دا كڕكەوتو باڵی بەسەردا هێنان.
الجفاجِفُ: شێوەو پۆشاك.
الجفجف من الأرض: چاڵایی ناو زەوی چاڵی

قـولى پـان‌و پـۆڕ ٥ ڕەشـەبای بـەهێز کەبەسەر هەرشتێکدا بڕوا وشکی بکا ٥ ئافرەتی زۆر بڵێ‌و چەقەچەناو.

**جَفَـخَ جَفْخـاً**: بـەخۆی نـازی‌و تەکـەبوری کرد، (هو جفاخ).

**جَافَخَـهُ**: خـۆی بەسـەردا بـادا، شـانازی بەسەردا کرد.

**جَفَـرَ جفـوراً**: وازی لـەئاو فڕێـدان هێنـاو جیماعی بۆ نەکرا.

**جَفَرَ الجديُ**: کاریلەکە یان بەرخۆلەکە زل بوو ورگی گەورە بوو.

**جَفَرَ من المرض**: لەنەخۆشییەکەی ڕزگاری بوو چاکبۆوە.

**أَجْفَرَ**: بەمانا (جَفَرَ) دێ ٥ گوم‌و بـوو ٥ بۆنی جەستەی گۆڕا ٥ کەلەکەی پان بوون.

**اجْفَرَ عنه**: وازی لێ هێنا تەرکی کرد.

**اجْفَرَ الركية وغيرها**: بیر یان هـەر شـتێکی لەو جۆرە بێ پان‌و پۆڕی کرد.

**اجْتَفَـرَ**: لـە ئـاو فڕێـدان‌و جیمـاعکردن کەوت.

**تَجَفَّرَ**: بۆ مطاوعەی (جَفَرَ) هاتووە.

**اجتَفَـرَ الجَفْـرُ**: خـۆی داڕشـت قەڵـەو بـوو واتـە: کاریلەکـە یـان بەرخۆلەکـە گۆشـتی گـرت قەڵـەو بـوو، توانـای لەوەڕخواردنی پەیدا کردو پێویستی بەخواردنی شیری دایکی نەما.

**اسْتَجْفَرَ**: بەمانا (تَجَفَّرَ) دێ.

**الجَفْـرُ**: کاریلـە یـان بەرخۆلەکـە پـێ بگـاو ورگی پان ببێ ٥ منـداڵ کـە گوشـتن ببێ‌و ورگ پەیدا بکا ٥ بیری ئاو کە پـان‌و پۆڕبـێ‌و ئـەم لاو ئـەولای بەبـەرد هەڵنەچنرابێ، (ك: أجفـار، جيفار، جُفَرَة)٥.

هـەروەها نـاوە بـۆ کتێبێـك کـە ئیمامی عەلی یان جەعفەری صادق: ڕوداوی داهاتووی پێشبینی کردووەو لەو کتێبەدا تۆماری کردون.

**علـم الجَفْـر**: زانیارییەکـە دەربـارەی پیتـەکان لـەڕوی مانایانـەوەو ئاماژەکردنیان بۆڕوداوی ڕۆژگار.

**الجُفْرَة من كل شيئ**: ناوەڕاستی شت یان زوربەی شت ٥ یـان چاڵی کەوانـەیی گـەورە ٥ درزی دینگـەو کۆڵەکـە کـە لـەزەوی دا چـەقێندرابن ٥ نـاوەوەی سینگ، (ك: جفر، جفار).

**الجفير**: تیردان، یان کەشکۆڵێك لـەتیردان گـەورەتربێ لـە پێسـت یـان لـە دار دروسـتکرابێ ٥ لەپەنـدی پێشـیناندا هاتووە (ليس في جفيره غير زنـدين) بـە کەسـێك دەگـوترێ: خێروبێـری بۆ کەس نەبێ.

**الجَفيرُ**: بەمانا (الجفير) دێ.

**اَلْمِجْفَـرُ مـن الطعـام**: جـۆرە خواردەمەنییەکـە هێـزی جیمـاعکردن لـەو کەسـەدا کـەم بکاتەوە کە دەیخوا.

**اَلْمُجْفَـرُ**: ئەسـپ‌و حوشـتری ورگ زل ٥ یـان هـەر گیانلـەرێك کـە کەلەکـەی پان‌و گەورە بن.

**جَفِسَ من الطعام جَفَساً وجفاسةً:** خواردەمەنییەکەی پێش چاو کەوت ئارەزۆی ناکا.

**الجِفسُ من الناس:** پیاوی خراپو بەد لەگەڵ ئەوەشدا هیچی لەبارانەبی‌و خوێڕی‌و تەمبەڵ بێ ٥ پیاوی کەتەو زەبەلاح‌و وشك تەبیات.

**جَفَشَهُ جَفشاً:** کۆی کردەوەو کەمێك گوشی.

**جَفَشَ الناقةَ:** بەسەری پەنجەکانی حوشترەکەی دۆشی.

**جَفَظَه جَفظاً:** پڕیکرد.

**إجْفَأَظَّ:** بەهۆی نەخۆشی یان ئەو زەبرەی پێی کەوت خەریکە بمری‌و وا لەگیانەڵاودایە.

**اجفَأظَّ الجيفةُ:** لاشەکە هاوسا.

**الْجَفظُ:** حەبلی کەشتی.

**الْجفيظُ:** کوژراوی هەڵاوساو.

**جَفَّ الشَّيْئَ جفوفاً وجفافاً:** وشك بووە.

**جَفَّ الرَّجُلُ:** پیاوەکە بێ دەنگ بوو وڕتەی نەکرد.

**جَفَّ الشَّيْئَ جفاً:** شتەکەی کۆکردەوە.

**جَفَّفَ الشَّيْئَ تجفيفاً وتجفافاً:** شتەکەی وشك کردەوە.

**جَفَّفَ الانسانَ أو الفرسَ:** زرێی لەبەرکرد، یان شتێکی خستە سەرپشتی ئەسپەکەی بۆ ئەوەی بیپارێزی لە بریندار بوون.

**اجْتَفَّ ما في الاناء:** هەرچی لە قاپەکەدا بوو خواردییەوە.

**تَجَفَّفَ:** بۆ مطاوعەی (جَفَّفَ) هاتووە.

**تجَفَّفَ الطائر:** باڵندەکە خۆی فش کردەوە ٥ بەسەر هێلکەکانی دا خۆی کرکردو باڵەکانی بەسەردا دان.

**التِّجْفَاف:** ئەو شتەیە شەڕکەر لەبەری دەکاوەکوو زرێ، هەروا سەرجل‌و شێوە کورتان‌و زینێکە دەخرێتە سەرپشتی وڵاغە بەرزە بۆ ئەوەی لەبرینداربوون بپارێزرێ، (ك: تجافيف)٥.

**الجُفَاف:** ئەوەی وشك بێتەوە لەو شتانەی وشك دەکرێنەوە.

**الجُفَافَةُ:** ئەو گیاو گژەی وەکوو حەشیشە وایەو بڵاو دەبێتەوە.

**الْجَفَفُ:** زەوی وشکی رەقەڵان ٥ پێداویستی.

**الجَفُّ:** کۆمەڵێك ئادەمیزاد.

**الجُفُّ:** شتی کلۆر ٥ ئەو پەردەیەی بەسەر جروزەی خورماوە هەیە ٥ دۆڵچەی بە ئەندازەی نیوە دیزە پێك بێ ٥ پیرەمێرد ٥ تەپۆڵکە زەوی نەزۆر رەق نەزۆر نەرمەڵان بێ ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد ٥ کەسایەتی هەموو شتێك.

**الجُفَّةُ:** کۆمەڵێك ئادەمیزاد ٥ دوڵچەی بچوك کە دیزەیەك پڕبکا.

**الجَفيف:** گیای وشکەوە بوو پوش‌و پەلاش.

**الْمُجَفِف:** مادەیەکی زەیتی لینجە لە کەتان یان لەخەشخاش دروست

دەکـــــرێ ئــــەمجار کـــــەمێك
لەخۆشـــکراوی مەغنیســـی تێکـــەڵ
دەکرێ ئەمجار رەنگی زەیتی تێکەڵ
دەکرێ بۆ ئەوەی زوو وشك بێتەوە.
**جَفَلَ** جفولاً: هەڵات، هەڵسلەمییەوەو هەڵات ٥ بەگورجی رۆیی ٥ جاڕز بوو ترسا ٥ دەگوترێ: (فلان جافل القلب).
**جَفِلَ الشَّعْرُ**: قژەکە ژاکاو تێکچوون.
**جَفَلَ الفيلُ**: فیلەکە پیسایی خۆی توڕدا.
**جَفَــلَ الشَّــيْءَ جفــلاً**: شــتەکەی رامــاڵیو رایدان دوری خستنەوە.
**جَفَلَ البحـر الســمكَ**: دەریـا ماسییەکانی هەڵدایە کەنار.
**جَفَلَ الريحُ السحابَ**: با هەورەکانی رادان.
**جَفَلَ الشَّيءَ عـن الشَّيْءَ**: ئـەو شتەی لـەو شتە دور خستەوە.
**جَفَلَ الطيْرَ وغيره**: باڵندەکەی تەرەکرد.
**جَفَلَ فلاناً**: رۆیشتو پەلەی کرد.
**جَفَّلَهُ**: دەری کرد ٥ رای ماڵێ ٥ (إنْجَفَلَ) بۆ مطاوعەی (جَفَلَهُ) دێ.
**تَجَفَّلَ**: بۆ موطاوعەی (جَفَّلَهُ) هاتووە.
**تَجَفَّلَ الـديكُ**: کەڵەشێرەکە خـۆی فـش کـردەوە پـەروتوکی گـەردنی راسـت بوونەوە.
**الأجْفَــلُ**: کۆمــەڵێك ئــادەمیزاد ٥ دەگــوترێ: (دعاهم الاجفل) هـەموو ئادەمیزادەکانی بانگ کردن بۆ نانخواردن.
**الأجْفَلَةُ**: بەمانا (الأجفل) دێ.
**الإجْفِيلُ**: ئەو کەسەی لە هەموو شتێك دەترسێ.
**الجُفَالُ**: زۆرینە لە هەموو شتێك.
**الجُفَالَةُ**: بەمانا (الجفالُ) دێ.
**الجَفْــلُ**: ترسـنۆك: کەسـێکە لـە هـەموو شـتێك بترسـێ ٥ هـەوری بارانـاوی ٥ جۆرە مێرویەکە رەشو گەورەن.
**الجِفْلُ**: شیاکەی فیل.
**الجَفَلُ**: کۆمەڵێك ئادەمیزاد.
**الجَفْلَـةُ مــن الشـجر**: درەختێکـە گـەڵای زۆری بی ٥ خوری بڕاوە.
**الجُفُولُ من النســاء**: پـیرەژنو ئـافرەتی بەساڵا چوو.
**الجفيلُ**: خوری زۆر ٥ ئەو سەرفرتاندنو هەڵپاچـینو قونارکردنەیــە کەلــە رووەكو زرعــات دەکرێتــەوە کاتــێ زۆر پڕو چڕ دەبێ.
**جَفَنَ الطعامَ جَفْناً**: خۆراکەکەی خستە نـاو تەشتەکەوە (ناو قصعەکەوە).
**جَفَــنَ نَفْسَــهُ عــن الشَّــيْءَ**: خـۆی لـە خراپەکاری گێڕایەوە.
**جَفَّــنَ**: تەشــت (ســوێنە)ی دروســتکرد ٥ ســـوێنەیەکی پێشکەشـــکرد، خـــۆراکی تێـدابوو ٥ دەگـوترێ: (إئتِنـا نَجْفِـنُ لـك) وەرە لامان سوێنەت بۆ دروست دەکەین.
**تَجَفَّـنَ**: خـۆی پاڵدایـە خێڵـی جوفنـە، خـۆی بەیەکێ لەو هۆزە حیساب کرد.
**الْجَفْنُ**: پێڵوی چاو ٥ لەپەنـدی پێشینانـدا هـاتووە (انــە لشــديد جفــن العــين) بەکەسێك دەگوترێ: کـە بـۆ شـەوبە

خەبەری ئازابیو بەشەو کەم بنوێ ٥ کالانی خەنجەرو شمشێر، (ك: أجْفُن اجفان جُفون).

جَفْنُ الماء: هەور.

جفنا رغيف: هەردوو دیوی کولێرە.

الجَفْنَةُ: تەشت، سوێنە ٥ بیری پچوك، (ك: جِفان، جِفَن)ە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ﴾ ٥ لە زانستی کیمیادا بە قاپێك دەگوترێ: لەسوالەتی چینی دروست دەکرێ بۆ گەرمکردنی شت بەکاردێ.

جَفَا الشَّيْئَ جفاءً وَجَفْواً: تەرە بوو دوورکەوتەوە ٥ رەق بوو.

جفا فلان: فلاّنکەس تەبیاتی توندو تیژی بوو، رەوشتی ناشیرین بوو.

جفا الشَّيْئَ عليه: شتەکەی لەسەر قورس بوو.

جفا الشَّيْئُ: شتەکەی دوور خستەوە توڕی دا.

جفا فلاناً وعليه: روی لەفلانکەس وەرگێڕاو دەنگی لێ دابڕی.

جَفَا البَقْلَ: لە رەگو ریشەوە روەکەی هەڵکەند.

جفي البَقْلَ: روەکەکەی دورخستەوە.

جفي فلاناً: خستی.

أجْفَتِ الأرض: زەوییەکە خێرو بێری نەما وەکوو کەفو خاشاکی سەر لافاو بێ سوودە.

أجفى الماشيةَ: ئاژەڵەکانی لێ خوڕین بێ رەحمانە راوی نان.

جافى الشَّيْئَ: شتەکەی دوور خستەوە.

اجتَفَاهُ: بەمانا (جفاه) دێ.

تجافى: بۆ مطاوعەی (جافاه) دێ ٥ (تجافى عنه) لێی دورکەوتەوە.

تجافى في سجوده: لەکاتی سوژدە بردندا قوڵەکانی لەکەلەکەو ورگیو لەڕانی دورخستەوە.

استَجْفَاهُ: بەوشك تەبیاتی لەقەڵەمدا.

الجافى في علم الرسم: ئەومیە وێنەکە بەپێچەوانەی سروشتی خۆی بخرێتە بەرچاو ٥ وەکوو ئەوە نمونەکە نەرم بێ وێنەکە وابێتە بەرچاو کە رەقو تەقە.

الجُفَاءُ: ئەو کەفو خشتو خاڵەیە مەنجەڵ یان لافاو بەملاو بەولای خۆیدا دەیهاوێ.

الجُفايَةَ: کەشتی بەتاڵ.

جَلَبَ جَلْباً وَجلباً: هەراو هۆریای بەرپاکرد.

جَلَبَ الجُرحُ: برینەکە گۆشتە وەزونی هێنایەوەو قەتماغەی بەست.

جَلَبَ الدمُ: خوێنەکە وشك بۆوە.

جَلَبَ عليه: تاوانی کرد ٥ (جَلَبَ لأهله): کاسبی بۆ ماڵو منداڵی خۆی کرد.

جَلَبَ الشَّيْئَ: شتەکەی لە شوێنێکەوە گواستەوەو بۆ شوێنێکی تر ٥ لەپەندی پێشیناندا هاتووە: (رب أمنية جلبت منية): زۆر هیواو ئاوات هەیە مردن دێنێ.

جَلَبَ فلاناً: هەرەشەی لەفلانکەس کرد بەسزادانو گەلە کۆمەکی لێکردن.

جَلَبَ على الفرس: كەمێ ئەسپەكەی هێواش كردەوە بۆ ئەوەی بازبدا.

جَلِبَ الشَّيْءُ جَلَبَاً: شتەكە كۆبووەوە.

أجْلَبَ القومُ: هۆزەكە كۆبونەوەو گەلەكۆمەكییان كرد.

اجْلَبَ الجرحُ: بەمانا (جَلَبَ) دێ.

أجَلَبَ الدمُ: خوێنەكە وشك بووە

أجْلَبَ فلان لاهله: كاسبی بۆ ماڵو منداڵی خۆی كرد.

أجْلَبَ عليه: كۆبۆوە لەسەری.

اجْلَبَ الرجلَ: هەڕەشەی لێكرد بەسزادان و گەلە كۆمەكی لێكرد.

أجْلَبَ: یارمەتی داو كۆمەكی پێ كرد.

أجْلَبَ الشَّيْءَ: بەپەڕوی تەرشتەكەی داپۆشی.

أجْلَبَ على الفرس: لە ئەسپەكەی تۆزێ هێواش كردەوە بۆ ئەوەی بازی پێ بدا.

جَلَّبَ القومُ والرعدُ والغَيْثُ: خەڵكەكە، هەورەكە، بارانەكە: دەنگیان لێ هات.

جَلَّبَ على الفرس: بەمانا (جَلَبَ) دێ.

انجلب: بۆ موطاوعەی (جلب) هاتووە.

تَجَلَّبَ: بەشوێن لەوەڕی خۆشدا گەڕا.

اسْتَجْلَبَ الشَّيْءَ: داوای كرد ئەو شتەی بۆ بێنن.

الجالِبة: بەڵاو كارەسات، (ك: جوالب).

اَلْجَلَب: جەڵەب: كۆمەڵە خوشتر یان رەشە وڵاخ و مەڕو زن كە دەبرێن بۆ فرۆشتن هەروەها كاڵاو شتی تر كە بەكۆمەڵ ببرێ بۆ فرۆشتن، (ك: اجلاب)ە.

الجِلْبُ من كل شيئ: بەمانا پەردەی ئەو شتەیە كە لەگەڵیا دەگوترێ ٥ لەگەڵ شەودا بەمانا تاریكییەكەیەتی ٥ دەگوترێ: (جِلب الليل) ٥ هەروەها بەمانا هەوری گەواڵ گەواڵ و چڕو پڕە بابێ بارانیش بێ، (ك: أجلاب)ە.

الجُلْبَانُ: هەمبانەیەكە كیفێكە لە پێست دروست دەكرێ بۆ ئەوەی شمشێری ناو كالانی تێدا هەڵگیرێ ٥ یان سوار شمشێرو پێداویستییەكانی دەخاتە ناوی ٥ روەكێكی وەرزییە لە پێری (قورنییە) تۆوەكەی دەخورێ.

الجُلَّبَان: بەمانا (الجُلْبَان) دێ ٥ هەروەها بەمانا (جەڵەبچی) دێ.

الجُلْبَةُ: ئەو توێكڵەیە لەكاتی چاكبونەوەی برینەدا دەكەوێتە سەر برینەكە ٥ پێستێكی تەڕە دەخرێتە سەرشت بۆ ئەوەی ناوەكەی هەڵمژێ و وشك بێتەوە ٥ پەڵە هەور ٥ پەڵە پەڵەی لەوەڕگا ٥ رۆژگاری ناخۆش و كارەساتاوی (ك: جَلَب)ە.

الجُلاَّبُ: ئاوی گوڵاو.

الجَلوبَةُ: هەرشتێك لە دەرەوەی وڵاتەوە بهێندرێ بۆ بازرگانی پێ كردن ٥ حوشتر ئەگەر باری لێ بنرێ، (ك: جلائب)ە.

الجَلِيبُ: شتی هێنراو، بۆ (نێرو مێ) دەبێ.

الجليبةُ: شتی هێنراو.

جَلْبَبَهُ: جیلبابی لەبەرکرد.
تَجَلْبَبَ: بۆ مطاوعەی (جلبب) هاتووە.
الجِلْبَابُ: کراس ٥ کراسی ئاودامان، جزداشە ٥ سەرپۆش ٥ کەوا ٥ بالتۆ ٥ عەبای ئافرەت، (ك: جلابیب)ە.
جَلْجَلَ السحابُ وَالرَّعْدُ: هەورەکە گرمەو لەرەی کرد.
جَلْجَلَ الرجلُ: پیاوەکە زەنگەکەی جولاند.
جَلْجَلَ الفرسُ: ئەسپەکە حیلەی خۆش بوو گڕی تێدانەما.
جَلْجَلَ الشَّيْءَ: شتەکەی جولاند لەناکامی جولاندنەکەیدا دەنگێکی بەهێزی لێهات ٥ ئەو شتەی تێکەڵ بەشتێکی تر کرد لەناکامی تێکەڵاو بوونەکەدا دەنگێکی گەورەی لێ پەیدا بوو ٥ زەنگی بەشتەکەوە بەست ٥ شتەکەی لەبیژنگدا.
تَجَلْجَلَ: بۆ مطاوعەی (جلجلە) دێ ٥ دەگوترێ: (تَجَلْجَلَ القوم للسفر): خەڵکەکە کەوتنە جمو جوڵ بۆ سەفەر.
الجُلاَجِلُ: دەنگی بەهێزی بێ گرێو گۆڵ ٥ منالی روح سوکی وریا لەئیشی خۆیدا.
الجَلْجَالُ: دەنگی بەهێز
الجُلْجُلاَنُ: کونجی کە لە توێکڵەکەی دایەپێش دروێنەکردنی٥ دانەوێڵەی گژنیزە ٥ ناخی دڵ.
الجُلْجُلُ: زەنگی بچوك ٥ کاری گەورەو بچوك.
المُجَلْجِلُ: پیاوی ئازاو رەکابەرو زیرەكو بەدەمو پل ٥ فەرمانڕەوای بەهێز ٥ پیاوی رێكو پێكو نەجیب زادە.
المُجَلْجَلُ: وە جاخزادەو نژاد پاكو خاوێنو پاڵفتە.
جَلَحَ الحیوانُ النَّبتَ والشَّجرَ جَلْحاً: ئاژەڵەکە روەکەکەی خوارد درەختەکەی خوارد ٥ سەرەتەرزەو سەرانسەرەکەی خوارد.
جَلِحَ جَلَحاً: ئەملاو ئەولای سەری توکی پێوە ماوە ٥ توکی سەری لەو دوجێگەیەدا کۆبۆتەوە.
جَلِحَ الیومُ: رۆژەکە سامناك بوو زۆر ناخۆشو پڕ کارەسات بوو.
جَالَحَهُ: بەر بەرەکانی کرد لێی هەڵگەڕایەوە ٥ (جَالَحَهُ بالعداوة): دژایەتی خۆی بۆ ئاشکرا کرد.
جَلَّحَ الذئبُ: دێڵە گورگەکە بێچوی بوو.
جَلَّحَتِ السَّنَةُ: ساڵەکە هەموو سامانەکەی برد.
جَلَّحَ فلان: فلانکەس رۆیشت بەخێرایی.
جَلَّحَ في الأمر: لەوکارەدا هەررای خۆی پەسەند دەکاو بەقسەی کەسی تر ناکا ٥ لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو.
جَلَّحَ على القوم: هێرشی کردە سەر ئەو قەومەو پێشڕەوی کرد.
جَلَّحَ الحیوانُ النبتَ والشَجَر: بەمانا (جَلَحَهُ) دێ.

**الأجْلَحُ**: ئاژەڵی کۆڵ؛ حەیوانێك شاخی نەبێ ٥ بانێك سیاجی نەبێ ٥ کەژاوەیەك سەری نەبێ، (ك: أجلاح)٥.

**الاِجْلِيحُ من النبت**: ئەو گیاو گژەیە سەرەکەی خورابێ.

**الجَالِحَةُ**: ئەو پرزو پەرو گڵوك و تۆوەیە کە لە رووەك و درەخت هەڵدەوەرێ بەهۆی رەشەباوە.

**الجُلاَحُ**: لافاوی بەهێز کە هەموو شتێك رادەماڵێ.

**الجَلْحَاء**: ئاژەڵی کۆڵ (بێ شاخ) ٥ گوندێك شورەی نەبێ زەوی بێ درەخت، (ك: جُلْحٌ)٥.

**الجَلَحَةُ**: شوێنی کۆبونەوەی قژ لەسەردا.

**المُجَالِحُ**: شێر.

**المِجْلاحُ**: ساڵێکی گرانی کە هیچ ماڵ و سامانێك ناهێڵێ، (ك: مجالح).

**جَلَخَ بفلان جَلْخاً**: فلانکەسی خست بەزەوی دا دا.

**جَلَخَ السيلُ الوادي**: لافاوەکە قەراخەکانی شیوەکەی دابڕی و پڕی کرد.

**جَلَخَ الشَّيْءَ**: شتەکەی درێژکردەوە ٥ توێکڵەکەی لێ داماڵی.

**جَلَخَ فلاناً بالسيف**: بەشمشێر پارچەیەکی لەجەستەی فلانکەس بڕی و لێی کردەوە.

**جَلَّخَ الشَّيْءَ**: بەمانا (جَلَخَهُ) دێ.

**جَلَّخَ الموسى ونحوها**: تیژی کردەوە.

**اجْلَخَّ**: بێ هێز بوو، ئێسقانی جەستەی پۆڵکان توانای هەڵسانی نیە ٥ لەکاتی سوژدە بردندا قۆڵی بڵاوکردن.

**الجُلاَّخُ**: لافاوی شت رادەر ٥ شیوی قوڵ.

**الجَلْخُ**: بەردە هەسان ٥ بەردی چەقۆ تیژکردنەوە.

**الجلِيخُ**: دەنگی ئاو خورەخوڕی ئاو.

**جَلَدَ جَلْداً**: لەپێستی دا ٥ بەپێست لێی دا.

**جَلَدَت الحية فلاناً**: مارەکە بەفلانکەسیەوە دا.

**جَلَدَ به الأرض**: پێستەکەی بەزەوی کێشا.

**جَلَدَ فلاناً على الأمر**: بەزۆر ئەو کارەی بەفلانکەس کرد.

**جَلِدَت الأرض**: زەوییەکە سەهۆڵبەندانی تێدا پەیدا بوو.

**جَلُدَ جلادةً وجلودة وَجَلَداً**: بەهێز بوو ٥ لەسەر ناخۆشی خۆی گرت ٥ (هو جَلْدٌ) کۆیەکەی (أجلاد)٥.

**أجْلَدَ**: بەمانا (جَلَدَ) هاتووە.

**اجْلَدَ فلاناً اليه**: وایکرد فلان پەنابەری بۆ فلانکەس و موحتاجی بێ.

**أجْلِدَ**: بەمانا (جُلِدَ) دێ.

**جَلَّدَهُ بالسيف ونحوه مجالدةً وجِلاداً**: بەشمشێر لێی دا ٥ لەپەندی پێشیناندا هاتووە: (لولا جلادی غنم تلادی) ئەگەر بەرگری نەبوایە خۆم و ماڵ و سامانەکەمیان لێ دەستاندم.

**جَلَّدَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەپێست داپۆشی

٥ دەگوترێ: (هذا الكتاب في مجلدين وفي مجلدين).

جَلَّدَ الذبيحةَ: کوشتییەکەی کەوڵکرد ٥ پێستەکەی لێ داماڵی.

اجتلدوا بالسیوف ونحوها: بەشمشێر لێکیان راکێشا.

اجتلد ما في الاناء: هەرچی لەقاپەکەدا بوو خواردیەوە.

تجالدوا بالسیوف ونحوها: بەمانا (اجتلدوا) هاتووە.

تَجَلَّدَ: بۆ مطاوعەی (جَلَّدَه) هاتووە ٥ خۆراگری‌و ئازایەتی خۆی رانواند ٥ خۆی بەئازاو نەبەرد نیشاندا.

الأجْلَدُ: زەوی رەق‌و سەخت.

التجالید: (تجالید الانسان): کۆئەندامی جەستەی ئادەمیزاد.

الجِلْدُ: پێست، (ك: اجلاد ، جلود)، دەگوترێ: (لَبِسَ فلان لفلان جلد النمر): فلانکەس دژایەتی خۆی بۆ فلان دەرخست.

الجَلَدُ: شتێکە لە پەرۆو پاڵ دروست دەکرێ لەسەر شێوەی بێچوە حوشتر حوشترەکەی پێ هەڵدەخەڵەتێنن بۆ ئەوەی شیر بدا.

الأجْلَدُ من الإبل والغنم: ئەومیە ئەبێچوی هەبێ ئەشیر، (ك: أجلاد، جلاد).

الجِلْدَة: پارچەیەك لە پێست.

جِلْدَة الرجل: هۆزو عەشیرەتی پیاو.

الْجَلَّاد: جەلاب؛ ئەو یاساوڵ‌و دەستو پێوەندانەن کە هەڵدەستن بەکاری لێدان‌و کوشتنی ئەوانەی دژی ئاغاکەیانن ٥ پێست فرۆشی.

الجلید: سیخوار.

المِجْلادُ: شورك، گورز ٥ پارچەیەك پێست یان پەرو کە ئافرەتی شین‌و شەپۆڕکەر پێی لەخۆدەدا.

المِجْلَدُ: بەمانا (المِجْلاد) دێ، (ك: مجالد)ە.

المُجَلَّدُ: جەستەی بێ گۆشت ٥ جەستەیەك پێستی بە ئێسقانەوە نووساوە گۆشتی پێوە نەماوە.

المُجَلَّدُ: (حیوان مُجَلَّدٌ): ئاژەڵێکە لە لێدان ناترسێ.

الجُلَّاذی: پتەو توندو سەخت ٥ بەردوشاخ ٥ وەستا ٥ رەبەن.

الجلذاء: زەوی رەق‌و پتەو ٥ بەردو شاخ.

اجْلَوَّزَ: رۆیی‌و پەلەی کرد لە رۆیشتنەکەیدا.

اجلوَّز المطرُ: تێپەڕی‌و کاتی دواکەوتنی بارینی باران بەردەوام بوو.

اجْلَوَّز به السیرُ: رۆیشتنەکەی بەشێوەی خێرایی بەردەوام بوو.

جَلَزَ في الأرض جَلْزاً وجلیزاً: بەخێرایی رۆیی.

جَلَزَ الشَّیْءَ جَلْزاً: شتەکەی پێچایەوەو توندی کرد.

جَلَزَ الشَّیْءَ الی الشَّیْءِ: خستیە پاڵی.

جَلَزَ الشَّیْءَ بالشَّیْءَ: ئەو شتەی بەم شتە بەست.

جَلَزَ علی الأمر نفسه: لەسەر ئەنجامدانی کارەکە ورەی بەرخۆدا.

جَلَزَ في الأرض: بەمانا (جَلَزَ) دێ ◦ (جَلَزَ الشَّيءَ) بەمانا (جَلَزَ) دێ.
جَلْوَزَ الشرطيُ: پۆلیسەکە بەهێواشی هاتو چۆی کرد.
الجِلاَزُ: هەرشتێك بەسەر شتێکی تردا خوار بکرێتەوەو تێوەی بپێچرێ.
الجَلَزُ: بازنەیەکە دەکرێتە لای خواروی دەسکی رمبو شمشێرەوە.
الجِلَوْزُ: پیاوی کەتەو ئازا: درەختی بندوق ◦ پۆلیس.
الجِلْوازُ: پۆلیس، (ك: جلاوزة)ە.
المَجْلُوزُ: پیاوی گۆشتن‌و شانو مل قەوی ◦ راپەسەندو ئاقڵ.
جَلَسَ جلوساً: دانیشت ◦ (جلس الطائرُ): باڵندەکە هەڵنیشت.
جَلَسَ الشَّيءُ: شتەکە مایەوە.
جَلَسَ فلان جَلْساً: فلانکەس هاتە شوێنێکی بەرزایی‌و پتەو ◦ دەگوترێ: (جلس السحابُ): هەورەکە بەرەو بەرزایی رۆییشتن.
أجْلَسَهُ: دای نیشاند.
جَالَسَهُ: لەگەڵی دانیشت (هو مجالس، جليس) ◦ دەگوترێ: (هو جليس نفسه) ئەگەر لەخەڵك گۆشەگیر بوو.
تجالَسُوا: خەڵکەکە هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان دانیشتن.
اسْتَجْلَسَهُ: داوای لێکرد دابنیشێ.
الجَلْسُ: ئافرەتێك دانیشێ لە حەوشەو بەردەرگاو جێی نەهێڵێ ◦ ئافرەتی رەزان‌و خاوەن رەوشت ◦ شتی ئەستورو درێژو پتەو ◦ شەرابی کۆن، (ك: اجلاس، جلاس).
الجِلْسُ: هاونشین، گێلی تێنەگەیشتوو.
الجَلْسَةُ: یەك دانیشتن، کۆبوونەوەی کۆمەڵێك خەڵك بۆ قسەکردن‌و بریاردان لەسەر پرۆژەیەك ◦ دانیشتنەکە بەکراوە دادەنرێ ئەگەر رێگا هەبوو هەموو کەس ئامادەی بێ، بەداخراو حسێب دەکرێ ئەگەر تایبەت بو بۆ ئەندامەکانی ئەو کارەو سەربەو حیزبو لایەنە.
الجَلَسَةُ: کەسێك زۆر دانیشتبێ
الجِلْسِيُ: دەوروبەری گلێنەی چاو.
الجُلُسَّانُ: گوڵی سپی، یان گوڵی هەڵوەریو.
الجَلِيسُ: هاونیشین ◦ زۆر دانیشتو.
المَجلِس: شوێنی دانیشتن ◦ کۆمەڵێك ئادەمیزادی تایبەتی بۆ تێروانین‌و لێکۆڵینەوەو بریاردان لەسەر شتێك.
مجلس الشعب: یانەو ئەنجومەنی گەل.
مجلس العموم: یانەو ئەنجوومەنی گشتی.
مجلس الاعیان: ئەنجوومەنی پیران.
جِلسرين: شلەمەنییەکی لینج‌و لەزگەییە تامی شیرینەو بێ رەنگە.
جُلاّش: جۆرێکە لە خۆراك، شیرینی لێ دروست دەکرێ.
جَلَطَ الرجلُ جَلْطا: درۆی کرد ◦ سوێندی خوارد.

جَلَطَ الشَّيءَ عن الشَّيءِ: شتەکەی لەو شتە داماڵی، روتی کرد ٥ کوشتی یەکەی کەوڵ کرد ٥ سەری تاشی ٥ شمشێرەکەی روت کرد لە کالان دەری هێنا.

تَجلَّطَ الدمُ: خوێنەکە لەنێو دەمارەکاندا یان لە دەرەوە خەست بووە.

إجْتَلَطَهُ: پاشقولی دا، دزی.

اجْتَلَطَ ما في الاناء: چی لەقاپەکەدا بوو خواردییەوە: دەگوترێ: (إجْتَلَطَ الاناء): قاپەکەی خواردەوە.

إنْجَلَطَ: بۆ موطاوعەی (جَلَطَ) هاتووە.

إنْجَلَطَ الشَّيْءَ عن الشَّيْءَ: ئەو شتە لەو شتە روت بووە.

الْجُلْطَةُ: باقی ماندەی ماست لەقاپدا ٥ پارچەیەك لەخوێن.

جَلَعَ جلوعاً: بێ شەرمو حەیابوو قسەی ناشیرینی کرد.

جلعت المرأةُ: ئافرەتەکە خۆی سفور کردو خۆی بۆ بێگانەو نامەحرەم دەرخست.

جَلَعَ الشَّيْءَ: شتەکەی دەرخست، ئاشکرای کرد.

جَلَعَ الثوب: کراسەکەی داکەند.

جَلِعَ جَلْعاً وجلاعة: بەمانا (جَلَعَ) دێ ٥ بەمانا هەڵگەڕانەوەو دەرکەوتن دێ ٥ بەمانا دەم داپچڕینو کلبەتیژکردنەوە دێ.

جَلِعَت الشفتان: لێوەکان هەڵقرچانو یەکنەکەوتنەوە ٥ دەگوترێ: (جَلِعَ الفم – واللثة): لێوەکان هەڵگەڕانەوەو پوکەکەی دەرکەوت.

جَالَعَ: بەمانا (جَلَعَ) دێ ٥ (جالعت المرأة): بەمانا (جَعَلَت المرأة) دێ.

جَالَعَ فلاناً: کێشەی لەگەڵ فلانکەس کرد بەشێوەی ناشیرین ولامی دایەوە.

إنْجَلَعَ: بۆ مطاوعەی (جَلَعَهُ) هاتووە.

تجالَعُوا: بەمانا کێشەیان تێکەوتو یەکتریان بەجوێن داشت لەکاتی دابەشکردنی ماڵو ساماندا یان لەکاتی خواردنەوەدا یان لەکاتی قورمارکردندا.

الجَليعُ من النساء: ئەو ژنەیە لەلای مێردەکەی خۆ دانەپۆشێ ٥ لە حەدیثی پێغەمبەردا هاتووە: (جليع على زوجها حصان من غيره).

جَلَفَهُ جَلْفاً: بەمانا رامالینو رادان دێ ٥ سپی کردو توێکلی لێ داماڵی گروی پێستەکەی لێ کردەوە ٥ لە بێخ دەری هێناو هەڵی کەند.

جَلَفَ الذبيحة: کوشتییەکەی گرو پێستەکەی کەند.

جَلَفَ الجُلاَفَ: سەری کوڵینەو کۆپەکەی لابرد.

اجْلَفَ الرجلُ: پیاوەکە سەرقاپی کوڵینەو کوپەکەی دوور خستەوە.

جَلَفَ الدهر فلاناً: زمانە ماڵو سامانی پێ نەهێشت.

اجْتَلَفَهُ: بەمانا (جَلَفَهُ) دێ.

تَجَلَّفَ: بۆ (مطاوعة)ی جلف دێ ٥ كزو لاواز بوو.

الجالِفَة: ئەو ساڵەیە ماڵو سامان بفەوتێنێ ٥ برینێك گۆشتەكە بدڕێو نەگاتە ناوەوە.

الجُلاّف: قوڕ ٥ (جلاف الدنّ): ئەو قوڕەیە دەمی كوڵینەو كوپەی پێ سواغ دەدرێ ٥ بەخیلو چروك، گێلو ئەحمەق ٥ كوپەی بەتاڵ ٥ جەستەی بێ سەر ٥ كوشتییەك ناوسكو سەروپێی پاككرابێ ٥ نانی ئەستوری بێ پێخۆر، خەپلەو كولێرە رەقە ٥ لە حەدیثی عوسماندا هاتووە: (كل شيئ سوى جلف الطعام وظلّ ثوب وبيت يستر فضل)، (ك: أجلاف، أجلف جلوف).

الجِلْفَةُ: چاوگی وشەی (جَلَفَ)ەیە. ٥ یەكجار دەگەیەنێ.

الجُلْفَةُ: ئەو شتەیە سپی كرابێ كەوڵ كرابێ توێكڵی لێ كرابێتەوە.

جُلفُ القلم: ئەو شوێنەیە كە دادراوە لەقەڵەمەكە.

الجَليفُ من الرجال: پیاوی چروك، (ك: جلفاء)ە.

الجِليفَةُ: بەمانا (الجلوفة) دێ ٥ بەمانا (الجلوفة)ش دێ.

جَلْفَطَ السفينةَ: لەوحەی كەشتییەكەی لێك بەستنو درزەكانی بەقیرو شتی واپڕكردەوە ٥ لە حەدیثی عومەردا هاتووە: (لا أحمل المسلمين على أعواد نجرها النجار وجلفظها الجلفاظ)

الجلفاظ: ئەو كەسەیە نێوانو درزی تەختە دارەكان پڕ دەكاتەوە بە قیرو شتی وا كون بڕیان دەكا، (ك: جلافِظة).

الْجَلْفَقُ: ئەو ئاسنو دارەیە لەملاو لەولای پەیژەو قالدرمە دەچەسپێنرێن بۆ ئەوەی كەسیان لێ بەرنەبێتەوە (محەجەرە).

جَلَقَ الشَيْءَ جَلَقاً: پەردەی لەسەر لادا (جَلَقَ رأسه) سەری تاشی.

جَلَقَ الحصن: بەمەنجەنیق ئاگر بارانو بەردبارانی قەڵاكەی كرد.

جَلَّقَ الحصنَ: بەمانا (جَلَقَ) دێ.

تَجَلَّقَ: پێكەنی بەجۆرێك كە دوا خرێی ناودەمی دەركەوت.

الجُلاّقة: تۆزقاڵێك، دەگوترێ: (ما عليه جُلاّقة لحم): تۆزقاڵێك گۆشتی پێوە نەماوە.

الجلَقَةُ: ئەو كۆئەندامانەی ئادەمیزاد پێكەنینیانی پێ ئەنجام دەدا.

جِلِقُ: ناوێكی كۆنی شاری دیمشقە.

الجِلِقُ: دانەوێڵەیەكە وەكوو گەنم وایە لەولاتی یەمەن دەڕوێ.

الْجَوَالِقُ: جەواڵ، (ك: جواليق وجوالقات)ە.

الْجِوَالِقُ: بەمانا (الجَوالِقَ).

المَنْجَليقُ: مەنجەنیق ئامرێكی شەڕە بەردی پێ هەڵدەدرێ بۆ شوێنی دوور، (ك: مَجَاليقَ)ە.

**جَلّ عن موطِنه جلالاً**: دەرچوو لە وڵاتی خۆی.
**جَلّ الشَّيْءَ جلاً**: زۆربەی شتەکەی وەرگرت.
**جَلّ الدابّةَ**: جلی خستە سەرپشتی وڵاغەکە.
**جَلَّ الجِلَّة**: هەڵی گرتەوەو کۆی کردەوە.
**جَلَّ الدابّةُ الجِلَّة**: وڵاغەکە کشپلو شیاکەی خوارد.
**جَلَّ الشَّيْءَ عليه**: رایکێشاو چنی.
**جَلَّ جلالاً وجَلاَلةً**: گەورەو شکۆ مەند بوو، (ك: أجلّة اجلاّء): هەروا بەمانا تەمەن درێژی دێ ٥ بەمانا (قالّ بوو ئەزموونو تەجرەبە لەبێژینگی داوە) ٥ بەمانا: (پاكو بێگەردو بەرزو پیرۆزە).
**أجَلّ فلان**: فلان گەورە بوو، هێزی پەیدا کرد.
**أجَلّ فلاناً**: فلانی بەگەورە داناو رێزی لێگرت ٥ بە پیاوێکی گەورەی بینی.
**أجَلّ الشَّيْءَ**: گشتگیری کرد ٥ هەموانی بوو ٥ لە دوعای نوێژە بارانەدا دەگوترێ: (وابلاً مُجَلَّلاً): بارانی دڵۆپە گەورەو گشتگیر.
**جَلَّلَ الدابّةَ**: جلی لە وڵاغەکرد.
**اجْتَلَّ الجِلَّةَ**: بەمانا (جَلَّها) دێ ٥ (اجتلّ الدابّة الجلة) جلی لە وڵاغەکە کرد.
**تجالّ فلان**: فلانکەس کەوتە ساڵەوە پیربوو.
**تَجَالّ عنه وعليه**: خۆی بە بەرز گرتو خۆی بەزل زانی.
**تَجَالّ فلاناً**: فلانکەسی بەگەورە داناو رێزی لێ گرت.
**وتَجَالّ الشَّيْءَ**: زوربەی زۆری شتەکەی ورگرت.
**تَجَلَّلَ به**: خۆی پێ داپۆشی ٥ (تَجَلَّلَ الشَّيْءَ) زۆربەی شتەکەی وەرگرت ٥
**إجلال**: خاترو خوایش، دەگوترێ: (فعلت كذا من اجلالك)، (ومن أجل اجلالك): ئەو ئیشەم لەبەر خاتری تۆ ئەنجامدا.
**التَّجِلَّةُ**: بەمانا (اجلال) دێ ٥ هەم بەمانا (الجلال) دێ ٥ دەگوترێ: (هم قوم ذوتَجِلَّةٍ) و(فعلت هذا من تجلتك).
**الجالة**: کۆمەڵە خەڵکێك کە تازە هاتبنە وڵاتێك ٥ ئێستا هەر بەوشە عەرەبیەکە ناوزەد دەکرێ، دەگوترێ: (جالية كذا).
**الجَلاَل**: بەمانا خاترو خوایش دێ ٥ دەگوترێ: (فعلت كذا من جلالك): ئەوەم کرد لەبەرخاتری تۆ.
**الجُلاَل**: زۆرینەی هەموو شتێك.
**الجلاَلُ**: پەردە، کۆی (جُلّ)٥ (الجلائل) کۆی (جليلة)یە.
**الجَلّ**: سەرجلو پەشمەكو خێمەیە کە وڵاغی پێ دادەپۆشرێ، (ك: جلال، اجلال) ٥ هەروا بەشیراعی کەشتی دەگوترێ ٥ ئەوکاتە کۆیەکەی

(جُلـولُ، أجـلال)ە ٥ لاسـكی روەك‌و قەدەكەیـەتی كاتـێ گوڵەكـەی پێـوە نەمێنێ ٥ گوڵی (عُرْفُ الدیك)ە.

**الْجُـلُّ**: بـەمانا (الجَـلُّ) دێ ٥ لـە هـەموو شـتێك زۆرینـەو زۆری دەگەیـەنێ ٥ لـــە خـــانوو: دیـــوارو هۆدەكـــانی دەگەیـەنێ ٥ هـەروا بـەمانا خـاترو خوایش دێ، دەگوترێ: (فعلـت كـذا من جُلِكَ).

**الجِلُّ**: گەورەو مەزن ٥ پێچەوانەی (الدِقّ) دێ ٥ لە حـەدیـثدا هـاتووە: (اللـهم إغفـر لِـي ذنبـي كِلِـهِ دِقِـهِ وجِلِـهِ) هـەرواناوە بـۆ قـەدو لاسـكی روەك كاتێ گوڵەكەی لێ دەكرێتەوە.

**الْجَلَلُ**: شتی گەورەو كاری مەزن‌و پیرۆز ٥ لـــە هـــەمان كاتـــدا بـــەمانای پێچـــەوانەش دێ ٥ واتـــە: شـــتی بچوك‌و بێ نرخ.

**الْجِلَّةُ**: ئامێرێكە بۆ خورما لێكردنەوە.

**الْجُلَّــی**: كـــاری نـــاخۆش‌و چـــورتم‌و تەنگانـەو بـەڵای گـەورە لـە پەنـدی پێشینانـدا هاتووە (لا یُـدْعی لِلْجُلـی الاأخوها) كاری گەورەو ئەركی گـران دەخرێتە ئەستۆی پیاوی خۆی.

**الْجَلاّء**: بەمانا (الْجُلی) دێ.

**الْجَلاّلَـةُ** مــن الماشـیة: ئەوەیـە قشـپل‌و شیاكە بخوا.

**الجلیل**: ناوێكە لە ناوە جوانەكانی خودا ٥ لـە زانیـاری فەلسـەفەدا بـە شتێك دەگوترێ: لە سنوور تێپەڕی كردبێ لـەروی رەوشـت‌و فـەنن‌و فیكـرەوە ٥ دەگوترێ: (منظر جلیل رائع).

**الْمَجلَّـة**: پـەڕاو، گۆڤـار كـە زۆر لایـەنی زانسـتی تێـدا تۆمـار دەكـرێ ٥ لـە بوارێـــك لـــە بوارەكـــانی فـــەنن‌و ئەدەبـدا كـە مانگانـەو وەرزانـەو ساڵانە دەردەچـن، نـەك رۆژ نامـەی رۆژانە، (ك: مِجال مجلات)ە.

**جَلَمَ الشَّیْءَ جَلْماً**: شتەكەی بڕیەوە تاشی.

**جَلَمَ الشعر والصوف**: مـوو خوریێەكە بە برینگ بڕییەوە.

**جَلَمَ الحیـوانَ**: گۆشـتی سەر ئێسقانی حەیوانـە كوشتییەكەی داتاشی‌و لێی كردەوە.

**اجْـتَلَمَ الحیـوانَ**: كوڵـك‌و مووەكـەی بـە برینگ لە ئاژەڵەكە كردەوە.

**الْجُلاَمَـــةُ**: ئـەو خـوری‌و مـوو كوڵــك‌و بەرگنەیە لە حەیوان كرابێتەوە.

**الجَلَمُ**: برینگ، مانگی یەكشەوە.

**الْجَلَمَـانُ**: لەسـەر كێشـی (فَعَـلاَن)ە ئـەو مقەست‌و برینگەیە خوری‌و مووەكەی پێ دەبڕدرێتەوە، (ك: جِلام)ە.

**الجِلْمُ**: بەزی ورگ‌و ریخۆڵە.

**الْجَلَمَـدُ**: بـەرد ٥ پیـاوی ئـازاو مـەرد ٥ دەنـگ گـەورە ٥ جەڵەبـە حـەیوان ٥ ئاژەڵی بەتەمەن، (ك: جلامِد)ە.

**الْجُلْمُـدُ** مـن الرجـالِ: پیـاوی ئـازاو بەجەرگ‌و چاونەترس.

**الجِلْمِدُ**: بەردی گەورە لەناوی كەمدا.

**الْجَلْمَدَةُ من الأرض**: زەوی بەردەڵان ٥ کە بۆ پیاو بەکار هێنرا ٥ بەمانا ئازاو نەبەردە ٥ هەروا بەمانا (مانگا)ش دێ، (ك: جَلاَمِدُ).

**الْجُلْمُودُ**: بەمانا (الْجَلْمَدُ)دێ، (ك: جلاميد)ە ٥ دەگوترێ: (ألقى عليه جلاميده) واتە قورسایی خۆی خستە سەر.

**جَلْمَقَ القَوْسَ**: کەوانەکەی بە تیلمە سیرم پێچا.

**الجِلْمَاقُ**: ئەو سیرمەو چەرمەیە کەوانی پێ بپێچرێ، (ك: جلاميق)ە.

**الْجَلْمَقُ**: خێوەت، (ك: جلاميق)ە.

**الْجُلْنَارُ**: گوڵی درەختی هەنار.

**جَلَهَ الرجُلَ جَلْهاً**: پیاوەکەی لەکارێکی گرنگو ترسناك گێڕایەوە

**جَلَهَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ئاشکرا کرد.

**جَلَهَ البَيْتَ**: خانووەکەی واڵێ کرد بێ دەرگاو پەردەو پەنجەرە بوو (هو مجلوه).

**جَلَهَ العَمَامَةَ**: میزەرەکەی لە پێشە سەری بەرزکردەوە.

**جَلِهَ جَلَهاً**: ناوچەوانی پان و گەورە بوو موی پێشە سەری بەرەو دواوە هەڵدرانەوە ٥ یان هەر پێشەسەری موی لێ نەڕوا.

**الأَجْلَهُ**: کەڵەگای بێ شاخ.

**الْجَلَهَةُ**: بەردی گەورەی خڕ ٥ گەڕەك و هۆبەی قەوم ٥ کەنارێك لە دوو کەناری روبار ٥ خورمایەك دەنکەکەی دەرهاتبێ و بەماست یان بە رۆن تێکەڵ بکرێ.

**الْجَلِيهَةُ**: خورما ناوکەکەی دەرهاتبێ و بەماست یا بەرۆن تێکەڵ بکرێ ٥ شوێنێك لە خڕکە بەرد پاککرابێتەوە.

**جَلْهَزَ**: چاو پۆشی لەو شتە کردو شاردیەوە، دەیزانی لەکوێیەو چی دەکا خۆی لێ بێ ئاگاکرد.

**الجُلاَهِقُ**: قوڕی خڕی لوسکراوی سواوە، کەلاگلێنە، ئەو بوندوقەی پێی دەهاوێژرێ، (ك: الجَلاهق)ە.

**الْجَلْهَمُ**: روەکێکە لە پێڕی نەبکەکانە.

**الجُلْهُمُ**: بەردی گەورە تاوێرە بەرد، (ك: جَلاهِم).

**الْجَلْهَمَةُ**: یەکێك لە لێوارەکانی روبارە، (ك: جَلاهِم).

**الجُلْهَمَةُ**: بەمانا (الْجَلْهَمَةُ) دێ. توندو تیژی و چورتم ٥ پلان و نەخشە.

**الجُلْهُومُ**: کۆمەڵی زۆر.

**جلا القوم عن الوطن ومنه جَلاءً وجَلْواً**: خەڵکەکە لە برسان یان لەترسان نیشتمانیان جێ هێشت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا أن كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِمُ الْجَلَاءَ لَعَذَّبَهُمْ فِي الدُّنْيَا﴾.

**جلا الأمر جلاءً**: کارەکە ئاشکرا بوو دەرکەوت.

**جلا فلان عينه**: فلاَنکەس چاوی خۆی رشتن.

**جلا بثوبه**: پۆشاکەی خۆی فرێ دا.

جَلاَ العدو أو الجـدبُ القـومَ عـن أوطـانهم: دوژمن یان گرانیو قاتو قـڕی ئـەو قەومـەی لەزێـدو نیشتمانی خۆیان دەرپەڕاند.

جَــلا النحــلَ جــلاءً: دوکـەڵی بەسـەر هەنگەلانەکـەدا کـرد قـانگی دان بـۆ ئەوەی هەنگوینەکە ببڕێ.

جَلا السیفَ والفِضَّـةَ والمـرآة ونحوهـا جَلْـواً وجلاءً: مشتو مـاڵی کـردن ژەنـگو چڵکی لێ داماڵین ٥ دەگوترێ: (جـلا بصره بالكحل): چاوی بەکل ڕشتن.

جَلَت الماشِطَةُ العروسَ على بَعْلِها: ئافرەتـە بوکڕازینەرەوەکە بوکەکەی ڕانواند بۆ زاواکە، وای کرد چاوی پێ بکـەوێ بـە ڕازاوەییو جوانکراوی.

جــلا الــزوجُ عروســه: زاواکــە سـەیری بوکەکەی کرد بەڕازاوەیی.

جلا الزوجُ عروسه وصـيفةً أو غيرهـا جلـواً: زاواکـە کارەکـەرێکی پێشکەش بـە بوکەکـەی کـرد لـەکاتی ڕازانـەوەو خۆجوانکردندا.

جـلا الأمْـرَ جـلاءً: شـتەکەی ئاشـکراکرد، پەردەی لەسەر کارەکە هەڵگرت.

جَــلا فلانــاً الأمْــرَ جلـواً: شـتەکەی بـۆ فلانکەس ئاشکرا کرد.

جلا فلاناً وعنـه الْهَـمَّ: غـەمو خەفـەتی لـە دڵی فلانکەس دەرکرد.

جَلَى السیْفَ والفضة ونحوها جَلْياً وجـلاءً: ژەنــگو چڵــکەکەی لێ کردنــەوەو مشتو ماڵی کردن.

جليت السماءُ جَلًى: ئاسمان هەسـاو بـوو هەوری پێوە نەما.

جليت الليلةُ – والجبهةُ: شەو درێژ بوو ٥ ناوچـــاوانی پـــان بـــوو، مـــوی پێشەسەری پاشەکشەیان کرد.

جَلَـى الرجـل: پیاوەکـە قـژی پێشەسـەری بـەرەو دوا هەڵدرانـەوە گردبونـەوە یان هەر قژی پێشە سەری نەڕوان ناوچـــەوانی بـــاش دەرکـــەوت دەگـوترێ: (هو أجلى، وهي جَلْـواء)، (ك: جُلوٌ).

أجْلَى القومُ عن المكان ومنه: خەڵـکەکە لەو شوێنە دەرپەڕین لـە ترسـان یـا لە بەر قاتو قڕی.

أجْلَى الناسُ عن الشَّيْئِ: خەڵکەکە لـەو کارەساتو چورتمە ڕزگاریان بوو.

أجْلَى يعدو: پەلەی کردو ڕۆیشت.

أجْلَى الجَدْبُ أو العَدُوُّ القومَ عن مكانهم: قـاتو قـڕی یـان دوژمـن ئـەو گـەلو نەتەوەیــەی لــە شــوێنی خۆیــان دەرپەڕاند.

أجْلَـى عنـه الْهَـمُّ: خـەمو خەفـەتی لـەدڵ دەرهاویشــت ٥ لــەکاتی پاڕانــەوە بــۆ نەخۆش دەگوترێ: (أجلى الله عنه) خـودا ئەو نەخۆشییە لە جەستەی دەربهاوێ.

جَالَيْتُهُ بالأمر: کارەکەم ئاشکرا کرد.

جَلّي الفرسُ تَجلیةً: لەرمبازیـدا ئەسـپەکە پێش کەوت.

جَلِيَ البازى: هەڵۆکە سەری بەرز کـردەوە ئەمجار ڕوانی.

**جَلِيَ ببصره**: چاوی تێبڕیو سەیری کرد وەکوو چۆن هەڵۆ بۆ نێچیری خۆی دەڕوانێ.

**جَلَي عن نفسه**: بیرو رای خۆی دەربڕی.

**جلي النهارُ الظلمة**: رۆژ تاریکی رادا، رەیماڵی.

**جلى الأمرَ والَهمَّ عنه**: کارەکەی لەسەر لابرد ٥ خەفەتی لە دڵ دەرکرد.

**جلى القَوْمَ عن أوطانهم**: ئەو نەتەوەی لە نیشتمانی خۆیان وەدەرنا

**جَلَي فلان عروسه وصيفةً أو غيرها**: زاواکە کارەکەرێك یان دیاری تری پێشکەشی بوکەکەکرد لەکاتی خۆرازاندنەوەدا.

**اجْتَلَى القومُ عن الموضع**: ئەو نەتەوە لەو شوێنە دەرچوون و بلاوەیان لێکرد.

**أجْتَلَى الجَدْبُ أوِ العَدُوُّ القوم عن موضعهم**: گرانی یان دوژمن ئەو قەومەی لەشوێنی خۆیان دەرپەڕاند.

**اجتلى العروسُ على بعلها**: بوکەکەی بۆ زاواکە رانواند بە ئارایشکراوی نیشانی دا.

**اجتلى الشَّيْئَ**: سەیری شتەکەی کرد.

**اجتلى العروسَ بَعْلُها**: مێردەکە سەیری ژنەکەی خۆی کرد لەکاتێکا رازێندرابۆوە.

**أجْتَلَى السَّيفَ**: شمشێرەکەی مشت و ماڵ کرد.

**اجتلى العمامة**: مێزەرەکەی بەرزکردەوە لەسەر ناچەوانی لای برد.

**اجتلى العمامة عن رأسه**: مێزەرەکەی لەسەری کردەوە.

**إنجلى**: بۆ موطاوعەی (جلاە) هاتووە.

**تجاليا**: ئەو دووە بەنهێنی بەکتریان زانی و لێك ئاشکرا بوون.

**تجلى الشَّيْئَ تجلياً**: بۆ مطاوعەی (جلاّە) هاتووە.

**تَجَلَّى الصقرُ**: هەڵۆکە چاوی نوقاندن و پاشان کردنیەوە بۆ ئەوەی چاوەکانی باش ببینن.

**اجْلَوْلَى**: لەولاتێکەوە رۆیی بۆ ولاتێکی تر.

**الأجلى**: روخسار جوان (ابن الأجلى) شێرە ٥ پیاو ماقوڵ و گەورە پیاو ٥ بەیانی ٥ کارو شتی ئاشکرا.

**الجالية**: ئەو کەسانەی لەولاتی خۆیان دەرچون و کەوتوونە ولاتێکی تر ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد کە لەولاتێکی تازەدا ژیان بەسەر دەبەن، ئەو ولاتە تازەیە لەبنەڕەتدا زێدو نیشتمانی ئەوان نییە. هەروا وشەی (الجالية) بە ئەهلی زیممەش دەگوترێ ٥ هەروا بەهەموو کەسێك دەگوترێ کە سەرانەیان لێ بسەندرێ، با لەزێدو نیشتمانی خۆشیاندا مابنەوە.

**الجلا**: کل ٥ (ابن جلا): پیاو ماقوڵ: کەسێك ناسراوبێ و خەڵکی رێزی لێ بگرن، شوێن جێگەی دیاربێ بە پەنجە ئاماژەی بۆ بکرێ.

**الجَلاءُ**: کاری ئاشکرا ٥ شایەت و بەڵگە

لـەدادگادا ٥ كلـە سـوبحانی ٥ كـاتی روناكی رۆژ، دەگـوترێ: (مـا أقمـت عنده الا جلاء يوم).

الجِلاَءُ: كل (كله سوبحاني) لـە حـەديثـی ئوممـو سـەلەمەدا هـاتووە: (كرهـتُ لِلْمُحِدّ أن تكتحِلَ بالجلاء).

جلاء فلان: ئـەو كونيـەو نازناوەيـە كـە دەبێتە نيشانەی رێز لێگرتنی.

الجِلْـــــوَةُ: رازاندنـــــەوەی بـــــوك ٥ ئەوديارييەيە زاوا دەيدا بەبوك.

الجَلِيَّةُ: هەواڵی راست، راستی رووداو.

المَجَـالي: شـوێنی روتانـەوەی سـەر ئـەو شوێنەی لەسەر تووكی پێوە نەمابێ، كە زوربەی كات پێشەسەر دەگرێتەوە.

الجلوكومـــا: نەخۆشـــييەكە نيشـانەكەی ئەوەيـە فشاری خـوێن لـەناو چـاودا پەيدا دەبێ.

جَمِئَ على فـلان جَمَـأً: رقـی لەفلانكـەس هەڵسا ٥ (هو جمِئٌ).

جَمِئَ الفَرَسُ: پەڵە سـپييەكەی جەسـتەی درێژ بووە (هو أجمأ)

تَجَمَّأَ القومُ: قەومو خوێش كۆبوونەوە.

تَجَمَّأَ فـلان في ثيابه: خـۆی كـۆكردەوە، خۆی گرمۆڵە كرد.

تَجمأ على الشَّيْئَ: خۆی بەسەر شتەكە دا داو دايپۆشی.

الجَمَأ: كەس.

الجِماءَ: بەمانا (الجمأ) دێ.

الْمُجَمَّأ فرس مُجَمَّأٌ: ئەسپێكە پەڵەسپی ناوچاوانی درێژە.

الْجُمْبَازُ: جۆرە يارييەكی وەرزشە.

جَمجم فلان: فلاّنكـەس قسەكەی خـۆی رون نەكردەوە هەرمينگە مينگی بوو.

جمجم كلامَهُ: قسەكانی بە تونێكڵ كردن.

جمجم الشَّيْئَ في صـدره: شـتەكەی لـەدڵی خۆی داهێشتەوەو ئاشكرای نەكرد.

جمجم فلاناً: فلاّنكەسی بەهيلاك برد.

تَجَمْجَمَ فلان: بەمانا (جَمْجَمَ) دێ.

الجُمْجُمُ: شتی زێر پێ دراو.

الجُمْجُمَـةَ: ئيسـقانی سـەر كـە مێشـكی لەخۆ گرتووە ٥ بـەمانا (سـەر) دێ ٥ ئـــادەميزاد ٥ ســـەرۆك خـــێڵو فـەرمانڕەوا ٥ وەجـاخزادە ٥ پياڵـەی ئـاو خواردنـەوە كـە لـە دار دروست كرابـێ وەكـوو (كاســە) ٥ ئـامێری پێوانـە وەكـوو قسـناخ ٥ هـەوجاڕ ٥ بيريك كە لـەزەوی هـەڵۆڵو خراپدا لێ بدرێ، (ك: جُمْجُمُ، جَمَاجِمُ)

جَمَـحَ الفَـرَسُ جَمحـاً وجموحـاً وجماحـاً: ئەسـپەكە سـەركەش بـوو بەويستی خاوەنەكـــەی رەوی نـــەكرد، (ك: جوامح وجُماح)٥.

جَمَحَ الرجلُ: پياوەكە هەر بەقسەی خـۆی كـردو شـوێن هـەواو هەوەسـی خـۆی كەوت ٥ (هو جامح وجموح).

جَمَحَت السفينة: كەشتييەكە لـەڕێڕەوی خۆی لادەداو كەشتييەوانەكان نەيان توانی كۆنترۆڵی بكەن.

جَمَحَتِ المَفازَةُ بالقوم: بیابان‌و سارایە کە بەهۆی دووری‌و بەرفراوانییەوە ئەو هۆزەی بەهیلاك برد.
جَمَحَ فلان إلى كذا: فلانكەس پەلەی كرد بۆ فلان شت.
جَمَحَت المرأة من زوجها: ژنەكە لەماڵەوە بەرق هەڵساوی هاتە دەرەوەو رۆیشتەوە بۆ ماڵی باوانی بەبێ رازی بوونی مێردەكەی.
الجُمَّاحُ: تیروكەوانی بێ سەرتیرە، شتێكی سەرخرە پێی فێری تیرهاوێژی دەبێ ٥ تیرێكە قوڕی لەسەرەكەی دەدرێ دەهاوێژرێتە باڵندەو شتی وەها، (ك: جامیح).
الْجُمَخْلُ: گیانلەبەری ناو صەدەف.
جَمَخ جَمْخاً: لوتبەرزی نواندو خۆی بەزلزانی‌و شانازی كرد ٥ (هو جامخ وجموخ وجميخ وجُمّاخ، (ك: جُمَّخٌ).
جَمَخَ الصَّبِيَ: منداڵەكە بازی هاویشت.
جَمَخَ الصبيان بالكِعاب: منداڵەكان یاریان بە تۆپەڵەكرد.
جَمَخَ الخيلَ والكِعاب: ئەسپەكەی تاودا تۆپەكەی هاویشت.
جَمَخَهُ: شانازی بەسەردا كرد.
جَمَدَ الماءُ والسائلُ جَمْداً: ئاوەكە بەستی شلەمەنییەكە رەق بوو
جَمُدَت عينه: چاوی بێ فرمێسك بوو فرمێسكی كەم هەڵوەراند. (فهي جامدة وجمود.)

جَمَدت الناقةُ أوالشاةُ: حوشترەكە یان مەڕەكە شیری كەم بوو
جَمُدَتِ الأرض: زەوییەكە بارانی لێ نەباری.
جَمدت السَّنةُ: ساڵەكە بێ باران بوو وشكە ساڵ بوو بارانی تێدا نەباری.
جَمُدَ فلان: فلانكەس دەس قوچاو بوو ٥ دەگوترێ: (جَمُدَتْ كَفُّهُ): دەست قوچاو بوو، (فهو جامد وجماد الكف).
جَمُدَ حق فلان: مافی فلان چەسپا.
جَمَدَ الشَّيْئَ جَمْداً: شتەكەی بڕییەوە.
أجْمَدَ فلان: فلانكەس كەوتە مانگی (جُومادی)ییەوە ٥ بەخیلی‌و چروكییەكەی پەرەی ساند ٥ خێرو بیری كەم بوو ٥ مافی فلان چەسپا.
جَمَّدَ الماءَ والسائل: نزیك بوو ئاوەكە یان شلەمەنییەكە بی بەستێ.
الجامِدُ: سنووری نێوان دوو پارچە زەوی یان دوو خانوو، (ك: جوامد)٥.
الجَماد: بەشی سێیەم لە بونەوەردا.
جَمادِ: بەدەست قوچاوو چروك دەگوترێ: بۆ زەمكردنی بەپێچەوانەی (حَمادِ) بۆ مەدحكردن بەكاردێ.
الْجَمْدُ: سەهۆڵ.
الْجَمَدُ: بەمانا (الْجَمْدُ) دێ ٥ گردۆلكەیەكی رەقەڵان‌و سەخت، بەردو شاخ، (ك: اجماد جِماد)٥.

**الْجُمْـــدُ**: گردۆڵـــكەی ڕەقو ســـەخت لـــە زەوی، (ك: جِماد وأجماد)ە.
**جُمَادِي**: یەكێكە لەمانگە عەرەبییەكان دوو مانگ هەن ناویـان (جُمـادی)یـە (جمادی یەكەم) و (جُمادی دووەم).
**جُمَـادی**: بـە ڕۆژانـی زسـتان دەگـوترێ: چـونكە لـەو ڕۆژانـەدا ئـاو دەبێتـە ســـەهۆڵو دەیبەســـتێ ە لەپەنـــدی پێشیناندا هاتووە دەڵێ: (شـهرا ربیـع كُجُمَادی البؤس) بەكەسێك دەگوترێ كە لە هەموو حاڵێكدا ئاخو ئۆف بكا لـە خۆشـیو ناخۆشـی دا ئـەو هـەر زاكـەی بـێ، دەگـوترێ: (ظلـت العـینُ جمادی) چاوەكان بێ فرمێسكن.
**الجُمَّـادُ**: (سـیف جَمَّـادٌ): شمشـێرێكی بڕندەیە.
**جَمَـــرَ الفَـــرَسُ جَمْـــراً**: بـــە پێوەنـــدەوە ئەسپەكە بازی دا.
**جَمَرت الدابةُ**: وڵاغەكە بـازی هاویشـتو بەگورجی ڕۆیی.
**أَجْمَرَ القومُ**: قەومو خوێش كۆبونەوە.
**أَجْمَرَ الفرسُ**: بەمانا (جَمَرَ) دێ.
**أجْمَـــرَتِ الليلـــةُ**: شـــەوەكە بـــەردەوام مانگەشەو بوو.
**أجْمَرَ ثوبَهُ**: پۆشاكەكەی گوڵاو پڕژین كرد.
**أجْمَـرَت المـــرأةُ**: ئافرەتەكـــە قـــژەكانی لەپاشە سەری داكۆكردەوەو لە دواوە توند بەستیو بەری نەدانەوە.
**أجْمَرَ الرجـلُ شـعره**: پیاوەكـە قـژەكانی كردنە گودلەو كاكۆڵ.
**أجْمَرَ الأمرُ بنی فلان**: ئەو كارە هەموو خێڵی فلانی گرتەوە.
**أجْمَرَ الخَيْلَ**: ئەسپەكەی لاوازكرد وای لێ كرد ورگی بچوك بووە.
**اجْمَرَ الجِمَارُ الخفَّ والحافِرَ**: كرۆكی دارخورما سمی وڵاغەكانی پتەو كرد.
**جَمَّرَ القومُ**: خزمو خوێش كۆبوونەوە.
**جَمَّرَ الحاجُ**: حاجی ڕەجمی شەیتانیان كرد.
**جَمَّـــرَ الرجـــلُ**: پیاوەكـــە كرۆكـــی دارخورماكـــەی بـــڕی ە دەگـــوترێ: (جَمَّـــرَ الرجـــلُ النخـــلَ): پیاوەكـــە درەختە خورماكەی بڕی.
**جَمَّـرَت المـرأةُ**: بـەمانا (أجْمَـرَتْ) دێ ە دەگـوترێ: (جَمَّـرَت شـعرها): قـژی لەپاشە سەری بەست.
**جَمَّرَ الشَّيْءَ**: شتەكەی كۆ كردەوە.
**جَمَّـرَ الأمـــيرُ الجَـــيْشَ**: پاشـا سـوپاكەی كـــۆكردەوە لەبـــەرەكانی جـــەنگ دا دایمەزراندنو نەیهێشت بگەڕێنـەوە بۆ ماڵەوە.
**جَمَّـرَ اللَّحْـمَ أو الخُبْـزَ**: گۆشـتەكە یـان نانەكەی خستەسەر پشكۆ ئاگر.
**جَمَّرَ الثوبَ**: كراسەكەی بوخار پڕژێن كرد.
**اجْتَمَـــرَ بـــالمِجْمَرَةِ**: بـــە گوڵاوپـــڕژێن پۆشاكەكەی ڕشاند.
**تَجَمَّرَ القومُ**: خزمو قەوم كۆبونەوە.
**تَجمَّرَ الجَيْشُ**: سوپاكە لەبەرەی جەنگدا قەتیس ما.

استجْمَرَ القومُ: قەومەکە کۆبوونەوە.

استَجْمَرَ الرجلُ: پیاوەکە بە بەرد خۆی پاك کردەوە.

الجامور: کرۆکی دار خورما ناوەروکی ◊ تاکەکەی (جامورة)ە هەروا ناوە بۆ گۆڕ ◊ بۆ سەر.

الجَمَارُ: کۆمەڵو جەڵەب جەڵەب ◊ دەگوترێ: (عدّ فلان ابله جماراً).

الجَمَارُ: بەلای جولەکەوە رافەی (المِثنی)یەو تەواوکەریەتی.

جُمَاري: هەموو: دەگوترێ: (جاء القوم جُمــاری): قەومەکە هەموویان بەکۆمەڵ هاتن.

الجَمْرَةُ: پشکۆ ئاگر ◊ لە پەندی پێشینان‌دا هاتووە (لوقلت تَمْرَةَ لقال جَمْرَةً) بۆ کەسێك دەگوترێ: هەرلایەنی دژایەتی بگرێ ◊ هەروا ناوە بۆ بەردە وردکە ◊ بەزوریش ناوە بۆ ئەو بەردە وردانەی حاجیەکەن رەجمی شەیتانی پێ دەکەن ◊ تاریکی شەو کەبگاتە ئەوپەڕی ◊ گەلو نەتەوەیەك یەکگرتوو بنو کەسیان لێ تەرەنەبێو لەگەڵ کەسی تر پەیمانبەستو سوێندخۆر نەبن ◊ دەگوترێ: (هم جَمْرَة) ئازاو نەبەردو داکۆکیکەرن لەوڵاتو خێڵو نەتەوە ◊ بەمانا رقو تورەییش هاتووە لە پەندا دەڵێ: (إهرق على جمرِك ماءً) ئاو بکە بەسەر پشکۆی رقو تورەییتدا.

الجُمَارُ: ناوەرۆکی دارخورما تاکەکەی (جمارة)ە ◊ لە پەندی پێشینان‌دا هاتووە ◊ (جُمارَة نؤكل بالهُلاَس) بۆ ماڵو سامان دەگوترێ: یەکێك بەنارەحەتی کۆی دەکاتەوە دوایی دەبێتە میرات بۆ ئەبلەو نەزان ◊ لە زانستی روەکناسی دا بەناوەڕۆکی روەکەکە دەگوترێ.

الجَمِيْرُ: کۆمەڵگای گەلو نەتەوە ◊ لەقژ ئەوەی کراوە بە کاکۆڵو گودلە.

ابن جمير: شەوی زۆر تاریك ◊ مانگی یەکشەوەی ون.

ابنا جميـر: شەوو رۆژ.

الجميرة: زولف کە دهۆندرێتەوە.

المِجْمَرُ: مقەڵی، ئاگردان ◊ ئەو شتەی پشکۆ ئاگری تێدا دادەنرێ ◊ ئەو دارە عوودەی دەسوتێ بۆن بڵاودەکاتەوە، (ك: مجامِرَ)ە.

المُجْمَّرَ: بخور؛ بخورد.

الجَمرك: گومرگ وشەیەکی (تورکی)یە بە عەرەبی پێی دەگوترێ: (مکس).

جَمَزَ الفرسُ ونحوه جَمَزاً وجَمَزى: ئەسپەکە بە گورگە لوقە رۆیی، رۆیشتنەکەی نزیك بوو لەراکردن ◊ بازی دا.

جَمَزَ الانسانُ: بەپەلە رۆیی.

جَمَزَ فلان في الأرض: رۆیی بەناو زەویدا.

جَمَزَ فلان به: گاڵتەی پێکرد.

الجُمْزُ: باقی ماندەی لاسکی هێشوە خورما، (ك: اجماز وجموز).

الْجُمْزَةُ: ئەو لاسكو سەرە لقو پۆپە كە دانەوێڵەكەی پێوەیە.

الْجَمّاز من الدواب: ولاغی خۆشڕۆو بەراپەڕ.

الْجُمّازَةُ: جبەیەكە لە خوری دروستكرابێ قۆڵەكانی تەسك بن ٥ لە حەدیثدا هاتووە كە پێغەمبەر (د.خ): (توضأ فضاق عن يديه كما جمازة كانت عليه).

اَلْجَمّازَةُ: ئامێرێكە بۆ سواربوونو شت گواستنەوە لە شێوەی عەرەبانەدا ئەسپ رای دەكێشێ.

الْجُمَّيْزُ: جۆرە درەختێكە میوەكەی دەشوبهێتە هەنجیر.

الْجُمَّيْزى: بەمانا (الْجُمَّيْزُ) دێ.

جَمَسَ السمنُ ونحوه جمساً وجموساً: رۆنەكە رەق بوو، بەستی.

جَمَسَ النَّبْتُ: رووەكەكە ناسكیو تازەییەكەی نەماو رەق بوو ٥ لە حەدیثدا هاتووە لە ئیمامی عومەریان پرسی دەربارەی مشكێك بكەوێتە ناو رۆنەوە، لەوەڵامدا وتی: (ان كان جامساً الْقِيَ ماحوله وأكل، وان كان مائعاً أريق كله).

جَمُسَ السَّمنُ جُمُوسة: بەمانا (جَمَسَ) دێ.

الجاموس: گامێش ٥ رەشە ولاغێكە لەمانگا گەورەترە بەخێو دەكرێ بۆ جوتو بۆ شیردان.

الْجُمَاسِية: دەگوترێ: (ليلة جماسية شەوێكی سارده ناو دەیبەستێو دەبێ بە سەهۆڵ.

اَلْجَمْسَةُ: ئاگر.

الْجُمْسَةُ: خورمای وشك ٥ خورمای تازە پێگەیشتووی كەشیرین نەبووبێو نەرمیش نەبووبێ ٥ جەڵەبە حوشتر، (ك: جُمْسٌ)٥.

جَمَشَ نبات الأرض جَمْشاً: گیاو گژی زەوییەكەی دورییەوە.

جَمَشَ رأسَهُ: سەری خۆی تاشی ٥ دەگوترێ: (جَمَشَ شَعْرَهُ).

جَمَشَتْ النورةُ الشَّعْرَ: داڕووەكە مووەكانی هەموو لێكردنەوە.

جَمَشَ الجِسْمَ: جەستەی سوتاند.

جَمَشَ الضرعَ: بەسەری پەنجە گوانەكەی دۆشی.

جَمَشَ المرأة: دڵداری لەگەڵ ئافرەتەكە كرد ٥ یان یاری لەگەڵ كرد ٥ (هو جامش وجَمّاش) دەشگوترێ: (جَمَشته المرأةُ).

جَمَّشَ الْمَرْأةَ: بەمانا (جَمَشَها) دێ.

الجُمُوشُ: داروی مولێكردنەوە ٥ دەگوترێ: (سنة جموش) ساڵێكە گیاو گژی هیچ نەهێشتەوە.

الجَميشُ: داڕوی روتێنەرەوە ٥ شوێنێك گیای لێ نەڕوێ.

جَمَعَ المتفرق جمعاً: شتەكانی كۆكردنەوە.

جمع الله القلوبَ: خودا دڵەكانی یەكدیگیركردن ٥ (هو جامع وجَموع).

جَمَعَ القومُ لاعدائهم: ئەو قەومە خۆيان حازر كرد بۆ شەڕ لەگەڵ دوژمن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ﴾.

جَمَعَ أمْرَهُ: بڕیاری لەسەر کاری خۆیدا.

جَمَعَ عليه ثِيابَهُ: پۆشاکەکەی لەبەرکرد.

اجْمَعَ القومُ: خەڵکەکە یەکیان گرتو رای خۆیان کرد بەیەك.

اجْمَعَت الأرض: زەوییەکە روتایەوە بێ گیاوگژ بوو.

اجمع القدر: مەنجەڵەکە کوڵی هەڵچوو

اجمع المُتَفَرِقَ: شتە بڵاوبووەکانی کۆکردەوە.

اجمع الأمْرَ: کارەکەی توندو تۆڵو پتەو کرد ٥ لەقورئاندا هاتووە ﴿فَأَجْمِعُوا كَيْدَكُمْ ثُمَّ ائْتُوا صَفًّا﴾ ٥

اجْمَعَ الأمر وعليه: بڕیاری لەسەردا نیازی خۆی یەکالا بکاتەوە ٥ لەحەدیسدا هاتووە (من لم يجمع الصيام من الليل فلا صيام لـه) کەسێك شەو بڕیاری بە ڕۆژو بوون نەداو نییەت نەهێنێ ڕۆژوی دروست نییە.

اجْمَعَ الشَّيْءَ: شتەکەی حازر کرد ٥ وشکی کردەوەو کزر بووە.

اجْمَعَ فلاناً: فلانکەسی وەگری خۆی کرد.

اجْمَعَ الابلَ: بەکۆمەڵ حوشترەکانی لێ خوڕین.

اجْمَعَ المطر الأرض: بارانەکە بەسەر زەویدا باری‌و ئاو ڕەوان بوو زەوی ڕەقو نەرمی گرتەوە.

جَامَعَ المرأةَ: کاری سەرجێی لەگەڵ ژنەکەدا کرد.

جَمَعَ فلاناً على أمر كذا: لەگەڵ فلاندا رایان یەکی گرت.

جَمَّعَ النـاسُ: خەڵکەکە ئامادەی ئەنجامدانی نوێژو مەراسیمی جومعە بوون.

جَمَّعَ الدجاجةُ: مریشکەکە هێلکەکانی لەسکی خۆیدا کۆکردەوە.

جَمَّعَ المتفرّقَ: شتە بڵاوەکانی کۆکردەوە.

اجْتَمَعَ: بۆ مطاوعەی (جَمَعَهُ) هاتووە.

اِجْتَمع الرجلُ: ڕیشی پڕبووە، گەیشتە تۆپەڵاکی گەنجییەتی.

اجتَمَعَ الماشي: پیادەکە پەلەی کرد لە ڕۆیشتندا ٥ لەرەوشتو وەصفی پێغەمبەردا هاتووە (كان اذا مشى مشى مجتمعاً).

تَجَمَّعَ: هەندێ لەشتەکان پاڵیان دایە پاڵ شتەکانی تر.

استجْمَعَ: بەمانا (تَجَمَّعَ) هاتووە ٥ دەگوترێ: (إستجمع القوم): لە هەموو لایەکەوە خەڵکەکە کۆبوونەوە.

استجمعَ السيلُ: لافاوەکە لەهەموو لایەکەوە کۆ بووەوە ٥ دەگوترێ: (استجمع الوادي): لە هەموو لایەکەوە لافاو هەڵسا: هیچ شوێنێك نەما لافاوی لێ هەڵنەستێ.

استَجْمَعَ البَقْلُ ونحوه: دانەوێڵەکە وشك بووە.

استجمعَ للجري أو الوثوب: خۆی گیف داو خۆی ئامادەکرد بۆ ڕۆیشتن یان بۆ بازدان.

استجمع الرَّجُلُ: پیاوەکە گەیشتە پلەی کامڵیو هێزو توانا.

استجمع لـه أمـره: هـەموو کـارە دڵخۆشکەرەکانی بۆ دەستەبەر بوو.

أَجْمَـعُ: ناوێکـە بـۆ تەئیـدو جەختکردنەوەی هەموانی بەکاردێ ٥ دەگـوترێ: (جـاء القـومُ أجمعهـم) (باجمعهم).

الاجمـاعُ: یەکـدیگیربوونو ڕێککـەوتنی کۆمـەڵێکی تایبـەتی یـان هـەموو کەس لەسـەر کـارێکی تایبـەتی، ئـەم یەکگرتنـە دەبێتـە بەڵـگە لەسـەر بڕیـارو حوکمەکـە ٥ فوقـەهای موسوڵمانەکان وشەی (اجماع) کورت هەڵـدێنن لـە هـاوڕایی موجتەهیـدەکان لـە چەرخێـکدا، لەسـەر کـارێکی ئـایینیو بەبنـە مایـەك لەبنـەماکانی تەشـریع دەژمێردرێ.

الاجتماع: زانستی کۆمەڵایەتی: زانیاری زانسـتێکە بـاس لـە دروسـتبوونو گەشـەکردنی کۆمـەڵانی ئـادەمیزاد دەکـا ٥ سروشـتو قـانونو یاسـای کۆمەڵایـەتی بـاس دەکـاو دیاردەکانیـان دەخاتـە بـەر توێژینـەوەو لێکۆڵینـەوە ٥ دەگـوترێ: (رجل اجتماعی) پیاوێکە بەگوێرەی پێداویستییەکانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی هـەڵسو کـەوت دەکـاو زۆر تێکەڵ بە جەماوەر دەبێ.

الجامِعُ: ناوێکە لەناوە جوانەکانی خـودا ٥ مزگەوتێك کەنوێژی هـەینی تێـدا ئـەنجام بـدرێ ٥ دەگـوترێ: (مسـجد الجامع) (أمر جامع): کارێکە گرنگـەو خەڵـك لەسـەری کۆدەبێتـەوە ٥ لەقورئان داهاتووە: ﴿وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَـى أَمْـرٍ جَـامِعٍ لَـمْ يَـذْهَبُوا حَتَّـى يَسْتَأْذِنُوهُ﴾.

کلام جامع: دەقو قسەیەکە وشـەکانی کەمو ماناکانی جوانو زۆرن ٥ (قِـدْرٌ جامِع) مەنجەڵی گەورە.

الجامعة: زنجیرێکە دەستو مـل پێکـەوە دەبەسـتێ ٥ کۆمـەڵێك کۆلێـژو پـەیمانگای خوێنـدنو زانسـتین ئـادابو زانیارییـان تێـدا دەخوێندرێو دەگوترێتەوە.

قدر جامعة: مەنجەڵی گەورە ٥ (جمعتهم جامعـة) کـارێکی گـەورە کـۆی کردونـەوە ٥ (کلمـة جامعـة) مانـای زۆر هەڵـدەگرێو وشـەکە بـۆ خـۆی کورتـە ٥ لـە حـەدیـثدا هـاتووە پێغەمبـەر فەرموویـەتی: (أوتیـت جوامع الكلم) قسەی بەپێزو پڕ مانا فێر کراوم.

جامع
مجوز
مجهر
مجول
مجمرة
جناح
جوانح
جعد
جيب
جفت
جلز السنان
جفنة
منجنيق
مجواب
جمجمة
جام
جورب
جُلّ
جلهاق
جنك
مجن
جنطيان
جناحية
جار النهر
جفن
جلبان
جوز
جوز الهند
جاورس
جعدة
جلم
جلكي
جعل
جندب
جمل البحر
جمل
جاموس

الجامع: کۆکەرەوەی هەموو شتێك کە لەبنەمایەك داکۆ دەبنەوە ٥ وەکوو قەدی دار کە هێزی هەموو لق‌و پۆپەکانی تێدا کۆ دەبێتەوە وەکوو کە کۆمەڵێك شت کۆبکاتەوە وەکوو دەگوترێ: (الخمر جماع الاثم) ٥ هەروا دەگوترێ: (هذا الباب جماع هذه الأبواب)، (فلان جماع لبني فلان) هەموو خزم‌و کەس‌و کارەکانی لێی کۆدەبنەوەو، گوێ لەبیرو راکانی دەگرن‌و بەقسەی دەکەن.

قِدر جماع: مەنجەڵێکی گەورەو پان‌و پۆرە، مەرێکی تێدا جێگە دەبێتەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (استأجَرَ الأجيرَ جماعاً ومجامعةً) کرێکاری بەکرێ گرت‌و هەموو حەفتەیەك کرێی خۆی دایە.

الجَمَاعَةُ: ژمارەی زۆر لە ئادەمیزاد لە درەخت‌و رووەك ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد کە یەك مەبەست کۆیان بکاتەوە.

الجماعيَّة: لەزاراوەی ئابوری سیاسیدا، بریتییە لە رێبازێکی سۆشیالیستی، ئەوە دەچەسپێنێ کە سودی بەروبوم‌و بەرهەم دەبێ بۆ دەوڵەت بێ ٥ مڵکایەتی تایبەت‌و تاك نەمێنێ تەنیا ماڵی دانراو بۆ سەرف کردن دەبێ لەچوار چێوەی مڵکایەتی تایبەتی دا بمێنێ ٥ (المعاهدة الجماعية): پەیماننامەی نێوان زیاد لە دوو دەوڵەت دەگەیەنێ.

الجَمْعُ: کۆمەڵ، کۆبووەکان ٥ سوپا ٥ دارخورما بڕوی لە دەنکێك نەزانرێ صنفەکەی چییە، وەجبە خورمایەکی تێکەڵە لەچەند جۆرێك کە پەسند نەبن، لەزگەو کەتیرەی سور ٥ لەزاراوەی زانستی ریاضی: بریتییە لە کۆکردنە چەند ژمارەیەك ٥ (يوم الجمع): رۆژی قیامەت (يوم جمع) رۆژی عەرەفە.

أيام جمع: رۆژانی کە حاجییەکان لە سارای مینا دەمێننەوە.

الجُمْعُ والجِمْعُ: پێکەوە بە هەمووی دەگوترێ: (ضَرَبَهُ بجِمْع يده) یان دەگوترێ: (أعطاه جُمْعَ الكفِّ) پڕ بەمشتی شتی پێدا ٥ هەروا دەگوترێ: (أخذ بجُمْع ثيابه) پڕ بەکراسەکەی وەرگرت ٥ هەروا دەگوترێ: (أمرهم بجَمْعٍ) کارەکانیان هەمووی بەنهێنییە ٥ هەروا دەگوترێ: (ذهب الشهر بجُمْعٍ) مانگەکە هەمووی تێپەڕ بوو.

الجَمْعاءُ من البهائم: ئەو ماڵات‌و حەیوانانەیە کە جەستەیان ساغ بێ هیچ بەشێکی لەجستە نەبوبێتەوە ٥ کە بوحوشتر بەکاربێ مەبەست حوشتری پیرە.

جمعاءُ: وشەیەکە بۆ گشتگیری‌و

هــــەموانی بـــەکاردێ دەگـــوترێ: (جــاءت القبيلــة جَمْعَــاءَ) هۆزەکـە هەموویان هاتن.

الجُمْعَــةُ: کۆمــەڵو دەســتەو پێــر ٥ دەشکوترێ: (جُمعة من تمـر) چنگێك لـەخورما ٥ بـەمانا ئولفـەتو وەگـر بـوونی یـەکتر دێ: دەگـوترێ: (أدام اللهُ جُمْعَةَ مابينكما).

الجُمْعَـةُ والجُمُعَـةُ والجُمَعَـةُ: ڕۆژی هـەینی ئـەو ڕۆژەی نێـوان پێـنج شـەممەو شەممە لە ڕۆژانی حەفتەدا.

الجُمَــاعُ مـــن کـــل شـــيئ: بنکـــەو سەرچەمســـــەری هـــــەموو لـــقو پۆپـەکان ٥ هەرشـتێك کۆببێتــەوەو چەند شتێك پاڵ بدرێنـەلای چەند شتێکی تـر ٥ کۆمەڵـگایەکی تێکەڵ لەچەند هـۆزو بنەماڵەی جیاجیـا ٥ (جَمَّــا عُ الجَسَــدِ) بریتییــە لەســەر ٥(جُمَّــــا ع الثريــــا)ئــەو کۆمەڵــە ئەستێرەیە کە پێی دەگوترێ: کۆ.

الْجَمعِيَّــةَ: کۆمــەڵێك یەکــدەگرن بــۆ مەبەستێکی تایبەتیو بیرو هزرێکی هاوبــەش لــە نێوانیانـــدا ٥ وەکـــوو (الجَمعِية الخيرية الاسلامية)، (الجمعيـة التشريعية) ، (الجمعية العلمية)

الجَميــعُ: کۆبــوەوە ٥ دەگــوترێ: (حـــي جميع) خێڵێکی کۆبـووەوەن ٥ (وقـوم جميع) قەومێکی گردوکۆن ٥ (ورجـل جميع): پیاوێکە تێکسمڕاوو بەشانو شەوکەتە (هو جميع الرأى) ئەو پیاوە ڕاپەسـندو بـیرو بۆچـون ژیرانەیـە (جميع السلاح): کۆکەرەوەی چەك ٥ (ناقـة جميـع) حوشـترێکە لـە سـکیدا بێچوو هەیە، هەروەها وشەی (جميع) بـەمانا سوپایە ٥ هـەم بـۆ تەئکیـدو گشـــتگیری بـــەکاردێ دەگـــوترێ: (أخذت حقي جميعه).

المُجْتَمَــــعُ: شــــوێنی کۆبوونـــەوەی ٥ کۆمەڵگای ئادەمیزاد.

المَجْمَــــعُ: شـوێنی کۆبوونــەوە ٥ ئــەو خەڵـــکانەی کۆبوونــــەوە واتــــە: ئەوانــەی کۆبوونەوەکــەیان پێــك هێنـاوە ٥ شوێنی بەیـەك گەیشتنی دوو شـت یـان زیـاتر وەکـوو (مجمـع البحرين) ٥ هەروا ناوە بۆ دەزگایـەك کە گرنگی بەلایەنی زمانـەوانی یـان فـەننو ئـەدەبو زانسـتو زانیـاری بدا، (ك: مجامع)٥.

المَجْمَعَة: شوێنی کۆبونەوە.

الْمُجْمَعَةُ: وتارێکی ڕێكو پێك کە کەمو کوڕی تێدا نەبێ.

المجموع: کۆ ٥ ئاکامی لێکدانی چەند ژمارەیەك.

جَمَلَ الشَيئَ جَمْلاً: لەشـتە بـلاوە بووەکـان ئەوەی کۆ کردۆتەوە.

جَمَلَ الشَحْمَ: بەزو پیوەکەی تواندەوە.

جَمَلَ جَمالاً: شێوەو ڕوخساری جوان بـوو ٥ ڕەوشـتو ئـەخلاقی جـوان بـوو

(فهو جميل)، (ك: جملاء) (وهي جميلة)، (ك: جمائل).

أجْمَلَ: حوشترەكانی زۆر بون ٥ (أجْمَلَ في الطلب) بەجوانی داخوازییەكەی خۆی گەیاند ٥ لە حەدیسدا هاتووە: (أجملوا في طلب الرزق فان كلاً ميسر لما خلق له).

أجْمَلَ الشَّحْمَ: بەزوپیۆوەكەی تواندەوە.

أجْمَلَ الشَّيْئَ: ئەو شتەی لەبلاوە بوەكان كۆ كردەوە.

أجْمَلَ الحساب: ژمارەكانی حیسابی كۆكردەوە.

أجْمَلَ الكلامَ: قسەكەی بەكورتی رانواندو شتەكەی دەربڕی،

أجْمَلَ الصَّنيعةَ: كردارەكەی جوان ئەنجام داو رازاندییەوەو زۆری كرد.

جَامَلَهُ: بەجوانی هەڵس‌و كەوتی لەگەڵدا كردو بەپیر داخوازییەكانیەوە چوو.

جَمَّلَهُ: جوانی كردو ئارایشی دا ٥ لە دوعاو پارانەوەدا دەگوترێ: (جَمَّلَ الله عليك): خودا جوانخاصت بكاو لەدڵی خەڵكی دا شیرین ببی.

جَمَّلَ الأميرُ الجيشَ: فەرمانڕەوا سوپاكەی لەبەرەی شەڕهێشتەوە ٥ مانەوەی سوپای درێژ كردەوە.

أجْتَمَلَ: بەزوپیوی خوارد ٥ خۆی پێ چەوركرد.

اجتملَ الشحمَ: بەزەكەی تواندەوە.

تَجَمَّلَ: بۆ مطاوعەی (جَمَّلَهُ) هاتووە ٥ خۆی جوان كردو بەتەكەللوف جوانی بەسەر خۆیدا هێنا ٥ دەشگوترێ: (تَجَمَّلَ الفقيرُ): هەژارەكە پیوی خوارد.

اسْتَجْمَلَ الشيئ: شتەكەی بەجوان لەقەڵەمدا.

الجامِلُ: جەڵە بە حوشتر لەگەڵ شوان‌و بارو بارگەنەكەیدا.

رجل جامل: پیاوێكی خاوەن حوشتر.

الجَمَالُ: بەلای فەیلەسوفەكانەوە صیفەتێكە لە شتەكاندا دەبیندرێ‌و دڵ خۆش دەكاو رەزامەندی وەدی دێنێ.

علم الجمال: بەشێكە لەبەشەكانی فەلسەفە باسی جوانی‌و ئەندازەكانی جوانی‌و بیرۆكەو تیۆری جوانی دەكا.

الجُمَّالُ: كەسێك شتێك زۆر جوان بێ لە جوانی دا بێ وێنەبێ.

الجُمَّاليُّ من الابل والناس: كەتەو دەست‌و پل قەوی‌و تێكسمڕاوو جەستە تەواو.

الجَمَلُ: حوشتری گەورە ٥ لەو حوشترە گەورانە هی وایان هەیە دوو دوگی هەیە ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە: (ما استتر من قاد الجَمَلَ): كەسێك حوشتر لێ بخورێ خۆی بۆ ناشێردرێتەوە بەكەسێك دەگوترێ: كارێكی ئاشكرا بكاو نەشێردرێتەوە ٥ هەروا دەگوترێ: (وتخذ اللَّيلَ

جَمَلاً) شەوی کردووە بە حوشترو سواری بووە بەکەسێك دەگوترێ: هەر بەشەو ئیشەکانی بکاو بەشەو کەم بخەوێ (ك: جُمْلٌ وأجمالٌ وجِمال وأجْمَلٌ وجمالة و....)

الجَمَلُ: حەبلی ئەستور ٥ ماسی ٥ جۆرە ماسی یەکە.

الجُمَلُ: کۆمەڵێك ئادەمیزاد.

الجُمْلانَةُ: بولبول.

الجُمْلَةُ: کۆکەرەوەی هەر شتێك، کۆی شت، دەگوترێ: (أخذ الشيءَ جَمْلة وباعه جَمْلَةً) واتە: بەکۆ نەك پارچە پارچە.

الْجُمْلَـةُ: لـەلای زانایـانی بەلاغـەو نەحوییـەکان رستـەیەکە موسـنەدو موسنەدو ئیلەیهی تێدابێ موبتـەداو خەبەری لەخۆگرتبێ.

الجَمَلُـونُ: هەڵاشـێکی کەوانەییـە لـە شێوەی دوگی حوشتردایە.

الجَمّالُ: خاوەنی حوشتر، شوانی حوشتر، (ك: جَمّالة)ە.

الجُمّالُ: زۆر زۆر جوان‌و قەشەنگ.

الْجُمَّلُ: حەبلی ئەستور.

حیسابُ الجَمَلْ: جۆرێکە لە حیساب‌و هەژمار لەبەرامبـەر هـەر پیتێـك ژمارەیـەك دادەنرێ بەشێوەی (أبجد هوز).

الجُمَّيْلُ: بولبول.

الجَمُولُ: ئافرەتی قەڵەوو گۆشتن ٥ ئەو کەسەی بەز دەتوێنێتەوە.

الجَمِيْلُ: بەزی تواوەی کۆبوەوە.

الْجُمَيْلُ: بولبول.

الْمُجْمَـلُ مـن الكـلام: رسـتەی کـورت ٥ لەزانیاری رەسمدا شێوەیەکە گرنگی دەدا بەلایەنی شێوەکە.

جَـــمَّ جموماً: کۆبووەوە، زۆر بوو ٥ دەگـوترێ: (جَمَـتِ البئـرُ): بیرەکـە ئاوەکەی داکەوت رۆچو بەتایبـەتی دوای ئاوڵی هەڵگۆزتن.

جَمَّ الفرسُ وغيره جمّاً وجَمَاماً: ئەسپەکە پشـوی داو حەسـایەوە هێـزی پەیداکردەوە.

جَمَّ العظمُ: گۆشتی زۆر بوو (جَـمَّ الفـرسُ جماماً): ئەسپەکە ئەپەڕێ‌و تۆوەکەی تێدا کۆبوە.

جَـمَّ الأمـرُ: کارەکـە نزیـك بـووەو کـاتی هات.

جَـمَّ الانـاءَ والمكيـالَ ونحوهمـا: قاپەکـەی پڕکرد هەتا لەسەرییەوە ڕژا.

جَمَّ الرجلُ جَمَّتِ المرأة: گۆشتیان زۆر بوو قەڵەو بوون.

جَمَّ الكبشُ والنعجةُ ونحوهما: بەرانەکە یان نێریەکە کۆڵ بوون؛ شاخیان نـەبوو ٥ لە پەندی پێشینانـدا هاتووە دەڵێ: (عند النطـاح يغلـب الكـبش الأجـم) ئەم پەندە بۆ کەسێك لێ دەدرێ کـە هاوەڵەکـەی بەسـەردا زاڵ ببـێ بـەهۆی ئامادەباشـی‌و خۆحازرکردنەوە ٥ دەگـوترێ: (جَـم الرجـلُ): پیاوەکـە بـەبێ رمـب (بـێ چەك) چووە گۆڕەپانی جەنگەوە.

٢٢ج

رحل

رحل (الطوارق ، الجزائر)

رحل جزائري

جمل ذو سنامين

هودج جزائري

جمل الحراثة (القطر التونسي)

محمل لنقل الاصى

رحل آسيوي

رحل آسيوي

شكال او عقال

هودج

رحل طارقي

هودج (اولاد سليمان)

جَمَّ البنـاءُ: بالەخانەکە بەبێ بارکۆنو سوێ بان بوو.

جَمَّ السَّطحُ: سەربانەکە بەبێ سیپاجو شورا بوو

أجَمَّ الانسان والفرسُ ونحوهما: ئادەمیزادەکە یان ئەسپەکە پشوویان داو ماندوو بوونیان نەما.

أجَمَّ الأمرُ: کارەکە نزیك بووەو کاتی خۆی هات.

اجَمَّت الحاجةُ: پێویستییەکە هاتە پێشەوە.

أجَمَّ الفراق: کاتی لێك جیابوونەوە هات.

أجَمّ الماء ونحوه: وازی لە ئاوەکە هێنا کۆبووەوە.

أجَمَّ الانسانَ والفرسَ وغيرهما: ئارامی پێدان ٥ دەگوترێ: (أجمّ نفسَك)، (أجَمَّ فلان لسانه من الكلام).

جَمَّمَ النباتُ: روەکەکە لەخۆکەوتو پەلو پۆی کردن.

جَمَّمَت المرأة: ئافرەتەکە قژەکانی کۆکردنەوەو کورتی کردنەوە بۆ ئەوەی وەکوو پیاو بچێ.

جَمم شعره: پیاوەکە قژەکانی کۆکردنەوەو کاکۆڵەکانی رێك خست لە حەدیثدا هاتووە: (لَعَنَ الله المجممات من النساء) پەروەردگار نەفرینی لەو ئافرەتانە کردووە کە قژیان کۆدەکەنەوەو لە پاشە سەریان دەیان بەستن.

جَمَّمَ الإناءَ والمِكيالَ: قاپەکەو پێوەرەکەی پڕ کرد.

تَجَمَّمَ النبت: روەکەکە لەخۆکەوتو پەلو پۆپی کردن.

استجمَّ: کۆبووە، زۆر بوو.

استجمّت الأرض: زەوی گیاو گژی روا.

استجم الانسان والفرس وغيرهما: بەمانا (أجمّ) دێ.

استجمَّ البِئرَ واستجمَ الفرسَ واستجمّ نفسه: پشوی دایەو ماوەیەك لێی وەستا تا وەگۆڕ بکەوێتەوە.

الْجَمَامُ: پشودانو ئستیراحەت.

الجُمَامُ: پڕکردنی قاپو مەنجەڵو شتی وا ٥ مەنجەڵێك یان تەنەکەو رپەو قسناغێك کە دوای تێکردنی شتەکە بەسەریەوە بڕ ژێ.

الجَمُّ: زۆرینە زۆر لە هەموو شتێك ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا﴾.

الجَمُّ من الشيئ: زۆرینە لەشت، (ك: جمام وجموم) دەگوترێ: (جَمّ الغفير، الجمّ الغفير) کۆمەڵی زۆر.

الجَمَمُ: زۆرو کۆبووەوە لە هەموو شتێك ٥ ئەگەر بۆ قاپو ئامێری پێوانە بەکارهات بەمانا پڕو سەررێژە.

الجَمَّاءُ: هیلکەی سەر، کاسە سەر، کەللەی سەر.

الجُمّاني: کۆبووەوەی قژی پێشەسەر ٥ قژی زۆرو درێژ کە بەسەر شان دا پەخش بوبن.

الْجَمَّةُ: مێینەی (اَلْجَمّ)ە.

جَمَّةُ البئرِ: ئەوەیە ئاوەکەی داکەوتبێ دوای ئەوەی ئاوی لێ هەڵگوازرا.

جَمَّـــةُ السـفينة: ئـەو شـوێنەیە کـە لەشوێنی بزمارو رەباطەکانییەوە ئـاو دەتکێ‌و تێیدا کۆ دەبێتـەوە ٥ دەگـوترێ: (جـــاءوا في جَمَّـــةٍ): بەکۆمەڵ هاتن داوای خوێن دەکەن.

اَلْجَمُـومُ: زۆرو کۆبـووەوە لـە هـەموو شـــتێك، گیـاو گـژی زۆر، رووەك‌و دەرەختـی چـڕو پـڕی تـر کـە روی زەوییەکە داپۆشن ٥ دەگوترێ ٥ (بئر جَمُــوم)، (فـرس جَمُـومُ العــدو): ئەسـپێکە لـە ریشـتندا دەمـەیێ‌و بەردەوام باز دەهاوێ.

اَلْجَمـــيمُ: زۆرو کۆبـووەوە لـە هــەموو شـتێك ٥ گیـاو گـژی زۆر ٥ ڕووەك‌و درەختــی چـڕو پـڕ کەزەوییەکـە داپۆشی.

اَلْجَـمُّ: شـوێنی راوەسـتانی ئـاو ٥ سـنگ ٥ دەگـوترێ: (فـلان واسـعُ اَلْمَجَـمّ) فلانکـەس سـنگ فراوانـە بـەهیچ شـــتێك رقـــی هەڵناســـتێ بـــە پێچەوانەوە دەگـوترێ: (فـلان ضَيِّقُ الْمَجَمّ) فلانکەس تەنگە تیژەیە زوو توڕە دەبێ، (ك: مَجَامّ)ە.

الْمَجَمَّــــةُ: هەرشـــتێك راحـــەت‌و کەیفخۆشی بێنێ.

الْجُمَّـانُ لوئلـوء: دەنکـە مـورو لـەزیو دروسـت دەکـرێ لەســەر شـێوەی لوئلوء ٥ هەروا پێستێکی چندراوو پەراوێز بۆ کـراو بـە مـیروی رەنگـاو رەنـگ ئـافرەت دەیکاتـە ملـی خـۆی، نێوان گەردن‌و مەمکی دادەگرێ.

جَمْهَـرَ الشَّـيْئَ: شـتەکەی کـۆ کـردەوە ٥ لەسەر گۆڕەکە گڵی کۆکردەوە.

جَمْهَرَ الكلامَ: قسەکەی کورت کردەوە.

جَمْهَـرَ لـه الخَبَـرَ واليـه وعليـه: هـەواڵی جەماوەرەکـەی پێدا ٥ یـان هـەواڵی هەنـــدێ لەجـــەماوەری پێـــداو راستییەکانی لێ شاردنەوە.

تَجَمْهَرَ عليه: دەستدرێژی کـردە سـەر ٥ (تَجَمْهَـرَ النـاس) جەماوەرەکـە گـرد بۆوەو.

الجَمَاهِرُ: کەتەو زەبەلاح، (ك: جماهر)ە.

الجُمْهُورُ مـن كـل شيئ: زۆرینـە ٥ لەبـو چـــەوی کۆمـــەڵ بـــوو، زوربــەی جــەماوەر، (ك: جـــاهير)ە (جـــاهير الناس): پیاو ماقوڵان.

الجمهـــوري: پاڵــدراو بــۆلای جــەماوەر (الحكـــم الجمهـــوری) ئەوەیـە کـارو باری دەوڵەت بەدەست کەسانێکەوە بێ گەل هەڵیان بژێرێ لەسەر داب‌و نـــەریتێکی تایبـــەتی ٥ گـــەل‌و نەتـەوەکان سـەرەك کۆمارێـك بـۆ ماوەیــەکی دیـاریکراو بـۆ خۆیـان هەڵدەبـــژێرن ٥ هـــەرواناوە بـــۆ شـەرابێك لـەترێ دروسـت دەکـرێ‌و سەرخۆشکەرە.

الجمهوريـــة: دەوڵەتێکــە حــاکمێکی

هەڵبـڕێراو لەلایـەن کەلـەوە یـان لەلایەن پەرلەمانەوە بەڕێوەی دەبا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو.
**اَلْمَجْمَهَـرُ**: تونـدو تـۆڵو دامـەزراوو جەستەرێكو پێك.
**مُجَمْهَـرات العـرب**: حـەوت چـامەی عـەرەبین هـی شـاعیرانی چـینی دووەمن و لـەدوا (اَلْمُعَلَّقـات السبعة) لەسەری کۆبونەوە.
**تَجَمَّـى مـن کـل شـیئ**: کەسـایەتیو قەبارەو چەندییەتو چۆنیەت بـۆ هەموو شتێك ٥ لەتکە شاخو درکە شـــاخ ٥ گـــریو لـــوو هاوســـان لەجەستەی ئادەمیزاد.
**الجُمـاءُ**: بـەمانا (الجِمَـا) دێ ٥ (الجُمـاةُ) بەمانا (الجُماءُ) دێ.
**جَنَا جُنـوءاً**: خـۆی کـۆم کـردەوەو مـەیلان بوو ٥ خۆی بەسەردا کوشمەڵە کـرد ٥ دەگـوترێ: (جنـأ لِي عَـدْوِهِ) خـۆی نەوی کردو بەگورجی ڕۆیی.
**جَنِـئَ**: (جَنَـأَ) شـانەکانی بەسەرسنگی دا دەڕوانن پشتی کۆم بۆتەوە.
جنـا الکـبش ونحـوه: بەرانەکـە شاخەکانی بەرەو پاش هەڵگەڕانەوە ٥ (هو أجنأ وهي جَنآء).
**اجْنَأ عليه**: بەمانا (جنأ عليه)دێ.
**اجتنـأ علیـه**: بـەمانا (جنـأ علیـه) دێ ٥ (جانأ علیه) بەمانا (جَنَأ علیه) دێ.
**تجانأ علیه**: بەمانا (جَنَأَ علیه) دێ.
**الأجْنَـأ**: پشـت کـوڕ: کەسـێکە شـانی بەسەر سنگی دابڕوانن.
**المُجْنَأ**: تیرو کەوان.
**اَلْمُجْنَأة**: چاڵی گۆڕ، گۆڕیچە
**جَنَبَ فلان في بني فـلان جنابةً**: فڵانکەس لـەناو خێڵـی فڵانـدا نیشـتەجێ بـوو بەغەریبی.
**جَنَـبَ الـریحُ جنوبـاً**: هـەوا لـە باشـورەوە هاتووە یان بەرەو باشوور دەچێ.
**جَنَبَ الیه جنباً**: ئـارەزووی کـردو حـەزی لێ بوو دیدەنی بکا.
**جَنَبَ الشَّیْئَ**: لێـی دوورکەوتـەوە ٥ دووری خستەوە ٥ پـاڵی پێوەنـا، لاتەنیشتی هـەنگاوت، خـاترو خوایشی نـەگرت ڕێزی لێنەنا.
**جَنَبَ الـبعیرَ**: لاتەنیشتی حوشـترەکەی داخ کرد.
**جَنب البیتَ ونحوه جنبـاً**: بەکـەرتو گڵـی بـۆ خانوەکـە هێنــاو داپۆشــی ٥ یــان خێرو بێری زۆری بەسەردا ڕشت.
**جنـب الأرض**: بـە کـەرتو یـان بـە ماڵمـاڵ زەوییەکـەی ڕێـك خسـتو تـەختی کرد.
**جنب الفرسَ أو الأسیر جنباً**: کێشایە لاوەو کەنارگیری کرد.
**جَنَبَ فلاناً الشَّیئَ جَنْباً وجنوباً وجنابـةً**: دووری خسـتەوە ٥ قورئـــان دەوفـــەرموێ: ﴿وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أن نَّعْبُدَ الأَصْنَامَ﴾.
**جَنِـبَ جنبـاً**: دوورکەوتـەوە ٥ هـاواری لاکەلەکـەی کـرد ٥ بـەلادا سـوڕا لـە

تینواندا دولاهاتەوە، گرمۆڵەبوو (جَنِب الیه): ئارەزووی لای ئەوی کردو کەوتە دڵەراوکێوە.

جَنِب الریح: بەمانا (جَنَبَ) دێ.

جَنَبَ فلان: فلانکەس لەشی پیس بوو.

جَنَبَ جنابة: دوورکەوتەوە ٥ نزیك بووە ٥ لەشی پیس بوو ٥ (جُنِبَ): هاواری لاکەلەکەی کرد ٥ رەشەبا لێی دا بای وەشت تێکیدا ٥ دەگوترێ: (جُنِبَ القومُ أو الزرعُ).

أجْنَبَ: دوورکەوتەوە.(أجنب عنه) لێی دورکەوتەوە ٥ لەشی پیس بوو.

أجْنَبَ فلاناً الشَّيْئَ: ئەو شتانەی لە فلانکەس دوور خستەوە.

جانَبَهُ: لایەنگیری ئەوی کرد، یان بۆ پشتگیری ئەوی رۆیی ٥ دوری خستەوە ٥ لەپەندی پێشیناندا هاتووە (قد جانب الروضَ رأهوی الجرل) لە باخ و گوڵستان دوور کەوتۆتەوە ئارزووی ولاتی سوتەمەرۆیەتی.

جَنَّبَ القومُ: ئەو هۆزە شیریان برایەوەو کەم بوو.

جَنَّبَ العامُ: ساڵەکە نەهات بوو.

جَنَّبَ الفرسَ أو الشَّيْئَ: دووری خستەوە.

جَنَّبَ فلاناً الشَّيْئَ: شتەکەی لەفلانکەس دوور خستەوە.

اجتَنَبَ: لەشی پیس بوو.

اجتنبَ الشَّيْئَ: لەشتەکە دوور کەوتەوەو خۆی پاراست.

أجتنب الفَرَسَ ونحوه: ئەسپەکەی دوور خستەوە.

اجتنبَ الشَّيْئَ: لێی دوور کەوتەوە

تَجَنَّبَ: لەشی پیس بوو.

تَجَنَّبَ الشَّيْئَ: لە شتەکە دوور کەوتەوە دەگوترێ: (هو مُتَجَنِّبٌ له) ئەو خۆی لەو شتە دور دەگرێ.

اسْتَجْنَبَ: لەشی پیس بوو.

الأجْنَبُ: بێگانە لە خزمایەتی دا، یان لەزێدو نیشتماندا ٥ شتێك رام نەبێ.

الأجْنَبي: بێگانە، دەرەکی ٥ دەگوترێ: (هو أجنبي في هذا الأمر) ئەو لەو کارە بێگانەیەو دوورە نایزانێ و ئاگای لێ نیە ٥ کەسێك مافی ئەوەی نەبێ رەگەزنامەی ئەو ولاتە وەربگرێ، (ك: اجانب)ە.

الجانب: لاتەنیشتی ئادەمیزادو هی تریش ٥ ئەملا، ئەولا، ناوچە ٥ بەردەرگای ماڵ ٥ هۆبەو گەرەك، (ك: جوانب) ٥ هەندێکیان دەگوترێ: (إنه لَمُنتِفخُ الْجَوانِب) فلان لوتبەرزو خۆبەزلزانە ٥ غەریب ٥ ئەو کەسەی گەردن کەچ نەبێ.

الْجَنَاب: دەوروبەر، دەگوترێ: (مُروا يسيرون جَنَابَيه) پێیان بڵێ: با بەدەوری فلاندا برۆن ٥ بەردەرگای ماڵ یان گەرەك و هۆبە، دەگوترێ:

(أنـا في جَنَـابِ فـلان) مـن لـەژێر چـاودێری فلانـدامو لەھۆبـەو دیوەخـانی ئـەودام ٥ هـەروا دەگـوترێ: (فـلان رحـب الجنـاب، خصیب الجناب) دەستو دڵ فراوانو سەخی سروشتە ٥ مـەردو نەبـەردو پیاوە، (ك: أجنبية)٥.

الجُنَـابُ: نەخۆشـی ٥ (ذات الجَنْـب) نەخۆشـییەکە توشـی پـەردەی سییەکان دەبێ.

الجِنَابُ: دژایەتیو ئاژاوەو دڵ ئازاردان ٥ دەگوترێ: (فلان لجَّ في جِنَابٍ قبيح) فلان زۆر توندڕەو بوو لە ئازاردانی خەڵـكو كـاری ناشـیرینـدا ٥ هـەروا دەگـوترێ: (فـرس طـوع الجنـاب) ئەسپێکی سەرنەرمو جڵەو خۆشە.

الجَنَـاب: یارییـەکی منالانـە (دوو منـاڵ بەرامبەر بەیەك هەرەیەکە یان هەوڵی ئەوەدەدا بەرامبەرەکەی نەیگرێ).

الجنابا،: بەمانا (الجُنابی) دێ.

اَلْجَنَابَةُ: لەش پیسی، حاڵەتێکە بەسـەر پیـاوو ئـافرەت دا دێ لـەئاکامی جوتبـون یـان ئاوهاتنـەوە بـەبێ جوتبوون ٥ دەگوترێ: (اغتسـل مـن الجنابة) غوسڵی لـەش پیسـی لـەخۆی دەرکـرد ٥ بـەمانا (نزیـك، ئـەولاو ئەملا) دێ، دەگوترێ: (مرّوا يسيرون جنابتيه) پێیـان بڵـێ بـەنزیکی ئـەودا بـڕۆن بـەلای ئـەودا تێپـەڕن ٥ لەئـەملای ئـەووەوە بـڕۆن ٥ (وقعـدوا جنابتيـــــه) لـــــەنزیك ئـــــەو دانیشـتن.اَلْجَنْـبُ مـن كـل شـيئ: تەنیشتو ئـەملاو ئـەولای شـتەکە ٥ لایـەنێك ٥ بەرامبـەر ٥ دەگـوترێ: (هذا قليـل في جنـب مودتـك) (مـاذا فعلت في جنب حاجتي) لە قورئانـدا هاتووە دەفـەرموێ: ﴿يَا حَسْرَتَى عَلَى مَـا فَرَّطـتُ فِـي جَنـبِ اللّـهِ﴾، (ك: جنوب، أجناب)٥.

جار الجَنْب: ئـەو جیرانـەی مـاڵی بـەماڵی تۆوە نووسـابێ ٥ (الصاحب بالجنب): ئـەو کەسـەی بەجەسـتە لێـت نزیـك بێ، هاوڕێی سەفەرت بێ.

اَلْجَنْبُ في السـباق: ئەوەیە پێشبڕکێ کـەر لەتـەك ئەسپەکەیدا ئەسـپێکی تـر وەکوو یەدەگ ئامادە بکا، بۆ ئـەوەی ئەگـەر ئەسـپەکەی شکسـتی هێنـا خێرا ئەسپەکەی تـر بـەکار بێنـێ ٥ کورتو کوڵەبنە.

الجُنُـــبُ: دوور ٥ قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿فَبَصُـرَتْ بِـهِ عَـن جُنُـبٍ وَهُـمْ لَـا يَشْعُرُونَ﴾ ٥ بەمانا (نـزیکیش) دێ ٥ خزم ببێتە جیرانت.

جـار الْجُنُـب: هـاوڕێی سـەفەرت ٥ ئـەو کەسەی پابەنـدی ویستەکانت نـەبێ ٥ ئەو کەسـەی توشی حاڵـەتی لـەش پیسی بێ.

الجَنْبَـةُ مـن الشّـيْئ: لایـەنی شـتەکە ٥ نزیـكو ئـەملاو ئـەولای شـتەکە ٥

گۆشـــەگیری و خۆپـــارێزی ٥ لـــە حـەدیـثـدا هـاتووە: (علـیکم بالجنبَـةِ فانهـــا عَفَـــافُ) تابۆتـــان دەکـــرێ گۆشـــەگیری هەڵبـــژێرن چـــونکە دەبێتە مایـەی دەستو داوێنپاکی ٥ هـــەروا بـــەدرەختێك دەگـــوترێ: گەڵادار بێو هاوینان سەوزبێ ٥ ئەو گیـــاو گـــزەی لـــەنێوان درەخـــتو ڕەوەکدا دەڕۆێ.

**الْجَنَبَةُ**: لای شتو نزیکی شت.

**الْجُنَبَةُ**: ئەو کەسەیە خۆی لەخەڵکی تر دەپارێزێ.

**الْجُنَّابُ**: هاوڕێی هەمناهەنگو هاودەم.

**الْجَنُـوبُ**: لای پێچـەوانەی بـاکور واتـە: باشور ٥ بایەك کە لەولایەوە بێ.

**الْجَنِیـــبُ**: ئـەو ئەسپەی بـۆ قـەراغ ڕێ کێش دەکرێ.

**الْجُنَّابُ**: لغاو شلو سەرنەرم ٥ کەسێك یان ولاغێك لـە ڕۆیشتندا بلەنگێ ٥ بێگانـــەو غـــەریب ٥ جۆرێکـــە لـــە خورمای باش، (ك: جُنُب)٥.

**الْجَنِیبـــةُ**: ولاخـــی کێشـــکراو ٥ لابـــار بەتەنیشـتی حوشـترەوە ٥ بەهـەردو تایەکان دەگـوترێ: (جنیبتـان)، (ك: جنائـــب)٥ ٥ دەگـــوترێ: (فـــلان لُقَـــادُ الجنائـب بـین یدیـه) فلانکەس بـارو بارگەنە لە پێشیەوە دەڕوا.

**الْمَجْنَبُ**: خێرو شەڕی زۆر.

**الْمِجْنَبُ**: بەمانا (اَلْمَجْنَب) دێ ٥ کەرتو (دێراو هەڵدەر) ٥ ئامێرێکە وەکوو خاکەناز ددانی نیە لای خواروی زۆر تـەنگو تیـژە ٥ زەوی پـێ تـەخت دەکرێ، گڵی پـی بـەرز دەکرێتـەوە بۆبـەهێزکردنی دەورو بـەری جۆگـا ئـاو ٥ کـەوان ٥ پـەردە ٥ سـنووری نێوان دوو دەوڵەت.

**اَلْجَنَبَةُ مِـن الجیش**: لایـەکی سوپا (جا ڕاسـت یـان چـەپ) ٥ هـەر دوولای سوپا پێیان دەگوترێ: (مَجْنَبَتَان) لـە حەدیـثدا هـاتووە دەفـەرموێ: (انـه صلی الله علیه وسـم بَعَـث خالـد بـن الولید یـوم الفـتح علـی المجنة الیمنـی والزبیـر علی المجنبة الیسری).

**تَجَنَّث**: خۆی پـاڵ خێزانـی تـردا، خـۆی کـردە کـوڕو نـەوەی خەڵـکی تـر ٥ دەزووی لەســـەر شـــت هەڵـــکرد بـــەجۆرێك شـــتەکەی شـــاردەوە باڵندەکە بـاڵی خـۆی بڵاوکردنـەوەو هەڵنیشت.

**الجِنْث**: لوغەتێکە لە وشەی (جِنْس) ٥ یان جـۆرە زمـان لالییەکـە، (ك: جنـاث وجنوث).

**الْجُنْثِـيُّ**: ئاسـنگەر ٥ حوشـتر خـنکین٥ زری٥ شمشـێر ٥ جۆرێکیشـە لـە ئاسنی باش، (ك: أجناث)٥.

**اَلْجُـنْجُنُ والْجِـنْجِنُ**: ئێسقانی سنگ، (ك: جناجن)٥.

**الْجُنْجُنَةُ والْجِنْجِنَة**: بەمانا (اَلْجُنْجُنُ) دێ.

**اَلْجُنبُجُون:** بەمانا (الْجُنجِنُ) دێ، (ك: جَنَاجِنُ)ە.

**جَنَحَ جَنْحاً وجنوحاً:** خواربۆوە دەگوترێ: (جنح اليه وجنح له) بەلای ئەوىدا تاشی، قسەی ئەوی پەسندكرد ە شوێن ئەو كەوت.

**جَنَحَ الانسانُ والبعيرُ:** بەسەر یەكدا كەوت ە مەیەلانی كرد .

**جَنَحَت السفينةُ:** گەشتییەكە گەیشتە تەنكاو شانی داداو بەزەوییەوە نووساو لەقورچەقیو رۆیشتنی بۆ نەكرا.

**جَنَحَ الطائرُ:** باڵندەكە باڵەكانی لێك دان.

**جَنَحَ الرجلُ:** پیاوەكە پابەندی فەرمان بوو.

**جَنَح الليل:** شەو راشكا بەرەو كۆتایی رۆیی.

**جَـنَحَ الحيـوان في سيره:** ئاژەڵەكە لەكاتی رۆیشتندا بەهۆی پەلەو خێرا رۆیشتنەوە ملی بۆ پێشەوە درێژكرد.

**جَنَحَ فلان على مِرفقَيهِ:** فلانكەس خۆی خستە سەر هەردوو ئانیشكیو لەزەوی قایمی كرد ە یان خستنیە سەر سەرین.

**جَـنَحَ علـى الشَّيْ:** روی لەشتەكە كرد بەهەردوو دەستی خەریكیەتیو خۆی بەسەردا شۆڕكردۆتەوە.

**جَنَحَ أن يأكل كذا:** بەلایەوە تاوان بوو ئەو شتە ئاوا بخوا.

**جَنَحَ الطائرُ جَنحاً:** لەشەقەی باڵی داو فڕی ە باڵی خۆی شكاندنەوەو لێكی دان.

**جُنِحَ:** باڵی شكا.

**اجْنَحَ الشَّيْ:** شتەكەی خوار كردەوە.

**جَنَّحَهُ:** باڵی بۆ دروست كردن.

**جَنَّحَ المخالفة:** بڕیاری دا سەرپێچییەكەی شیاوی سزادان بێ.

**إجْتَنَحَ الانسان:** پەراسوی شكان.

**اجْتَنَحَ الرجل على رحله:** پیاوەكە لەسەر ولاغەكەی هەردوك ئانیشكی دادان ە خۆی خستە سەر هەدوو دەستی ە لە حەدیثدا هاتووە كە پێغەمبەر (د.خ) نەخۆش كەوتووە پاشان تۆزێك ئازارەكەی لەسەر سوك بووە (فاجتنح على أسامة حتى دخل المسجد) قورسایی خۆی خستە سەر ئوسامە چووە ناومزگەوتەوە.

**اجْتَنَحَ في السجود:** قورسایی خۆی خستە سەر لەپی دەستیو ئانیشكی لەزەوی بەرزكردەوەو لەكەلەكەی خۆی دووری خستنەوە بەجۆرێك ئانیشكی وەكوو باڵ دەهاتنە بەرچاو.

**اجْتَنَحَ الحيوان في سيره:** حەیوانەكە لە رۆیشتندا شوێنی كەوت.

**اجتَـنَحَ الشَّيْ:** شتەكەی خواركردەوە دوولای هێنایەوە.

**تَجَنَّحَ:** بۆ (مطاوعە)ی (جَنَّحَهُ) هاتووە.

**تَجنَّحَ في السجود:** بەمانا (اجتَنَحَ) هاتووە.

**اسْتَجْنَحَ الليلُ:** شەوداهات.

**الجانِحَـةُ:** پەراسووە كورتەكان كە لەسنگەوە نزیكن.

**الجَنَاحُ**: بال (ئەو ئەندامەی بالندە پێی دەفڕێ ◊ دوو بال ◊ قۆڵ ◊ بن هەنگڵ ◊ لاتەنیشت ◊ (جناح القصر وجناح البيت) لایەك لەباڵەخانە لایەك لەخانوو ◊ كۆمەڵێك لەشت ◊ (جناح الرحى) دوولای بەرداش ◊ (جناحا النصل) تیژاییەكانی ◊ (جناحا العسكر) دوولای سوپا (جناحا الوادی) ئەم بەرو ئەو بەری شیو ◊ دەگوترێ: (فلان في جَنَاحِ فلان) فلانكەس لەژێر چاودێری و سەرپەرشتیاری فلان دایە.

**جناح السفر**: لەسەر سەفەر ◊ دەگوترێ: (هو على جناح السفر) خەریكە سەفەربكا ◊ (ركب جناحی الطائر) ولاتی جێ هێشت ◊ (ركب جناحی نعامة) بە لێبڕانەوە خەریكی كارەكەیەو زۆر گرنگی پێ دەدا ◊ (هو في جناحي طائر) لەدڵەراوكێ‌و رارایی دایە (خفض له جناحه) گوێ لە مستی بوو گوێ رادیریەتی ◊ لەقورئاندا هاتووە: ﴿وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ﴾ ◊ (فلان مقصوص الجناح) فلانكەس دەستەوەسانەو هیچی بۆ ئەنجام نادرێ ◊ یەكێكە لە لایەنەكانی یاری تۆپی پێ ◊ كە پێك دێ لە یانزە.

**الجُنَاحُ**: تاوان ◊ مەیل كردن بۆ تاوان‌و گوناە ◊ هەڵگرتنی خەم‌و خەفەت ◊ كۆمەڵێك لەشت ◊ هەروا دەگوترێ: (انا اليك جُناح) تامەزرۆم بۆ دیدارتان.

**الجَناحِيةُ**: پیرێكن لە شیعە توندڕەوەكان؛ شوێنكەوتەی عەبدوڵڵای كوڕی موعاوییەی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەری (ذی الجناحين)ن.

**الجِنحُ**: لا ◊ ئەملاو ئەولا ◊ چاودێری ◊ بەشێك لەشەو ◊ تاریكی شەو ◊ دەورو بەری رێگا.

**الجُنحُ**: تاریكی شەو.

**الجُنحَةُ**: تاوانێكە شیاوی ئەومیە ئەوەی ئەنجامی داوە سزا بدرێ.

**المَجْنَحَةُ**: پارچە پێستێكە لە پێشەوەی بار دادەنرێ كاروانچی لەسەر رادەكشێ، (ك: مجانح).

**جَنَّدَ الجُنودَ**: سەربازەكانی كۆكردەوە (جَنَّدَ فلاناً) فلانكەسی كرد بەسەرباز.

**تَجَنَّدَ**: سەربازی دامەزراندن ◊ سەربازی پەیداكردن.

**الجُنَادِيّ**: قوماشێك كە لە دیوار بدرێ‌و دیواری پێ دابپۆشرێ ◊ هەشتێك راخەربێ یان پێخەف بێ ◊ لەحەدیثی سالمدا هاتووە دەڵێ: (سترنا البيت بجُنادِيٍّ أخضر) دیواری ماڵەكەمان بە قوماشێكی سەوز داپۆشیبو ◊ ئەبو ئەیبوب هاتە ژوورەوە بینی‌و بەپەلە رۆیە دەرەوە، چونكە پێی ناخۆش بوو كە ئەو قوماشە لە دیوار دراوە.

جناح ومجنحات : (١) ذوات الجناحين - (٢) مستقيمات الأجنحة - (٣) مغمدة الأجنحة - (٤) نصفية الأجنحة

**اَلْجُنْدُ**: سەربازی، یارمەتیدەرو دەستەو پێوەند، (ك: أجناد وجنود).

**اَلْجَنَدُ**: زەوی رەقەڵانو سەخت ٥ بەردێکە لەقوڕ دەچێ.

**اَلْجُنْدِيُّ**: یەك سەرباز.

**اَلْجُنْدِيَة**: یاسای سوپا.

**اَلْجُنْدُبُ**: جۆرە کوللەیەکە دەنگی (سیرە سیرێ) لێ دێو باز دەهاوێو دەفڕێ، (ك: جَنادِبَ)٥ ٥ لەپەندی پێشیناندا هاتووە دەڵێ: (وصَرَّ الجندبُ) کارەکە بەبنبەست گەییو کێشەکە قورس بوو.

**أم جُنْدُب**: بەلاو کارەسات، ستەمو تاوان ٥ لەپەندا هاتووە دەڵێ ٥ (رکب امَّ جُندبٍ): واتە تاوانی کردو ستەمی ئەنجامدا ٥ (وقع بأم جندب) غەدری کردو غەیری بکوژی کوشتەوە.

**جَنْدَرَ الثوبُ**: پۆشاکەکە رەونەقی جارانی بۆ هاتەوە لە ئوتوی دا، مشتو ماڵی کردەوە.

**جَنْدَرَ الكتابَ**: بەقەڵەم بەسەر وشەکاڵو کوژاوەکاندا هاتەوە تۆخی کردنەوە بۆ ئەوەی بخوێندرێنەوە.

**اَلْجَنْدَرَةُ**: ئامێرێکی دارینەیە پۆشاکی پێ لەو توو دەدرێو چرچو لۆچی پێراست دەکرێتەوە.

**اَلْجَنَادِلُ**: شتی گەورەو پتەوو بەهێز، (ك: جَنادِلَ)٥.

**اَلْجَنْدَلُ**: شوێنێکە لە ڕێڕەوی روباردا بەهۆی زۆر بەسەرا رۆیشتنی ئاوەکە بەردو شاخەکە پتەو دەبن لەپەندی پێشیناندا هاتووە (جندلتان اِصْطكّتا) ٥ بەدوو هێزی پتەو دەگوترێ: کە بەگژیەکدا بچن، (ك: جَنادِلَ)٥.

**جَنَزَ الشَّيْءَ جَنْزاً**: شتەکەی شاردەوە ٥ کۆی کردەوە.

**جَنَزَ الميتَ**: مردووەکەی خستەسەر دارەمەیت.

**الجِنازَةُ**: دارەمەیت ٥ مردو ٥ یان دارەمەیتو مردووەکەو ئەوانەی لەگەڵی دا دەچن بۆ سەر قەبرانو کفنو دفنی دەکەن ٥ شتێك لەسەرشانی جەماوەر ناخۆش بێو خەفەتی پێ بخۆن ٥ دەگوترێ: (ضُرِبَ حتى تُرِك جنازةً) ئەوەندەی لێ درا تا بەمردویان خست (طعن في جَنازته) واتە مرد.

**الجَنائِزِيّ**: ئەو کەسەی لەپێش جەنازەکەوە دەڕواو قورئان یان ذیکرو تەهلیلە دەخوێنێ.

**اَللّحن الجنائزيّ**: سودو ذیکرێکە لە پێش جەنازەکەوە دەخوێندرێ.

**جَنَسَتِ الرُّطَبَةُ جَنْساً**: خورماکە هەمووی تێکرا گەیی.

**جانَسَهُ**: چووە پێری ئەوەوە، خۆی وەکوو ئەو لێ کرد.

**جَنَّسَ الأشياء**: هەموو تاکەکانی وەکوو یەك لێکسردن کردنی بەیەك

جیـنس‌و پێـڕ پاڵـیدان بەرەگـەزو جینسی خۆیانەوە.

تَجَنَّسَ: بۆ مطاوعەی (جَنَّسَهُ) هاتووە.

تَجَانُساً: لەرەگەزدا خۆیان وەكوو یەك لێكرد.

الجِنَاسُ: لـەزاراوەی بەلاغیانـدا ئەوەیـە دوو وشـەیان دوو رسـتە لەهـەموو پیتەكانیانـدا یـان لـە زۆربـەیان دا وەكوو یەك بچن‌و مانایان جوودابێ.

الجِنْسُ: بنـەماو رەگـەزو جـۆر ە لـە زاراوەی مەنتیقیەكانـدا ئەوەیـە دەلالـەت بكـا لەسەر زۆر شت كە جۆرەكانیان جوداواز بن وەكوو (حـەیوان) كـە رەگەزێكە زۆر جـۆری وەكـوو (ئـادەمیزاد)و (ئەسـپ)و (رەشـــە وڵاخ)و زۆر جـــۆری تـــری گیانلەبەر دەگرێتەوە ە بەیەكگەیشتنی نێرو مێ لەبارەی سێكسەوە.

الجِنسِيُّ: پاڵـدراو بـۆلای (جیـنس) لـە زاراوەی یاساو قانوندا پەیوەندییـەكی یاسـاییە تاكێـك دەبەسـتێتەوە بـە وڵاتێكـەوە، وا دەبـێ پەیوەندییەكـە راسـتەقینەو بنەرەتییـە، وادەبـێ لاوەكییـەو بـەهۆی شـتی تـرەوە ئـەو هاوڵاتی بوونە بەدەست دەهێندرێ.

الجِنسِيَةُ: صیفەتێكە بـە ئـادەمیزادەوە دەلكـێ لـە روی پەیوەنـدی‌و گەڕانەوەی بۆ نەتەوەو گەلێك.

الجِنِّیسُ: ماسـییەكە لـەنێوان رەنگـی سپی‌و رەنگی زەردا.

الجَنِّیسُ: شتی رەسەن‌و ساغلەم.

جَنَفَ، جَنِفَ جُنُوفـاً: لا خواربـوو، سـتەمی كرد ە دەگوترێ: (جنف علیه، وعنـه) لایدا (جنف فیه) ستەمی كرد.

جَنِـفَ جَنَفـاً: بـەمانا (جَنَـفَ) دێ ە لەقورئاندا هاتووە دەفـەرموێ: (فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًـا فَأَصْـلَحَ بَيْـنَهُمْ فَـلاَ إِثْـمَ عَلَيْـهِ) ە پشتی كـۆم بۆوە.

أَجْنَفَ: بەمانا (جَنِفَ) دێ.

أَجْنَفَ فلانـاً: لـە بڕیارەكـەی فـلان دا ستەمی بەدیكرد.

جانَفَ القَومَ: خـۆی لـە گەلەكـەی تـەرە كردو لێیان دوور كەوتەوە.

تَجانَفَ: لایدا، لە رێگای راست كلابـوو ە لەقورئاندا هاتووە دەفـەرموێ: (فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ).

تجانف عنه: لێی لادا، (تجـانف لـە والیـە) بۆی لادا.

تجانف في مشیته: لـە رۆیشـتندا خـۆی باداو فیزی كرد.

الأَجْنَفُ: كەتـەو زەبـەللاح ە دەگـوترێ: (قدح أجنف) پیاڵەیەكی ئەستور.

الجُنَانِيُّ: ئەوكەسەی لە رۆیشتندا خـۆی بادەدا فیزو لوتبەرزی دەنوێنێ.

المِجْنَـفُ: سـتەمكار (خصـم مجنـف) ركابەرێكی ستەمكارە.

جَنَقَهُ: بە قۆچـەقاینی بـە (مەنجـەنیق) بەردی تێگرت ئاگر بارانی كرد.

**أجناس:**

أسوجي — من سكّان أوروبا الوسطى — من سكّان جزيرة كريت

شيخ لبناني — هندوستاني — شيخ درزي

يمني — يزيدي — شيخ عربي

مغربي — من الطوارق — من سكّان مراكش

**أجناس:**

تركي — صيني — من سُكّان التيبت

ياباني — من هنود أميركا — من سُكّان الكونغو

من قبيلة مُوي (فيتنام) — من سُكّان جزر فيلبين — رئيس قبيلة من حُمر الجلود

من سُكّان أستراليا الداخلية — من سُكّان صومالي — من سُكّان هيه

جَنَقَةُ: بەمانا (جَنَقَةُ) دێ.

اَلْجُنُــقُ: ئەوانــەی ســەروکاری مەنجـەنیق دەکـــەن ◦ ئـــەو بەردانـــەی بـــە مەنجەنیق دەهاوێژرێن.

اَلْمِنجَنيقُ: (المِنجَليـق): مەنجـەنیق، (ك: منجنيقات، مجانق، مجانيق).

الجُنْكُ: تەنبور، ئامێرێکی گۆرانیو مۆسیقایە.

جَنَّ جَنّاً: خۆی حەشاردا.

جَــنَّ الليــلُ جِنّــاً وجنونــاً وجنانــاً: شــەو تــاریکیی هێنــا ◦ تــاریکی داهــات ◦ دەگـوترێ: (جَـنَّ الظـلامُ) تاریکـایی شەو چڕو پڕتر بوو.

جَنَّ عليه، جَنَّ الشَّيْءَ: شـتەکەی داپۆشـی ◦ لەقورئاندا هاتووە دەفـەرموێ: (فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا).

جَـــنَّ المَيِّـــتَ: مردوەکـــەی کفــن کـــرد ◦ مردوەکەی خستە ناو گۆڕەوە.

جُنَّ جَناً وجُنوناً وجِنَّةً ومَجَنَّـةً: شێت بـوو، عــەقڵی لەدەســت دا، بـۆ زێــدەڕەوی لەو مانایەدا دەگوترێ: (جُنَّ جُنُونَهُ).

جُنَّ بِهِ ومنه: سەری لێی سوڕماو سـەرنجی راکێشا وای لێ هات بۆی شێت بوو.

أجَنَّ: بەمانا (جُنَّ) دێ.

أجَنَّ الشَّيْءَ عنه: شتەکە خۆی حەشاردا.

أجَـنَّ المـرأة جَنينـاً: ئافرەتەکـە منـداڵی کەوتە سکەوە.

أجَنَّ الشَّيْءَ: شتەکەی حەشاردا، شتێکی بۆ دانا داپیۆشی.

أجَـنَّ المَيِّـتَ: مردوەکـەی داپۆشـی ◦ لـە حەدیشدا هاتووە: (وَلِيَ دفن رسـول الله وإجنانه علي والعباس).

أجَـنَّ الله فلانـاً: خـودا عـەقڵو ئـاوەزی لەفلانکەس ستاندەوە.

اجَنَّ الشَّيْءَ صَـدْرُهُ: شـتەکەی لـە سنگی خۆی دا شاردەوە.

جَنَّنَهُ: بەمانا (أجَنَّهُ) دێ.

اجْتَنَّ: خۆی حەشاردا.

تَجَانَّ وتَجانَنَ: خۆی بـە شێت نیشـاندا ◦ دەگوترێ: (تجانَّ عليه).

تَجَــنَّنَ: بــۆ موطاوعـــەی (جَنَّنَـــهُ) دێ ◦ دەشگوترێ: (تَجَنَّنَ عليه).

اسْتَجَنَّ: خۆی حەشـاردا، ویسـتی خـۆی حەشاربدا.

التَّجْنينُ: شێوە قسەی جندۆکە، ئـەوەی جندۆکـە دەیڵـێن ◦ دەگـوترێ: (هــو ينطــق بــالتجنين): بەشـێوەی قسـەی هەلەقو مەلەقو بێمانا قسە دەکا ◦ کەس تێی ناگا دەڵێ چی.

الْجانُّ: جندۆکـە ◦ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَـانٌّ﴾ ◦ جـۆرە مارێکـە چـاو رەشو رەنـگ زەردو قـــەبارە گـــەورە ◦ قورئـــان دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَآهَـا تَهْتَـزُّ كَأَنَّهَـا جَانٌّ وَلَّى مُدْبِرًا﴾، (ك: جِنَان وجوَان) ◦ لـە حـەدیـثدا هـاتووە دەڵـێ: (انَّ فيها جناناً كثيراً).

الْجَنَانُ: لە هەموو شتێکدا ناو سکیەتی ◦ دڵ ◦ لە پەندی پێشیناندا هاتووە

دەڵێ: (اذا فرحَ الجنانُ بكت العينان)
• هەروا بەمانا كاری نهێنی هاتووە
• شتی شێردراوە.

**جَنَان الناس**: كۆمەڵی ئادەمیزاد كە ئەوانەی دەكەونە ناوەو دادەپۆشرێن.

**جنان الليل**: تاریكی شەوی زۆر تاریك.

**الجِنُّ**: پێچەوانەی ئادەمیزاد كە رەگەزی جندۆكە دەگرێتەوە • تاكەكەی (جِنّی)یە • دەگوترێ: (بات فلان ضيف جن بمكان خال لا أنيس به).

**الجنّ من كل شيء**: سەرەتاو دەستە گوڵی شت • نیشات و هێزی شت.

**جنّ الشباب**: هەرەتی لاوەتی و گەنجییەتی.

**جنّ النبات**: گوڵ و چرۆی رووەك.

**جنّ الليل**: بەمانا (جنانه) دێ.

**الْجَنَنُ**: پەردە، گۆڕ، كفن • شێردراوە • مردو، (ك: أجنان).

**الْجَنَّةُ**: باخ و بێستان • بەمەرجێ درەختی تێدا بێ • بەتایبەتی درەختی خورماو داری مێو • بەهەشت • ئەو شوێنەی رۆژی قیامەت خودا پێداوان دەچنە ناوی، (ك: جِنان)ە.

**الجِنّةُ**: شێتی • قورئان دەفەرموێ: ﴿أَم بِهِ جِنَّةٌ﴾؟ • هەروا بەمانا جندۆكەش هاتووە • قورئان دەفەرموێ: ﴿مِنَ الْجِنَّةِ وَ النَّاسِ﴾ • كۆمەڵی جندۆكە • لە هەموو شتێكدا جۆرە بەهێزو بە توانا و كامڵ و بێ خەوشەكەی.

**الْجُنُون**: نەمانی عەقڵ و ئاوەز، یان نەخۆشی و شێوانی عەقڵ.

**الْجَنِينُ**: گۆڕ • شتی حەشاردراوو داپۆشراو • منداڵ لەو كاتەیدا كە لەسكی دایكیایەتی • بەلای پزیشكەكانەوە بەو زارۆڵەیە دەگوترێ: كە لە منداڵدان دایە تا تەمەنی دەگاتە كۆتایی هەفتەی هەشتەم، لەوە بەولاوە پێی دەگوترێ: (حَمْل) • لە زانیاری (أحياء)دا بەیەكەم رووەكی پەیدا بوو لە دەنكە تۆم دەگوترێ زیندو لەسەرەتای موتربە بوونی تادێتە ژیانی سەر زەوی، (ك: أجنة، أجنّن).

**الْجَنِينَةُ**: پارچە قوماشێكە ئافرەت لە شان و ملی خۆی دەئاڵێنێ.

**المِجَنُّ**: مەتەڵ • دەگوترێ: (قَلَبَ فلان مَجِنَّهُ): فلانكەس حەیاو شەرمی تكاو ئەوی ناشێ كردی • یان دەگوترێ: دوژمنایەتی بكرێتە بەر لەگەڵ یەكێكدا یان لەگەڵ كۆمەڵێك • هەروا بەمانا گەردن بەند دێ.

**المِجنّةُ**: مەتەڵ، (ك: مَجان)ە.

**الْمَجَنَّةُ**: شێتی • شوێنی خۆ حەشاردان • زەوییەك جندۆكەی زۆری هەبێ، (ك: مجان).

**المجنون**: شێت، كەسێك عەقڵی لەدەست دابێ، (ك: مجانين).

**اَلْمَجْنُونَةُ**: دارخورمای زۆر بەرزو قوچ، (ك: مجانين).

**جَنَى** جناية: تاوانی ئەنجامدا ٥ دەگوترێ: (جنى على نفسه) و(جنى على قومه).

**جنى الذنبَ على فلان**: كێشی كرد بۆئەنجامدانی تاوانو خراپەكاری.

**جَنَى الثَمَرَةَ ونحوه**: میوەكەی چنی.

**جنى جَنياً**: میوەكەی لە شوێنی خۆی لێكردەوە.

**جَنَى الثمرة لفلان**، وجنى الثمرة فلاناً جنى الذهبُ: كۆی كردەوە، (ك: جناة وجُنَاءٌ)ة.

**جَنِيَ جَنىً**: پشتی دەرپەڕیو سنگی چووە ناوەوە ٥ دەگوترێ: (هو أجنى وهي جَنْواءُ).

**أجْنَى الثَمَرُ**: كاتی چنینی میوەكە هات.

**أجْنَى الشجَرُ**: درەختەكە میوەی پەیدابوو، میوە چن دەستی كرد بە میوە چنین.

**أجْنَى الأرض**: زەوییەكە شتی چندراوی زۆر بوو.

**أجْنى الله الماشية**: پەروەردگار گیاو گژی بۆ ئاژەڵەكان رواند.

**أجْنى الله فلاناً الثمرَ**: خودا هێزی چنینی میوەی دا بە فلان.

**جانى عليه**: داوای كردنی تاوانێكی لەسەر تۆمار كرد كە نەیكردبوو.

**اجتنى الثمرة ونحوها**: میوەكەی چنی.

**اجتنى العَسَلَ**: هەنگوینەكەی كۆكردەوە.

**اجتنى ماءَ المطرِ**: چووە سەر ناوی بارانەكەو لێی خواردەوە.

**تَجَنَّى عليه**: دەست درێژی كردە سەر، دەگوترێ: (تجنى عليه جناية).

**تجنى الثمرة ونحوها**: میوەكەی چنی.

**الجاني**: ئەوكەسەیە خورما موتوربە دەكا ٥ كاسبكار.

**اَلْجَنَى**: هەر بەروبومێك لە درەخت لێبكرێتەوە ٥ لەپەندی پێشیناندا هاتووە (هذا جَنَايَ وخياره فيه) بە كەسێك دەگوترێ: بەرژەوەندی هاوەڵەكەی پێش بەرژەوەندی خۆی بخا ٥ هەروا بەمانا قارچك دێ ٥ ناوە بۆ لەوەڕ، بۆ ترێ، بۆ خورمای تەڕو گەییو كە پێی دەگوترێ: روتەب ٥ بۆ هەنگوین، بۆ زێڕ، (ك: أجنٍ وأجناء)ة.

**الجِنَاية**: لە زاراوەی قانوندا بە تاوانێك دەگوترێ شیاوی سزادان بێ یان بە ئیعدام یان بەحەبسو زیندانی هەتا هەتایی یان ماوەیەكی دیاریكراو، (ك: جنايا).

**اَلْجَنِيُّ**: هەر میوەیەك كە تازە لە درەختەكە چنرابێ.

**الجاهِبُ**: ئاشكرا ٥ دەگوترێ: (أتاه جاهباً) بە ئاشكرا هات بۆلای.

**الجَهْبُ**: دەمو چاوی گرژو ناشیرینو رەزا قورس.

**اَلْمِجْهَبُ**: بێ حەیاو ئابڕو تكاو، (ك: مَجَاهِبَ)ة.

**الجِهْبَازُ**: رەخنە گری شارەزاو لێزان بە نهێنی کارەکان، (ك: جهابذة).
**الْجَهْبَلُ**: سەر گەورە ٥ بە ساڵاچوو ٥ پیرەمێرد.
**الجَهْبَلَةُ**: ئافرەتی ناشیرینی رەزا گران.
**جَهَثَ جَهْثاً**: ترس‌و رق هەڵسان یان کەیفخۆشی‌و تەڕ دەماخی وای لێکرد سەنگینی خۆی لە دەستدا، (هو جاهث رهي جهثان).
**جَهْجَهَ الأبطالُ**: پاڵەوانەکان لە مەیدانی جەنگدا دەستیان کرد بە هەلهەلە کێشان چەهچەهە.
**جَهْجَهَ بالسبع**: چغەی لە درندەکە کرد بۆئەوەی وازبێنێ ٥ لە حەدیثدا هاتووە دەڵێ: پیاوێکی هۆزی ئەسلەم گورك پەلاماری رانە مەڕەکەی داو مەڕێکی برد (فَجَهْجَهَ الرجلُ).
**جَهْجَهَ الرَّجُلَ**: پیاوەکەی لە هەموو شتێك گێڕایەوە.
**تَجَهْجَهَ الأبطالُ**: پاڵەوانەکان لە مەیدانی جەنگدا هەلهەلەیان کێشا.
**جَهَدَ جَهْداً**: کرنگی جیدییەت ٥ لەقورئاندا هاتووە: ﴿وَأَقْسَمُواْ بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ﴾ ٥ بەمانا تێکۆشان‌و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە مەبەست هاتووە ٥ توشی چورتم‌و نارەحەتی بوو.
**جَهَدَ بفلان**: فلانکەسی بە تاقی کردەوە.
**جَهَدَ فلاناً**: فلانکەس نارەحەتی تووش بوو ٥ بە جەختەوە داوای لێکردو ئیلحاحی لێکرد.
**جَهَدَ الدابَّةَ**: زیاد لە توانای وڵاغەکە باری لێنا، یان رێگای پێ بڕی.
**جَهَدَ المرضُ أو التعبُ أو الحبُّ**: نەخۆشی یان ماندو بوون یان دڵداری لاوازی کرد.
**جَهَدَ اللَّبن**: ماستەکەی کردە ماستاوو هەموو رۆن‌و چەورییەکەی لێگرت.
**جَهَدَ الطعامَ**: حەزی لە خواردنەکە کرد ٥ زۆری لێ خوارد.
**جَهَدَت الماشيةُ المرعى**: ئاژەڵەکان زۆریان لە لەوەڕی پاوانەکە خوارد.
**جَهَدَ المالَ**: ماڵەکەی دابەش کرد هەموی تەخشان‌و پەخشان کرد.
**جُهِدَ الناسُ**: خەڵکەکە توشی قات‌و قڕی بوون.
**جَهَدَ العيشُ جهداً**: ژیان ناخۆش‌و پڕ چورتم بوو.
**أَجْهَدَ**: کەوتە نێو ناخۆشی‌و کارەساتەوە ٥ بوو بە خاوەنی وڵاغێکی زەعیف‌و لاواز.
**أَجْهَدَت الأرض**: زەوییەکە فشەڵ بوو بەرز بۆوە.
**أَجْهَدَ لـه الطريقُ والحقُّ**: رێگای راست‌و حەق دەرکەوت.
**أَجْهَدَ الشَّيْءُ**: شتەکە تێکەڵاو بوو.
**أَجْهَدَ الشيبُ فيه**: خێرا پیربوو، پیری بە خێرایی بە جەستەیدا بڵاوبۆوە.
**أَجْهَدَ العَدُوُّ عليه**: دوژمن بە تەواوەتی رق‌و قینی خۆی دەرخست.
**أَجْهَدَ فلان في الأمر**: فلانکەس لە ئیشەکەدا ئیحتیاتی کرد.

أجْهَدَ له الشَّيْئَ والأمرُ: شتەکەی خستە ژێر دەستی ٥ کارەکەی پێ سپارد.
أجْهَدَ فلاناً: بەمانا (جَهَدَهُ) دێ.
أجْهَدَ الدابةَ: ماندوی کرد ٥ دەگوترێ: (أجْهَدَهُ على أن يفعل كذا): زەختی لێکرد بەتۆپزی ئەو کارەی پێکرد.
أجْهَدَ مالَهُ: ماڵو سامانەکەی دابەش کردو هەمووی سەرف کرد.
أجْهَدَ الطعامُ: ئارەزوی خواردنەکەی کرد.
جاهَدَ العدوَّ مجاهدة وجهاداً: شەڕی لەگەڵ دوژمن کرد.
اجْتَهَدَ: ئەوی لە توانایدا بوو ئەنجامی داو درێغی نەکرد.
تجاهَدَ: بەمانا (اجتهد) هاتووە.
الاجتهاد: لە زاراوەی فوقەهاو شەرع زانانىدا هەوڵدانو توێژینەوەی شەرعزانە، لێکۆڵینەوەو بەراورد کردنی بەڵگەو دەقەکانە بۆئەوەی بگاتە ئەوەی رای بۆ دروست بێ لەسەر بڕیارێك دەربارەی قەضییەیەکی شەرعی.
الجَهَادُ: زەوی دەشتاییو تەخت جا گیاو گژی لێ روابێ یان نا ٥ هەروا بەمانا ساراو چۆڵەوانی دێ ٥ بەمانا زەوی رەقەڵانو پتەویش دێ ٥ لەحەدیثدا هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ: (نزلَ بأرض جَهَادٍ) ٥ هەروا بەمانا بەری درەختی ئەراك دێ.
الجِهَادُ: لە زاراوەی شەرع زانانىدا بریتییە لە شەڕکردنو بەگژا چونەوەی ئەو ناموسوڵمانانەی کە لە ئەهلی زیممە نین.
الجُهادَى: بەمانا کورتەی شتو پوختەی شتە ٥ دەگوترێ: (جهادى الأمر) پوختەی کار.
الجَهْدُ: ماندو بوونو ناخۆشی ٥ کۆتاییو مەبەست ٥ تواناو وزە ٥ دەگوترێ: (جَهْدُ جاهِدٍ وجَهْدُ البلاء) ٥ خێزانی زۆرو هەژاری ٥ لە زاراوەی فەلسەفەدا: هەر هەوڵو تێکۆشانێك زیندەوەرێکی عاقڵمەند ئەنجامی بدا بە جەستە یان بە تێفکرینو وردبوونەوە.
الجُهَيْدى: بەمانا (الجُهْدُ) دێ ٥ دەگوترێ: (لَأَبْلُغَنَّ جهيدى من هذا الأمر).
المُجْتَهِدُ: ئەو شەرع زانەیە کە هەرچی توانای خۆی هەیە ئاراستەی مەسەلەیەکی دەکا بۆئەوەی بڕیارێکی لەسەر بدا لەگەڵ شەرعی خودادا بگونجێ ٥ پێویستە موجتەهید چەند مەرجێکی تێدابن ئەمجار دەتوانێ ئیجتهاد بکا.
المجهود: وزەو توانای بەکارهێنراو.
جَهَرَ الشَّيْئَ جهراً: شتەکە دەرکەوت ٥ دەری خست، ئاشکرای کرد.
جَهَرَ بالكلام ونحوه: قسەکەی راگەیاند ٥ لەقورئاندا دەفەرموێ: (وَإِن تَجْهَرْ

بِـالْقَوْلِ فَإِنَّـهُ يَعْلَـمُ السِّـرَّ وَأَخْفَـى) ٥ دەشگوترێ: (جَهَرَ الكلامَ): قسـەكەی راگەیاند بە دەنگی بەرز.

جَهَرَ الشَّيْءَ: بەبێ پەردە چاوی پێكەوت ٥ ئامادەی كردو مەزەندەی كرد.

جَهَرَت الشمسُ فلاناً: خۆر چاوی فلانـی تێكداو نەیبینی.

جَهَـرَ الأرض: بـە نەشـارەزایی رێگاكـەی بڕی.

جَهَرَ الجَيْشَ والقومَ: لەپێش چـاوی سوپاو خەڵكەكە زۆر بوون.

جَهَرَ الشَّيْءُ فلانـاً: ئەوشتە لەپێش چاوی فلانكەس زۆر گەورەبوو ٥ روخسارو جوانی سەرنجی راكێشا ٥ لە وەصفی پێغەمبـەردا گـوتراوە: (مـن رآه جهـده) هەركەسـێ چـاوی پـێ بكەوتایـە سـەرنجی رادەكێشاو لێـی سەرسام دەبوو.

جَهَـرَ فـلان البِئـرَ: فلانكـەس بیرەكـەی لـە قـوڕو لیتـە پـاك كـردەوە ٥ ئـاوی لێ هـەڵێنجا ٥ هـەڵی كەنـد تـا گەیشتە ئاو.

جَهَـرَ السِّـقاءَ: مەشـكەكەی هەژانـدو رۆنەكەی لێ دەرهێنا.

جَهَـرَ القـومَ: بـەناكاو لـە بەرەبەیانـدا بەسەریدا دان‌و غافڵگیری كردن.

جَهِرَ الانسان وغيره جهراً: چاوی بـە تیشكی خۆر تێك چوون‌و هیچی نەبینی.

جَهِرَت العينُ: چاوی زەق بـوو ٥ چاوی دەرپەڕی، تۆزێك خێل‌و قیچ بوو.

جَهِـرَ الفـرسُ: ئەسـپەكە سـپیاتییەكەی هەموو ناوچەوانی گرتەوە.

جَهِرَ الانسانُ جَهورةً وجهاراً: جەستەی پـێ گەیی‌و خۆی قـایم كـردو روخساری جوان بوو ٥ (هو أجهر وهي جهراء).

جَهُرَ الصوتُ جَهورةً وجهارةً: دەنگـی بـەرز بۆوە.

جَهُرَ فلان: فلانكەس جەستەی رێك‌و پێك بـوو خـۆی دارشـت ٥ روخسـاری جوان‌و شیرین بوو ٥ (هو جَهِير).

أجْهَرَ: راپگەیاند، دەری خست.

أجْهَـرَ بـالكلام: قسـەكەی دەرخسـت، ئاشكرای كرد.

أجْهَرَ فلان: فلانكەس بە دەنـگ گـەورە ناسراوە ٥ یان منداڵی جوانی بوون.

جَاهَرَهُ بالعداوة: دەست پێشـخەری كـرد لە دوژمنایەتیدا.

جاهره بالأمر: كارەكەی لە لا دركاند.

جَهْـوَر فـلان: فلانكـەس دەنگـی بەرزكردەوە.

جَهْوَر الحديث: قسەكەی ئاشكرا كرد.

تَجَاهَرَ فلان: فلانكەس دەری خست كە چاوی زەعیفە.

اجْتَهَـرَ الشَّـيْءَ: بـەبێ پـەردە شـتەكەی بینی.

اجْتَهَرَ الجَيْشَ والقومَ: بەمانا (جَهَرَهم) دێ.

اجْتَهَرَ فلانـاً: لـە چـاو فلانكـەس دا زۆر گـەورەبوو، جـوانی روخسـاری سەرنجی راكێشا ٥ دەگـوترێ: (اجْتَهَرَ

البِئْرَ): بیرەکەی لە قوڕو لیتە پاك کردەوە ٥ ئاوی لێ دەرهێنا.

الجِهَارُ: بە ئاشکراو عەلەنی ٥ دەگوترێ: (لَقِيه نهاراً جهاراً).

الجَهْـرُ: ماوەیێـك لـە رۆژگـار ٥ ساڵێکی تەواو.

جُهْرُ الرجلِ: شێوەو روخساری پیاوەکە ٥ دەگوترێ: (ما احسن جُهرُهُ).

الجَهْـرَاءُ مـن الأرض: زەوییەکی پان‌و پۆڕو بێ دارو درەخت بێ گردو شیوو درکە شاخ ٥ بانووی سەر دەشت‌و بان.

الجَهْـرَاءُ مـن القـوم: کۆمەڵ‌و پێـرو تاقمیان ٥ پیاو ماقوڵ‌و ریش سپێیان.

الجَهْرَةُ: ئەوەی ئاشکراو دیار بێ ٥ بێ پەردەو داپۆشەر بێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً﴾.

الْجَهْوَرُ: پیاوی ئازاو چاو نەترس.

الجَهِـيرُ: درەوشاوە ٥ دەگوترێ: (وجـهٌ جَهِيرٌ) روناکایی روخساری دیارە.

الجَهِيرُ مـن اللبن: ئەو ماستەی لەگەڵ ئاوەکە تێکەڵ نەبووبێ بە کلۆیی مابێتەوە.

الجَهِـيرَةُ: (جَهِـيرَةُ الانسـان): لایەنـە ئاشکراکانی ئادەمیزاد.

المِجْهَارُ: ئەو کەسەی سروشتی وابێ بە دەنگی بەرز قسە بکا ٥ هەروا ئاوە بۆ موکەبەرەو میکرۆفۆن.

المِجْهَرُ: میکرۆسکۆپ، (ك: مجاهر).

اَلْمَجْهُورُ من الأصوات: دەنگێکە زەبزەبەی هەیە لەگەڵ ئەو دەنگە زەبزەبەییە دوو وەتەری دەنگی لە گەرودا زەبزەبە بەرێك‌و پێك دێننە کایەوە.

جَهَـزَ علـى الجـريح جَهْـزاً: پەلەی کرد لە کوشتنی بریندارەکەو زوو لەناوی برد.

أَجْهَزَ على الجريح: بەمانا (جَهَـزَ) دێ ٥ لە حەدیثی ئیبنو مەسعود دا هاتووە دەڵێ: (أنه أتى على ابى جهل وهو صريع فَاجْهَزَ عليه).

جَهَّـزَهُ: جیازییەکەی بۆ ئامادەکرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ﴾.

تَجَهَّزَ للأمر: خۆی بۆ کارەکە ئامادە کرد.

الجَّهَـازُ: پێداویستی کاروان‌و بارو بارگەنەو ئەو کاڵایەی بە کاروانەکەیە.

الجِهَاز: پێداویستی هەموو کارێك پێی دەگوترێ: (جَهَاز). دەگوترێ: (جهاز العروس، جهاز الجيش، جهاز الميت) ٥ لە زیندوا (جَهَاز) یان (جِهَاز) ئەومیە ئامێرێکی جەستە ئەرکێکی تایبەتی‌و گرنگ ئەنجام بدا وەکوو (جهاز التنفس) (جهاز الهضم) ٥ هەروا بە مەکینەی ئامێرێك دەڵێن: کە کارێکی تایبەتی پێ ئەنجام بدرێ وەکو (جهاز التقطير، جهاز التبخير) ٥

هـــەروا بـــە كۆمـــەڵێك خەڵـــك دەگوترێ: كارێكی تایبەتیو گرنگ ئەنجام بدەن وەكوو (جهاز الدعاية) (جهـــاز الاســـــتخبارات، جهـــاز الجاسوسية).

اَلْجَهِيــزُ: دەگـوترێ: (صــوت جَهِيــزٌ): دەنگێكە پەلە پەلی تێدایە.

فـرس جَهِيـز: ئەسپێكی قاڵب سوكە ٥ (فرس جهيز الشدّ) ئەسپێكە گورجو گۆڵو بەراپەرە.

اَلْجَهِيزَةُ: گورگ ٥ ورچ، بێچوە ورچ.

جَهِيزَةُ: ناوی ئافرەتێكە هەموو قسەی وتـار بێـژو قسەكەرەكانی گەلەكەی بـڕیو كێشـەكەی یـەكالا كـردەوە؛ ئـەوە بـوو كۆمـەڵێك خەڵـك كـۆ بوبوونەوە بۆ صولحو كوژاندنـەوەی خوێنێك لە پڕێكا ئافرەتێك كەناوی (جهيـزة) بـوو هاتـە ژورەوەو وتـی بكوژەكە لەلایەن خزمـی كوژراوەكە كوژرایـــەوە! ئـیتر خەڵكەكـە بـە یەكتریان گوت (قطعت جهيـزة قـولَ كل خطيب).

جَهَشَتْ نَفْسُــهُ جَهَشَـاناً وجهشـاً وجهوشـاً: جوڵایەوەو خەریك بـوو لـە پرمـەی گریان بدا.

جَهَـــشَ الصـبی الی أمـه: منداڵەكـە بـۆلای دایكی روانیو لە پرمـەی گریـانی دا ٥ لـــە حـــەدیـــثدا هـــاتووە دەڵـــێ: پێغەمبـــەر (د.خ) لـــە حودەیبییـــە دەڵێــت: (فَجَهَشْــنَا الی رســول الله) ســـەیری پێغەمبـــەرمان كـــردوو خـــەریك بـــوو لـــە پرمـــەی گریـــان بدەین.

جَهَشَ للشـوق والحـزن والبكـاء: خـۆی بـۆ خۆشـی یـان ماتـەموگریان ئامـادە كرد.

جَهَشَ الی القوم: هات بۆلای قەومەكە.

جَهَـــشَ فـــلان مـــن أرض الی أرض: فـلان بەپەلـە لـە فلان شوێنەوە هات بـۆ فلان شوێن.

جَهَشَ من الشَّيِ: لەشتەكە هەڵات.

جَهَشَتْ اليه نفسه جَهَوشاً: ویستی خۆی بڕشێنێتەوە.

جَهِـشَ الصـبيُ الی أمـه: منداڵەكـە دایكـی بینیو خەریك بوو بگری.

أجْهَـــشَ: ویســتی بگــری ٥ دەگـــوترێ: (أجْهَـــشَ للبكـــاء و بالبكـــاء) لـــە حەدیثدا هاتووە: (فسأئني فأجهشت بالبُكاءِ).

اَجْهَشَـتْ اليـه نفسُـهُ: هێڵنجـی هاتـیو رشایەوە.

اجْهَشَ فلاناً عن الأمر: پەلـەی لـە فـلان كرد.

اَلْجَهْشَـةُ: كۆمـەڵێك ئـادەمیزاد ٥ فرمێسـك كە لەكاتی گریاندا هەڵدەومرن.

جَهَضَ فلاناً: بەسـەر فـلان دا سـەركەوت ٥ دەگـوترێ: (جَهَضَـه عـن الأمـر) لـەو كارە دووری خستەوە.

**أجهضت الحامـلُ**: ئافرەتەکە منداڵەکەی بــە ناکــامی لــەبار خــۆی بــرد ٥ دەگوتریٚ: (أجْهَضَتْ جنيناً) کۆرپەکـەی لـەبار خـۆی چـواند ٥ لـە حـەدیـثدا هـاتووە: (فأجْهَضَتْ جنينها) (هي مجهض ومجهضــةُ)، (ك: مجــاهض ومجــاهيض) ٥ منداڵە لەبار چووەکە پێی دەگوتریٚ: (مُجْهَضٌ، جهيض).

**اجْهَضَ الجارحَ عن صيده**: تاژییەکـەی لـە نێچیرەکە دوور خستەوە.

**اجْهَضَ عن مكانه**: شتەکەی لـە شوێنی خۆی جوڵاندو لای برد.

**اجْهَضَ عن الأمر**: پەلەی کرد لە کارەکە ٥ لــە حــەدیــثدا هــاتووە دەڵــیٚ: (فأجْهَضوهم عن أثقالهم يوم أحد).

**جاهَضَهُ عنه**: داکۆکی لێکردو نەیهێشت بچــیٚ بــۆلای ٥ لـــە حـــەدیثـــی موحەممـــەدی کـــوڕی مەســلەمەدا هاتووە ٥ (قصد يوم أحد رجلاً، قـال: فَجَاهَضَنی عنه أبو سفيان).

**الإجْهَــاضُ**: لەبارچــوونی زاڕۆکــە لــە منداڵـدان بێتـە دەرەوە پـێش ئـەوەی تەمەنی زاڕۆکەکە بگاتە چوار مانگ.

**الجـاهِضُ**: ئـەوەی لـە دووگـی حوشـتر بەرزدەبێتـەوە.

**الجاهِضَـةُ**: جاشـە کـەری تەمـەن یـەك ساڵ.

**الجَهَاض**: میوەی درەختی ئیراك.

**الْجِهْضُ**: منداڵی لەبارچوو.

**الجهّاضَةُ**: حوشتری پیر.

**الجَهيضُ**: بەمانا (الجِهْضُ) دیٚ.

**المِجْهَـاضُ**: ئـەو ئافرەتـەی منـداڵی بـۆ رانەوەستیٚ هەرکـە منـداڵی لەسکی کەوت پاش ماوەیەك لـەباری بچیٚ، (ك: مجاهيض)ە.

**تَجَهْضَـمَ**: خـۆی رانوانـدو تەکـەببوری کردو خۆی بەزل زانی.

**الْجَهْضَـمُ**: کەسێك دەمو چـاو گـەورەو خــڕو قــەد ئەســتورو کەتــەبیٚ ٥ ناوێکیشە بۆ شێر.

**جَهِلَت القدْر**: مەنجەڵەکە زۆر کوڵی، بە پێچەوانەی مانای (تَحَلّمتَ)ە.

**جَهِـلَ** فـلان علـى غـيره جهـلاً وجهالـةً: فلاّنکەس رەفتاری ناشیرینی لەگـەڵ فلاّنکەس کـرد ٥ لەقورئانـدا هـاتووە دەفەرمویٚ: (قَالُواْ أَتَتَّخِذُنَا هُـزُواً قَـالَ أَعُوذُ بِاللّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ).

**جَهِــلَ الشَّــيْءَ وبــه**: شـتەکەی نـەزانی، بەشـــتەکەی نـــەزانی ٥ قورئـــان دەفەرمویٚ: ﴿أن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَـةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾.

**جَهِلَ الحقَّ**: حەقی بە زایەدا ٥ (هو جاهل)، (ك: جُهَّالٌ، جَهَلة جُهَلاَء....).

**أَجْهَلَهُ**: وای لێکرد نەزان و نەفام بیٚ.

**جَهَّلَهُ**: بە نەفامی لەقەڵەم دا، نیسبەتی دا بـۆ نـەزانی ٥ خسـتییە نـاو حاڵـەتی نەفامیو سەر لیٚ شێوان و نەزانییەوە.

**إجْتَهَلَـهُ الغَضَـبُ والأَنَفَـةُ**: رق هەڵسان و دەمــارگیری وایــان لێکــرد راســتی نەبینیٚ و جاهیل بیٚ.

تَجَاهَلَ: خۆی بە نەزان نیشان دا هەرچەندە نەزان نەبوو.
إسْتَجْهَلَهُ: بە نەفامی لە قەڵەم دا ٥ بە نەفامو کاڵ فامی هاتە بەرچاو ٥ هەڵی نا بۆ نەفامی ٥ لە حەدیثی ئیبنو عەبباسدا هاتووە دەفەرموێ: (من استَجْهَلَ مؤمناً فعليه إثمه) هەر کەسێك موسوڵمانێك هەڵنێ بۆ نەفامی ئەوە تاوانی ئەو کەسەی لە ئەستۆیە ٥ هەروا (استجهل) بەمانا سوکایەتی پێکردنیش هاتووە.
اسْتَجْهَلَ الريحُ الغُصْنَ: بایەکە لقو پۆپی درەختەکەی جوڵاندەوە.
الْجَاهِلُ: شێر.
الجاهلية: ئەو سەردەمو رۆژگارەی عەرەبە پێش هاتنی ئیسلام ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الأُولَى﴾ ٥ هەروەها وشەی (الجاهليه) بەمانا ئەو رۆژگارانە دێ کە دەکەوێتە نێوان هاتنی دوو پێغەمبەرەوە کە پێی دەگوترێ: زەمانی (فیترەت).
الجَهْلُ: لە زاراوەی زانا کەلامییەکاندا ئەوەیە بروات بە شتێك بێ بە پێچەوانەی واقیعەکەی ٥ (جەهل دوو بەشە): (١) الجهل البسيط: نەبوونی زانیاری دەربارەی شتێك ٥ (٢) الجهل المركب: بریتییە لەوەی بڕواتوابێ فلاّن شت بەو جۆرەیە لە واقیعیشدا بە پێچەوانەوە بێ.
الْجَيْهَلُ: دارێکە (کۆڵەوەژێکە) پشکۆ ئاگری پێ تێکەڵ دەدرێن ٥ بەردی گەورە.
الْجَيْهَلَةُ: دارێکە پشکۆ ئاگری پێ تێك هەڵدەدرێن.
المِجْهالُ: حوشترێکە بە هێواشی بڕوا.
الْمَجْهَلُ: سارایەك نیشانەی رێگاو بانی تێدا نەبێ ٥ دەگوترێ: (أَرْضٌ مَجْهَلٌ): زەوییەکە ئادەمیزاد سەری لێ دەرناکا ناتوانێ پێیدا بڕوا، (ك: مَجَاهِلَ).
الْمِجْهَلُ: بەمانا (الجيهلة) دێ.
الْمَجْهَلَةُ: ئەوەیە پاڵ بە ئادەمیزادەوە بنێ بۆنەفامیو نەزانی ٥ لە حەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (الولد مَبْخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ مجهلة).
المِجْهَلَةُ: بەمانا (الجَيْهَلَةُ) دێ.
المجهول من النوق: ئەو حوشترەیە سك نەکا ٥ زەوییەك نیشانەو کێوی تێدا نەبن.
جَهَمَهُ جَهْماً: بە دەمو چاوێکی ناشیرینەوە پێشوازی لێ کرد قسەی رەقی پێ گوت ٥ دەگوترێ: (جَهَمَنی بما اکره) قسەی ناشیرینی پێ گوتم.
جَهِمَهُ جَهْماً: بە رویەکی ناشیرینەوە پێشوازی لێکرد.
جَهُمَ جَهَامَةً وجُهُومَةً: دەمو چاوی گرژ بوو، روی ترش کرد ٥ دەگوترێ: (جَهُمَ وجْهُهُ).

**أجْهَمَتِ السَّماءُ**: ئاسمان هەورێکی بێ بارانی پێوەیە.

**إجْـتَهَمَ**: کەوتـە نـاو تاریکـایی کۆتـایی شەووەوە ○ لـە تـاریکی کۆتـای شـەودا رۆیی.

**تَجَهَّـمَـهُ**: ولـە: بـەمانا (جَهَمَـهُ) دێ ○ لـە حـەدیثـدا هـاتووە دەڵـێ: (الی مــن تکلنی؟ الی عـدو یتجهمنـی) بـە کـێم دەسپێری؟ بە دوژمنێـك کـە بـەڕوی گرژەوە پێشوازیم لێ دەکا.

**تَجَهَّمَ الأملُ فلاناً**: هیـواو ئـاوات فلآنـی نەگرتەوە، ئاواتەکەی نەهاتە دی.

**الجَهـامُ**: هـەورێك بـارانی پێـوە نـەبێ ○ دەگوترێ: (جاءنی بهذا الأمـر بجهـامٍ) شتێکی بێ خێرو بێری بۆ هێنام.

**الجَهْمَةُ**: مەنجەڵی گەورە.

**الجُهْمَةُ**: تاریکایی کۆتایی شەو.

**الجَهْمِیـةُ**: پێـرێکن لـە خەواریجـەکان لـە مورجیئـەکان کـە رێـڕەوی جـەهمی کوڕی صفوانن.

**الجَهُـومُ مـن الرجـال**: پیـاوی لاوازی بـێ دەسەڵات.

**الْجَیْهُمَان**: زەعفەران.

**جَهَنَ جُهوناً**: نزیك بووە ○ پێی گەیشت.

**الجُهَانَـةُ**: کــەنیزەکی گــەنجو تــازە پێگەیشتوو.

**الْجَهْنُ**: روو گرژی.

**الْجُهْنَةُ**: تاریکی کۆتایی شەو.

**جُهَیْنَةُ**: هـۆزێکن لـە خێڵـی قـوضاعـە ○ دەگـوترێ: (فـلان جُهَیْنَـةُ الأخبـار): هەواڵی راست لای فلآنە.

**الْجِهْنَامُ**: چاڵی قـوڵ ○ بیرێـك زۆر قـوڵ بێ.

**جَهَنَّمُ**: ناوێکە لە ناوی ئەو شوێنەی خـودا تاوانبـارانی تێـدا سـزا دەدا واتـە: دۆزەخ.

**جَهَنَّمِیةُ**: گوڵە جەهەنەمی؛ گوڵێکە لـە باغچەی ماڵانو باغچە گشتییەکاندا بۆ جوانی دەروێندرێ.

**جَهِیَتِ السـماءُ جَهـیً**: ئاسمـان ساو بـوو هەوری پێوە نەما.

**جَهِی البَیْتُ**:خانووەکە وێران بوو.

**جَهِی فلان**: فلآن کـەس سـەری روتایـەوەو توکی پێوە نەما.

**أجْهَت السماء**: بەمانا (جَهِیَتْ) دێ.

**أجْهَی القومُ**: ئاسمان بۆ ئەو ئەتەوە ساو بوو.

**أجْهَـی الطریـقُ**: رێگەکـە ئاشـکرا بـوو، دەرکـەوت ○ دەگـوترێ: (أجْهَـی لـه الطریق والأمرُ): رێگاکەو کارەکە بـۆ فلآن کەس رون بووەوە.

**أجْهَـی الخِبَـاءُ**: ماڵەکـە ○ خێمەکـە، رەشماڵەکە، بێ پەردە بوو.

**أجْهَـی فـلان علیـه**: فلآنکـەس رژدو چروك بوو.

**أجْهَت المرأة علـی زوجهـا**: ئافرەتەکـە نــەزۆك بــوو منــداڵی لــە ســکی نەکەوت.

**أجْهَى الطريقَ والبَيْتَ**: ڕێگاکەی ڕون کردەوەماڵەکەی بۆ دیاری کرد.

**جاهاه**: شانازی بەسەردا کرد.

**جَهّىَ الشجَّةَ**: برینەکەی گەورەکرد.

**الجاهي**: ئاشکرا، دەگوترێ: (أتاه جاهياً) بە ئاشکرا هات بۆ لای.

**الجَهْوَةُ**: تەپۆڵکە، گرد.

**جَابَ الطيرُ جوباً**: باڵندەکە کەوتە خوار.

**جـاب فـلان ألشَّـيْءَ**: فلانکەس شتەکەی بڕییەوە ٥ ناوەڕاستەکەی بڕییەوە، کونی تێکرد.

**جاب النَعْلَ**: نەعلەکەی دارشت.

**جاب الصخرةَ**: بەردەکەی تاشی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَثَمُـودَ الَّـذِينَ جَـابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ﴾.

**جـاب الأرض والفـلات والـبلاد**: بەناو زەوییەکەدا ڕۆیشت دەشتەکەی بڕی وڵاتەکەی بڕی بە پێدا ڕۆیشتن.

**جاب الخبرُ البلادَ**: هەواڵەکە بەناو وڵاتدا بڵاوەی کرد.

**جاب الظلامَ**: چووە ناو تاریکاییەوە.

**أجَابَتِ الأرض**: زەوییەکە گیای ڕواند.

**أجَـابَ فـلان فلانـاً**: فـلان وەڵامـی پرسـیارەکانی فلانـی دایـەوە ٥ دەگـوترێ: (أجـاب عـن السـؤال): وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە.

**أجـابَ طَلَبَـهُ**: داواکـەی قبـوڵ کـرد ٥ ئیشـەکەی بـۆ جێبـەجێ کـرد ٥ لەقورئاندا هاتووە دەفەرموێ: ﴿فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾.

**جَاوَبَـهُ مُجاوبَـةً وجواباً**: هەریەکـە لـە بەرامبـەرەکان وەڵامـی ئـەوی تـری دایەوە.

**جَـوَّبَ القمـرُ**: مـانگ دونیـای ڕونـاك کردەوە ٥ دەرکەوت.

**جَـوَّبَ علـى فـلان بـترس**: بـە مەتـەڵ فلانکەسی پاراست.

**جَوَّبَ ألشَّيْءَ**: شتەکەی ناو بۆش کـرد ٥ ناوەڕاستەکەی بڕی کونی کـرد ٥ لە حـەدیـثدا هـاتووە دەڵـێ: (أخـذت اهاباً مطوناً فجوبت).

**جَوَّبَ المطرُ الأرض**: بارانەکە هەنـدێ لە زەوی گرتەوەو هەنـدێکی نەگرتـەوە واتـە لـە هەنـدێ شـوێن بـاریو لـە هەندێ شوێنی تر نا.

**اجتـابَ ألشَّـيْءَ**: شـتەکەی کـون کـرد، چووە ناوی.

**اجتاب البئرَ**: بیرەکەی هەڵکەند.

**اجتـاب الـبلاد والفـلاة**: وڵاتو دەشـتو سارای تەی کرد پێیاندا تێپەڕی.

**اجتاب القميصَ**: کراسەکەی لەبەر کـرد لـە حـەدیـثدا هـاتووە دەفـەرموێ: (أتاه مجتابي النمار).

**اجتاب الظلام**: چووە ناو تاریکییەوە.

**انجاب**: هەڵقڵیشا، دولەت بوو بڕایەوە.

**انجاب السحابُ**: هەورەکە لاچوو.

**انجـاب الظـلام**: تـاریکی لاچـوو نـەما، دونیا ڕوناك بوو.

**تجاوب القومُ:** ئەو قەومە هەندێكیان وەڵامی هەندێكیانی دایەوە داخوازی یەكتریان هێنایە دیو ڕێك كەوتن.

**استجابَهُ:** وەڵامی بۆ ناردەوە.

**استجاب لە:** گوێبیستی فەرمانەكەی بوو داواكەی جێبەجێ كرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي﴾.

**استجاب الله فلاناً ولە ومنە:** خودا دوعای فڵانكەسی قبوڵ كردو داخوازییەكەی بۆ هێنایە دی.

**استجوبَهُ:** داوای وەڵامی لێكرد.

**اَلْجَابَةُ:** وەڵام، دەگوترێ: (أساءَ سمعاً فأساء جابةً).

**الجواب:** وەڵامی پرسیار، بە پیرەوە هاتنی داخوازی، ڕەدكردنەوەی داوا، وەڵامدانەوەی نامە، وەڵامی ڕەخنە ٥ دەنگی باڵندە ٥ لە حەدیثدا هاتووە لە باسی دروستكردنی كابەدا دەفەرموێ: (فسمعنا جَواباً من السماء فاذا بطائر أعظم من النسر) ٥ لە زانستی مۆسیقادا بە ئاوازی هەشتەم دەگوترێ لە پلەكانی مۆسیقادا.

**اَلْجَوْبُ:** كراسێكە ئافرەت لەبەری دەكا ٥ مەتەڵ ٥ دۆڵچەی گەورە ٥ جۆر، دەگوترێ: (لي فلان جَوْبان من خلق) فڵانكەس دوو جۆر ڕەوشتی تێدایە لەسەر هیچ جۆرێكیان بەردەوام نابێ.

**اَلْجَوْبَةُ:** كەڵو كەلێن لە هەوردا یان لە كێودا ٥ هەروا هەر چاڵو دۆڵێكی بەر فراوان ٥ دەشتایی ڕوتەنی نێوان دوو كێو ٥ كۆڵانی نێوان دوو خانوو ٥ چاڵایی زەوی كەم درەخت ٥ مەتەڵ.

**الجوّاب من الرجال:** گەڕیدەو ڕەوتەنی هەمیشەیی.

**المِجْوَابُ:** ئاسنی برندە شتی تری پێ ببڕدرێتەوە ٥ ئامێری شت كون كردن ٥ بڕین.

**المِجْوَبُ:** ئاسنێك شتی پێ ببڕدرێتەوە ٥ مەتەڵ ٥ كراس ئافرەت لەبەری بكا.

**الْمجَوْبَةُ:** وەڵام.

**جَوِثَ جَوْثاً:** سكی لە سەرەوە گەورە بوو ٥ سكی لە خوارەوە داچۆڕا (هو أجوث وهي جَوْثاء)، (ك: جُوث).

**جاح فلان:** فڵانكەس ماڵو سامانی خزمەكانی فەوتا ٥ وازی لە بەڵگە هێنانەوە هێنا شتی تری ڕەچاو كرد.

**جاحت الجائحةُ المالَ:** بەڵاكە ماڵو سامانەكەی فەوتاندو لە بێخ دەری هێنا دەگوترێ: (أعاذكم الله من جوح الدهر): خودا لە بەڵای زەمانە بتانپارێزێ.

**أجاحَت الجائحةُ المالَ:** بەڵاكە ماڵو سامانەكەی فەوتاند.

**جَوَّحَ رجلَهُ:** قاچی ڕوت كرد پێخواس بوو.

**الأجْوَحُ:** پان و پۆڕ لە هەموو شتێك، (هي جَوْحَاءُ)، (ك: جوح).

**الجائحةُ:** بەڵاو كارەسات كە توشی ماڵو سامانی پیاو دەبێو لەناوی دەبا ٥ لە زاراوەی شەرعزاناندا بریتییە لە

بەڵاو ئافاتێك لە ئاسمانەوە هاتبێ بەرو بووم و میوەی لەناو بردبێ هەمووی لەناو بردبێ یان هەندێکی.

سنة جائحة: ساڵێکی قات و قڕی.

**الْجَوْحُ**: کاڵەکە شامی.

**الْجَوْحَةُ**: کارەسات و بەڵای ئاسمانی.

**الْمِجْوَحُ**: ئەو کەسەی پێویستی بە هەموو شتێك بێ، (ك: مجاوِح).

**جاخ** السیلُ الوادي جاخه: لافاوەکە قەراخ و بیجاغی شیوەکەی دادڕی.

جَوَّخ السیلُ فلاناً: لافاوەکە فلانکەسی لەناو برد، کوشتی.

تجوخت البئرُ: بیرەکە تێك ڕوخا.

تجوخت القرحةُ: دومەڵەکە بە چەقۆ شەقی برد.

**الجوخ**: خوێدان، تورەکەیەکە لە خوری رەنگ کراو دەچندرێ.

**الجوخةُ**: چاڵ.

**جاد** جودةً: باش بوو، (جاد العملُ) کردەوەکە باش بوو، (ك: جیاد وجیائد).

جادَ الرجلُ: کاری باشی کرد قسەی چاکی کردن، (هو مجواد).

جاد الفرسُ: ئەسپی چاك بوو.

جاد الفرسُ في عَدْوِهِ: ئەسپەکە تیژڕەو بوو (فهو وهي جواد) ە لە پەندی پێشینانەدا هاتووە دەڵێ: (ان الجواد قد یَعْثِرُ) ئەسپی ڕەسەنیش هەڵدەنگوێ ە بە کەسێك دەگوترێ: زوربەی کردەوەکانی باش بێ و جارێك هەڵە بکا، (ك: جیاد).

جاد فلان جوداً: فلانکەس سەخاوەتی نواند، ماڵی بەخشی.

جاد بنفسه جَوْداً وجئوداً: نزیك بوو گیانی دەرچێ، بمرێ.

جاد المطر: باران زۆر باری.

جاد العینُ: چاوەکە فرمێسکی زۆر ڕشت.

جاد المطرُ الأرض: باران لەو زەوییە باری، گرتیەوە ە دەگوترێ: (جاد المطرُ القومَ) بارانەکە ئەو خێڵەو زەوی و وڵاتیانی گرتەوە ە لە حەدیشدا هاتووە دەفەرموێ: (ترکت اهل مکة وقد جیدوا).

جاد الهوی فلاناً: سۆزو دڵداری فلانکەسی نەخۆش خست، بەسەریدا زاڵ بوو، برستی لێ بڕی.

جاد النعاسُ فلاناً: وەنەوز بەسەر فلانەدا زاڵ بوو، (هو جائد).

جادَ فلاناً: لە سەخاوەتدا بەسەر فلانکەسدا زاڵ بوو.

جِیدَ فلان جواداً: فلانکەس تینووی بوو.

جِیدَ من العطشِ: لە تینواندا بە هیلاك چوو، خەریك بوو بمرێ ە دەگوترێ: (انی لأُجَادُ الی لقائه): ئارەزووی دیتنی دەکەم و دەبرێم بۆلای.

أَجَادَ: کاری باشی ئەنجامدا، قسەی چاکی کرد، دەگوترێ: (أجاد الشيءَ وفیه): وای لێکرد باش بێ ە لە کارەکەدا ئیشی باشی کرد.

أجاد فلان: فلانكەس بوو بە خاوەنی ئەسپی چاك ٥ لە حەدیسدا هاتووە دەفەرموێ: (باعَدَهُ الله من النار سبعين خريفاً للمضمر المجيد).

أجادت فلانة: فلان ئافرەت منداڵێکی سەخی سروشتی بووە.

أجاد فلاناً: بە سەخی سروشتی لە قەڵەم دا.

أجاد فلاناً النقد والثياب: پارەی باش، قوماشی باشی دابە فلانكەس.

أجادَ الجَوْدُ الأرض: بارانەکە لە زەوییەکەی دا.

أجاد الجَوْدُ فلاناً: باران فلانکەسی کوشت.

أجْوَدَ: کاری باشی کرد، قسەی چاکی کرد ٥ بوو بە خاوەنی ئەسپی باش‌و رەسەن.

أجْوَدَ الشَّيْئَ وفيه: شتەکەی بە باشی ئەنجامدا.

جَاوَدَهُ: لە سەخاوەتیدا لەوی تێپەڕاند.

جَوَّدَ الفرسُ في عدوه: ئەسپەکە لە رۆیشتن دا زۆر باش بوو.

جَوَّدَ الشَّيْئَ: شتەکەی چاك کرد.

تجاودوا في الشَّيْئَ: سەیریان کرد ئاخۆ کامیان ئیشەکەی باشتر ئەنجامداوە.

تجاودوا في المحاورة: سەیریان کرد بزانن کامیان بەڵگەکەی بەهێزترە ٥ لە حەدیسدا هاتووە دەگوترێ: (نظروا أيهم أجود حديثاً).

تَجَوَّدَ في العمل: دەست رەنگینی لە کارەکەیدا کرد.

تَجَوَّدَ الشَّيْئَ: شتەکەی هەڵبژاردو داوای کرد شتێکی باش بێ.

استجاد الشَّيْئَ: بەمانا (تَجَوَّدَه) هاتووە ٥ بە باشی لە قەڵەم دا.

استجاد الفَرَسَ: هیوای خواست ئەسپەکەی ئەسپی رەسەن بێ ٥ بەدوای ئەسپی رەسەندا گەڕا ٥ ئەسپی چاکی پەیدا کرد.

استجاد فلاناً: داوای بەخشش‌و دەسەندەی لێکرد.

التجاويد: بارانی زۆر.

الجاديّ: زەعفەران.

الجَوَادُ: ئەسپی رەسەن، (ك: جِيَاد)ە ٥ لەقورئاندا هاتووە دەفەرموێ: (إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ).

الْجُوَادُ: هەنوز.

الجَوْد: بارانی زۆر ٥ لە حەدیسی نوێژە بارانەدا هاتووە دەفەرموێ: (ولم يأتِ أحد من ناحية الاحَدَثَ بالجَوْد).

الجُودُ: بەلای زانایانی ئەخلاقەوە رەوشتێکە خاوەنەکەی هەڵدەنێ بۆ بەخشینی ئەو شتەی پێویستە ببەخشرێ بەبێ بارتەقا.

الجَوْدَةُ: چاك‌و باش ٥ باش ماڵی بوون، لە زاراوەی ئەهلی فکرو وردبونەوەدا ئەوەیە بە رێك‌و پێکی لە شتێك شتێکی دی بەدی بکا، بە باشی لە مەلزوماتەوە بڕوا بۆ لەوازیم.

جارَ جَوْراً: داوای ئەوەی کرد پەنا بدرێ، نەهێڵدرێ دەستی دوژمنی بگاتێ.

جار الطريقُ: ڕێگاکەی نەدییەوە.

جار الأرض: گژو گیاو رووەکی زەوییەکە زۆر بەرز بووەوە.

جار عن القصد والطريق: لە مەبەستو ڕێگا کلا بوو، لایدا.

جار في حكمه: لە بڕیارەکەی ستەمی کرد، ناحەقی کرد ٥ دەگوترێ: (جار عليه في حكمه): لە بڕیارەکەیدا ستەمی لێکرد ٥ (هو جائر)، (ك: جَوَرة).

أجَارَهُ: پەنای داو پاراستی، نەیهێشت دەستی دوژمنی بگاتێ ٥ دەشگوترێ: (أجاره من فلان): لە دەستی فلانکەس پاراستی ٥ لەقورئاندا هاتووە: ﴿وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ﴾.

أجار الله من عذابه: خودا لە سزای خۆی پاراستی.

أجارَ المتاعَ: کاڵاکەی پاراست.

أجارَ فلاناً عن الطريق: فلانکەسی لە ڕێبازەکە لادا.

أجارَ على القوم فلان: فلانکەس لادان لە ڕێبازی بەسەر قەومەکەدا سەپاند.

جاوره مجاورة وجواراً: لە پەنایدا نیشتەجێ بوو، بوو بە هاوسێی ٥ پەیمانی دایە یارمەتی بدا، بیپارێزێ لە دوژمن.

جاور المسجدَ: لە مزگەوتدا مایەوە بۆ خودا پەرستی بە مەبەستی (اعتكاف).

جاور المدينة أو مكة: لە مەدینەدا یا لە مەککە دا مایەوە.

جاورَ بني فلان وفيهم: بە هاوسێیەتی فلان بنەماڵە بەختەوەر بوو.

جَوَّرَهُ: ستەمی پاڵ دا، بە ستەمکاری لە قەڵەم دا.

جَوَّرَ البناءَ: بیناکەی ڕوخاند.

جَوَّرَ فلاناً: فلانکەسی بە زەویدا دا، کوشتی.

اجتَوَرَ القومُ: ئەو خێڵە هەندێکیان بوونە هاوسێی هەندێکیان.

تَجَاوَرَ القومُ: بەمانا (اجتوروا) هاتووە.

تَجَوَّرَ: بۆ موطاوعەی (جَوَّرَهُ) هاتووە.

تَجَوَّرَ على فِراشِه: کابرا لەسەر نوێنی خۆی ڕاکشا، پاڵ کەوت.

تَجَوَّرَ خِباءُ الليل: تاریکایی شەو لاچوو نەما.

استَجَارَ بفلان: پەنای بۆ فلانکەس برد، هاواری بۆ ئەو برد.

استَجَارَ فلاناً: داوای لە فلانکەس کرد کە پەنای بداو ترسی دوژمنی لێ بڕەوێنێتەوە ٥ لەقورئاندا هاتووە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ﴾ ٥ دەگوترێ: (استجاره من فلان): لە ستەمو دەست درێژی فلان ڕزگاری کرد.

الجار: هاوسێ؛ ئەوکەسەی ماڵی لەپەنا ماڵتەوە بێ یان دوکانی لە تەنیشت دوکانتەوە بێ، یان شەریکی تیجارتت بێ ٥ لە هەندی پیشیناندا

هاتووه دەگوترێ: (قد يؤخذ الجار بذنب الجار) ٥ هەروا وشەی (الجَارُ) بەمانەش دەگوترێ: پەنا دەر، پەنا دراو، هاوسەر (مێرد یان ژن)، سوێند خۆرو پەیماندەرو یارمەتیدەر، (ك: جيرة، جيران، أجوار).

الْجَــوَارُ: نـاوی زۆرو قـوڵ ٥ هـەروا دەوروبەری خانوو.

الجِوارُ: عەهدو بەڵێن و ئەمان.

الْجَوْرُ: ستەم، (ك: جَوَرَةٌ وجُـوَرَةٌ) دەگوترێ: (عنده من المال الجَوْرُ) ماڵ و سامانێکی زۆرو لە ڕادە بەدەری هەیە.

الجِوَرُّ: شتی رەق و پتەو ٥ دەگوترێ: (بعير جِوَرٌّ): حوشتری کەتەو قەبارە گەورە ٥ (سَيْلٌ جِوَرٌّ): لافاوێکی زۆرو ترسناك ٥ (غيث جِـــوَرٌّ): بـارانێکی زۆرو هەورەکانی بەگرمە گرم.

الْجَــوَّار: زەوی کـێڵ، جوتیـار، ئـەو کەسـەی هەمیشـە خـەریکی بـاخ و بێستان بێ و نیشیان تێدا بکا.

جَوْرَبَهُ: گۆرەویی لەپێ کرد.

تَجَوْرَبَ: بۆ موطاوعەی (جَوْرَبَهُ) دێ.

الْجَوْرَبُ: پۆشاکی پیاو، (ك: جواربة)ە.

جاز القولُ جوزاً وجَـوازاً ومَجَـازاً: وتەکە پەسـەندکرا، وتەکـەی قبـوڵ کـردو تەنفیزیشی کرد.

جاز العقدُ وغيرُهُ: گرێبەستەکە پەسەند بوو، گـرێ بەسـتو پەیمانەکەی جێبـەجێ کرد، ڕۆیاندی، ڕەتی نەکردەوە.

جَازَ الْمَوْضِعَ وبه: ئەو شوێنەی بڕی و پێیدا ڕۆیی و تەی کرد.

جاز بفلان المَوْضِعَ: ڕابەرایەتی فلانـی کـرد تـا ئـەو مەودایـەی بـڕی ٥ دەسـت درێـژی کـردە سـەرو خسـتیە دوا خۆی ٥ پاش خۆی دا.

أجازَ على اسمه: نیشانەی لەسەر نـاوی خۆی دانا.

اجازَ الشَّيْئَ: ڕێگەی بە شتەکەی داو بە جائیزی دانا.

أجاز الموضِعَ: ئەو شوێنەی بڕی و پێیدا تێپەڕی.

أجاز فلاناً الموضـع: ڕابەرایـەتی فلانـی کرد تا ئەو مەودایەی بڕی.

أجاز العَقْدَ: گرێ بەستەکەی مۆر کردو پێی ڕازی بوو.

أجـاز الـرأي والأمْـرَ: ڕایەکـەی پەسـەند کردو کارەکەی ئەنجامدا.

أجـاز المعلـمُ تلميـذَهُ: مامۆسـتاکە بـڕوا نامەکــەی دا بــە قوتابییەکــەی و ڕێگەی دا زانیاری لـێ ڕیوایەت بکا.

جاوز عن ذنبه: چاوپۆشی لە تاوانەکەی کردو لێی خۆش بوو.

جـاوز الطريـق ونحـوه: ڕێگاکـەی خسـتە پاش خۆیەوە لێی تێپەڕی.

جَوَّزَ لهم دوابَّهُمْ: یەکە یەکە ئاژەڵەکانی بۆ پەڕاندنەوە.

جَـوَّزَ الـدراهِمِ: پارەکـەی قبـوڵ کـرد هەرچـەند کـەم و کورپیشـیان تێـدا

جَوَّزَ الرأيَ والأمرَ: رایەکەی پەسەند کرد، فەرمانەکەی جێبەجێ کرد.
جَوَّزَ لهم الدواب: ئاژەڵەکانی بۆ ئاودان.
اجتاز: تێپەڕی ٥ دەگوترێ: (اجتاز الموضعَ) لەو شوێنە تێپەڕی.
تجاوز عن الشَّيْءَ: چاو پۆشی لەشتەکە کرد.
تجاوَزَ عن الرجل: لە پیاوەکە خۆش بوو ٥ دەگوترێ: (تجاوز عن الذنب) لە تاوانەکە خۆش بوو.
تجاوز في الشَّيْءَ: زێدە ڕۆیی لەشتەکەدا کرد.
تجاوزَ الموضعَ: بەمانا (جازَهُ) دێ.
تجوَّزَ في الأمر: بە ناچاری تەحەممولی کردو چاوی لێ پۆشی.
تجوَّزَ عن الرجل: بەمانا (تجاوزَ) دێ.
تجوَّزَ في الصلاة: نوێژەکەی کەم کردەوەو درێژەی پێ نەدا، لە حەدیثی عەلی دا هاتووە دەفەرموێ: (تجوّزوا في الصلاة).
تجوَّزَ في الكلام: قسەکانی بە توێکڵەوە کردن.
تجوَّزَ الدراهمَ: دیرهەمەکانی قبوڵ کردن هەرچەندە تەزویریشیان تێدا بوو.
استجاز: داوای مۆڵەتی کرد.
استجاز المسافر فلاناً: ڕێبوارەکە داوای لە فلان کرد هەندێکی پارە بداتێ بۆئەوەی کاڵاکەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك پێ بگوێزێتەوە.
استجاز: داوای لێکرد ئاژەڵەکانی یان کشتوکاڵەکەی بۆ ئاوبدا.
استجاز فلاناً: داوای لە فلان کرد ڕێگەی پێ بدا ڕیوایەتی لێوە بگێڕێتەوە.
الجائز: ئەو کەسەیە بەلای هۆبەیەکدا تێپەڕێ‌و تینووی بێ جا ئاوی بدەنێ یان ناموسوڵمانەکان ٥ هەروا ئاوە بۆ نێرگە؛ (دارێکی ئەستورە رادێڵدرێ‌و ئەمسەرەو سەری دارەکانی تری دەخرێنە سەر)، (ك: أجوزة، جیزان جوزان).
الجائزة: ئەو بڕە ئاوەیە ڕێبوار لەگەڵ خۆی هەڵی دەگرێ لەم قۆناغ بۆ ئەو قۆناغ یان لەم بیرە ئاوەوە تا دەگاتە بیرە ئاوێکی تر ٥ جامە ئاوێك ٥ بەخشش‌و ڕێز لێنان، (ك: جوائز)ە.
جوائز الأمثال والأشعار: ئەو شیعرو پەندانەن خەڵك لەم شارەوە دەیانباتە شارێکی تر واتە زوو بەناو خەڵکیدا بڵاو دەبنەوە.
الجَوَازُ: ئەو ئاوەیە کشتوکاڵ یان ئاژەڵ دەیخواتەوە ٥ ئەو ئاوەیە ڕێبوار بۆ پێداویستی ڕێگا لەگەڵ خۆی دەیبات.
جواز السفر: پێناسەو بەڵگە نامەیەکە دەوڵەت دەیدا بە هاوڵاتیان بۆئەوەی بتوانن سەفەر بکەن بۆ دەرەوەی وڵات هەرکاتێ حەزیان لێ بوو، (ك: أجوزة)ە.
الْجَوْزُ من كل شيء: ناوەڕاستی ٥ لە حەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (أنه قام من جوز الليل يصلّي) ٥ هەروا بەمانا

زۆرینەی شت دێ ە بەروبومێك بە کەڵکی خواردن بێ ە دارێکی جوانە بۆ ئەساسی ناو ماڵ بەکاردێ.

**جوز الهند:** دەنکی نەرجیل.

**الجوزاء:** بورجێکە لە بورجەکانی ئاسمان.

**الجوزة:** تاکی گوێز ە جامێك ئاو ە ئەو ئەندازە ئاوەی رێبوار لەگەڵ خۆی هەڵی دەگرێ بۆ پێویستی رێگا لە کانییەکەوە بۆ کانیاوێکی تر ە جۆرێکە لە ترێ زەردە کە پێگەیی زۆر زەرد دەبێ.

**الجیز:** قەراخی شیو ە شوێنی قەوم و زێدو نیشتمانیان ە دەگوترێ: (نزلنا جیز بني فلان).

**الجیزة:** ئەو برە ئاوەیە رێبوار لە قۆناغێکەوە لەگەڵ خۆی دەیبا تا دەگاتە قۆناغێکی تر یان کانیاوو بیرە ئاوێکی تر، (ك: جِیزٌ وجِیَزٌ).

**المجاز:** شوێنی تێپەڕ بوون ە (المجاز في الکلام) ئەوەیە لە مانای خۆی لایدابێ وشەکە بۆ مانایەکی تر بەکار هێنرابێ.

**مجازة النهر:** پردی سەر روبار.

**أرض جازة:** زەوییەك داری گوێزی زۆری لێ بێ.

**المجیز:** سەرپەرشتیار، وەکوو وەلی و وەصی ە مامۆستایەك ئیجازەبدا بە قوتابیەکەی.

**جاسَ جوساً وجوساناً:** رارا بوو، هاموشۆی بەناودا کرد، پێیدا بلاو بوونەوە ە دەگوترێ: (جاسوا خلال الدیار) بەناو کۆڵان و هۆبەو خێڵەکاندا بڵاوبوونەوە بە مەبەستی تێکدان و شێواندنی وڵات و تالانکردنی.

**جاس الحارسُ وغیره:** حەرەسەکە بەشەو بەناو ماڵەکاندا گەڕا.

**جاسَ الشَّيْءَ:** ویستی وردە وردە شتەکە بە دەست بێنێ ە پێی لێنا.

**اجْتَاسَ:** هاتۆچۆی کرد.

**الجوسق:** باڵەخانەی بچوك ە قەلاو شورا.

**جَاشَ جَوْشاً:** هەموو شەو نەوەستاو رۆیی.

**تَجَوَّشَ اللیلُ:** بەشێك لە شەو رۆیی.

**تَجَوَّشَ فلان:** فلانکەس کەمێك لاواز بوو.

**الجَوْشُ:** سینگ ە ناوەڕاست ە بەشی زۆری شەو.

**الجُوْش:** سینگ.

**الْجَوْشَنُ:** سینگ، زرێ، (ك: جواشن)ە.

**جَاعَ جوعاً وجَوْعةً ومجاعةً:** برسی بوو ە (تجوع الحرةُ ولا تأکل بثدییها) بە کەسێك دەگوترێ خۆ بپارێزێ لە کاری سوکانەو ئیشی نالەبار.

**جاع الحيُّ:** زیندەوەرەکە ناو سکی بەتاڵ بوو، لە پەندی پێشیناندا هاتووە دەڵێ: (بطن جائع ووجه مدهون) سکی برسی و دەم و چاوی ئارایشکراو ە بەکەسێك دەگوترێ: بە درۆ خۆ بە تێرو تەسەل نیشان بدا، لە پەندی کوردی دا دەڵێ: (سك لە

برسـا قـوڕەی دێو کـراس لەبـەرا خشەی دێ).

**جائع القِدر**: برسـیو هـەژار، (ك: جیـاع وجُوَّع وجُیَّـع) ٥ (هـو جَوْعـان وهـي جوعی)، (ك: جیاع وجیاعی).

**أجاعَـهُ**: خـۆراکی لێ قەدەغـە کـرد ٥ ناچاری برسیایەتی کرد.

**جَوَّعه**: بەمانا (أجاعَهُ) دێ ٥ لـە پەنـدی پێشـینانـدا هـاتووە: (جَـوِّعْ کَلْبَـكَ یَتْبَعْـكَ): سـەگەکەت برسـی بکـە شوێنت دەکەوێ.

**تَجَوَّعَ**: بـە ئەنقەسـت خـۆی بـە برسـی کـردن دا یـان خـۆی برسـی کـرد ٥ دەگـوترێ: (تَجَـوَّع للـدواء): خـۆت برسی بکە بۆ دەرمان خواردن.

**اسْـتَجَاعَ**: سـات دوا سـات خـەریکی خواردن بوو هەمیشە دەمی دەجولا.

**الجوعُ**: برسییەتی ٥ خالّی بوونی گەدە لە خواردەمەنی.

**الْمَجاعَةُ**: سالّی بێ بارانیو قاتو قڕی، (ك: مجائع).

**الْمَجْوَعَةُ**: بەمانا (الَمجاعَة) دێ.

**الْمَجوُعَةُ**: بەمانا (الَمجاعَةُ) دێ.

**جافَـهُ جَوْفـاً**: لـەناو سـکی دا، نـاو سـکی هەنگاوت.

**جاف الصیدَ**: ناو سکی نێچیرەکەی هـەنگاوت گوللەکـە چـووە نـاو سـکییەوەو ئـەم دیواو دیوی نەکرد ٥ هەروا دەگـوترێ: (جـاف فلانـاً بطعنـةٍ، وجافـت الطعنـة فلاناً): سەرە رمبێکـی بـەورگی فلاّنـدا کـرد ٥ لـە حـەدیـثدا هـاتووە: (فِي الجائفة ثلث الدية).

**جاف الدواءُ فلانـاً**: دەرمانەکە چـووە نـاو سکی فلاّنکەسەوە.

**جَوِفَ جَوَفاً**: ناوسکی هەبوو ٥ ناوسکی خالّی بوو ٥ سکی گەورە بـوو ٥ (هـو أجْـوَفٌ وهي جوفاء)، (ك: جوف، وجُوفان).

**أجافَهُ الطَّعْنَةَ وبِها**: بە زەبرەکە ناوسکی پێ هەنگاوت.

**أجَافَ البابَ**: دەرگاکەی پێـوە دایـەوە ٥ چووە نـاو خانووەکـەوەو دەرگاکـەی پێوە دایەوە.

**جَوَّفَ الشَّيْءَ**: شتەکەی ناو کلۆر کرد.

**جَـوَّفَ الصَّـیْدَ**: تیرەکـەی لـەناو جـەرگی نێچیرەکە دا ناوسکی هەنگاوت.

**إجْتافَهُ**: چووە ناو بۆشایی جەستەیەوە.

**تَجَوَّفَ**: بۆ موطاوەعەی (جَوَّفَهُ) هاتووە.

**تَجَـوَّفَ الشَّـيْءَ**: چـووە نـاو کلـۆرایی جەستەیەوە.

**اسْتَجَافَ**: بەر فراوان بوو.

**اسْتَجَافَ الشَّـيْءَ**: شتەکە هاتـە دەسـتی بە کلۆری.

**استَجْوَفَ**: بەمانا (اسْتَجَافَ) دێ.

**الأجْوَفان**: گەدەو شەرمگا.

**التجویـف**: ئـەو بۆشـاییەیە دەکەوێتـە ناو شتەوە.

**التجویـف البریتـوني**: بۆشایی نـاو سـکە، دەورە دراوە بـە پەردەیـەکی لووسـی

وەهــا کــە ڕیخۆڵــەکانی لــەناو خــۆ گرتــوون ٥ هــەروا نــاوە بــۆ دیــوی ناوەوەی دیواری گەدە، (ك: تجاريف)ە.

**الجـائف**: ڕەگێکــە بــە باسـك‌و قــۆڵی ئــادەمیزاددا دەڕوا تــا دەگاتـــە غوضروق شان.

**الجائفة**: عەیبی گەورە.

**الجُــوافُ**: نەخۆشــی سکچــوونە کــە هۆکارەکــەی نەزانــدرێ، بــە زۆری توشی پیاوی بە سالاچوو دەبێ.

**الجُوافة**: جۆرە ماسییەکە، گۆشتەکەی زۆر بـاش نییـە ٥ لـە حـەدیثـی مالیکـدا هـاتووە دەفـەرموێ: (أكلـت رغيفــاً ورأسَ جُوافـةٍ فعلـى الـدنيا العفـاء) ٥ جۆرێکیشـە لـە سـێوە ئـەمریکی، یـان میوەیەکە لە سێوی ئەمریکی دەچێ.

**الجَوْفُ من كل شيئ**: کلۆرایی‌و ناوسکیەتی ٥ کە جاری وا هەیـە پڕەو جاری وا هەیە خالّییە، (ك: أجواف)ە.

**الجَوْفُ من الليل**: سێیەکی کۆتایی شەو.

**الجوف مـن الأرض**: ناوسکی زەوی، چاڵی قوڵ‌و پان، شیوو دۆڵ.

**المجَـــوُفُ**: زۆر کلــۆر ٥ بـــە پیـــاوی ترسـنۆکیش دەگـوترێ ٥ لـەم ڕووەوە کە دڵی نیە دڵی مردووە.

**جَوِقَ جَوَقاً**: ملی ئەستور بوو.

**جَوِقَ الوجهُ**: دەم‌و چاوی خـوار بـوو (هـو اجوق وهي جوقاء)، (ك: جوق).

**جَـوَّق القـومُ عليـه**: قەومەکـە دەنگیـان بەسـەردا بـەرز کـردەوەو هەریەکـە لەلای خۆیەوە دەینەڕاند بەسەریا.

**جَوَّق القومَ**: قەومەکەی کۆکردەوە.

**تَجَوَّقَ**: بۆ موطاوعەی (جَوَّقَهُ) هاتووە.

**تَجَـــوَّق فـــلان**: کۆمــەڵێکی خەڵــك کۆکردەوە.

**الْجَـوْقُ**: کۆمـەڵێك لـە ئـادەمیزاد ٥ هـەر کۆمەڵـە خەڵـکێك کـۆ ببنــەوە بـۆ یەك مەبەست، (ك: أجواق)ە.

**الجَوْقَةُ**: بەمانا (الجوقُ) دێ.

**المُجَـوَّق**: ئەوەیە کاکیلەکانی خـواربن‌و لە ئاستی یەك نەبن.

**جَالَ الترابُ جـولاً وجَوْلـةً وجولانـاً وجُئـولاً**: تەپ‌و تـۆز بـەرز بـووەوە ٥ لـە پەنـدی پێشیناندا هاتووە دەڵێ: (للباطل جَوْلَـةٌ ثم يضمحل).

**جَـــالَ النطـــاقُ**: پشـتێنەکەی دەجوڵــێ، دەخزێ لەبەر گەورەیی‌و پانی.

**جَالَ في الأرض**: بە زەویدا سوڕایەوە بەبێ ئەوەی لە شوێنێك نیشتەجێ بێ.

**جال القومُ في الحرب جولـةً**: قەومەکـە لـە شـەڕدا پاشـە کشـەیان کـردو پاشـان هێرشیان بردەوە.

**جال بسيفه**: شمشێرەکەی هەڵسوڕاندو بـە دەوری خۆیدا خولی دا.

**جــال الامــرُ في نفســه**: کارەکـە سـەقامگیر نەبوو، لە دڵیا هاتو چوو.

**جال الشيئَ من غيره**: شتەکەی هەڵبژارد.

**أجالَهُ و به**: وای لێکرد بێ‌و بچێ.

أجالَ القومُ الرأى فيما بينهم: خەڵکەکە لەناو خۆیاندا بۆچوونەکەیان لێك دایەوەو چەندو چونیان تێدا کرد ٥ دەگوترێ: (أجِلْ جائِلَتَكَ): کاری خۆت بکەو گوێ بەکەس مەدە، ڕاڕا مەبە.

جاولە: بەرەنگاری بووەو دەری کرد.

جَوَّلَ البلادَ وفيها تجويلاً: زۆر بەناو وڵاتدا هاتۆ چۆی کرد.

اجتالَ في البلاد: بەمانا (جَوَّلَ) دێ.

اجتال من الشَّيْئِ: لەو شتە هەڵی بژارد.

اجْتَالَ القومَ: قەومەکەی لە ڕێبازی خۆیان لادا، لەبیرو بۆچونەکەیان هەڵی گێڕانەوە.

اجتال الشيطان فلاناً: شەیتان سوکایەتی بە فلان کردو لە ڕێبازەکەی هەڵیداشتو خستیە سەر ڕێبازی گلاوی خۆی ٥ لە حەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (اني خلقت عبادي حنفاءَ فاجتالهم الشيطانُ).

إنْجَالَ الترابُ: گڵو خۆڵ بەرز بووەوە.

انجال في البلاد: بەمانا (جَوَّلَ) دێ.

تجاولوا في الحرب: لە شەڕدا یەکتریان هێناو بردو لێکیان دا.

استجاله الشيطانُ: بەمانا (اجتاله) دێ.

استجال الريحُ السحابَ: بایەکە هەورەکەی ڕاداو بردی بۆ شوێنێکی تر.

استجالَ فلان السحابَ: فلانکەس هەورەکەی بینی با ڕایدەداو دەیهێناو دەیبرد.

الجـال: قەراخی بیر، قەراخی شیو ٥ عەزیمەتو سوربوون لەسەر شت.

جُوال: نەخۆشییەکە توشی ئادەمیزاد دەبێ بریتییە لەوەی لەکاتی نووستندا دەڕوا جمو جوڵ دەکا.

الْجَوْلُ: ئەو شتەیە با هەڵی دەگرێ لەسەر ڕووی زەوی لە گڵو خۆڵو زیخو بەرد ٥ دەستە سەربازی زۆر ٥ جەڵەبە ئاژەڵی زۆر ٥ بەردی زلی بنکی بیر کە بناغەی دیواری بیرەکەی لەسەر هەڵدەچندرێ ٥ عەقڵو ئاوەز، (ك: أجوال)ە.

الْجَوْلانُ: ئەو پوشو پەڵاشو زیخو خشتو خۆڵەیە کە با هەڵیدەگرێ بۆ حەوا.

الجَوْلاَنى: (يوم جولانى): ڕۆژێکی زۆر تەپو تۆزاوییە ٥ (رجل جولانى): پیاوێکە خێرو بێری بۆ هەموو کەسە بەخششو دەسەندەی نزیكو دوری گرتەوە.

الْجَوَّالَـةُ: پێرێکی وەرزشکارن، بەپێ بەناو وڵاتدا دەگەڕێن.

الْجَوِيلُ: ئەو پوشو پەڵاشو گەڵاو خشتو خۆڵەیە کە با هەڵی دەگرێ.

الْمَجَالُ: شوێنی هاتوچۆ، شوێنێك جێگای شتی تری تێدا بێتەوە.

المِجْوَلُ: کراسێکە لە ماڵەوە لەبەر دەکرێ، وەکوو بیجامەو جزداشە ٥ لە حەدیثی عائیشەدا هاتووە دەفەرموێ: ﴿كان النبي (ص) اذا دخل علينا لَبِسَ مِجْـوَلاً﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ پارچە

قوماشێکی سپی دەخرێتە سەر دەستی ئەو پیاوەی قومار چییەکان قوداخەکانی دەدەنێ لەکاتی کۆبونەوەدا ٥ مەتەڵ ٥ دیرھەمی ساغو بێ غەش ٥ زیو ٥ وێنەی مانگ لە زیو دابڕێزرێو بخرێتە ریزی ملوانکەوە ٥ کەرە کێوی، (ك: مَجَاوِلَ).

**الجُواليق**: جەواڵ ٥ شتێکە لە خوریو موو دروست دەکرێو شتی تێدەکرێ وەکوو گوێنیو خەرار، (ك: جوالِقُ وجواليق)ە.

**جَامَ جَوْماً**: داوای شتێکی کرد، خێربێ یان شەڕبێ.

**اَلْجَامُ**: پەرداخ بۆ شت تێدا خواردنەوە لە زیو دروست دەکرێ یان لەشتی تر بە زۆری بۆ پیاڵەی مەیخواردنەوە بەکاردێ ٥ دەگوترێ: (صَبَّ عليه جام غضبه): رقی خۆی بەسەردا رشت، (ك: جامات، أجوام، جوم)ە.

**الجامة**: بەمانا (الجامُ) دێ.

**الجَوْمُ**: چاودێری کارو شوانی شت ٥ کەیەك شتیان ھەبێ.

**جَانَ جَوْناً وجوُنَةً**: رەش داگیرسا ٥ تاریك بوو.

**اَلْجَوْنُ**: رەش، سپی، بۆ ھەردوو ماناکە بەکاردێ ٥ ھەروا بۆ مانای روناکی، تاریکی یان بۆ رەنگێکی رەش رەنگی سوری تێکەڵ بێ ٥ قەراخەکانی قەوس، کە پێیان دەگوترێ: (جَوْنان).

**اَلْجَوْناءُ**: خۆر، مەنجەڵ، حوشتری رەش.

**اَلْجَوْنَةُ**: خۆر.

**اَلْجُونَةُ**: رەش ٥ گردۆڵکە ٥ ھەمبانچوکەیەکی خڕو کەوانەییە چەرمی تێوە دەپێچرێ، عەتار باشی عەترەکانی تێدا ھەڵدەگرێ ٥ دەربارەی صیفەتی پێغەمبەر (د.خ) گوتراوە: (فوجدت ليده بَرْداً وريحاً كأنّما أخرجها من جونة العطار)، (ك: جُوَن)ە.

**اَلْجُونِيُّ**: رەش ٥ جۆرێکە لە باڵندەی قەتێ بەر ورگو باڵەکانیان رەشن.

**جَاهَ فلاناً بمكروه جوهاً**: بە خراپەکاری بەرەنگاری فلان بووە.

**تَجَوَّهَ فلان**: ھەوڵی پلەو پایەی دا.

**اَلْجَاهُ**: پلەو پایە رێزداری.

**الجاهة**: بەمانا (الجاه) دێ.

**اَلْجَوْهَرُ**: حەقیقەت، کرۆك، خودی شت.

**الجَوْهَرُ من الأَحْجَارِ**: ھەرشتێك شتێکی بەسوودی لێ پەیدا بێ ٥ شتی بەنرخ کە دەنکە گەوھەری لێ دروست بکرێ ٥ لە زاراوەی فەلسەفەدا جەوھەر شتێکە خۆی خۆی رادەگرێ، بەرامبەرەکەی پێی دەگوترێ: (عەرەض) کە دیاردەیەکە بەشتی ترەوە دەوەستێ، تاکەکەی (جوهرة)، (ك: جواهر).

**الجَوْهَرِيّ**: ئەوکەسەی جەوھەر دروست دەکا ٥ جەوھەر فرۆش.

**جَوِيَ فلان جَوىً**: فلان سنگی نەخۆش بوو ٥ سنگی تەنگ بوو ٥ نەخۆشییەکەی

درێـژەی کێشـا ٥ خۆشەویسـتییەکەی بەهێز بوو.

جَوِيَ الماءُ: ئاوەکە گۆڕاو بۆنی کرد ٥ لە حـەدیثـی یـەئجوج و مەئجوجـدا هـاتووە دەڵـێ: (فتجـوی الأرض مـن نتنهم): زەوی بە بۆگەنیان پڕبوو.

جَوِيَ الْبَلَدَ ومنه وعنه: ئاوو هەوای وڵاتەکەی پێ نەکەوت، پێی ناخۆش بوو.

جـاوی الإبـلَ بهـا: حوشـترەکانی بـانگ کردن بۆ سەر ئاو.

جَوَّی السقاء ونحوه: کوندەکەی پینەکرد.

اجْتَـوىَ الطعـامَ: خۆراکەکـەی بـەلاوە ناخۆش بوو رەتی کردەوە.

إجْتـوی الْبَلَـدَ: مانـەوەی لـەو وڵاتـەدا بـەلاوە نـاخۆش بـوو ٥ لە حـەدیثـی عورەینـەدا هـاتووە: (قـدموا المدینـة فاجْتَوَرْهـا) ٥ دەگـوترێ: (اجتـوی القومَ): رقی لە قەومەکە هەڵسا.

استجوی الْبَلَدَ: بەمانا (اجتواه) دێ.

الجِـواءُ: دۆڵو شـیوی پـانو پـۆڕ ٥ پانتایی‌و بەتاڵایی نێوان خانوەکان ٥ ئـەو شـتەی دەخرێتـە ژێـر مەنجەڵـەوە دوای داگرتنـی لەسـەر ئاگر بۆئەوەی ئەو گەرمییـەی زیـان بەژێر خۆیەوە نەگەیەنێ.

الْجَـوُّ: بۆشـایی نێـوان ئاسمـان‌و زەوی ٥ نزمایی دەشتاییەکان.

جَوّ کل شيئ: ناوەوەی شـتەکە، (ك: جـواء وأجواء).

الجُوَّةُ من کل شيئ: ناوەوەی شتەکەیە ٥ پارچە زەوییەك کە دەماری پتـەوو بەردە زرونی تێدابن.

الجُوَّةُ: پینەی کوندەو مەشکە ٥ کون لە کێوو شتی تر.

جَـوَّانی: نـاوەوە پێچـەوانەی (برّانـی) واتـە: دەرەکـی ٥ لـە حـەدیثـەکـەی سـەلماندا هـاتووە دەڵـێ: (ان لکـل امرئـی جوّانیـاً وبرّانیـاً فمـن أصـلح جوّانیه اصلح الله برّانیه).

جاء جیئاً وَمَجیئاً وجَیْئَةً: هات ٥ دەگوترێ: (جاءه وجاء الیه وجاء به) هاتە لای، هێنای.

جاء الغیث: باران باری.

جاء الأمرُ: کارەکە رویدا، هات ٥ چەسپا.

جاء الأمْر: کارەکەی کرد.

جایَـاً فلانـاً فجـائَهُ: لـە هاتنـدا پـێش فلاَنکەس کەوت.

أجَاءَ فلاناً الی کذا: ناچاری کـرد فـلاَن هانا بۆ ئەوشتە بـەرێ ٥ لەقورئانـدا هـاتووە دەفـەرموێ: ﴿فَأَجَاءَهَـا الْمَخَـاضُ إِلَـى جِـذْعِ النَّخْلَـةِ﴾ ٥ لە پەنـدی پێشـینانـدا هـاتووە دەڵـێ: (شـرّمَا أجـاءك الی مخـة عرقـوب): تەنگانەیـەك پـاڵی بـەتۆوە نـاوە بـۆ مۆخی دەماری پاژنەپێ ٥ بەکەسێك دەگوترێ: زۆر پێداویستی هەبێ.

أجـاءت المـرأة ثوبهـا علـی خـدیها: ئافرەتەکـە سەرپۆشـەکەی خسـتە سەر دوو کوڵمی.

أجَأ النَعْـلَ: پێڵاوەکـەی بـە چـەرمی باریك بە (سیرمە) دوریەوە.

جاءَهُ مجاءَةً وجياءً: لە زۆر هاتندا پێشی کـەوت ٥ هاتنەکـەی لەگـەڵ هـاتنی ئەودابوو.

جايَأ فلاناً: روبـەڕوی فلانکـەس بۆوەو بەلای دا تێپەڕی.

جَيَّأ القِربَةَ: کوندەکە یـان مەشکەکەی بە سیرمە چەرم دوریەوە.

الجايئَةُ: ئەو کێمو زوخاوەیە لە برین دێ.

الجِيَـاءُ: ئەوشـتەیە تەختـە دار بـەردی تەختو شتی وا کە مەنجەڵی لەسەر نـاگر داگـیراوی دەخرێتەسـەر تـا ژێرخۆی نەسوتێنێ.

الجِيَاءَةُ: بەمانا (الجياءُ) دێ.

الجَيْـئَـةُ: کـێمو زوخـاوی لـە بـرین دێ ٥ پارچـەیەکە لـە ژێـر پێڵاو دەدرێ ٥ تیلمـــە چـــەرمێکە شـــتی پـــێ دەدورێتەوە.

جَيْئَةُ البطن: خوار ناوك، نێوان ناوكو بەر.

الْجيئَةُ: شێوە هاتن ٥ دەگـوترێ: (جيئتنا جيئة مباركة).

جابَ القَميصَ ونحوه: گیرفانی بۆ کراسـەکە یان کەواو چاکەتەکە کرد.

جَيَّبَ الْقَميصَ: گیرفانی بۆ کراسەکە کرد.

جَيْبُ القميص: ئەو کونەیـە لـەکاتی لەبـەر کردنـی کراسـەکەدا سـەری تێـڕۆ دەکـەی، (ك: جيـوب وأجيـاب)ە ٥ لەقورئانـــدا هـــاتووە دەفـــەرموێ:

﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾.

ناصح الجَيْب: ئەمینو دەست پاك.

جيب الأرض: شوێنی چونە ناو زەوییەکـە ٥ (جيب الثوب) گیرفان.

جَيِدَ يَجْيَدُ يَجَادُ جَيَداً: گـەردنی درێـژ بـوو جوان بوو (هو أجيد وهي جَيْداءُ).

الجِيْـدُ: گـەردن، لای پێشـەوەی شـوێنی ملوانکە تێکردنی.

جَيِرَ يَجْيَـرُ جـيراً: کورتـە بـاڵابوو قـەمبور بوو.

جَيَّرَهُ: چەوری کرد بەمادەی جیر.

جَيَّرَ الحَوْضَ: حەوزەکەی قوڵ کرد.

الجائر: گەرماییەکە لـە قـورگو سـنگدا پەیـدا دەبـێ بـەهۆی رق هەڵسانەوە یان برسییەتی.

جَيْـرِ: پیتـی وەڵامـە بـەمانا بـەڵێ دێ ٥ سوێندەو بەمانا (حەقە) دێ.

الْجِيْرُ: مادەیەکی سپییە لە بـەردی جیری بەرهـەم دەهێنـدرێ کـە بـە نـاگر دەخرێتـە پلەیـەکی زۆر گەرمـەوە ٥ دوایی بەئاو سارد دەکرێتەوە.

الجَيَّارُ: بـەمانا (الجـائر) دێ ٥ دروسـتکەری جیری یان فرۆشیاری.

جَاشَ الماءُ جيشاً وجيوشاً وجيشاناً: ئاوەکـە هەڵقوڵاو فیچقەی کرد رەوان بوو.

جـاش البحـرُ: دەریـا کەوتـە شـەپۆلدانو کەس نەیوێرا سواری بێ.

جـاش بـالأمواج: بـە شـەپۆلەکانی کەوتـە جمو جوڵ.

**جـاش الـوادي**: ئـاوی روبارەكـە بـەرز بووەوە.

**جاش الميزابُ**: پلوسكەكە ئاوی لیٚ هەلٚرژاو رەوان بوو.

**جاش العين**: چاو فرمێسكی هەلٚوەراند.

**جاشَ الفَرَسُ**: ئەسپەكە كەوتە جەوەلان كاتێك ئاوزەنگی لیٚدرا.

**جـاشَ القِـدرُ**: مەنجەلٚەكە كولٚیو كەوتە قلٚپە قلٚپ.

**جاشت الحربُ بينهم**: شـەڕ لـەنێوانیان دا بەرپا بـوو ◊ لـە حـەدیثـدا هـاتووە دەفەرموێ: (ستكون فتنة لا يهدأ منها جانب الاجاش جانب).

**جاش نَفْسُهُ**: هێلٚنجی هاتنیو خەریك بوو وەرشێ ◊ دلٚی كەوتە ترپە ترپ لـە ترسـان یـا لـە خەفـەتان ◊ لـە حەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (وكأنّ نفسي جاشت).

**جـاش نفـس الجبـان**: دلٚـی ترسـنۆك، راچلٚەكاو ویستی هەلٚبێ.

**جاش الصدرُ**: سنگی لە رقو تورە بووندا كولٚیو كەفی دەچاند.

**جَاشَ الَهمُّ في صدره واليه نفسه**: دلٚـی وای بۆ چوو داوای شتێكی لیٚ دەكاو كاری پێیەتی.

**تَجَيَّشَتْ نفسه**: هێلٚنجی هاتنیو خەریك بوو وەرشێ ◊ لە حەدیث دا هاتووە دەلٚێ: (جاءوا بلحم فتجيّشت أنفس أصحابه).

**استجاشت القدرُ**: بەمانا (جاشت) دێ.

**استجاش فلانـاً**: داوای سوپای لێكـرد ◊ لـە حـەدیثـی عـامیری كـوڕی فوهەیرەدا هاتووە دەلٚێ: (فاستجاش عامر بن الطفيل).

**الجَيْشُ**: سوپا، كۆمەلٚێك خەلٚك لە شەڕدا.

**الجَيْشان**: هێزو گەنجیەتی.

**جاضَ جيضاً**: بە فیزو خۆبادانەوە رۆیشت ◊ دەگوترێ: (جاض في مشيته).

**جاض عـن الشَّيْءَ**: لـە شتەكە لایـداو كـلا بوو.

**جاض في القتال**: لـە شـەڕدا هـەلاٚت ◊ (هـو جائض وجيّاض).

**جايَضَهُمْ**: شانازی بەسەرەوە كردن.

**جَيَّضَ عن الشَّيْءَ**: بەمانا (جاضَ) دێ.

**الْجِيَّضَى**: رۆیشتنێكە خۆ بادانو فیزی پێوە دیارە.

**جافت الميتةُ**: مردووەكە بۆنی كرد.

**جيفت الْمَيْتَةُ**: بەمانا (جافـت) دێ ◊ لـە حەدیثی بەدردا هاتووە دەفـەرموێ: (أتكلّمُ أناساً جيَّفوا؟).

**جاف فلان**: فلاٚنكەس ترسا.

جاف فلاناً: لە فلاٚنكەسی دا.

**اجتافت الْمَيْتَةُ**: بەمانا (جافت) دێ.

**انجافـت الْمَيْتَـةُ**: بـەمانا (جافـت) دێ.

**الجيفة**: جەستەی مردو کاتێ بۆگەن دەکا.

**الجيل**: نەتەوە، رەگەزی ئادەمیزاد، چینێك لە ئادەمیزاد.

**الجيلُ**: چەرخێکی رۆژگار ٥ سێیەکی چەرخێك کە خەڵکی تێدا دەژیا، (ك: أجيال).

**الجيلاتين**: مادەیەکی شێوە لینجەو شت بەیەکەوە دەنووسێنێ‌و لە ئاودا ناتوێتەوە، لە ئێسقانی زیندەوەرو شتی تر دەردەهێندرێ پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە ئاودا دەکوڵێندرێ.

**جَيَّمَ جيماً**: نووسی.

**الجيمُ**: پیتێکە لە پیتەکانی هیجا ٥ هەروا ناوە بۆ حوشتری هارو سەرکەش، (ك: أجيام، جيمان).

**الجيولوجيا**: زانیارییەکە باسی زەوی دەکا لە روی دروستبونیەوەو ئەوشتانەی کاریان تێکردوەو ئەو قۆناغانەی پێیاندا تێپەڕیوە.

**الحاءُ**: پیتی شەشەمە لە ریزی هیجادا، شوێنی ناوەڕاستی قورگەو لەوێوە دێتەدەر.

**حَاحَـاً بالحمـار**: گوێدرێژەکەی هـەڵنا بـۆ خێرا رۆیشتن بە دەنگی (حەنحەە) بـە زۆری سـووکی تێـدا دەکـرێ و دەگوترێ: (حاحا).

**حَبَّ الإنسانُ والشَّيْءُ حُبّـاً**: ئادەمیزادەکە یان شتەکە خۆشەویست بوو.

**حَـبَّ فلانـاً**: فلانکەسـی خـۆش ویست ٥ دەگـوترێ: (حَبُبْــتَ الَيّ): لای مـن خۆشەویسـت بـووی ٥ دەگـوترێ: (ماأَحَبَّــهُ الَيّ): لـە بـواری مـەدح و سەرسوڕماندا.

**أَحَبَّ فلاناً**: فلان کەسی خۆش ویست.

**أَحَبَّ الزَّرْعُ والُبّ**: کشت و کاڵەکە بوو بە خاوەن دان و توێکڵ.

**حَابَّـهُ مُحابَّـةً وحِبَابـاً**: خۆشـی ویسـت و دۆستایەتی لەگەڵ دا کرد.

**حَبَّبَ الزرعُ**: دانەوێڵەکەی دەرکەوت.

**حَبَّبَ الشَّيْءَ اليـه**: شـتەکەی وا لێـکرد خۆشـی بـوێ لـە قورئانـدا هـاتووە: ﴿وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ﴾.

**حَبَّبَ السِّقَاءَ ونحوه**: کوندەکەی پڕکرد لە ئاوو تاوەکوو کوپەی لێ هات.

**حَبَّبَ الدواءَ ونحوه**: دەرمانەکـەی وەکـوو حەب لێـکرد.

**تَحابُّوا**: خەڵکەکە یەکتریان خۆش ویست ٥ لەحـەدیـثدا هـاتووە: (تَهَــادَوْا تَحَابُّوا).

**تَحَبَّــبَ اليــه**: خۆشــی ویســت و خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕی.

**تَحَبَّـبَ الماءُ ونحوه**: لەسـەر ئاوەکـە بڵق پەیدابوو.

**تَحَبَّبَ السِّقاءُ ونحوه**: کوندەکە پڕبوو لـە ئاو وەکوو کووپە راوەستا.

**الْحَـابُّ**: ئـەو هاوێژراوەیـە لـە نزیـك هــــەدەف دەکــــەوێ و نــــای هەنگێوێ ٥ دەگـوترێ: (سـهم حـابٌّ) و (کرة حابَّةٌ)، (ك: حَوَابٌّ.)٥

**الْحَبَابُ**: چەند رێگایەکن لەسەر روبەری ئـاو پەیـدادەبن بـەهۆی زەختـی بـا ٥ دەگـوترێ: (طفا الحَبَابُ على الشـراب): بڵقەکان وەکوو دەنکە مرواری بەسـەر شەرابەکەوە دەرکەوتن.

**الْحَبَابُ**: شەونم کە دەکەوێتە سەر گوڵ و گیا.

**الْحَـــبُّ**: دانەوێڵەکــە لــەناو گــوڵ و توێکڵەکەدایە، وەکوو دەنکە گەنم و دەنکـە جـۆ هەرشتێـك لـە شێوەی دەنکە دانەوێڵەدا بێ، وەکوو دەنکی تەسـبیح و دڵۆپـە بـاران و دەنکـە تەرزە.

**الْحُــــبُّ**: خۆشەویســــتی؛ بــــەلای

فەیلەسوفەکانەوە ئارەزوی ئادەمیزادە بۆ ئادەمیزادێکی تر یان بۆ شتی تری بەنرخو بە سوود ٥ هەروا ناوە بۆ مەرکانەو گۆزەو کوپەی ئاو، (ك: أحباب حِبَبَة رحباب)ە.

الحِبُّ: خۆشەویستو دڵسۆزو سۆزدار، (ك: أحباب وحِبان وحِبَبَةٌ) دەنکە تۆمی گیاو گژ ٥ پاقلەی کێوی کە بەکەڵکی بزیو دێ ٥ گوارەی یەك گۆ.

الحَبَبُ: بەمانا (الحباب) دێ ٥ ددانی وردو رێكو جوانی وەکوو دەنکە مرواری.

الْحَبَّةُ: تاکی کۆی (الحَبُّ)ە ٥ هەروا بەمانا بەشێك لە شت دێ ٥ کە بۆکێش بگوترێ: مەبەست کێشی دوو دەنکە جۆی مامناوەندییە.

حَبَّةُ القلب: ناخی دڵو دەروون.

الحِبَّةُ: دانەوێڵەی رووەکی کێوی ٥ لە حەدیسدا هاتووە دەفەرموێ: (فَيَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ).

الْمَحَبَّةَ: ئارەزۆی شتی دڵخۆشکەر.

الْمُسْتَحَبُّ: ئەو شتەی شەرع بە پەسەندی بزانێو واجبی نەکردبێ.

حَبَّذا: ئوسلوبێکە بۆ مەدح بەکار دەهێندرێ.

حَبَّذا فلاناً: بە فلان کەسی گوت: (حَبَّذَ) (حَبَّذَا الامر) مەدحی کرد.

حَبْتَرَ الجِسْمُ: جەستەکە لاوازبوو کێشی سووك بوو.

الحُباتِرُ والحَبْتَرُ: کورتە بالا، کوڵە بنە، (ك: حَبَاتِر)ە.

تَحَبْجَرَت الأمعاءُ: ریخۆڵەکان پێکدا نووسان.

حَبْحَبَ: بەهۆی بەد خۆراکییەوە لاوازو کزبوو.

حَبْحَبَ الماءُ: ئاوەکە کەم کەم هاتە خوارەوە.

الحُباحِبُ: مێشێکە بەشەو دەفرێ کلکی دەدرەوشێتەوە.

نار الحُبَاحِب: ئەو پریشکە ئاگرانەن کە لە حەوادا بەهۆی لێك کەوتنی بەردو شتی واوە پەیدا دەبێ.

أم حُباحِب: دەعباییێکە وەکوو (کوللە بچکۆلە) رەنگاو رەنگە.

الْحَنْحَبُ: کورتە بالا کوڵە بنە ٥ رووەکێکە لە پێری کولەکە بەرەکەی لە وڵاتی میصر پێی دەگوترێ: (بطیخ) لە عێراق پێی دەڵێن: (الرقي) واتە: شوتی.

حَبَرَه حبوراً: کەیف خۆش کرد، نازو نیعمەتی بەسەردا رشت ٥ لە قورئاندا هاتووە: ﴿ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ﴾.

حَبَّرَ البُرْدَ: بوردەکەی پەراوێز چن کردو رازاندییەوە.

حَبِرَ حَبَراً: کەیف خۆش بوو، گەشایەوە.

حَبِرَ الأرض: زەوییەکە گیاو گژی زۆربوو، زەوییەکە بە گیا داپۆشرا.

حَبِرَ الجُرْحُ: برینەکە چاك بووەو ئازاری ماوە.

حَبِرَ الأسنانُ: ددانەکان زەرد بوون.
أَحْبَرَتِ الأرض: بەمانا (حَبِرَتْ) دێ.
أَحْبَرَ فلاناً: فلاّنکەس کەیف خۆش کرد.
أَحْبَرَتِ الضربَةُ جِلدَهُ: لێدانەکە شوێنەواری خۆی بە پێستییەوە هێشتەوە.
حَبَّرَهُ: بەمانا (حَبَرَهُ) دێ.
حَبَّرَ الشَّيءَ: شتەکەی رازاندەوە، جوانی کرد ٥ دەگوترێ:
حَبَّرَ الشعر والكلامَ والخط: شیعرو قسەکانو خەتەکەی رازاندەوە وای لێکرد گوێ لەبیستنیو چاو لەسەیرکردنی تێرنەبن.
حَبَّرَ الدَّوَاةَ: قوتوەکەی پڕکرد لە مەرەکەب.
حَبَّرَ الكتابَ: کتێبەکەی نووسیەوە.
حَبَّرَ الرسْمَ: بە مەرەکەب وێنەکەی دیاری کرد.
الحابُورُ: کۆڕو کۆبوونەوەی خۆشیو رابواردن (ئاپۆڕا).
الحِبَارُ: وشکەڵبوونی پێستی دەست بەهۆی ئیش پێکردنەوە ٥ شوێنەواری لێدانو داخ کردنو شتی وا بەسەر پێستەوە.
الحُبَارى: باڵندەیەکی مل درێژە رەنگی خاکییە وەکوو قاز دەچێ دەندۆکی درێژە ٥ نێرو مێو تاکو کۆ هەموویان پێیان دەگوترێ: (حباری).
الْحَبْرُ: زاناو رۆشنبیر، (ك: أحْبار وحبور)ە.
الحِبْرُ: بەمانا (الحَبرُ) دێ ٥ مەرەکەبی شت پێ نووسین.

الحِبَرَةُ: قوماشێکە لە لۆکە یان لە کەتان بەرهەم دەهێندرێ خەتخەت بوو کاتی خۆی لە وڵاتی یەمەن دروست کراوە ٥ چارەکەو سەرپۆشێکی دروستکراو لە حەریر بوو، ئافرەت کە لەماڵ دەچوونە دەرەوە سەرو ملی خۆیانیان پێ دادەپۆشی.
الحُبْرَة: زەردییەکە دەکەوێتە سەر ددان.
الحَبِيرُ: کراسی نەرمو نیانی گوڵگوڵاویو رەنگاو رەنگ.
المِحْبَرَةُ: شوشەی مەرەکەب، (ك: محابر)ە.
الْحَبَرْكي: ئادەمیزادی پشت درێژی قاچ کورت.
حَبَسَهُ حَبْساً: بەندیکرد، نەیهێشت بڕوا بەل بهاوێ.
حَبَسَ الشَّيءَ: ئەو ماڵەی ئەو شتەی وەقف کرد نە دەفرۆشرێ نە دەبێتە ماڵی میراتی، تەنها سوود لە بەروبوومەکەی دەبیندرێ.
حَبَسَ الشَّيءَ بالشَّيءِ: ئەوشتەی بەو شتە داپۆشی ٥ تێیەوە پێچا.
أَحْبَسَهُ وحَبَّسَهُ: بەمانا (حَبَسَهُ) دێن.
إحْتَبَسَ: نەیهێشت مەنعی کرد ٥ بۆ مطاوعەی (حَبَسَهُ) دێ.
إحْتَبَسَ الانسانَ وغيره: بەمانا (حَبسَهُ) دێ.
إحْتَبَسَ فلان الشَّيءَ: فلاّن کەس ئەوشتەی تایبەت کرد بەخۆیەوە.
تَحَبَّسَ في الكلام: لە قسەکردن کەوت، لە قسەکردن وەستا.
تَحَبَّسَ على كذا: خۆی لەسەر ئەوشتە

تایبەت کردو پێیەوە هەڵەو گیربوو.
الحابِسُ: شتێکە وەکوو حەوز ئاوی تێدا پەزمەندە دەکرێ ٥ دەگوترێ: (زق حـابس): کوندەیەکـە ئـاوی تێـدا هەڵدەگیرێ.
کـلأٌ حـابِسٌ: لـەوەڕگاو پاوانێـکە ئـاژەڵ تێیـدا قـەتیس دەمێنـێ‌و لێـی دەرناچێ.
الحُبَاسَةُ: شتێکە لەشێوەی حەوزدا ئاوی تێدا پەزمەندە دەکرێ.
الْحُبُسُ: پیرۆزی سوپا.
الحَـبْسُ: بەندیخانـە، شـوێنی تێـدا بەندکردنی تاوانبارو تۆمەتبار.
الْحِبْسُ: ئەوشتەیە دەخرێتە نێو ڕێـڕەوی ئـاوەوە بۆئـەوەی بەربەسـتی بکـا وەکوو قفڵ.
المـاء الحِبْسُ: ئـەو ئاوەیـە ئـاوی تـری نەیەتە سەرو زیادنەکا.
الْحُبْسَـةُ: قورسـایی‌و گرێیەکـە لەسـەر زوبـان خاوەنەکـەی ناتوانـێ ویسـتی خۆی دەربڕێ.
الحَبِـیسُ: بەنـدکراو، (ك: حُـبُس)ە ٥ (حَبِیسَـةُ) بـۆ مێیینـە بەکاردێ، (ك: حَبَائِسَ)ە.
الْمَحْـبِسُ: شـوێنی ئاڵفـدانی ئـاژەڵ ٥ پشتیری وڵاخ، ئاغەڵ.
المِحْبَسُ: بەمانا(الْمَحْـبِسُ)دێ ٥ هـەروا بـەمانا چەرچـەفی سـەر دۆشـەکی نوستن دێ.
مِحْـبَسُ المـاء: قفـڵ‌و سـەدادە کـە کۆنترۆڵی ڕەوانبون‌و گێرانەوەی ئـاو، غاز، نەوت‌و ئەو جۆرە شتانە دەکا.
حَـبَشَ لـه حَبْشـاً: بـۆی کـۆکردەوە ٥ دەگوترێ: (حَبَشَ لأهله) پێداویستی بۆ ماڵ‌و منداڵەکەی کۆکردەوە.
احْبَشَـتِ المـرأةُ بولـدها: ئافرەتەکـە منداڵێکی قوله ڕەشی بوو.
حَبَّشَ له: بەمانا (حَبَشَ) دێ.
حَـبَّشَ الأشـیاءَ ونحوهـا: شـتەکانی کۆکردنەوە.
احْتَبَشَ الشَّیْئَ: شتەکەی کۆکردەوە.
تَحَبَّشَ القـومُ: قەومەکـە کۆبوونـەوە ٥ دەگوترێ: (تَحَبَّشُوا علیه).
الأحْـبَشُ: بـەمانا (الحَـبَشُ) دێ، (ك: الآحابِشُ)ە.
الأُحْبُوشُ والأُحْبُوشَةُ: کۆمەڵێك خەڵك کەلە هۆزو خێڵی جیا جیا بن، (ك: احابیش)ە.
أحابیشُ قریش: کۆمەڵێـك ئـادەمیزادی قـوڕەیش‌و کەنانـەو خوزاعـە کـە لەلای کێوی حوبشی کۆبوونـەوە لـە خوار مەککەو پەیمانیان بەست دژی پێغەمبەرو موسوڵمانەکان بجەنگن.
الحُباشَـةُ: هەرشتێـك کۆکرابێتـەوە ٥ کۆمەڵێکی تێـکەڵ‌و هەمـە جۆر لـە ئادەمیزاد.
الحُبَاشیةُ: هەڵۆ.
الحَـبَشُ: ڕەگەزێـکن لـە وڵاتـی سۆدان ٥ دانیشـتوانی وڵاتـی حەبەشـە ٥ تاکەکـەی (حَبَشِـیُّ)، (ك: حُبْشـانٌ).

الحَبَشَةُ: بەمانا (الحَبَشُ) دێ.

بلاد الحُبْشان: وڵاتی ئەثیوبیایە لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا.

الحَبَشِيَّةُ: ئافرەتی حەبەشی، مێینەی (الحَبَشي)یە ٥ دەگوترێ: (روضة حَبَشِيةُ): باخێکی سەوزو چڕو پڕو بەدەماخ لە سەوزیانا ڕەش هەڵگەڕاوە.

حَبَضَ الوَتَرُ حَبْضاً: ژێیەکە بەتوندی دەرپەڕی ورشەی هات، گیزەی کرد.

حَبَضَ بالوَتَر: بە ژێ بۆلای خۆی کێشی کردو ئەمجار بەرەڵای کردەوە دەنگی لێوە هات.

حَبَضَ القلب والعرق: دڵ، یان دەمار بەپەلە لێیداو پاشان هێدی بووە.

حَبَضَ الشَيْءَ حبوضاً:شتەکە کەمی کرد.

حَبَضَ السهمُ: تیرەکە سەری کردو هەدەفەکەی نەهەنگاوت.

حَبَضَ الأمْرُ: کارەکە پوچەڵ بووەو بەسەر چوو ٥ دەگوترێ: (حَبَضَ حَقُّهُ): مافی پێشێل کرا.

حَبَضَ فلان: پێچەوانەی ئەوەی کە گومانی لێدەکرا هەڵسو کەوتی کرد هیچ خێرو بێرێکی لێ هەڵنەومری ٥ چروك بوو.

حَبِضَ الشَيْءَ أو السهمُ أو العِرْقُ حَبَضاً: بەمانا (حَبَضَ) دێ.

أحْبَضَ الرامي السَّهْمَ: تیر هاوێژەکە تیرەکەی بڵند هاویشتو سەری کرد.

أحْبَضَ البئرَ: هەموو ئاوی بیرەکەی هەڵێنجاو هیچی تێدا نەهێشت.

احْبَضَ الحقَّ: حەقەکەی پوچاندەوە، حەقی بەفیڕۆدا.

الحُبَاضُ: زەعیفیو لاوازی.

الحَبْضُ: دەنگی کزو نزم ٥ باقی ماندەی ژیان ٥ دەگوترێ: (مابه حَبْضٌ ولانَبْضٌ) نە نوزەی دێ نە جوڵەی ماوە.

المِحْبَضُ: کەوچکە دارینەیەکی تایبەتییە هەنگوینی پێ دەردەهێندرێ ٥ یان بەدارێك دەگوترێ هەنگو زەردەواڵەی پێ دەردەکرێ ٥ هەروا بەو دارە دەگوترێ کە بەهۆیەوە ژێیەکە لەلۆکەکە دەدرێ بۆ شیکردنەوەی لۆکەکە ٥ ژێی کەمانچە، (ك: مَحَابض)ە.

حَبَطَ عَمَلُهُ حَبْطا وحُبُوطا: کردەوەکەی بەتاڵ بووە.

حَبِطَتِ الدابةُ حَبَطا: گەدەی ئاژەڵەکە بای کرد بەهۆی زۆر خواردن یان بەهۆی خواردنی شتێك کە بۆی نەگونجاو بوو.

حَبِطَ البَطنُ أو الجِلْدُ: گەدەی ئەستوور بوو پێستی هاوسا.

حَبِطَ الجُرْحُ: برینەکە دوا چاکبوونەوە شوێنەواری ما.

حَبِطَ ماء البئر: ئاوی بیرەکە ڕۆچوو دیارنەماو وشك بوو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَئِنْ أشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾.

حَبِطَ دمُهُ: خوێنەکەی بەفیڕۆ چوو.

اَحْبَطَ ماءُ البئرِ: ئاوی بیرەکە ڕۆچوو نەژیایەوە.

اَحْبَطَ عملَهُ ودمَهُ: کارەکەی پوچ کردەوە خوێنەکەی بەفیڕۆدا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَحْبَطَ اللّٰهُ أَعْمَالَهُمْ﴾.

الحُبَاطُ: هێشانی سك و سك هاوسان بەهۆی زۆر خواردنەوە یان خواردنی شتێك کە لەگەڵ میزاجیدا نەگونجێ.

حَبَقَ فلان حباقاً: فلان بای لێبووە، تسی کەند.

حَبَقَ فلاناً حَبْقاً: لە فلان کەسی دا بەدار بە شورك بە قەمچی بە حەبل.

حَبَقَ المتاعَ: کالاکانی کۆکردنەوەو توند شەتەکی دان.

الحَبَقُ: گیایەکی بۆنخۆشە.

حَبَقُ الماء وحَبَقُ التمساح: پنگی ئاوی.

حَبَقَ الفتی وحَبَقَ الفیل: مەرزنجۆش، مەرد قوش ٥ گیایەکی بۆنخۆشە بۆ میزگیران و مەعیدە تێکچوون و پێوەدانی دوپشك سودی هەیە، بەعەرەبی ناوە ئەصلییەکەی (السَّمْسَقُ).

حَبَق البقر: گوڵە بەیبون، گوڵە فەقێلە.

الحِبِقّی: ڕۆیشتنی گورج و خێرا.

الحِبِقَّةُ: کورتە بالا.

حَبَكَ الشَيءَ حَبْكاً: شتەکەی پتەو کرد ٥ دەگوترێ: (حَبَكَ الثوبَ): بەباشی قوماشەکەی چنی، شاڵەکەی بەباشی جۆلایی کرد.

حَبَكَ الحَبْلَ: گرێی حەبلەکەی زۆر توند کرد.

حَبَكَ العُقْدَةَ: گرێیەکەی توند کردو پتەوی کرد.

حَبَكَ الأمرَ: کارەکەی باش تەگبیر کرد.

حَبَكَ الثوبَ: لکی کراسەکەی هەڵدایەوەو دووری.

حَبَّكَ الشَّيْءَ: بەمانا (حَبَكَهُ) دێ.

حَبَّكَ الشَّعْرَ: مووەکەی، قژەکەی گرژکرد.

حَبَّكَ الثَّوْبَ: بەشێوەی خەت خەت قوماشەکەی چنی.

حَبَّكَ الريحُ الرملَ والماء الساكنَ: بایەکە لە لمبەلانەکە یان لە ئاوە ڕاوەستاوەکەدا ڕێگەی دروست کردن.

احْتَبَكَ الشَّيْءَ: بەمانا (حَبَكه) دێ.

تَحَبَّكَ: حەبلەکەی توند کردو شەتەکی دا.

الحِبَاكُ: ئەو ڕێگەو بانانەن کە بای بەهێز لە ئاوی ڕاوەستاوو لمبەلاندا دروستی دەکا ٥ گورزە قەفەزاژە کە بەیەکەوە دەبەسرێ.

حِبَاكُ الثَّوْبِ: ئەوەیە کراسەکە لکەکانی هەڵبدرێنەوەو بدروێ.

حِبَاكُ الحَمَام: ئەو ڕەشاییەی لەسەر باڵی کۆترە، (ك: حُبُكَ)ە.

الْحُبْكَةُ: حەبلێکە لە ناوقەد دەپێچرێ.

الْحُبْكَةُ من السراويل: ئەوەیە دۆخینی

تێدابێ، (ك: حُبَك)ه.

**الحَبيكةُ**: چندراو، رێگەو شوێنێکە کە بای بەهێز لە ئاوو لمبەڵانی دەکاه رێـرەوی ئەستێرە، (ك: حُبُـك)ه، قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ﴾.

**المحبوك**: ئازاو بەهێز دەگوترێ: (فرس محبوك) ئەسپێکی بەهێزە.

**حَبَلَهُ**: بە حەبل بەستییەوە.

**حَبَلَ الصَّيدَ**: داوی بۆ نێچیرەکە نایەوەو بەو هۆیەوە گرتیه دەگوترێ: (حَبَلَتْ فلانةُ فلاناً): فلان ئافرەت فلان کەسی خستە داوی عیشقی خۆیەوەو گیرۆدەی کرد.

**حَبِلَتْ الأُنثى حَبَلاً**: سکی بوو، مندالی لە سکی کەوته (هي حابلة)، (ك: حَبَلَةٌ وهي حُبْلى)، (ك: حَبَالى).

**حَبِلَ الزرعُ**: گوڵە گەنمو جۆ کە پڕبوون لە دانەوێڵەه دەگوترێ: (حَبِلَ فلان من الشراب): فلان گەدەی پڕبوو لە شەراب.

**احْبَلَهُ**: بەمانا (حَبَلَهُ) دێ.

**احْبَلَ الأُنثى**: موتوربەی کرد.

**حَبَّلَ الزرعُ**: کشتوکاڵەکە گەشەی کردو تێك چڕزا.

**حَبَّلَ الشَّعْرَ**: مووەکەی بادا قژەکانی کردن بە پرچ هۆنینیەوە.

**احْتَبَلَ الصَّيْدَ**: بەمانا (حَبَلَهُ) دێ واتە: داوی بۆ دانا ه دەگوترێ: (احتبلـه الموتُ بحبائله): مردن جۆرەها داوی خۆی نایەوە بۆی.

**احْتَبَلت فلانةُ فلاناً**: فلان ئافرەت فلان کەسی خستە داوی عیشقو دڵداری خۆیەوە.

**تَحَبَّلَت الدابَّةُ**: وڵاغەکە قاچەکانی لە حەبل ئاڵۆزانو گیرۆدەبوو.

**تَحَبَّلَ الصيدَ**: داوی بۆ نێچیرەکە نایەوە.

**الأُحْبُول والأُحْبولة**: داوو کەپك، (ك: أحابيل)ه.

**الحابل**: ئەو نێچیرەوانەیە کە نێچیر بەداو دەگرێ ه کەپکی بۆ دادەنێ ه لە پەندی پێشینانداهاتووە (اختلط الحابل بالنابل) (ثار الحابل بالنابل) (ثار الحابل على النابل) کاتێك دەگوترێ: کە ئیشەکان چەواشە بوبنو نەزاندرێ چۆن چارەسەر بکرێن.

**الحابولُ**: ئەو حەبلەیە کە خورماڕن پێی سەردەکەوێتە سەر دارخورماکە، (ك: حوابيل)ه.

**الحِبَالَةُ**: داوو کەپك، (ك: حَبَائل)ه.

**حبائل الموت**: هۆکارەکانی مردن.

**الحَبَّالُ**: حەبل دروستکەر یان حەبل فرۆش، (ك: حَبَّالة).

**الحَبْلُ**: گوریس، پەتك، حەبل ه ئەو شتەیە لە گوشو لەمۆو شتی وا بادرابێ شتی پێ ببێچرێ یان شتی پێ راکێشرێ ه دەگوترێ: (فلان

يخطب في حبل فلان) فلان كەس كۆڵەدار بە گوريسى فلان دێنێ ٥ كينايەيە لەوەى پارمەتى دەداو كۆمەگى پێ دەكا.

**حَبْلَ الوريد**: رەگى بناگوێ، رەگى لامل ٥ شا دەمارى لامل ٥ لە قورئان دا هاتووە ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾.

**حَبْل العاتق**: رەگێكە لەنێوان شان و ملدا.

**حَبل الذراع**: رەگى دەست ٥ دەگوترێ: (هو على حبل ذراعك) واتە: ئەو كارە بەتۆ دەكرێ.

**حَبْل الفقار**: رەگێكە بە درێژايى پشت درێژبۆتەوە ٥ پەيمان و وادەو بەڵێن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا﴾.

**الحَبْلان**: شەوو رۆژ.

**الْحَبَلُ**: هەرشتێك شتێكى تر لەخۆى گرتبێ ٥ بێچو حەبەلە بۆ سك و منداڵدان ٥ لوئلوء حەبەلە بۆ صەدەف ٥ شەراب حەبەلە بۆ پەرداخ.

**الْحَبَلَةُ**: دارى مێو ٥ تولە مێو، (ك: حَبَلٌ)ە.

**الْحُبْلَةُ**: دانەوێڵەى وەكوو نيسك و فاسۆلياو فول و شتى لەو جۆرە.

**الْمَحْبِلُ**: منداڵدان، رەحم، كۆئەندامى زاوزێى ئافرەت، (ك: محابل)ە.

**الْمُحْتَبَل**: زەنگى دەستى ولاخ ئەو شوێنەى حەبلى تێدەخرێ بۆ بەستنەوە زۆر سمى دەستى.

**حَبِنَ حَبَناً**: ورگى زلبوو بە سروشت يان بەنەخۆشى.

**حَبِن القدم**: قاچەكە گۆشتن بوو.

**حَبِن عليه**: رقى لێ هەڵساو لێى تورە بوو (هو أحْبَنُ وهى حَبْناء).

**أحْبَنَهُ الطعام والدواءُ**: خۆراكەكە يان دەرمانەكە واى لێكرد رقى هەڵسێ.

**الحَبَنُ**: دەردێكە تووشى گەدە دەبێ، گەورەى دەكاو دەهاوسێ.

**الحِبْنُ**: دومەڵ، كوان، مەيمون، (ك: حَبون).

**الحَبْنُ**: درەختي (دفلى)يە.

**الحَبَنَاء**: ئەو كۆترەيە كە هێلكە ناكا، (ك: حُبْنٌ)ە.

**الحِبْنَةُ**: دومەڵ، كوان، (ك: حِبَنٌ)ە.

**الحَبِينُ**: درەختى (دفلايە).

**حَبَا الصَّبِيُّ حبواً**: منداڵەكە بە گاگۆڵكى رۆيى ٥ دەگوترێ: (حبا البَعيرُ): حوشترەكە پيخى كرد لەبەر ماندويەتى ٥ يان بەستراوەتەوەو زەحفى كرد.

**حبا الشّيءُ**: شتەكە نزيك بووە ٥ دەگوترێ: (حبا السحابُ) هەورەكە سوارى يەك بوو لە زەوى نزيك بووە.

**حبا السهمُ**: تيرەكە لە زەوى خشكاو ئەمجار هەڵبەزييەوە رێى مەبەست كەوت.

حبا فلان للخمسين: فلان كەس لەپەنجا نزيك بۆوە.

حبا فلاناً حباءً وحَبْوةً: بەخششى دا بەفلان ◊ دەگوترێ: (حباه العطاءُ).

أحبى الرامى: تيرهاوێژەكە تيرەكەى هاويشتى كورتى هێناو نيشانەكەى نەهەنگاوت.

حاباه مُحاباةً وحِباءً: تايبەتى كرد بەخۆيەوەو روى دايە.

حاباه في البيع: لە مامەڵەدا سەنگ‌و سووكى بۆ كردو لێى خۆش بوو.

إحْتَبى: كڵۆتى سمتى خستە سەر زەوى‌و ران‌و قاچى بە گەدەى خۆيەوە نان بەهەردوو دەستى چەمبەرەى لە ئەژنۆكانيەوە دا.

إحْتَبى بالثوب: قوماشەكەى لە پشتى خۆى‌و هەردوو ئەژنۆى وەرهێناو كڵۆتى سمتى خستە سەر زەوى ◊ واتە: بەشێوەى (ليحتباء) دانيشت.

اَلْحَبَا: هەورى پڕو گەواڵ گەواڵ‌و نزيك لەزەوى.

الحِباءُ: ئەو رێزو ئيكراميەيە پياو دەيبەخشێ بە هاوەڵەكەى.

حِباء المرأة: مارەيى ئافرەت، (ك: أحبية)، الحُبْةُ: دەنكى ترێ، (ك: حباً).

الحُبْوَة: شێوە دانيشتنى ئيحتبا؛ كڵۆت بخەيە سەر زەوى‌و ئەژنۆ هەڵنێى ◊ دەگوترێ: (حَلَّ فلان حُبْوَتَهُ) فلان كەس وازى لە دانيشتنى دەستەو ئەژنۆ هێنا ◊ هەروا ناوە بۆ ئەو قوماش‌و حەبلەى خۆى پێ كەمەنددەكا لە پشت‌و ئەژنۆى خۆى وەردەهێنێ، (ك: حُبىً)يە.

حَتَا حَتْواً: چاوى برپيە شتەكەو زۆرى سەيركرد.

حَتَا الشَّيْئَ: شتەكەى قايم كرد ◊ دەگوترێ: (حَتأ الجدارَ): ديوارەكەى بە پتەوى دانا.

حَتَا العُقْدَةَ: گرێكەى زۆر توند كرد.

حَتَا الثوْبَ: قوماشەكەى سەر لەنوێ دورييەوە، بەسەر دورمانەكەدا چۆوە.

حَتَا الكِسَاءَ: پرژى قوماشەكەى بادانەوە ريشوى بۆ دروست كردن.

حَتَا الحِمْلَ عن الدابة: بارەكەى لە وڵاغەكە داگرت.

اَحْتأ الشَّيْئَ: بەمانا (حَتَأهُ) دێ.

الحِتْءُ: ئەوەى لە قەراغ‌و بيجاغى كراسەوە هەڵپێچرابێ.

اَلْحَتِيُّ: قاوتى دروستكراو لە بەروبوومى درەختى دوم (ئەم درەختە لە ميصر هەيە).

حَتَّ الورقُ عن الشجر حتّاً: گەڵاكە لە درەختەكە هەڵوەرى.

حَتَّ الشَّيْئَ: دايگرت، هێنايە خوارێ.

حَتَّ الشَّجَرَ: دارەكەى سپى كرد توێكڵەكەى لێ كردەوە.

حَتَّ اللهُ مالَهُ: خودا ماڵ‌و سامانەكەى لێ ستاندەوە هەژار كەوت.

حَتَّ الشَّيْئَ عن الثوب: شتەكەى بە

کراسەکەوە هەڵپرواندو لێی کردەوە.

أحَتَّ الشَّجَرُ: درەختەکە وشك بوو، گەڵاکەی هەڵوەری.

إنْحَتَّ الورقُ عن الشجر: گەڵاکە لە درەختەکە هەڵوەری.

انْحَتَّ شَعْرُهُ: قژی روتایەوە، تووکی سەری هەڵوەری.

تَحَاتَّ الشَّيْئُ: شتەکە لێك بووەو بڵاو بووە ٥ دەگوترێ: (تَحَاتَّتْ أسنانُهُ): ددانەکانی داخوران و هەڵوەرین.

تَحَاتَّ الورقُ عن الغُصْنِ: پەلکە گەڵاکان لە لقی درەختەکانەوە هەڵوەرین ٥ دەگوترێ: (تَحَاتَّت الشجرةُ): گەڵاکانی درەختەکە هەڵوەرین.

تَحَاتَّت عنه ذنوبُهُ: گوناهەکانی لێ هەڵوەرین لە تاوان پاك بووە.

الحُتَاتُ والحُتَاتَةُ: ئەوەیە هەڵوەرێ جا لەهەر شتێك هەڵوەریو هەرشتێك بێ ٥ دەگوترێ: (مافي يدي منه حتاتَةٌ) هیچ شتێکم لە دەستدا نییە.

الحُتَاتُ: لەری و لاوازییەکە تووشی ئاژەڵ و وڵاخ دەبێ رەنگی دەگۆڕێ گۆشتەکەی لەڕ دەکاو تووکی دەروتێتەوە.

الحَتُّ: تیژڕەو ٥ دەگوترێ: (فَرَسٌ حتٌّ وظليم).

الحتُّ من التمر: ئەوەیە بەیەکەوە نەنووسێن، دەنکە خورماکان وشکەڵ بن، (ك: أحتَاتٌ) دەگوترێ: (مافي يدي منه حتٌّ) هیچ شتێکم لەدەستدا نییە ٥ لە پەندی پێشیناندا هاتووە دەڵێ: (تركوهم حتًّا بتًّا، أو حتًّا فتًّا) واتە: قەلاچۆیان کردن لەناویان بردن.

الحُتَّةُ: توێکڵ ٥ بەشێك لەشت.

الحَتُوتُ والمِحْتَاتُ من النخل: ئەوەیە خورما بەرسیلەکانی هەڵوەرن.

حتى: پیتی جەرڕە ئیسم مەجرور دەکا.

حَتْحَتَ الورق عن الشجر: گەڵای درەختەکەی هەڵوەراند.

حَتْحَتَ الشَّيْئَ: شتەکەی ورد ورد کرد.

تَحَتْحَتَ: بۆ مطاوعەی (حتحت)ە هاتووە.

حَتِدَ حَتَداً: بنەماکەی پاڵفتە بوو.

حَتْدُهُ: هەڵی بژارد لەبەر چاکی و رەسەنی.

الحَتُودُ من العيون: ئەو چاوەیە ئاوی نەوەستێ هەمیشە ئاویان لێ بێ ٥ دەگوترێ: (عين حُتُدٌ).

المُحْتِدُ: ئەصڵ و رەسەن ٥ تەبیعەت و سروشت ٥ دەگوترێ: (رجع الى مُحْتِدِهِ).

حَتَرَ فلاناً حَتْراً: بەخششی بۆ فلان کەس کەمکردەوە یان خۆراکی لێ کەمکردەوە.

حَتَرَ له شيئاً: کەمێکی پێ بەخشی.

حَتَرَ أهْلَهُ: ژیانی لەسەر ماڵو منداڵو خێزانی تەنگ کرد ٥ یان بەخێوی نەکردن.

حَتَرَ الشَّيءَ: شتەکەی پتەوکردو بناغەکەی چاك دامەزراند.
حَتَرَ العُقْدَةَ: گرێیەکەی پتەوکرد توندی کرد.
حَتَرَ الحَبْلَ: حەبلەکەی باش بادا.
حَتَرَ الشَّيءَ: چاوی لە شتەکە بڕیو زۆر تەماشای کرد.
أَحْتَرَ: خێرو بێری کەم بوو.
أَحْتَرَ على نفسه وأهله: مەسرەفی ماڵو منداڵی کەمکردەوە، بەباشی بژێوی بۆ دابین نەکردن.
أَحْتَرَ فلاناً: خۆراكو دەسندەی لە فلان بڕی.
حَتَّرَ للناس: خواردەمەنی بۆ خەڵك دروست کرد بەبۆنەی دروستکردنی خانوو.
**الحَتْفُ**: مردن، لەناوچوون ە دەگوترێ: (مات فلان حتف أنفه أو حتف أنفيه) واتە: لەسەر جێگاو نوێنی خۆی مرد، بەمردنی سروشتی خۆی گیانی سپارد ە دەشگوترێ: (مات فلان حتف فيه) ئەمەش لە رووی ئەوەوە هاتووە عەرەب پێیان وابوو ئادەمیزاد ئەگەر بکوژرێ روحەکەی لە شوێنی برینەکەیەوە دەردەچێ ە ئەگەر بە مردنی سروشتی خۆی بمرێ گیانەکەی لە لوتیەوە یان لەدەمیەوە دەردەچێ.
حَيَّةٌ حَتْفَةٌ: مارێکی کوشندەیە.
الحُتْفُلُ: پاشماوەی شۆربا ە وردە گۆشتی بنکی مەنجەڵ ە دەشگوترێ: (فلان من حتفل الناس): فلان کەس لە پێڕی هەتیو مچەو ئادەمیزادە پەستەکانە.
**حَتَكَ** حتكاناً: هەنگاوەکانی بەهۆی خێرا رۆیشتنەوە لێك نزیکبوونەوە.
حَتَكَ الطائرُ الحصى والرمل: باڵندەکە بەردە وردەو لمبەکەی بە باڵەکانی پشکنیو چینی تێداکردن.
حَتَكَ الرجلُ الشَّيءَ: پیاوەکە پشکنینی لە شتەکەدا ئەنجام دا.
تَحَتَّكَ في مشيه: لە رۆیشتندا هەنگاوەکانی لێك نزیك بوونەوە.
الحَوْتَكُ: کورتە باڵای کزو کۆڵەوار.
**حَتَمَ** بكذا حَتْماً: بڕیاری داو حوکمی دەرکرد بەو جۆرە.
حَتَمَ الأمرَ: کارەکەی قایم کرد، بناوانەکەی شێلا.
حَتَمَ عليه الأمرَ: کارەکەی لەسەر پێویست کرد ە (هو حتم)، (ك: حُتُم)ە.
أَحْتَمَ من طعامه: هەندێکی لە خواردەمەنییەکە هێشتەوە نەیخوارد.
إِنْحَتَمَ الأمرُ: کارەکە پێویست بوو نابێ پاشگوێ بخرێ.
تَحَتَّمَ الأمرُ: بەمانا (إنحَتَمَ الأمر)دێ.
تَحَتَّمَ فلان: فلان کەس بەرماوەی خوارد.
تَحَتَّمَ الأمرَ: ئیشەکەی لەسەر پێویست کرد.

**الحاتِمُ**: قازی، دادوەر ◊ قەلە رەشە، لەم رووەوە عەرەب لە کۆندا بڕوا باوەڕیان وابووە هەرکاتێ قەلە رەشە قیراندی نیشانەی ئەوەیە لێك جودا بوونەوەی دوو دڵدار رودەدا.

**الحُتَامَةُ**: بەرماوەی خۆراك لەسەر سفرەو خوان ◊ ئەو دەنك و وردەیەی لەکاتی خواردندا دەکەوێتە خوار.

**الحَتم**: بڕیارو حوکم و قەزا ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ ◊ هەروا بەمانا برادەری راستەقینەو دڵسۆز دێ ◊ دەگوترێ: (هو الأخ الحَتمُ).

**الحَتمةُ**: وردو هاڕ، دەگوترێ: (قارورة حَتَمَةٌ) گۆزەیەکی کەرت و پەرت.

**الحَتْمِيَّةُ**: (حتمية الأمر): پێویستی و گرنگی ئیشەکەو واز لێ نەهێنانی.

**حَتِنَتْ السهامُ حَتَنًا**: بەشەکان بەشوێن یەکدا هاتن و دابەشکران چون یەك و بێ جیاوازی.

**حَتِنَ الْحَرُّ**: گەرماکە پەرەی سەندو بەردەوام بوو.

**حَتَنَ اليومُ**: سەروبنی رۆژەکە وەکوو یەکی لێ هات لەگەرمیدا.

**احْتَنَ في رميه**: هەموو تیرەکانی هاویشتنی لەیەك شوێنیان دا.

**حاتَنَ فلان فلاناً**: فلان کەس وەکوو فلانی لێ هات چووە ریزی ئەوەوە.

**إحْتَتَنَ الشَّيْئُ**: شتەکە رێك بوو هیچی جوداوازی لەگەڵ ئەوی تری دانیە.

**تحاتنت الرياحُ**: بایەکە بەردەوام هەڵی کردو بروکەی نەدایە.

**تحاتنت الأشياء**: شتەکان یەك بەدوای یەکدا هاتن و چوون یەك بوون ◊ دەگوترێ: (تحاتنت السهامُ و تحاتنت الدموعُ).

**تحاتن القومُ**: قەومەکە رانواندنیان کردو کەوتنە پێشبڕکێ کردن لە تفەنگ هاویشتن و تیر هاویشتن داو وەك یەك دەرچوون.

**الحاتِنُ**: هاوشان و بەرامبەر.

**الحَتْنُ**: دەستاوەڵ و هاوشان.

**الْحَتْنى**: هاوشان و لەیەکچوو کۆمەڵێك هەموویان لەیەك بچن ◊ دەگوترێ: (وقعت النَّبْلُ حتنى) گوللەو تیرەکان وەکوو یەك بوون.

**حَتَا حَتْواً**: خێرا خێرا هەنگاوی هەڵێنان، بازێکی گورج و گۆڵانەی دا.

**حَتَا الثوبَ**: قوماشەکەی دوروو چاك قایمی کرد.

**حَتَا هُدْب الكساء**: پرژی تورەکەکەی وێك نان و نوساندنی پێیەوە.

**حتى الثوبَ وهُدْبَ الكساء**: قەراخی قوماشەکە یان پرژی قەراخی تورەکەکەی وێك نان.

**حَتّى الشرابَ**: زۆری شەراب خواردەوە.

**الحاتي**: ئەو کەسەی زۆر شەراب بخواتەوە.

**الحَتِيُّ**: ئەوەی لە درەختی (دۆم) هەڵوەرێ (دۆم: درەختێکە لە ولاتی

میصــر هەیــە) ٥ خورمــا وشــکەڵەو توێکڵە خورما.

**حَثَّـهُ حثـاً**: پـەیتا پـەیتا هـەڵینا بـۆ ئەنجامدانی کارەکەی.

**حثه علی الشَّيْئ**: هەڵینا بۆ ئەنجامدانی شتەکە.

**احَثَّهُ**: بەمانا (حثَّهُ) دێ.

**حَثَّثَ فلان**: فـلاّن کـەس خـەو تینـی بـۆ هێناو خێرا بەسەریدا زاڵ بوو.

**حَثَّثَ فلانـاً علـی الشَّـيْئ**: فـلاّن کەسـی هەڵنا بۆ ئەنجامدانی ئیشەکە.

**إحْثَثَّهُ**: بەمانا (حَثَّهُ) دێ.

**تَحَاثَّ القومُ علی الشَّيْئ**: قەومەکە فلاّن کەسیان هەڵنا بۆ ئەوکارە.

**اسْتَحَثَّهُ**: بەمانا (حَثَّهُ) دێ.

**الحِثاثُ**: نوستنی سوك کە خێرا بۆ چاو دێ.

**الحِثاثَــةُ**: گــەرمایی‌و گــڕێ‌و گــۆڵ کــە ئـادەمیزاد لەچـاوی خۆیـدا هەسـتی پـێ دەکا.

**الحُــثُّ**: وردکـراو کـوتراوو هـاڕاو لەهـەر شتێــك بــێ ٥ وردەکـا ٥ لمبـی زبـرو رەق‌و وشـك ٥ نــانی بــێ پێخــۆر ٥ دەگوترێ: (سويقٌ حُثٌّ): قاوتێك کە وردە هەویری لەگەڵ نەبێ.

**الحِثِّيَثي**: بەمانا (الحُثُّ) دێ.

**الحَثُــوثُ وَالحَثِيــثُ**: گــورج‌و گــۆڵ‌و بەخەمــەوە بــوو بــۆ ئەنجامــدانی ئەرکی سەر شانی ٥ خێراو کۆڵنەدەر لەبەرنامــەی خۆیــدا ٥ قورئـــان دەفـەرموێ: ﴿يُغْشِـي اللَّيْـلَ النَّهَـارَ يَـطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾ دەگوترێ: (ولی حَثِيثاً): بـە خێرایـی‌و تیـژڕۆ ڕۆیـی بـەرەو ئامانجی خۆی.

**الْمَحَثَّـةُ**: ئەسپێــکی ڕەســەن‌و خۆشــڕۆ کەلە ڕۆیشتن زوو ماندوو نەبێ.

**حَثْحَثَ البرقُ**: هەورە بروسکە کە تێکیەوە هاویشت.

**حَثْحَثَ الأمرَ والشَّـيْئَ** : کارەکـەی جوڵانـد، ئیشەکەی ڕاپەڕاند.

**حَثْحَثَ فلاناً علی الشَّيْئ**: فلاّن کەسی هەڵنا بۆ شتەکەو ڕێگای بۆ دۆزییەوە.

**الْحَثْحَاثُ**: مارێـك کـە هەمیشە لـە جم‌و جۆڵـدا بـێ ٥ ڕۆیشتنێـك کـە ڕێـك‌و ڕاست بێ‌و ئەملاو ئـەولای تێدا نـەبێ ٥ خەوێك خێرا لەچاو بکەوێ.

**الْحُثْحُـوثُ**: هـەڵنان ٥ گـورج‌و گـۆڵ لـە ئەنجامــدانی کارەکانیــدا دەگــوترێ: (کتيبة حُثْحُوث): تیپێکی گورج‌و گۆڵە بە باشی ئەرکەکانی ئەنجام دەدا.

**حَثِـرَ حَثَـراً**: تونـد بـوو، مـەیی، ڕەق بـوو، گرژبوو.

**حَثِرَ الجلـدُ وحَثِـرَ الـدواء، وحَثِـرَ العسـلُ**: پێســـتەکە زیپکــەی دەرکـــــرد ٥ دەرمانەکەی کرد بـە حـەب‌و گولاج، هەنگوینەکە ڕەق بوو.

**حَثِرَتِ العـين**: چـاوەکە تووشـی تراخومـا بــوو پێڵوەکـانی ئەسـتوور بــوون لــە پێڵوەکانیدا زیپکەی سور پەیدا بوون.

**حَثِـرَ الـدقيقُ**: ئاردەکـە تـەڕبوو بووبـە پرپڕۆڵەو پەکتری نەگرت.

حَثِـرَ اللسـانُ: زمانەکـە تفت بـوو تـامی خواردەمەنییەکەی نەکرد.

حَثِـرَت أذنُـهُ: گوێچـکەی بەباشـی نەیبیست.

حَثِرَ فؤادُه: دڵی باش شتەکەی وەرنـەگرت (هو أحثَرُ هی حثراء).

أحْثَرَ النَّخلُ: میوەی دارخورماکە پـێش ئەوەی بگا وردو رەق بوو.

حَثَّرَ الدواءَ: دەرمانەکـەی کـردە حـەبو گولاج.

الْحَثَـرُ: گـرێو گـوڵو زبرییـەك لـە چاودا پەیـدا دەبـێ بـەهۆی چـاو ئێشەوە ٥ گوڵـوکی تـری پـێش ئـەوەی ببێتـە بەرسیلە ٥ هێشوی ترێ.

الْحَثَـرَةُ: دەنکـی هێشـوە تـرێ سـەرەتای پەیدابوونی ٥ نەخۆشییەکە تووشی چاو دەبێ.

الْحَـثِيَةُ: خواردنێـکە دروسـت دەکـرێ دوای تەواوبوونی خانوو.

الْمُحَثَّرُ: لوت زل، لوت کەشکۆڵ.

حَثْرَبَ الماءُ: ئاوەکە لـێڵ بـوو ٥ دەگوترێ: (حَثْرَبت البئرُ:) ئاوی بیرەکە لێڵ بوو.

الْحُثْرُبُ: ئاوی لـێڵ ٥ چەوراییو بنکـڕی بنکی مەنجەڵ ٥ کەدەمێنێتەوە.

الْحَثْرَفَـةُ: خـرۆو سـورایی کەلەچـاودا پەیدا دەبێ.

حَثْرَمَت الشَّفَةُ: لێوەکە ئەستور بوو، هاوسا.

الْحُثارِمُ: لێو ئەستور، لێو فشەوەبوو.

الْحِثْرِمَـةُ: کەوانەیەکـە لـەخوار لووتـەوە لـە ناوەڕاسـتی لێـوی سـەرەوەدا ٥ کەناری لوت.

الْحَثـافِيُ: هـەموو ٥ دەگـوترێ: (أخـذه بحثافيره) واتە: (بحذافير) و (بمجوعه).

الْحُثْفُرُ: خڵتـەو پڵتـەی ڕۆنـی قـاڵ کـراو، دۆنـــگ ٥ منـــداڵی فـــڕێ دراو هەتیومچە، (ك: حثافر).

الْحَثْفَرَةُ: خڵتەو پڵتە کەلە بنکـی قـاپو مەنجـــەڵو گـــۆزەو دیـــزەدا دەمێنێتەوە.

حَثِلَ حَثَلاً: وەزعو حاڵی خراپ بوو.

احْثَلَهُ: خراپەی لەگەڵ کرد ٥ دەگوترێ: (أحثَلَـتِ الأم ولـدها) دایکەکـە بـە ناڵـەباریو خراپـی شـیری دا بـە زاروکەکەی.

أحْثَـلَ اللهُ فلانـاً: خـودا وەزعو حـاڵی فلانی گۆڕی توشی ناخۆشی کرد.

الْحُثالَةُ: شـتی خـراپ، شـتی خـراپو بـێ کـەڵك لەهـەموو شتێـك ٥ شـتی بـێ کەڵك لە دانەوێڵەو لـە خورمـاو ئـەو جـۆرە شـتانە ٥ کەسـانی خـراپو خوێڕیو هەتیومچە.

الْحَثَـلُ: بـارودۆخی ناڵـەبار ٥ شـیرپێدانی منداڵ بە نارێكو پێکی.

الحِثْلُ: کزو لەڕو لاواز، کەمو کوڕو بێ کەڵك.

الحِثْلَةُ: ئاوی کەم لە حەوزدا.

الْحَثْمَـةُ: نەخۆشـی ڕەبـوە، هەناسـەی تونـــد، ڕێبـــازی کـــوتراوەو ڕەق ٥ نەرمایی لوت، (ك: حِثام)٥.

**اَلْحُثْمَـةُ**: پلوسكى ئـاو لـه بەربەستى ئـاودا ٥ شـوێنى هـەڵرژانى ئـاو لـه حەوزەوە.

**اَلْحَوْكَمُ**: ئادەميزادى مام ناوەندى لەبارەى بالآوە يان ئاژەڵى مام ناوەندى.

**حَثَا** التراب ونحوه حثواً: گڵى بەسەردا كرد ٥ دەگوترێ: (حَثَا الـترابُ عليه ولـه) شتێكى كەمى پێدا.

**حَثَا** الـترابَ ونَحْـوَهُ: گڵى بەسـەردا كـرد ٥ دەگوترێ: (حثا عليه التراب) .

**حثا** في وجهه التراب: پێشى كەوت.

**حثـا** في وجهـه الرمـاد: تـەريقى كـردەوە ٥ بەسەر پاشوانيدا بردەوە.

**حثا** الماءَ: لوێچێكى ئـاو هەڵـگواز، بـەلۆيچ بە مست ئاوى هەڵگرت.

**حَثى** الترابُ ونحوُهُ حثياً: بەمانا (حثا) دێ.

**حَثى** الترابَ ونحوُه: بەمانا (حثاه) دێ.

**أحْثاه**: واى لێكرد گڵى بەسەرابدا.

**إحْتَثي** الترابَ: گڵى بەسەردا كرد.

**اسـتَحْثوا**: ئـەو كۆمەڵـه يـەكتريان گـڵ باران كرد گڵيان بەيەكتردادا.

**الحاثيـــاء**: گڵـــى دەردراو لـــه كـــونى (يەربوع) گيانلەبەرێكه وەكوو جرج وايـه كلكـى درێـژو دەسـتى كـورتو پاشوى درێژن، (ك: حواث).

**الحثـا**: گڵى بەسـەرا كراو گڵه شـەند ٥ كا يـان وردەكل ٥ بنخۆڵى كا ٥ توێكڵى خورما.

**الحثواء**: زەوييەك گڵى زۆربێ.

**اَلْحَثْوَةُ**: مشته خۆڵێك، چنگه خۆڵێك.

**اَلْحَثْيَةُ**: بەمانا (الحثوة) دێ.

**حَجَا** به حَجْـاً: دەستى پێوە گرتو پێى كەيف خۆش بوو.

**حَجَا** اليه: پەناى بۆ برد.

**حَجَاَ** عنه كذا: ئەو شتەى لێ قەدەغه كرد.

**تَحَجّاَ** به: بەمانا (حجابه) دێ.

**حَجَبَ** بينهما حَجْباً: بوو به پەردەو ناوەند له نێوانياندا.

**حَجَبَ** الشَّيْئَ: دايپۆشى، شتەكەى شاردەوە.

**حَجَبَ** فلاناً: نەيهێشت فـلأن كـەس بچێته ژوورەوە يان نەيهێشت ميرات بگرێ.

**حَجَبَ** الأميرَ: بوو به دەرگەوانى پاشا، بـوو به سكرتێرى پاشا.

**حَجَّبَ** الشَّيْئَ: بەمانا (حَجَبَهُ) دێ.

**احْتَجَبَ**: خۆى شاردەوە.

**انحَجَبَ**: بەمانا (احتجبَ) دێ.

**استَحْجَبَهُ**: كـردى بـه دەرگـەوانى خـۆى، كارى حيجابەى پێ سپارد.

**الحاجِـبُ**: دەرگـەوان (ك: حَجَبَـةٌ حُجُـبٌ وحُجاب) ئێسقانى پشت چاو لەگـەڵ گۆشـتەكەى ٥ بـرۆ ٥ ئـەو موانـەى لەبـەرزايى پشـت چـاوەوە رواون ٥ (جوته برۆ).

**الحاجِبُ** مـن كـل شـيئ: قـەراخو ئـەملاو ئەولاى، (ك: حواجب).

**حاجـب** الصـبح: بەرەبـەيانو سـەرەتاى گزنگ.

**الحجـــابِ**: پـــەردە، بـــالآ پۆشـــى، (ك: حُجُبٌ)ە.

**الحِجابَةُ**: پیشەی دەرگەوانی.

**الحَجْـــبُ**: مـــەنع کـــردن ٥ لـــە شـــەرعدا مـــەنعکردنی ئـــادەمیزادە بـــەهۆی بـــوونی یەکێـکی تـر لـە میراتگـرتن جایا ناهێڵێ هیچ بگری یان لێی کەم دەکاتەوە.

**الحَجَبَةُ**: سەری کلۆت ٥ کۆتایی رانە وەکوو جۆن شان کۆتایی قۆڵە، (ك: حَجَبٌ).

**حَجَّ** الیه: هات بۆلای.

**حَجَّ** المكانَ: قەصدی ئـەو شوێنەی کـرد ٥ چوو بۆی.

**حَـجَّ** البیـتَ الحـرامَ: چـوو بـۆ مـاڵی خـوا بەمەبەستی عیبادەت و حەجکردن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلِلّٰهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْـتِ﴾ ٥ دەگـوترێ: (حَـجَّ بنـو فـــلان فلانـــاً): فـلان بنەماڵـە زۆر هاموشۆی فلان کەسیان کرد.

**حَجَّ** الجُـرْحَ: برینەکـەی پشکنی بۆئـەوەی بزانێ چەند قوڵە تا چارەسەری بکا.

**حَجَّ** فلانـاً: لـە قـوڵایی چاویدا بـە بەڵـگە بۆری دا ٥ دەگـوترێ: (حاجَّهُ فَحَجَّهُ).

**أحَجَّ** فلاناً: فـلان کەسـی نـارد بۆئـەوەی حەجی ماڵی خودا بکا.

**حاجَّـهُ مَحَاجَّـةً وحِجاجـاً**: دەمـە دەمێـی لەگـــەڵ کـــردو کەوتـــە کێشـــەو موجادەلـــە لەگەڵێـــدا ٥ قورئـــان دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّـذِي حَـآجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رِبِّهِ﴾.

**احْـتَجَّ** علیـه: بەڵـگەی راسـت کـردەوە، رەدی دایـــەوە بـــەرەو روی وەســـتاو رەخنەی لە کارەکەی گرت.

**تَحاجُّوا**: موجادەلەیان لەگەڵ یەك کرد.

**الحاج**: ئەو کەسەیە دیدەنی کەعبە دەکا بەمەبەستی حـەجکردن، (ك: حُجَّاج وحجـــــیج)ە ٥ جـــاری وا هەیـــە دەگوترێ: (حاجِجُ).

**الحاجَّة**: ئـافرەت کـە چووبێ بـۆ حـەج ٥ نەرمەی گوێ.

**الحَجَاجُ من کل شـیئ**: قـەراخ و بیجاخی شـت ٥ ئێسـقانی بـرۆ، (ك: أحجـــة وحجاج)ە.

**الحَجُّ**: حەج یەکێـکە لـە پێـنج فـەرزەکانی ئیسـلام کـە بریتییـە لـە دیـدەنی کردنی ماڵی خوداو راوەستان لەسـەر کێوی عەرەفە بە گوێرەی شەرع.

**الحج الأكبر**: ئەوەیە وێرای تـەواف و ئیحـرام راوەستانی عەرەفەشی پێش بکەوێ.

**الحـــج الأصـــغر**: ئەوەیـــە راوەســـتانی عەرەفەی تێدا نەبێ واتە: عومرە.

**الْحَجَّةُ**: یـەکجار حـەجکردن ٥ نـەرمایی گـــوێ ٥ میرویـــەك یـــان لوئلوئێـــك وەکوو گوارە بکرێتە گوێ.

**الحُجَّـةُ**: بەڵـگەو نیشانە ٥ چەکی کـڕین و فرۆشـتن ٥ زانـای زۆر زانـاو خـاوەن بتمانە ٥ لە زاراوەی عیلمی حەدیث دا (حُجَّة) بریتییە لە حەدیث زانێك سێ سـەد هـەزار حـەدیثی لەبـەر بـێ بـە سـەنەدو مەتنـەوە، هـەروەها ئاگاداری

حـالْو وەزعـی راوییـەکان بـێ لـەڕوی جـەرح و تەعدیلـەوە لـەڕووی مێـژوو ژینامەیانەوە، (ك: حجج حجاجَ).

**الحِجَّةُ**: چاوگی کرداری (حَـجَّ) یـە یـان (مصدر مره)یە.

**حَجَّـة الـوِداع**: حـەجی ماڵئـاوایی: دوا حــەجکردنی پێغەمبــەرە ﷺ هــەروا بــەمانا (ساڵە) واتـە دوانـزە مـانگ، (ك: حِجَــج)ە ﷺ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ﴾.

**ذوالحِجَّــة**: مــانگی دوانـــزەی ســـاڵی قەمەرییــە ﷺ کــە دەبێتــە مــانگی حەجکردن.

**الْمِحْجَــاجُ**: ئــەو کەســەیە زۆر دەمــە دەمــێ و کێشــە دەکـا ﷺ ئامێرێــکە پزیشـك بـەکاری دەهێنـێ بۆنـەوەی بزانێ برینەکە چەند قووڵە.

**الْمَحَجَّـــةُ**: ڕێبــازی راســتەقینە، (ك: مَحَاجّ).

**حَجْحَجَ عـن الشَّيْئِ**: نەوێرایـە شتەکەو وازی لێ هێنا.

**حَجَرَ عليه حَجْـراً**: دەسـت بەسـەری کـردو مامەڵە کردن و دەست وەردانە مـاڵ و سامانی خۆی لێ قەدەغە کرد.

**حَجَـرَ عليـه الأمـرَ**: ئـەوکارەی لێ قەدەغـە کرد.

**حَجَرَ الشَّيْئَ على نفسـه**: شـتەکەی تایبـەت کرد بەخۆیەوە.

**حَجَّـرَ الأرض عليهــا وحولهــا**: لەســەر سـنوورەکانی زەوی نیشـانەی دانـان، سنگی چەقاندن، بەردی دانان.

**حَجَّرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی تەسك کردەوە.

**احْتَجَرَ الحيـوانُ**: حەیوانـەکـە سکی تونـد بوو، گەدەی رەق بوو.

**احتجر بفلان**: پەنای بۆ فلانکـەس بـردو داوای یارمەتیدانی لێکرد.

**احْتَجَرَ الأرض وعليها وحولهـا**: سنووری بۆ زەوییەکە دانا.

**احْتَجَرَ الشَّيْئَ**: شـتەکەی خسـتە کۆشـی خۆیەوە.

**احْتَجَرَ حُجْرَةً**: ژوورێـکی بۆخـۆی دیـاری کرد، کردی بە ژوور.

**تَحَجَّرَ**: وەکوو بەرد رەق بوو.

**تَحَجَّرَ المكانُ**: شوێنەکە بەردی زۆر بوو.

**تَحَجَّرَ على فـلان**: تـەنگی بـە فلانـکـەس هەڵچنی.

**تَحَجَّـرَ الجُـرحُ**: برینەکـە هاتـەوە یـەك و گۆشتەوەزونی هێنایەوە.

**تَحَجَّـــرَ الرجــلُ**: پیاوەکــە ژوورێــکی بۆخۆی بنیات نا.

**تَحَجَّرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی تەنگ کردەوە ﷺ دەگوترێ: (تَحَجَّرَ واسعاً).

**استحْجَرَ الطين**: قوڕەکە رەق بـوو بووبـە بەرد بووبە سواڵەت.

**اســتحْجَرَ الرجــل**: پیاوەکــە ژورێــکی بۆخۆی دانا.

**اســتحْجَرَ عليـــه**: کاڵتـــەی پێـــکردو سوکایەتی لەگەڵ دا نواند.

**الحــاجر**: زەوییـەك چـوار دەوری بـەرز

بکرێتـەوە ناوەڕاستی چاڵ بـێ ٥ چاڵاییەك ئاوی تێدا راوەستێ.

الحاجور: بەمانا (الحاجر) دێ ٥ بەمانا بەستو (پاساغ)یش دێ.

الحاجورة: یارییەکـە بـەم جـۆرە منداڵـەکان دێـن جوغزێـك لـە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکـەدا دەکێشن ئـەمجار یەکێکیان لـە ناوەڕاستی جوغزەکـەدا رادەوەستێ ٥ منداڵـەکانی تـر بـە دەورییـەوە دەیانـەوێ بیگـرن و ئـەویش هـەوڵ دەدا خۆ بەدەستەوە نەدا.

الحِجَارُ: پەرژین و شورا، سیاج ٥ دیواری خانوو.

الْحَجَّارُ: ئەو کەسەی ئیشی بەرد دەکا بەرد دەشکێنێ ٥ نەقارێ دەکا.

الحَجْـرُ: لـە شـەرعدا بریتییـە لـە مـەنعکردنی شـەخص لـەوەی تەصەروف لە ماڵ و سامانی خۆیدا بکا جا لەبەر منداڵی بێ یان بێ عەقڵ بێ یان شێت بێ.

الحَجْرُ: باوەشی ئادەمیزاد دەگوترێ: (هو في حِجْرِهِ) واتـە: لەژێر چاودێری و حیمایەی ئەودایە.

محجر العين: دەوران دەوری چاو.

الحِجْرُ: بەمانا (الْحَجْر) دێ ٥ جگە لەمانە شەرعییەکەی ٥ هەروا وشەی (حِجْر) بەمانا عەقڵ دێ قورئان دەفەرموێ: ﴿هَلْ فِي ذَلِكَ قَسَمٌ لِّـذِي حِجْـرٍ﴾ ٥ هەروا بـەمانا مـاین دێ، (ك: حُجُـور وأحجـار)ە ٥ بـاکوری کەعبـە کـە ناوچـەی (الحطـيم) دەگرێتـەوە ٥ کۆشی ئادەمیزاد.

الْحَجَـر: بەردی شکاو یان شاخ و بەردی گەورەو رەق و پتەو کە پێك دێ لە کۆمەڵـە بـەردی زل ٥ یـان بـەردی شکاوی یەکگرتوو پێکەوە نووساو جـۆش خـواردوو ٥ هـەروا نـاوە بـۆ بـەردی بەنرخ وەکوو یاقوت و ئـەو جۆرە شتانە.

الحجـر الأسـود: بـەردە رەشـە کەلـە گۆشـەیەکی دیـواری کەعبەدایـە، حاجییەکان لەکاتی تـەواف کردنـی کەعبەدا ماچی دەکەن یان بەدەست ئاماژەی بۆدەکەن.

حجر الطباعة: جـۆرە بەردێـکی جیرییـە گـڕن گڕنـە لـە رۆژگـاری کۆنـدا بـۆ چـاپکردن و رەسـم گـرتن بـەکاریان هێناوە.

الْحَجِـرُ: بـەردەڵان ٥ دەگـوترێ: (مكـان حَجِرٌ) شوێنێـکی بەردەڵانە.

الْحُجُـرُ: ئـەو گۆشـتەی بـە دەوری نینۆکەوەیە.

الحَجْرَةُ: قەراخ و لایەن، دەگـوترێ: (قعد حَجْـرَةً وحَجْـرت الطريـق) ئـەملاو ئەولای ڕێگا.

الحُجْـرَةُ: ژوور لـەژێر خـانوودا ٥ ژێرزەمین ٥ تەویلەی ئاژەڵ.

حُجْرَتا العسكر: لای راست و لای چەپی سوپا.

الْمَحْجَرُ: کانەبەرد ٥ ئەو شوێنەی لە کێو بەردی لێ دەردەهێندرێ.

**اَلْمَحْجَرُ فِي العين:** دەوران دەوری چاو.

**اَلْمِحْجَرُ:** بەمانا (اَلْمَحجِرُ) دێ ٥ شوێنی قورمتێنـــە نـــەو ناوچـــەيەی فەرمانگـەی تەندروسـتی پاسـاغی دەكـاو ناهێڵێ كەسـی لێ بێتـە دەرو كەسی بچێتە ناو.

**حَجَّزَ بينها حَجْزاً:** نێوانی خستە ناويانـەوە لێكی جياكردنەوە.

**حَجَـزَ الشَّـيْءَ:** شـتەكەی لـەخۆی گـرتو نەيهێشت بۆ كەسی تر بێ.

**حَجَزَ فلاناً عن الأمر:** فلانكەسـی لەكارەكە گێڕايەوەو مەنعی كرد.

**حَجَـزَ القاضـي علـى المـال:** قـازيی خـاوەن ماڵەكـــەی مـــەنع كـــرد لـــەوەی تەصەروف بە ماڵەكەوە بكا.

**حُجِزَ:** دەست بەسەر كرا.

**حَجِـزَ حَجَـزاً:** ريخۆڵـەكانی قـەبز بـوون، تووشـی گرفـت بـوون نـەيتوانی خـواردنو خواردنـەوەی زۆر بخـواو بخواتەوە.

**أَحْجَزَ:** هاتە وڵاتی حيجاز.

**حـــاجَزَهُ:** داوای لێـــكرد واز لـــە دژايەتيكردن بێنێ.

**اِحْتَجَزَ:** سەرپێچی كرد ٥ پابەنـد نـەبوو ٥ هاتە وڵاتی حيجاز.

**اِحْتَجَزَ بالإزار:** پشتێنی لەپشت بەست.

**اِحْتَجَزَ بالحصن:** بە قەڵاكە خۆی پاراست ٥ داكۆكی لەخۆی كرد.

**اِحْتَجَزَ من كذا:** خۆی لەوە پاراست.

**اِحْتَجَزَ لَحْمُهُ:** گۆشتی گرت، گۆشتن بوو.

**اِحْتَجَـــزَ الشَّـــيْءَ:** شـــتەكەی لەبـــەر پشتێنيدا.

**اِنْحَجَـــزَ:** لاســـاری كـــرد ٥ دەگـــوترێ: (اِنْحَجَزَ عنه) وازی لێ هێنا.

**تَحـاجَزَ الْقَـوْمُ:** قەومەكـە لێـك تـرازان هەندێكيان لە هەندێكيان دابڕان ٥ هەندێـــكيان پشـــتێنی هەندێـــكيان گرتو دەستەو دامانی يەكتر بـوون ٥ دەگـوترێ: (تحـــاجزت العبـــارات) رسـتەكان توكمـەو پێـكەوە گونجـاو رێكو پێك بوون.

**تَحَجَّـزَ:** پشتێنی تونـد كـرد، ناوقـەدی خۆی بە پشتێن توندكرد.

**الحاجز:** ناوانی دوو شت ٥ ناوەنـد ٥ ئـەو كەســـەی ناهێڵـــێ هەنـــدێ كـــەس پەيوەنـدی بـە هەندێـكی تريانـەوە بكـەن ٥ بەحـەقو راسـتی حوكميـان لەنێوانياندا دەكا، (ك: حَجَزَة)ە.

**الحِجَـازُ:** بـەمانا (الحـاجز) دێ ٥ پشـتێنو قايش پشـتێن كەلـە پشـت دەبەسـرێو ئاتەكو داوێنی پێوە قايم بكرێ ٥ ئەو حـــەبلو گوريســـەيە وڵاخـــی پـــێ دەبەسـترێتەوە ٥ هـەروا نـاوە بـۆ ئـەو دەڤەرو وڵاتەی دەكەوێتە نێوان وڵاتـی تيهامەو وڵاتی نەجدەوە ٥ جۆرێـكيشە لە دەنگو ئاوازی مۆسيقا.

**حَجَازَيْكَ:** بەردەوام لە نێوانيـان دا بـە ٥ بكەوە نێوانيانەوە.

**الحُجُـزُ:** ناحيـەو ئـەملاو ئـەولا ٥ هـۆزو خـێڵو خـزم كـە دەبنـە پـارێزەرو

داكۆكیكەر لەو كەسەی سەر بەوانە.

**اَلْحُجْزَةُ**: ناوقەد، شوێنی بەستنی پشتێن لە سێبەندەو ناوك ◦ شوێنی دۆخێنی شرواڵ دەگوترێ: (أخذ بحُجْزَتِهِ) پەنای بۆ بردوو پشتێنەكەی گرت داوای لێكرد یارمەتی بدا ◦ (رجل طيب الحُجْزَة) پیاوێكی داوێنپاكە ◦ (رجل شديد الحجزة) پیاوێكی خۆ راگرو پشوو درێژە ◦ (هذا كلام أخذ بعضه بحجز بعض) ئەمە قسەیەكی رێك و پێكە رستەكانی پێكەوە گونجاون.

**حُجِفَ**: سك چوونی توش بوو.

**اَلْحُجَافُ**: سكچوون بەهۆی زۆر خواردن یان خواردنی خراپ ◦ سك هێشەو تێكچوونی كۆئەندامی هەزم.

**الحجيف**: قۆڕەی سك ◦ قورتە قورتی گەدەو ریخۆڵە.

**حَجَلَ حَجْلاً وحجلاناً**: قاچێكی هەڵبڕی و لەسەر قاچێك رۆیشت ◦ لەسەر قاچێك حندەڵ حۆی كرد ◦ هەنگڵە شەلەی كرد.

**حَجِلَ المقيّد**: زنجیری لەپێدا بوو بازی دا.

**حَجِلَتْ عينهُ**: چاوی قوڵ بوون.

**حَجِلَتْ الدابّةُ**: وڵاخەكە زەندەكانی سپی بوون جەستەی تری هەمووی رەشە.

**أحْجَلَ الدابّةَ**: پەتەكەی لە قاچێكی وڵاغەكە كردەوە كردییە قاچەكەی تری.

**حَجَّلَ**: بەمانا (حَجَلَ) دێ.

**حَجَّلَ في وضوئه**: لەگەڵ شتنی دەستیدا هەندێ لە قۆڵی شت و لەگەڵ شتنی قاچەكانیشی دا هەندێ لە بەلەكی شت.

**حَجَّلَ العَرُوسَ**: پاوانەی بۆ بوكەكە كرد.

**حَجَّلَ الدابّةَ**: وڵاغەكەی بە پێوەند بەستەوە.

**حَجَّلَت المرأةُ بَنَانَهَا**: ئافرەتەكە خەنەی سەر پەنجەكانی رەنگاو رەنگ كرد.

**حَجَّلَ أمْرَهُ**: كارەكەی خۆی مەشهور كرد.

**يومٌ أغَرُّ مُحَجَّلٌ**: رۆژێكی بەناوبانگە.

**حَجَّلَ في مَشْيِهِ**: لە رۆیشتندا خۆی لەنگاند.

**التحجيلُ**: سپیایەتی لە قاچی وڵاغ دا لە ئەژنۆی تێپەڕنەكا.

**الحِجْلُ**: پاوانە، خرخاڵ ◦ زنجیرو پێوەند.

**اَلحَجْلَةُ**: یارییەكی منداڵانە، بەم جۆرە لەناو گۆڕەپانەكەدا چەند چوار گۆشەیەك دروست دەكەن، ئەمجار بە شێوەی (عیلۆكێ) لەم چوار گۆشەوە دەگوێزنەوە بۆ چوار گۆشەیەكی تر.

**اَلْحَجَلَـةُ**: تارایەكە، سەرپۆشێكە، كەژاوەیەكە بە قوماشی رەنگاو رەنگ دەرازێندرێتەوە بۆ بوك ◦ پەردەیەكە بۆ بوك لەناو ماڵدا دەگیرێتەوە ◦ كەو؛ باڵندەیەكە لە كۆتر گەورەترە دەنوك و قاچەكانی سورن گۆشتەكەی بۆ خواردن زۆر خۆشە.

أَلْمُحَجَّلُ من الدواب: ئەو ولآخەیە خوار ئەژنۆی سپی بێ ناوچەوان‌و شوێنی تریشی پەڵەی سپی تێدابن واتە بەڵەك بێ.

ثوب مُحَجَّلٌ: کراسێکی ئاو دامانە بگاتە پشت قولە قاپیەوە.

حَجَمَ فم الحیوان: لغاو یان (دەمبێن)ی لەدەمی حەیوانەکە کرد بۆئەوەی نەتوانێ شت بگەزێ یان بیجوێ.

حَجَمَ الْحَیْوانَ: حەیوانەکەی مەنع کرد.

حَجَمَ فلاناً عن الأمر: فلآنکەسی لەوکارە لەو شوێنە مەنع کرد نەیهێشت بیگاتێ.

حَجَمَ الصَّبِیُّ ثدي أمه: منداڵەکە مەمکی دایکی مژی.

حَجَمَت الحیّةُ فلاناً: مارەکە فلآنکەسی گەست، پێیەوە دا.

حَجَمَ المریضَ: نەخۆشەکەی چارەسەر کرد بە کەڵە شاخ لێگرتن.

أحْجَمَ الثَّدْيُ: مەمکی خڕکرد، (مەمکەکە خڕبوو).

احجم فلان عن الشَّيْءَ: فلآنکەس ئەوشتەی ئەنجام نەداو لێی پەشیمان بووە.

احجمت المرأةُ الصغیر: ئافرەتەکە یەکەم جار شیری دا بەمنداڵەکە.

حَجُمَ: زۆری تێ روانی‌و لێی وردبووە.

احْتَجَمَ: داوای کەڵەشاخ لێگرتنی لێ کرد.

الحِجامُ: لغاو، ئاسنێکە دەکرێتە دەمی ولآخەوە بۆئەوەی شتی بۆ نەخورێ شت نەگەزێ.

الحِجَامَةُ: پیشەی کەڵەشاخ گرتن.

الْحَجَّامُ: کەڵەشاخ گر.

الْحَجْمُ من کل شيء: قەبارەکەیەتی، ئەندازەی جەستەکەیەتی، (ك: حجوم)ە.

الْمَحْجَمُ: شوێنی کەڵەشاخ لێگرتن.

الْمِحْجَمُ: ئالەتی کەڵەشاخ گرتن، ئامێرەکەی ٥ ئەو قاپ‌و کیسەیەی کە خوێنەکەی تێدا کۆدەکرێتەوە، (ك: مَحَاجِمَ).

المِحْجَمَةُ: بەمانا (المِحْجَمُ) دێ.

حَجَنَ العودَ: شورکە دارەکەی چەماندەوە.

حَجَنَ الشَّيْءَ: بە گۆچان ئەوشتەی بۆلای خۆی کێش کرد.

حَجَنَ الدابَّةَ: بەگۆچان ولآغەکەی لاو نیوکرد.

حَجَنَ فلاناً عن الشَّيْءَ: فلآنکەسی لەوشتە گێڕایەوە نەیهێشت ئەنجامی بدا.

حَجِنَ حَجَناً وحُجْنَةً: نوشتایەوە خواربوو ٥ دەگوترێ: (حَجِنَ أنفه): سەری لووتی خواربۆوە بۆلای دەمی، لوتی شێوە قەلآنگی بوو.

حَجِنَتْ أذنه: نەرمەی لای سەروی گوێی بەرەو خوار شۆڕبووە.

حَجِنَ الشَّعْرُ: سەری تاڵە مووی قژەکانی گرژبوو هەڵگەڕانەوە.

حَجِنَ بالدار: لە ماڵ مایەوە دەرنەچوو.

حَجِنَ علیه وبه: دڵی پێوەبوو دەستی نەچوویە دەست بەرداری بێ ٥ (هەر

حَجِنَ، وأحْجَنَ وهي حَجِنةٌ وحجناء).

حَجُنَةُ: بەمانا (حَجِنَةُ) دێ.

إحْــتَجَنَ علیــه: دەس بەســەری کــرد، نەیهێشت.

إحْـتَجَنَ الشَّـيْئَ: بـەمانا (حَجَنَـهُ) دێ ە بۆلای خۆی برد بەخۆیەوە نوساند.

إحْــــتَجَنَ المـــالُ: مـــاڵو ســـامانەکەی کۆکردەوە.

إحْتَجَنَ مال غیره: ماڵی خەڵکی داگیرکرد، دزی، بۆ خۆی کۆنترۆڵ کرد.

تَحَجُّن: چەماندییەوە کردیە گۆچان.

الْحُجْنَةُ: هەموو شتێکی چەماوەو خوار ە ســــەلکە تەشــــی ە هــــەر شتێـــــك هەڵبژێری‌و تایبەتی بکەی بەخۆتەوە.

الْحَجَنَـةُ: روەکێــکی تەمــەن درێــژە لــە کەناری روبـارو قـەراخ پـرد دەروێ ە زۆر دەشوبهێتە قەفەزاز.

الْحَجُـونُ: تەمبــەڵ ە بتــەوێ ولاتێـــك داگیربکــــەی‌و بــــە فـــیێڵ‌و بـــۆ چەواشـەکاری رو لـە شوێنێـکی تـر بکــەی ە نـــاوی کێوێـــکیشە لـــە دەوروبەری مەککە.

الْمِحْجَــــنُ: هەرشتێـــــك سەرێـــکی چـــــەمابێتەوە وەکـــوو گۆچــــان‌و دەندوکی باڵندە ە دەشگوترێ (فـلان محجـــن مـــال) فـلان بـاش دەزانـــێ سەروکاری ماڵ‌و سامانی خـۆی بکا، (ك: محاجن)ە.

حَجَا حَجواً: راوەستا.

حَجَــا بالمکـــان: لـەو شـوێنە مایـەوەو جێگیربوو.

حَجَا بالشَّيْئِ: دەستی پێـوە گرت‌و چروکی تێداکرد لێی نەبەخشی.

حَجَا فلاناً كذا: گومانی بـە فلانکـەس بـرد کە ئەوەیە.

حَجَــا الشَّــيْئَ: شتەکەی پاراسـت‌و لـەخۆی گرت، دەستی پێوە گرت.

حَجَا فلاناً: فلانکەسی مەنع کرد.

حَجَــا الأمْــرَ: وا گومــانی بــردو ئیـدیعای ئەوەی کرد وەڵێ لێی یەقین نەبوو.

حَجَا بفلان خیراً: گومانی خێرو چاکەی لە فلان کرد پێی وابوو پیاوی چاکە.

حَجَــا الــریح الســفینة: بــا کەشـتییەکەی رۆیاند.

حَجَـا فلاناً: بـە بەڵـگە بەسەریدا زاڵ بـوو بۆری دا.

حَجِيَ بـە حجـاً: خۆشـی ویسـت‌و پێیـەوە نووساو لێی نەبووەوە.

حَجِيَ الیه: پەنای بۆ برد.

أحْجی بالشيئ: بەمانا (حَجی به) دێ.

حاجاه مُحاجاةً وحِجَاءً: دەمە دەمێی لەگەڵ کردو بە بەڵـگە بۆری دا.

احْتَجی: بەڵـگەی بیرهاتەوە.

احْتَجی الشَّيْئَ: شتەکەی پاراست.

تَحـــاجوا: هەریەکــە لــەلای خۆیـــەوە بەڵـــگەی هێنایـــەوە رای خـــۆی پـــێ پەسەند بوو.

تَحَجـيّ: لـە پەناگـەو مەلجـەئا مایـەوە خۆی دەرنەخست.

**تَحَجیّ بالمكان:** پێشكەوت چوو بۆ شوێنەكەو تێیدا مایەوە.
**تَحَجیّ بالشَّيئِ:** عاشقی شتەكە بوو وەگری بوو نەیویست لێی جیابێتەوە ○ دەستی پێوە گرتو نەیویست لە دەستی دەرچێ.
**تَحَجیّ فلان بظَنِّه:** گومانی بە شتێك بردو لێی یەقین نەبوو.
**تَحَجیّ للشيئ:** شتەكەی هاتەوە بیر.
**إستَحجی اللحمُ:** بۆنی گۆشتەكە گۆڕا بەهۆی كاریگەرییەكی دەرەكییەوە كە تووشی حەیوانەكە بوو.
**الأحْجُوَّة:** وشەیەك ماناكەی پێچەوانەی لە فزەكەی بێ، (ك: أحَاجی).
**الأحْجِيَةُ:** بەمانا (الأحجوة) دێ ○ لوغزو موعەممایەكە خەڵكی پێشبڕكێ دەكەن لە حەلكردنیدا.
**حجا:** شیاو بوو ○ دەگوترێ: (هو حجًا بـه) ئەو شیاوی ئەوشتەیە.
**الْحَجَـا:** پەناگەو مەلجەء ○ پەردە ○ تەپۆڵكەو هەر شوێنێك بەرزبێ‌و بەسەر زەوییەكە بڕوانێ ○ ئەملاو ئەولای شوێن ○ قەراخ.
**الحجا من الشَّيئَ:** قەراخی شت ○ لایەكی شتەكە، (ك: أحجاء).
**الحِجَـا:** پەردە ○ عەقڵ‌و ئاوەز، (ك: أحجاء).
**الحَجْوِي:** ناوە بۆ حاڵەتی دەمە دەمێ.
**الحُجَيَّا:** بەمانا (الأحجية) دێ.
**حَدَاهُ حَدْءاً:** لای دا، گێڕایەوە.
**حَدِيَ بالمكان حَدَءاً:** لەو شوێنە مایەوەو تێیدا جێگیربوو.
**حَدِيَ الی المكان:** پەنای بۆ ئەو شوێنە برد.
**حَدِيَ علیه:** بەردەوام بوو لەسەر پارمەتیدان‌و لەخۆگرتنی‌و بەخێوكردنی.
**حدِئت المرأة علی ولدها:** ئافرەتەكە بەردەوام بوو لەسەر بەخێوكردنی كۆرپەكەی.
**الحَدَأةُ:** پاچی دوو سەر ○ تیری كەوان (سەرەتیر).
**الحِدَأة:** واشە ○ باڵندەیەكی گورج‌و گۆڵە لە حەوارا پەلاماری جرج‌و مریشك‌و شتی وادەداو زۆر بە پڕتاوی دەیانگرێ ○ دەگوترێ: (هو أخطف من الحِدَأة).
**حَدِبَتِ الأرض حَدَباً:** هەندێ لە شتەكان بەرزبوونەوە.
**حَدَبَ الرجلُ:** پیاوەكە قەمبوور بوو.
**حَدَبَ علیه:** بەسەریدا كۆمایەوەو سۆزی خۆی بۆ نواند.
**حَدَبت المرأة علی ولدها:** ئافرەتەكە بەسەر منداڵەكەیەوە دانیشت‌و دوای مردنی مێردەكەی شوی نەكردەوە لەبەر خاتری بەردەوامبوونی نازی منداڵەكەی ○ (هو حَدِبٌ وهي حدِبَةٌ).
**أحْدَبَهُ اللهُ:** خودا پشت كوڕی كرد.
**حَدَّبَـه الله:** بەمانا (أحْدَبَـهُ) دێ.

**حَدَّب الرسامُ الخطَّ:** خۆشنووسەکە نووسینەکەی زۆر قوڵ نەکرد.
**تحادَبَ:** بەمانا (حَدَّبَ) دێ ٥ بە ئەنقەست پشتی خۆی کوڕ کرد.
**تَحَدَّب عليه:** بەمانا (حَدَب عليه) دێ.
**تَحَدَّبَتِ المرأة على ولدها:** بەمانا (حَدِبَتْ) دێ.
**احدودب:** بەمانا (حدب) دێ.
**الْأَحْدَبُ:** ناخۆش و ئاڵۆزو قورس: دەگوترێ: (امر أحدَبُ) کارێکە بەکەس ناکرێ و دەستەبەر نابێ ٥ رەگێکە لە ئێسقانی باسکدا هەیە.
**الْحَدَبُ:** ئەوەیە لە زەوی بەرزبێتەوە تەپۆڵکە ٥ تیلمە دەمارە گڵی پتەو، بانوێك بەسەر نزمایی دا بڕوانێ، قورئان دەفەرموێ: ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾ ٥ زێدە گۆشت و بەرزاییەکە لەپشت پەیدا دەبێ ٥ (حدب الماء) ئەو شەپۆلە ئاوانەن بەرزدەبنەوە.
**حدب الشتاء:** جەنگەی سەرمای زستان، (ك: أحدابٌ وحِدابٌ).
**الحَدْباء:** دەگوترێ: (دابة حدباءُ) ولاغێکە ئێسقانی پشتی دیارە ٥ (سنة حدباء) ساڵێکی قات و قڕییە ٥ (حالة حدباء) بارو دۆخێکی نالەبارە کەس لەخۆی دڵنیا نییە.
**الآلة الحدباء:** دارە مەیت ٥ کەعبی کوڕی زوهەیر دەڵێ:

**وكلّ ابن أنثى وإن طالت سلامَتُهُ**
**يوماً على آلة حَدباءَ مَحْمُولُ**

**الحَدَبَةُ:** تەپۆڵکەی رەقەڵان و پتەو ٥ ئەو بەرزاییانەی لە پشت دەردەکەون.
**حَدَثَ الشَّيْءُ حدوثاً وحداثةً:** تازە پەیدابوو (پێچەوانەی کۆن) ئەگەر وشەی (حدث) لەگەڵ وشەی (قَدُمَ) خرایە رستەوە ئەوە بۆ (مزاوجة)و بۆ گشتگیری دەگوترێ: ئوسلوبێکی بەلاغییە دەڵێی (أخذه ماقَدُم وحَدُث).
**حَدَثَ الأمرُ حدوثاً:** شتەکە رویدا روداوەکە هاتە کایەوە.
**احدث الرجلُ:** پیاوەکە بێ دەست نوێژبوو دەستنوێژەکەی شکا.
**أحدث الشَّيْءَ:** ئەوشتەی داهێنا ٥ دروستی کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾.
**أحْدَثَ السَّيْفَ:** شمشێرەکەی مشت و ماڵ کرد.
**حَادَثَهُ:** قسەی لەگەڵ کرد.
**حادث السيف ونحوه:** مشت و ماڵی کرد.
**حَادَثَ قَلْبَهُ بذكرالله:** دڵی خۆی راهێنا بەیادی خودا.
**حَدَّثَ:** قسەی کرد، هەواڵی دا، فەرمایشتی پێغەمبەری گێڕانەوە.
**حَدَّثَ بالنِّعْمَةِ:** سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی بوو باسی کردن.

**حَدَّثَ فلاناً الحديث وبه:** هەواڵەکەی بە فلان گەیاند، حەدیثەکەی بۆ ریوایەت کرد.

**تَحَدَّثَ:** خەڵکەکە قسەی کرد، قسەی بۆکرد.

**تَحادَثَ القومُ:** قسەیان بۆ یەکتر کرد ٥ کەوتنە گفتو گۆ.

**اسْتَحْدَثَهُ:** بەدی هێنا، هێنایە کایەوە ٥ بە حەدیثی دانا.

**الأَحْداثُ:** بارانی پەڵە، بارانی سەرەتای ساڵ.

**الأُحْدُوثَةُ:** ئەومیە بکەوێتە سەر زاری خەڵك ٥ دەگوترێ: (صار فلان أحدوثةً): فلانکەس بوبە چیرۆکی سەر زوبانی خەڵك ٥ قسەی نەستەق و گاڵتەو گەپ ٥ قسەی پڕو پوچ.

**الحادث:** ئەوەی تازە پەیدابێ و سەر هەڵبدا پێچەوانەی (القدیم)ە، (ك: حوادث).

**الحادثة:** مێینەی (الحادث)ە ٥ بەڵاو کارەسات، (ك: حوادث)ە.

**الحداثَةَ:** ساڵانی گەنجی ٥ سەرەتاو هەوەڵ ٥ دەگوترێ: (أخذ الأمر بحداثته) لەسەرەتاوە کارەکەی خستە ئەستۆی خۆی.

**الحَدَثُ:** تەمەن پچوك ئەوەی تەمەنی لە خوار هەژدە ساڵەوە بێ ٥ کاری تازە پەیدابوو ٥ ئیشی خراپ کەلای خەڵك قێزەون بێ ٥ لەش پیسییەکی مەعنەوی کە بە دەستنوێژگرتن و غوسڵکردن تەیەموم کردن نامێنێ.

**حَدَثُ الدهر:** بەڵاو کارەساتی رۆژگار، (ك: أحداث)ە.

**الحِدْثُ:** ئەو کەسەیە زۆر قسەبکاو جوان شست رون بکاتەوە ٥ دەگوترێ: (فلان حِدْث فلان) فلانکەس وتەبێژی فلانە بە ناوی ئەوەوە قسە دەکا ٥ (حِدْث نساء) بە ناوی ژنانەوە قسە دەکا داکۆکییان لێ دەکا (حِدْثُ ملوك) وتەبێژی پاشایانە.

**الْحَدَثان:** شەوو رۆژ.

**حَدَثان الدهر:** بەڵاو کارەساتی رۆژگار.

**الحِدثان:** سەرەتا دەگوترێ: (حِدْثان الشباب) سەرەتای گەنجییەتی.

**الحِدیث:** زۆر بڵێ ٥ کەسێك زۆری حەدیث ریوایەت کردبن.

**الحَدیث:** هەر قسەو باسێك بگێردرێتەوەو بگوترێ: دەڵێن: (الحدیث ذو شجون) قسەیەکە کەسانی تری پێ ئاگادار دەکرێتەوە ٥ هەروا ناوە بۆ گفتارو کردارو هەڵوێستی پێغەمبەر (د.خ) ٥ بەمانا تازە بابەت دێ دەگوترێ: (هو حدیث عهد بکذا) ئەو لەو بارەوە تازەیەو لێی شارەزانییە.

علم الحديث: زانیاری‌و زانستێکە لەبارەی گوفتارو کردارو هەڵوێستەکانی پێغەمبەر (د.خ) لە ژیانیدا چۆنیەتی ریوایەت کردنیان‌و حاڵ‌و وەزعی ئەوانەی حەدیثەکەیان ریوایەت کردووەو ئەندازەی راستی‌و دروستی وەپاڵدانی ئەو حەدیثانە بۆ پێغەمبەر (د.خ)و گەلێ لایەنی تر.

اَلْمُحْدَثُ: شتێکە نەلە قورئان‌و نەلە حەدیثدا نەبە ئیجماع باسی کرابێ، (ك: محدثات) دەگوترێ: (مُحْدَثَاتُ الأمور).

اَلْمُحْدِثُ: تازە گەریکەر لە فەن‌و زانستدا.

اَلْمُحْدَثون: زاناو رۆشنبیرەکانی دوا سەدەکانی ناوەراست.

اَلْمُحَدِّثُ: ئەو راویانەی حەدیثی پێغەمبەریان ریوایەت کردوە.

اَلْمُحَدَّثُ: ئەوەی گومانی راست‌و دروست بە خەڵك بەرێ.

حَدَجَهُ حَدْجاً: کاڵەکە مارانەی تێگرت.

حَدَجَ فلاناً بِسَهْمٍ ونحوه: تیری تێگرت.

حَدَجَ ببصره: چاوی تێ بری سەرنجی خۆی خستە سەر، لە حەدیثی ئیبنو مەسعوددا هاتووە دەفەرموێ: (حَدِّث الناسَ ما حَدَجوك بأبصارهم) هەروا بەمانای تێروانینی سوکایەتی پێکردن‌و رق لێبوونەوە سەیری کرد.

حَدَجَهُ بذنبِ غيره: تاوانی خەڵکی تری وەپاڵدا.

حَدَجَ البعيرَ: بارەکەی لە پشتی حوشترەکە بارکردو شەتەکی دا.

حَدَجَ فلاناً ببيع سوء أو متاع سوء: فلانکەسی تووشی زیان کرد بەوە کە مامەڵەی خراپی لەگەڵیدا کرد یان کاڵای خراپی دایە.

احدجت شجرة الْحَنْظَلِ: درەختی گوژاڵك کاڵەکە مارانەکانی خۆی دەرکردن.

اَحْدَجَ البعيرَ: باری لە حوشترەکە بارکردو شەتەکی دا.

حَدَجَ ببصره: نیگای خستە سەرو چاوی تێبرین.

حَدَجَ الشيءَ: چاوی لە شتەکە بری‌و زۆری سەیر کرد.

الحِدْجُ: بار، هەر شتێك بە ولاخ بگوێزرێتەوە ٥ هەروا ناوە بۆ کەژاوەو بارگەنەی ئافرەتەکە، (ك: حدوج وحُدُج)ە.

الحُدْجُ: کاڵەکە مارانە ٥ کاڵەکی وردی نەگەیشتو (زرکە تاڵ).

اَلْحَدَجُ: بەمانا (الحُدْجُ) دێ ٥ هەروا ناوە بۆ باڵندەیەك لەشێوەی (قەتێ) دایە.

أبو حُدَيج: لەقلەق.

المِحْدَجُ: ئامێری داخکردنی حوشتر.

حَدَّ السيف ونحوه حِدَّةً: شمشێرەکە برندە بوو.

حَدَّت الرائحة: بۆنەکە زۆر کەسکون بوو.

حَدَّ الرجلُ: پیاوەکە زۆر بە نیشات بوو دڵی قایمو خۆراگر بوو.
حَدَّ علی غیرہ: رقی هەڵساو قسەی رەقی بەکابرا گوت.
حَـدَّ في معاملاتـه: لـه مامەڵـەو هـەڵسو کەوتیدا زۆر بەلای خۆیدا داتاشی.
حَدَّت المرأة علی زوجها حداداً: ژنەکە بۆ مردنی مێردەکەی خۆی رەشپۆش کردو وازی لـه خۆڕازاندنـەوەو خـۆ ئارایشدان هەڵگرت.
حَدَّ السیفَ حداً: شمشێرەکەی مشتو ماڵ کرد.
حَـدَّ بصـره الیـه: بـه سـەرنجەوە سـەیری کرد.
حَدَّ الأرض: سنوری بۆ زەوییەکە دانا لـه پارچەکانی تر جیای کردەوە.
حَدَّ الشَّیءَ من غیره: شتەکەی جیاکردەوە له شتەکانی تر هەڵی هاوارد.
حَدَّ فلاناً عن الأمر: فلاّنکەسی لەوکارە لادا.
حَـدَّ الجـانیَ: حـەددی شـەرعی بەسـەر تاوانکاردا چەسپاند ٥ سزای شەرعی له تاوانکار ستاند.
حُدَّ فلان حَدّاً: لـه رزقو رۆزی فلاّنکەسی کەمکردەوە.
أحَـدَّت المـرأةُ: ئافرەتەکـە خـۆی بـۆ مردنـی مێردەکـەی لـەخم گـرت ٥ خۆی رەشپۆش کرد.
أحَدَّت السَّیفَ والسکین: شمشێرەکە یان چەقۆکەی تیژکرد.
أحَدَّ بصره الیـه: چاوی تـێ بـڕی زۆری سەیرکرد.
حـــادَّت الأرض الأرض: ئـەو پارچـه زەوییـه هـاو سنووری فلاّن پارچـه زەوییه.
حـاد فـلان فلانـاً: فلاّنکـەس بووبـه جیرانی فلاّنکەس ٥ رقی لێ هەڵساو لێی یاخی بوو، قورئان دەفەرموێ: ﴿أَلَـمْ یَعْلَمُـوا أَنَّـهُ مَـن یُحَـادِدِ اللّـهَ وَرَسُـولَهُ فَـأَنَّ لَـهُ نَـارَ جَهَـنَّمَ خَالِـدًا فِیهَا﴾.
حَـدَّدَ علـی الشَّیْئَ: سـنووری لەسـەر شتەکە دانا.
حَدَّدَ علی فلان: فلاّنکەسی مـەنع کـرد لـەوەی بـە ویستی خـۆی کاروبـاری خۆی بەڕێوەبەرێ.
حَدَّدَ الیه وله: قەصدی کرد.
حَدَّدَ السَّیْفَ ونحوه: تیژی کرد.
حَـدَّدَ الشَّیْئَ: شـتەکەی دیـاری کـرد ٥ دەگـوترێ: (حـــدّد زمـــن المقابلـــة ومکانهـا) کـاتی چـاو پێـکەوتنەکەو شوێنەکەی دیاری کرد.
حَـدَّدَ السـلطانُ اقامــة فـلان: پاشـا مانـــەوەی فـــلاّنو شـــوێنی لێ مانەوەکەی دیاری کرد.
حَـدَّدَ معنـی اللفـظ أو العبـارة: مانـای وشەو رستەکانی شی کردەوە.
احْتَدَّ: بەمانا (حَدّ) دێ.
تحـادّوا: هەندێـک لەوانـه بـوون بـه جیرانی هەندێک له ئەوان.

تَحَدَّدَ: دیاری کرد.
استَحَدَّ: کێردەکەی تیژکرد ٥ بە تیغی تیژ سەرو ریشی تاشی.
حُدادُكَ أن تفْعَلَ كذا: هەموو توانـاو هێزی تۆ ئەوە بوو ئەوە بکەی.
الْحِدادُ: بەرگی تازیەو کۆتەڵ ٥ رەشپۆشی.
الحِدادَةُ: ئاسنگەری‌و پیشەی ئاسنگەری کردن.
الحَدُّ: پەردەو نێوان لە نێوان دوو شتدا.
الْحَدُّ من كل شيء: لە هەر شتێك لاتیژەکەی، کۆتایی ئەم سەرەو سەری شت ٥ دەگوترێ: (وضع حداً للأمر) سنورێکی بۆ شتەکە دانا.
الْحَدُّ من كل شيء حدته: لەهەر شتێك تیژاییەکەی.
الْحَدُّ من الخمر والشراب: هەڵچونی شەراب.
حدّ الرجل: زەبرو زەنگی پیاو، مەردایەتی لە بەهانا چوونی لێ قەوماوان ٥ لە زاراوەی شەرعدا سزایەکی دیاریکراوە پێویستە لە تاوانکار بسەنرێ ٥ هەروا وشەی (الحدّ) لە زاراوەی مەنطیقیەکان دا بریتییە لە پێناسەی شت ٥ رستەیەکە قسەیەکە ئامازە بکا بۆ خودی شتەکەو جەوهەرو کاکڵەکەی دەربخا، (ك: حُدُودَ)ە.
حدود الله: ئەوەیە خودا بە فەرمان‌و نەهیەکانی سنورداری کردبن.

الحَدَدُ: یاساغ ٥ دەگوترێ: (أمر حَدَدٌ) شتێکە نەگونجاوو پوچ‌و یاساغە ٥ یان بەمانا (چارنیە) دەگوترێ: (مالی عن هذا الأمر حَدَدٌ) لە کردنی ئەم کارەدا ناچارم بەدەست خۆم نیە هەر دەبێ بیکەم.
الحداد: ئاسنگەر؛ ئاسن گەرم دەکاو بە چەکوچ دەیکوتێ بۆئەوەی شتێکی لێ دروست بکا بە ویستی خۆی ٥ هەروا بەمانا ئاسن فرۆشیش دێ ٥ کاربەدەستی بەندیخانە.
الحِدَّةُ: رق هەڵسان‌و دەمار گیری ٥ دەگوترێ: (أخذته حِدَّة الغضب) رقی هەڵساو تورە بوو، هەروا دەگوترێ: (هو معروف بحدة التفكير) ئەو پیاوە بە بیرتیژو بیر قوڵ‌و سیاسی‌و لێزان بەناوبانگە.
الْحَدِيدُ: ئاسن، عونصورێکی فلزییە موغناتیس کێشی دەکا ٥ ژەنگ دەگرێ، ئاسنی نەرم‌و ئاسنی زۆر رەق هەیە، (ك: حدائد)ە دەگوترێ: (فلان حديد فلان) فلانکەس جیرانی فلانکەسە هەرکاتێ خانوویان بە تەنیشت یەکترەوە هەبوو یان زەوی‌و ملك‌و ماڵیان لە پەنایەکەوە هەبوو ٥ دەگوترێ: (داری حديدة دارك) ماڵم جیرانی ماڵی تۆیە.
المحدود: بێ بەخت‌و کەم شانس ٥ دەگوترێ: (تفكيره محدود) بیرو بۆچوونی تەسك‌و کەم مەودایە.

حَدَرَ الشَّيْءُ حَدْراً: شتەکە پڕبوو ئەستوور بوو ٥ دەگوترێ:
حَـدَرَ الرجـلُ: پیاوەکـە قەڵەو بـوو خـۆی دارشتو تێك سمرا.
حَدَرَ جلده: پێستی ئاوساو ئەستوور بوو.
حَدَرَت العينُ: چاوەکە ئەستوور بوو زەق بوو.
حَـدَرَ الشَّـيْءَ حُـدوراً: لـە بەرزاییـەوە شتەکەی هێنایە نزمایی.
حَدَرَ الحجرَ: بەردەکەی جوڵاندو خولاندی.
حَـدَرَت العـينُ الـدمعَ وبالـدمع: چـاو فرمێسکی باراند.
حَدَرَ اللثامَ عن فمِهِ: ئەوشتەی دەمو چاوی خۆی پێ داپۆشیبوو لایدا.
حَـدَرَ الـدواءُ الـبطنَ: دەرمانەکـە کـاری لـە گەدەی کرد سکی چواند.
حَدَرَ السفينةَ: کەشتییەکەی لەسەرچاوەی روبارەکـەوە پـاڵ پێونـا بـەرەو خواری روبار.
حَدَرَ السفينة في الماء: کەشتییەکەی خستە ناو ئاوەکەوە.
حَـدَرَ الـوبَ: درێـژی قوماشـەکەی کـەم کـردەوە بـەوە کـە قەراخەکـەی هەڵپێچا.
حَـدَرَ القـراءةَ والاقامـةَ: پەلـەی کـرد لـە خوێندنەوەو بانگدان وقامەت کردندا.
حَـدِرَت العـينُ حَـدَراً: چاوەکە خێـل بـوو دەگـوترێ: (حَدِرَ الرجلُ) (هـو احـدَرُ وهي حدراءُ).

أَحْدَرَ: بەمانا (حَدَرَ) دێ.
إِنْحَدَرَ: دابەزی داکەوت.
تَحادَرَ: بەربۆوە، دابەزی.
تَحَدَّرَ الشَّيْءُ: شتەکە بەرەو پیری هات.
الأُحْدُورُ: ئەو شوێنەیە شتی لێـوە دێتـە خوار.
الْحَادِرُ: رەوشت جوان، جەستە رێـك‌و پێـــك‌و گۆشـــتن‌و دامـــەزراو ٥ دەگـوترێ: (غـلام حـادِر) لاوێـکی رەوشت بەرزە ٥ بـەمانا بـەرزو بڵنـد دێ دەگـوترێ: (جبل حادر) کێوێـکی بەرزە.
الحادرة: مێینەی (الحادر)ە.
الحادور: بەمانا (الأحدور) دێ ٥ گوارە لە گوێـدا ٥ دەرمانێـك سـکی پـێ بچـێ، قەبز رەوان بکا.
الحَـدْرُ: تەپۆلکـەی پتـەو لەسـەر زەوی ٥ بـــەمانا (گـــورج‌و بەپەلـــە)ش دێ دەگـوترێ: (رجـل حَـدْر) پیاوێـکی گورج‌و گۆڵ بەپەلەیە.
الحَدَرُ: چاڵ‌و چوێڵی ناو زەوی.
الحدراء: بەمانا (الأُحْدور) دێ.
الحَدْرَةُ: زیپکەو کوان کەلە پێڵوی چاو دەربێ‌و چاو بهاوسێ.
الحُـدُورُ: شـوێنی چـاڵ ٥ ئەنـدازەی ئـەو ئاوەی لە بەرزاییەوە هەڵ دەڕژێ.
المُنْحَدِرُ: بەمانا (الأُحدُورُ) دێ.
حَدْرَجَ الشَّيْءَ: شتەکەی خولاندەوە ٥ لوسی کرد سفت‌و سۆڵی کرد.

حَـدَرَجَ الحبـلَ: گوریسـەکەی بـاداو گشـتی کرد، پتەوی کرد.

الحَـدْرَجُ: پچـوك ٥ کـەس ٥ دەگـوترێ: (مابالـدار مـن حَـدْرَجٍ) کـەس لـە خانووەکەدا نییە.

الحُدْرُجُ: سفتو لوس.

الحُدروجُ: بەمانا (الحُدْرُجُ) دێ.

المُحَدْرَجُ: قامچی، دارو شورکی فەلاقە کردن.

حَـدَسَ في الأرض حَدْساً: بـە نەشارەزایی بە زەوییەکەدا رۆیی.

حَـدَسَ في السير: بـە گـورجی رۆیـی زۆر قورتو پێچی کردن.

حَـدَسَ في الأمـر ونحـوه: گومـانی بـردو مەزندەی کرد.

حَدَسَ الشَّيءَ: شتەکەی مەزندە کرد.

حَـدَسَ علـى فـلان ظَنَّـهُ: ناواتەکـەی لـە فلانکەسدا نەهاتە دی.

حَدَسَ الكـلام علـى عواهنـه: قسەکانی کـردن بەبێ ئەوەی بزانێ ئاخۆ راستن یان نا.

حَـدَسَ الشَّـيْءَ برجلـه: شـتەی ژێرپـێ داو بەسەریدا رۆیی.

حَدَسَ فلاناً بسهم ونحوه: تیری لە فلانکەس گرت.

حَدَسَ الناقَـةَ وبهـا: حوشـترەکەی پـیخ دا ٥ پخـی داو کێـردی لـە گـەردنی نـاو سەری بڕی.

حَـدَسَ الشـاة: مەڕەکـەی پـاڵ خسـت بـۆ سەربڕین ٥ سەری بڕی.

حَـدَسَ الرجـل: پیاوەکـەی بـە زەویدا دا ٥ دەگـوترێ: (حـدس بـە الأرض) بـە زەوی کێشا.

تَحَدَّسَ الأخبارَ ونحوها: هەواڵەکانی جوان گێڕانەوە.

الحَـدْسُ: دەرك کردنـی بەدەرکردنێـکی راستەوخۆ.

الحدسية: رێبازێکە دەڵێ دەبێ زانیـاری بـە شـێوەیەکی راسـتەوخۆو بـە هەستەکان دەستەبەر بکرێ.

حَدَقَ المريضُ ونحـوه حَـدُوقاً: نەخۆشـەکە چـاوی کردنـەوە ورد ورد پێـی روانـینو چـاوی بـەدەوری خۆیـدا گێڕا.

حَدَقَ بە: دەورەی دا چوارلای لێ گرت.

حَدَقَ فلاناً حَدْقاً: رەشایی هەنگاوت.

حَـدَقَ الشَّـيْءَ بعينـه: بەچـاو تێبڕینـەوە تەماشای ئەو شتەی کرد.

حَدَقَ اليه: بـە سـەرنجەوە بۆلای شتەکەی روانی.

أحـدقت الأرض: زەوی هـەمووی بـوو بـە باخو باخات.

أحْـدَقَ بـه: بـەمانا (حَـدَقَ) دێ ٥ واتـە دەورەی دا.

حَدَّقَ به: بەمانا (حَدَقَ) دێ.

حَـدَّقَ اليـه: زۆری تـێ روانـیو بـەوردی سەیری کرد.

الْحَدَقَـةُ: رەشـێنەی چـاو، (ك: حَـدَقٌ وحداقٌ)ە ٥ دەگوترێ: (هو مـن رمـاة

الحدق) به كەسێك دەڵێن لێزان‌و دەست ڕەنگین بێ له بەرێوه بردنی ئیش‌و كاردا ٥ هەروا دەگوترێ: (تكلمت على حَدَق القوم) واته: قسەم بۆ خەڵكەكه كرد هەموو چاویان تێ بڕیبووم.

الحديقة: باخ ٥ هەر زەوییەك درەختی بەردار یا دارخورمای تێدابێ‌و پەرژینی بۆ كرابێ.

حَدِلَ حدلاً: له ڕێگای راست لای دا، ستەمی نواند ٥ دەگوترێ: (حَدِلَ عليه): ستەمی لێكردو دوژمنایەتی نواند ٥ لاسەنگ ڕۆیی ٥ به سروشت ملی خواربوو یان بەهۆی ئێش‌و ئازارەوه ملی خوار كردبوو ٥ دەگوترێ: (هو أحدل وهي حدلاء).

حَادَلَهُ: چاوو راوی لێكرد هەڵی فریواند.

حادل الرامي: تفەنگ هاوێژەكه بەسەر تفەنگەكەیدا چۆمایەوه.

حادل في مشيته: له ڕۆیشتندا خۆی بادا.

الأحدل: یەك دەست ٥ یەك گون.

الحَدَلُ: نا عادیل، حوكم ناڕەوا، ستەمكار.

الحدَلُ: ئازارێكه له ملدا پەیدا دەبێ.

حَدَمَه حَدْماً: به ئاگر گەرمی كرد، یان به گەرمی خۆر گەرمی كرد.

حَدَمَ الدم: خوێنەكەی زۆر سور كرد تا بەلای رەشیدا روانی.

حَدِمَت النار حَدَماً وحَدَمَةً: ئاگرەكه هەڵگیرساو بڵێسەی سەند.

أحْدَمت النار والحرارة: بەمانا (حدمت) دێ.

أحْدَمَ فلاناً: رقی فلانكەسی هەڵساندو تووڕەی كرد.

احتدمت الحرارة والنار ونحوهما: گەرما یان ئاگرەكه پەرەی سەند.

تَحَدَّم: سوتا.

الْحَدَمَةُ: دەنگی هەڵگیرسانی ئاگر (قرچه قرچی لرفه لرفی).

حَدَا الابلَ وبها حُدءًا: حوشترەكەی لێ خوڕی حودیەی بۆ گوت بۆئەوەی باش بڕوا.

حدا فلاناً على كذا: فلانكەسی نارد بۆسەر فلان....

حَدَا الشَّيْءَ حَدْواً: شوێن ئەوشته كەوت ٥ بەمانا هەرگێزاو هەرگیزیش هاتووه ٥ دەڵێ (ما أفعل ذلك ماحدا الليل والنهار) هەروا بەمانا لێكۆڵینەوەو توێژینەوه له شت هاتووه.

احتدى الشَّيْءَ: بەمانا (حداه) دێ.

تحدّى الشَّيْءَ: شوێن ئەوشته كەوت.

تحدى فلاناً: داوای بەرامبەری‌و پێشبڕكێی لەگەڵ داكرد ٥ ڕەدی دایەوه تەحەدای كرد.

الأحْدُوَّةُ، والأُحْدِيَةُ: گۆرانییەكه بۆ حوشتر دەگوترێ: بۆئەوەی باش بڕوا، (ك: أحادي).

الحادي: ئەو كەسەیه به گۆرانی گوتن حوشتر لێ دەخوڕێ، (ك: حداةُ)ه.

حادي النجم: ناوه بۆ پێنج ئەستێره یان بە ئەستێرەیەك دەگوترێ: دەكەوێتە نێوان ئەستێرەی ثورەییاو جەوزاء.

الحداءُ: حودیه ٥ گۆرانییەكە بۆ حوشتر دەگوترێ.

الحَدَى: هەتا هەتایە، هەرگیزاو هەرگیز.

الحَدْواءُ: بای شەماڵ، چونكە ئەویش هەور لێ دەخورێ.

الحُدَيّا: كێشەو نیزاع ٥ تاقە بەرامبەرو هاوشان.

حَذَّه حَذّاً: خێرا بڕییەوه.

حَذَّ الشَّيْءُ حَذَذاً: شتەكە دوایی هات دوا بڕاو بوو.

حَذَّ في سيره، حَذَّ في كلامه، حَذَّ في عمله: لە رۆیشتندا لە قسە كردندا لە ئیش كردندا گورجو گۆڵ بوو.

الأَحَذُّ: سفتو لوس بەجۆرێك هیچی پێوه نەنووسێ ٥ دەگوترێ: (سیف أَحَذُّ) شمشێری بڕندەو خێرا بڕ ٥ (أمر أحَذّ) دڵێكی زیرەكو هەستو بیر تیژ (فلان أَحَذُّ) فلانكەس بێ خێرەو هیچی لەدەست هەڵنایە ٥ یان هەژارو دڵنەرمە.

أَلْحَذّاءُ: (رحِمُ حَذّاء) خزمایەتی دابڕاو ٥ (عزيمة حَذّاء) سوور بوون لەسەر ئەنجامدانی كار ٥ (قصيدة حَذّاء) چامە شیعرێكە لەبەر باشیو رەوانیی زوو بەناو ولات دا بڵاودەبێتەوه ٥ (حاجة حَذّاء) كارێكە زوو ئەنجام دەدرێ.

الْحَذَذُ: بەلای زانایانی عوروزەوه كەوتنی وه تەدە لە بەحری كامل ٥ دەبێتە (مفاعلن مَعِلن).

الحُذَّةُ: پارچە (كوت) دەگوترێ: (أعطاه حُذَّةً من اللحم) ٥ كوتە گۆشتێكی پێدا.

حَذِرَ حَذَراً: بەخەبەر بوو خۆی ئامادە كرد.

حَذِرَ الشَّيْءَ ومنه: لێی ترساو خۆ پارێزی لێكرد.

حاذَرَهُ محاذرةً وحِذاراً: هەریەك لەو دوانە یەكتریان ترساندو لەیەك ترسان.

حَذَّره الشَّيْءَ ومنه: لەو شتە ترساندی ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ﴾.

الحاذورة: كەسێك زۆر حەزەری هەبێو شت لێك بداتەوه.

حَذارِ: (اسم الفعل)ە بەمانا فیعلی ئەمره واتە: بترسە.

الْحَذَرُ: دەگوترێ: (حَذَرَكَ زيداً) واتە لە زەید بترسە ٥ قورسایی و گرێیەكە لە چاودا پەیدا دەبێ بەهۆی زەختێك كە رێی دەكەوێ ٥ هەروا بەمانا حەزمو وره بەرزی دێ ٥ دەگوترێ: (لابْنُ حَذِر وأحذارِ) كوڕێكی خاوەن حەزمو خۆپارێزییە.

الْحَذُرُ: كەسێك زۆر شت لێك بداتەوەو بترسێ.

**الحِذْرِيَّةُ**: (حِذْرِيَّة الديك) پەڕی ملی کەڵەشێر، (ك: حَذارى وحَذّار)ە.

**الحَذيرُ**: ترسێنەر دەگوترێ: (أنا حذيرك منه) من ترسێنەری تۆم لەو شتە.

**المحذور**: شتێك خۆی لێ دەپارێزرێ قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا﴾.

**المَحْذورَةُ**: خودی ترسانو ترسەکە ٥ بەلاو کارەسات ٥ هاوارو دەنگی ترسێنەر، ئەسپ سواری هێرش بەر.

**حَذَفَ الشَّيْءَ حَذْفاً**: لەلایەکەوە قرتاندی لێی قرتاند ٥ دەگوترێ: (حَذَف الحجام الشَّعْرَ): کەڵەشاخ گرەکە مووەکانی هەڵپاچین.

**حَذَفَ بالعصا ونحوه**: بەگۆچان لێیدا دار عەصاکەی تێگرت.

**حَذَفَهُ بجائزة**: بەخششی پێدا بۆئەوەی خۆشەویستی خزمایەتی لە نێوانیاندا بەهێز ببێ.

**حَذَّفَ الشَّيْءَ**: شتەکەی رێك خست راستەو پاستەی کرد ٥ دەگوترێ: (حَذَّفَ الحجام الشَّعر) کەڵەشاخ گرەکە مووەکانی رێك خستن.

**حَذَّفَ الخطيبُ الكلامَ**: وتاربێژەکە قسەکانی رێك خستنو جوان رازاندنیەوە.

**احْتَذَفَ الثَّوبَ ونحوه**: هەندێکی لە قوماشەکە بڕی.

**الحُذافَةُ**: ئەوشتەی ببڕدرێو فڕێ بدرێ ٥ شتی کەم ٥ دەگوترێ: (في رحله حُذافة) لە بارەکەی کەمێ لە خواردەمەنی هەیە.

**الحَذَفُ**: مەرو ماڵاتێکی رەشی روتو بێ توکە قەبارە پچوکو بێ کلكو گوێچکەن ٥ جۆرێکن لە مراوی پچوك ٥ گەلاو پرژی روەك.

**الحَذْفاءُ**: گوێی پچوك کەئەوەندە پچوك بێ بە ئاستەم دیاربێ.

**الحِذْفَةُ**: پارچەیەکی بڕدراو لە قوماشو شتی وەها.

**المَحْذوفُ من الزقاق**: کوندەو مەشکەی هەنگڵ بڕاو ٥ لەزاراوەی زانا عوروزییەکاندا بەوو بەشە کرتاوە دەگوترێ: کە لەکۆتایی سەبەبی خەفیف دەقرتێندرێ.

**حَذْفَرَهُ حذفرةً وحذفاراً**: شتەکەی پڕکرد.

**الحذفار والحُذْفُورُ**: لایەنو شوێن ٥ ناوچە، (ك: حذافير)ە دەگوترێ: (أخذ الشيئ بحذافيره) شتەکەی بەتەواوی وەرگرت هیچی نەهێشتەوە ٥ هەموو لایەنو ئەملاو ئەولای هەڵگرت.

**حَذَقَ الخلُ ونحوه حُذوقاً**: سرکەکە زۆر مزربوو گەستی.

**حَذَقَ الخلُّ ونحوه اللسانَ**: سرکەکە زمانی بەست بە مزرایەتیەکەی.

**حَذَقَ فلان الشَّيْءَ حِذقاً**: فلانکەس شتەکەی بڕیەوە.

**حَذَقَ العمل وفيه**: لە کارەکەدا کارەمابوو باش چووە ناو ئیشەکەوەو تێیدا دەست

رەنگین بوو دەگوترێ: (هو حاذق).

أَحْذَقَهُ: وای لێکرد کارامـا بـێ لێـزان‌و دەست رەنگین بێ.

إِنْحَذَقَ: دابڕا، بڕایەوە.

تَحَذَّقَ: بـوو بـە کارامـا ٥ لافـی لێزانـی‌و کارامایی لێدا.

الحُـذاقِيّ: کێـردی تیـژکراوی بڕنـدە ٥ دەگوترێ: (رجـل حـذاقی) پیاوێـکی قسەزان‌و بەڵگە دروستە ٥ قسەکانی وەکوو دوخ ڕاستن ٥ شتی زۆر مزرو ترش.

حذِلَتْ عَيْنُهُ حَذَلاً: چاوەکانی لەبەر زۆر گریـان سـوور بـوون ٥ برژانگـەکانی بـەهۆی زیپکـەو پرووشـەوە کـە لـە پێڵۆی چاوەکان هاتوون هەڵوەرین ٥ (هي حَذِلَة وحَذْلاء).

أحْذَلَ البكاءُ أو الحرُّ العَيْنَ: بە گریان یـان گـــەرمایی، برژانگـــی چـــاوەکانی هەڵوەرین.

الحُـذالُ: صەمغێـکی سـورە لـە درەختـی سـەموور دێتـە دەرەوە عـەرەب پێـی دەڵێن (حیض السَّمُر).

الحِذْلُ: ئەصڵ، بناغـە، دۆخێنـی دەرپـێ ٥ دامێنی دەرپـێ‌و کـراس ٥ دەگـوترێ: (هـو في حـذل أمـه) ئـەو لـە باوەشـی دایکیدایە.

حَذْلَقَ: زیاد لە توانای خۆی لافی لێدا ٥ لافـی لێزانـی‌و عـاقڵ مەنـدی لێـداو واش نەبوو.

تَحَذْلَقَ: بەمانا (حَذْلَقَ) دێ ٥ دەگـوترێ: (هـو يتحـذلق في كلامـه) بـە قسەی خـۆی هیچـی نەهێشـتۆتەوە لافـی لێزانی‌و کارامایی لێدەدا.

الْحِـذْلِقُ مـن الرجـال: پیـاوی زۆر بلـێ‌و سەر ڕەق.

الْحَذْلَقَةُ: چاو گێڕان.

حَـذْلَمَ: پەلـەی کـرد دەتگـوت قلّمبـاز دەهاوێ.

تَحَذْلَمَ: بەمانا (حَذْلَمَ) دێ.

الحـذلوم: پیـاوی قاڵـب سـووکی گـورج‌و گۆڵ.

حَـذَمَ في كـذا حـذماً وحَـذَماناً: پەلـەی کـرد دەگـوترێ: (حَـذَمَ في مشـيه، حَـذَمَ في قراءته وحذم في طيرانه) پەلـەی کـرد لـە ڕۆیشـتنیدا لـە خوێندنەوەیـدا لـە فڕینـدا ٥ ئیمـامی عومـەر دەفـەرموێ: (إذا أذنت فَتَرَسَّلْ وإذا أقمْتَ فاحْذِم) کە بانگـت دا وشـەکان لەسـەرەخۆ بلـێ‌و درێـژیان بکـەرەوە ٥ کـە قامـەتت کـرد خێرا خێرا وشەکان بلێ‌و پەلەبکە.

حَذَمَ الشَّيْءَ حَـذْماً: شتەکەی بەخێرایی کـەرت کردو بڕیەوە ٥ (هو حاذم وحذيم).

الحَـذِمُ: بڕنـدەو تیـژ ٥ دەگـوترێ: (سـيف حاذم) شمشێرێـکی بڕندەیە.

الحُـذَمُ: کەروێشـکی گـورج‌و گـۆڵ ٥ دزی کاراما.

الْحُذمُ: کورتە باڵای هەنگاو کورت.

الحِذِيمُ من السيوف: بڕندەو تیـژ ٥ (ومـن الرجال) کاراماو لێزان.

الْحُذْمُور: هەموو ◦ دەگوترێ: (أخذ الشَّيْءَ بحذموره وبحذاميره) هەموو شتەکەی هەڵگرت هیچی نەهێشتەوە.

الْحُذُن: ناوقەدی کراس، شوێنی بەستنی پشتێن لە ناوقەدی کراس.

الْحُذُلَةُ من الرجال: کورتە باڵاو گوێ بچوك.

حَذا النَّعْلَ حَذْواً: ئەندازەی نەعلەکەی گرت و لەسەر شێوەی ئەو نەعلەی تری تاشی، بڕی.

حَذا فلان حذو فلان: فلان شوێن پێی فلانی هەڵگرت ئەوچی کرد ئەویش کردی.

حَذا لفلان نعلاً: نەعلێکی بۆ فلانکەس دروست کرد.

حَذا فلاناً شَيْئاً: شتێکی دا بە فلانکەس.

حَذا الجِلْدَ ونحوه حَذْياً: پێستەکەی بڕی هەڵی دڕی.

حَذا الشرابُ لسَانَهُ: شەرابەکە زوبانی تفت کرد.

حَذا فلاناً بلسانه: بە زوبان ڕەخنەی لە فلان گرت.

أحذاهُ: پێی بەخشی ◦ لە حەدیث دا هاتووە: (مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ مَثَلُ الدّارِيِّ إِنْ لَمْ يُحْذِكَ مِنْ عِطْرِهِ عَلِقَ بِكَ مِنْ رِيحِهِ).

أَحْذاهُ طَعْنَةً: زەبرێکی کوشندەی لێدا.

حاذاه محاذاةً وحِذاءً: کەوتە بەرامبەری و ڕوبەڕوی.

احْتَذى: پێڵاوی کردن.

احْتَذى الحِذاءَ: پێڵاوی لەپێ کردن.

احْتَذى مثال فلان أو على مثاله: لەسەر شێوەی ئەو هەڵس و کەوتی کرد.

تحاذى القومُ الشَّيْءَ: قەومەکە شتەکەیان دابەش کرد.

اسْتَحْذاهُ: داوای پێڵاوی لێکرد، داوای بەخشش و پاداشی لێکرد ◦ دەگوترێ: (اسْتَحْذَيْتُهُ فحذاني).

الحاذي: پێڵاو لەپێکەر.

الحِذاءُ: نەعل و پێڵاو سمی حوشتر و ئەسپ و ڕەشە وڵاخ.

حِذاء الشَّيْءِ: بەرامبەری شت ◦ (داری بحذاء داره) ماڵم بەرامبەر ماڵیانە.

الحُذاوةُ: ئەوەی بەردەبێتەوە لە پێست و ئەوەی لێی دەکرێتەوە.

الحُذايَةُ: بەشە تاڵانی و بەشە دەسکەوتی شەڕ.

الحَذّاءُ: پێنەچی پێڵاو دروستکەر ◦ پێڵاو فرۆش.

الحِذْوةُ: بەمانا (الحُذاوةُ) دێ ◦ توێیەك لە گۆشت ◦ پارچە گۆشتێك.

الحُذَيّا: بەمانا (الحذاية) دێ ◦ دیاری دانە بەمزدە هێنەر ◦ بەرامبەر ◦ دەگوترێ: (هو حُذَيّاك) ئەو بەرامبەری تۆیە.

الحَذِيَّةُ: عەطاو بەخشش.

الْمِحْذى: ئەو چەقۆی گۆشتی پێ کوت کوت دەکەی.

اَلْمِحْــــذاءُ: تانـــــەدەرو عــــەیبگرو لەکەدارکەری ناموسی خەڵك.

حَرَبَهُ بالحَرْبَةِ حَرْباً: بـە حەربە زەبرێـکی لێدا.

حَرَبَ حَرْباً: هەرچی هەیبوو لێی ستاند ٥ دەگـوترێ: (حَــرَبَ فلانـا مَالَــهُ) ماڵەکەی لە فلانکەس ستاند.

حَرِب حَرَبـاً: هـەموو مـاڵو سـامانەکەی لێ زەوت کرا ٥ زۆر رقی هەڵسا.

أحْرَبَ النَخْلُ: خورماکە تۆوەکەی دەردا.

أحْرَبَ الرجلُ النَّخْلَ: پیاوەکە خورماکەی موتوربە کرد بەتۆو.

أحْرَبَ الحَرْبَ: شەڕەکەی هەڵگیرساند.

أحْـرَبَ فلانـاً: شـارەزایی کـرد بۆئـەوەی دەستکەوتی شەڕی بەرکەوێ.

حَارَبَهُ مُحاربةً وحِراباً: شەڕی لەگەڵ کرد.

حــارَبَ اللهَ: لــە خــودا یــاخی بــوو سەرپێچی فەرمانەکەی کرد.

حَـرَّب السـنانَ ونحـوه: سـەرە رمبەکـەی تیژکرد.

حَرَّبَ فلاناً: رقی فلانکەسی هەڵساند.

حَرَّبَ فلانـاً علـى فـلان: فلانکەسـی هـەڵنا بۆسەری، دەنە دەنەی دا پەلاماری دا.

إحْتَرَبـوا: هەندێـکیان دژی هەندێـکیان جەنگان.

تحاربوا: بەمانا (احتربوا) دێ.

إحْرَنْبَـــــی: رقو کینـــــەی خـــۆی لێ خواردەوەو خـۆی ئامـادەکرد بـۆ داخ پێ رشتنی.

إحْرَنْبى المكانُ: شوێنەکە بەرفراوان بوو.

الحَــرْبُ: شـەڕ لـەنێوان دوو کـەسو دوو تاقمدا.

الحَرْبُ الباردةُ: ئەومیە هەریەکە لـەو دوو لایەنـە دژی یـەکتر کاربکـەن بـەبێ ئـەوەی بگاتـە حاڵـەتی پـەلاماردانو لێکدان، (ك: حُـرُوب)ە ٥ دەگـوترێ: (قامت الحـرب علـى سـاق) شـەڕەکە گـــــەرم بـــــوو، زۆر بەزەحمــــــەت دادەمرکێتــەوە ٥ (رجـــل حَــــرْبٌ) پیاوێـکی ئازایەو چاو نەترسە.

حرب لي و عليّ: دوژمنمە.

الحَـــــرَبُ: فـــەوتانو بـــەهیلاك چـــوون ٥ دەگوترێ: (واحَرَبَاهُ) لەکاتی ناخۆشیو تەنگانــەدا ٥ هــەروا نــاوە بــۆ تــۆوی خورما کە لە توێکڵەکەی دابێ.

الحِرْبـاءُ: گیانلەبـەرە خشۆکێـکی پچـوکە وەکـوو (سـام)ی بەڵـەك وایـە چـوار قاچی هەن، سەری زۆر پچوکە رەنگاو رەنگـە لەهـەر جێیـەك بـێ بـەرەنگی ئـەو شـوێنە دەنوێنـێ ٥ زۆری حـەز لەبەر خۆرە ٥ بە رۆژ خۆی بـەر خـۆر دەداو لە گـەڵیا دەگـەڕێو تـا ئاوادەبـێ روی تــێ دەکــا ٥ ئــالی لــە مــەدحی حوجرەکەی دا دەڵێ:

نەبیری ئەعظەم وەها تاوی دەدا وەک مەنجەنیق
بۆ دەوامی رۆژ پەرستی جینسی حەربای دێتە ناو

اَلْحَرْبَةُ: ئامێرە ئاسنێـکی کورتە، سـەری تیژە لەشەڕدا بەکار دەهێندرێ، (ك: حِرَابُ)ە.

**الحَرّابَةُ**: ئەوکەسەی زۆر ماڵو سامان داگیربکا ٥ دەستکەوتی زۆربێ ٥ دەگوترێ: (كتيبةٌ حرّابةٌ) دەستەیەکی شەڕکەری چاکن دەستکەوتیان زۆرە ٥ (امرأة حَرّابةٌ) ئافرەتێکی فیتنەو دوزمانو ئاژاوە گێڕو شەڕ هەڵگیرسێنەرە.

**الحَرِيبةُ**: (حَرِيبةُ الرجل) ئەو ماڵو داهاتەیەتی پێی دەژیا ٥ هەروا ناوە بۆ دەستکەوتی شەڕ، (ك: حَرَائِبَ)ە.

**المحرابُ**: ژور، ژووری خودا پەرستیو تێفکرین ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ﴾ ٥ هەروا بەمانا باڵە خانە هاتووە قورئان دەفەرموێ: ﴿يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِن مَّحَارِيبَ﴾ ٥ هەروا بە پێشی خانوو شوێنی گرنگی خانووش دەگوترێ: هەروا بە شوێنی راوەستانو نوێژکردنی ئیمامیش دەگوترێ: لە مزگەوتدا ٥ دەگوترێ: (رجل محراب) پیاوێکی ئازاو چاو نەترسە، (ك: محاريب)ە.

**المِحْرَبُ**: من الرجال: بەمانا (المحراب) دێ.

**المحروبةُ**: ئافرەتێکە منداڵی لێ سەندرابێ.

**حَرَثَهُ حَرْثاً**: دایکرۆشتو خواردی، کەوانە کەوانەی کرد کردی بەچەند پارچەیەکی کەوانەیی ٥ زۆر بە توندی شێلای.

**الحُرَثَةُ**: زۆر خۆر.

**حَرَثَ الأرض**: بە گاسن زەوییەکەی کێڵا بۆئەوەی کشتو کاڵی تێدا بکا.

**حَرَثَ النَّارَ**: ئاگرەکەی بە مقاش تێک وەردا.

**حَرَثَ الدابَّةَ**: وڵاخەکەی ماندوکردو برستی لێ بڕی.

**حَرَثَ الشَّيْءَ**: هەڵی پشکنیو گرنگی پێ داو لێی کۆڵیەوە.

**حَرَثَ القَوْسَ**: شوێنی هاتوچۆی وەتەری بۆ قەوسەکە دروست کرد.

**حَرَثَ المال**: ماڵو سامانەکەی کۆکردەوە.

**أحرثَ الدابَّةَ أو نفسه**: وڵاخەکەی یان خۆی ماندوو کرد.

**احترثَ الأرض**: زەوییەکەی کێڵا ٥ (احترث المالَ) ماڵەکەی کۆکردەوە.

**الحارِثُ** (أبو الحارث): شێر، کونیەی شێر.

**الحُراثُ**: شوێنی هاتوچۆی وەتەر لە قەوسدا.

**الحِرَاثُ**: تیر (سەرە تیر) پێش ئەوەی تیژ بکرێ ٥ مەجرای قەوس.

**الحِراثة**: پێشەی جوتیار، وەرزێر.

**الحَرْثُ**: کشتوکاڵ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ﴾ ٥ زەوی کێڵدراو ٥ ڕێبازی خۆڵە پەتاوی بەهۆی زۆر پێدا رۆیشتنەوە.

**حرث الدنيا**: کاڵاو شتومەکی دونیاییو ماڵو منداڵ.

**حرث الآخرة**: کردەوەی چاك بۆ دوارۆژ ٥ پاداشو نازو نیعمەتی قیامەت.

**الْحـرّاثُ**: ئەوكەسـەی زەوی دەكێڵـێ ٥ وەرزێر، جوتیار.

**المحراثُ والمِحْرَثُ**: ئامێری زەوی كێڵان ٥ گاسن‌و هـەوجار ٥ مقاش‌و كۆڵەوەژ كـە ئـاگری پـێ تێـك وەردەدرێ ٥ دەگوترێ: (هو محراث حرب).

**حَرَجَ أنيابَـهُ حَرْجـاً**: ددانـی جیڕكردنـەوەو لێـكی گیركردن لە رق‌و قینا.

**حَـرِجَ الصَّـدْرُ حَرَجـاً**: سنگی تـەنگ بـوو، هەناسە بڕكەی پێ كەوت.

**حَرِجَتِ العينُ**: چاوی سەرسام بوو (حَـرِجَ اليـه) پـەنای بـۆ بـرد لـە ناچـاری‌و تەنگە بەریدا.

**حَرِجَ الشَّيْءَ**: لە شتەكە ترسا.

**أحْرَجَ في يمينه**: سوێندەكەی لێ كەوت.

**أحْرَجَ فلاناً**: فلانكەسی خستە حاڵـەتی حەرەجـەوە، یـان خسـتیە گێـژاوی تاوانەوە.

**أحْـرَجَ الشَّـيْءَ علـى فـلان**: ئەوشـتەی لـە فلان قەدەغە كرد.

**أحْرَجَ فلاناً الى كذا**: فلانكەسی ناچاركرد بۆئەوە.

**حَرَّجَ الشَّيْءَ**: ئەوشـتەی یاساغ كـرد ٥ لـە حەدیث دا هاتووە: دەفەرموێ: (أللّهـم إني أحَرِّجُ حق الضعيفين: اليتيمَ والمرأة).

**حَرَّجَ عليه**: تەنگی پێ هەڵچنی ٥ (حَـرَّجَ في الأمر) بەردەوام بوو لە كارەكـەداو سوور بوو لەسەر ئەنجامدانی.

**حَـرَّجَ الحيـوانَ**: پـەتی نێچیری لـە ملـی ئاژەڵەكە كرد.

**تَحَـرَّجَ**: خـۆی لـە شتێـك پاراسـت لـە تەریقبوونـەوەو كردنـی كارێـك كـە تووشـی شـۆكی بكـا ٥ خـۆی لـەوە پاراست ئەو كارە بكا.

**تَحَرَّجَ مِنْهُ**: خۆی پاراست لەو كارە لەو شتە، هەرچـەند وا چاوەڕوان دەكـرا توشی چورتم‌و كێشە ببێ.

**الحارِجُ**: گوناهكار.

**الحَرَجُ**: لق‌و پۆپی درەختێـكی چڕو پڕ كە ناتواندرێ بچیە نێویەوە.

**الحَرَجُ مـن النـوق**: حوشـتری لـەڕو لاواز ٥ یــان بــە پێچــەوانەوە حوشــتری گۆشتن‌و قەبارە گـەورە ٥ بـارودۆخی نالــەبارو پــڕ تەنگــژە ٥ قورئــان دەفـەرموێ: ﴿يَجْعَـلْ صَـدْرَهُ ضَـيِّقًا حَرَجًا﴾ ٥ یان دەگوترێ: (حَدِثْ ولا حَـرَج) واتـە: هـیچ گوناهـت ناگاتـێ چی دەڵێی بیڵێ.

**الحَـرِجُ**: ئەوكەسـەی دەترسـێ لەگـژ ئـیش رابچێ.

**الحِرْجُ**: داوی نێچیرەوان (تـەبك‌و داوو دان ٥ قلێدەی ملی حەیوان ٥ جەڵەبـە مـەڕو بزن)، (ك: حِراجٌ وأحْراج وحِرَجة)ه.

**الحَرَجـة**: درەختێــكە هێنــدە چــڕوپڕە كــەس نــەتوانێ بچـێتە نێـو لـق‌و پۆپـــەكانی ٥ درەختێـــكی نـــاو دارەسـتان كـە گـەلا خـۆر دەمـی نەیگاتێ، (ك: حرجٌ حِراج).

**الحَـروجُ مـن النـوق**: ئـەو حوشـترەیە

گۆشتن‌و قەڵەو بێ.

**الحَرِيجُ**: شوێنی تەنگەبەر.

**المِحْــراجُ**: شــەوی زۆر ســاردو تــوش‌و زریان‌و کرێوە.

**المُحْرِجة مــن الأيمــان**: ئــەو سوێندەیە ناچاری دەبێ بیخۆی.

**الحُرْجُـوجُ مِــن النــوق**: حوشــتری درێــژی گـــــەورە، حوشـــــتری بـــــەهێز ٥ ئــادەمیزادی زەیــن تیــژی دڵ وریــا ٥ بای ساردو بەهێز، (ك: حراجيج)ە.

**الحَرْجَفُ من الرياح**: بای ساردی بەهێز لە ساڵی وشکدا.

**ليلة حَرْجَفٌ**: شەوێکی ساردو سەرما.

**حَرْجَلَ**: بازی دا بە راست‌و بــە چــەپدا ٥ ریــزی تــەواوکرد لــە نوێــژو غــەیری نوێژدا.

**الحَرْجَلَـةُ**: رەوە ئەســپ، (ك: حَراجِــلُ) دەگــوترێ: (جــاءوا حَراجلــة علــى خيولهم).

**حَرْجَمَ الدوابَ**: هەنــدێ لــە حەیوانــەکانی بەســــەر ئــــەوانی تــــردا شــــکاندەوە پێشــەکەی گێڕانــەوە، پێشــە تــای جەڵەبەکەو پاشە تاکەی تێــك بــۆوە ٥ کۆی کردنەوە.

**إحْرَنْجَمَ القوم والدوابُ**: ئاژەڵ‌و خەڵکەکە کۆبونەوەو تێك بوونەوە.

**إحْرَنْجَمَ فلان**: فلانکەس کارێکی بڕیارداو دوایی لێی پەشیمان بۆوە.

**حَرَدَه حَرْداً**: قەصدی کرد.

**حَرَدَ فلان عن قومه حــروداً**: فلانکەس لــە قەومەکەی خۆی گۆشەگیربوو.

**حَرِد عليه حَرَداً**: رقــی لێ هەڵسا ٥ قینــی لێ هەڵــگرت گێچــەڵی پێــکرد ویســتی پەلاماری بدا.

**حَــرِدَتْ الدابــةُ**: ولاغەکــە رەگێــکی جەستەی وشك بــوو، کــە دەڕوا لــۆژ لۆژیەتی (فهی حَرداء).

**حَــرِدَ فــلان**: فــلان کۆڵەکــەی گــران بــوو نەیتوانی پێیەوە بڕوا.

**أحْرَدَ في السير**: پەلەی کــرد لــە رۆیینــدا بەخێرایی بە رێگادا رۆیی.

**أحْــرَدَ فلانــاً**: فلانکەســی جیــاکردەوەو گۆشەگیری کرد.

**حــارَدَت الابــل**: حوشــترەکە شــیرەکەی وشکی کرد یان کەم بوو.

**حارَدَت السنةُ**: ساڵەکە کەم باران بوو.

**حــارد حــال فــلان**: وەزع‌و حــاڵی فــلان خراپ بوو.

**حــــارَدَ الرجــــل**: ئــــەو پیــــاوە دوای سەخاوەت‌و دەست‌و دڵفراوانی رژدو چروك بوو.

**حَرَّدَ فلان**: خۆی خستە ناو کۆخیلکەیەکەوە جێگای خۆی تێدا کردەوە.

**حَرَّدَ الشَّيَ**: شتەکەی خوار کردەوە.

**حَــــرَّدَ الکــــوخ**: ســــەربانی کۆخەکــــەی بەرزکردەوە وەکوو پشتی حوشتر.

**حَرَّد الشَّيَ**: شتەکەی هەموو چەورکرد.

**إنْحَرَدَ**: تاق بۆوە کەسی لەگەڵ نەما.

**إنْحَرَدَ النجمُ**: ئەستێرەکە کشا.

**تَحرَّدَ**: دوورکەوتەوە ٥ کلا بوو ٥ لا کەوت.

**الأحْرَدُ**: ئەو ولاغەیە تووشی نەخۆشی (حـەردد) بـوو کـە نەخۆشییە لـە رەگـەی لەشی کاردەکا ◊ دەگوترێ: (رجـل أحـرَدُ) پیاوێـکی چـروكو خراپە.

**الحارد**: کەم شیر (ئاژەڵی کەم شیر).

**الْحَرْدُ**: گۆشەگیر ◊ دەگوترێ: (رجـل حَـرْدٌ) پیاوێکە لە کۆمەڵو لە قەومو خوێش دورکەوتۆتەوە تێکەڵاویان نابێ.

**الحَـرَدُ**: دەردێـکە تووشـی رەگـی لەشـی حوشـــتر دەبـــێ رۆیشـــتنەکەی دەشێوێنێ.

**الحُرودُ من النوق**: حوشتری کەم شیر، یان هەر شیری نەبێ.

**الحريـدُ**: پیـاوی گۆشـەگیر ◊ خـانووی بەتاقـەوەو دوور لـە خـانووی تـر ◊ ماسی توێ توێ کراو.

**حَرْدَبَ حَرْدَبَةً**: سوكو کورجو گوڵ بوو.

**حَرَّ** الماء والهواء وغيرهمـا: ئاوەکە، کەشو هەواکە گەرم بوو.

**حَرَّ القَتْلُ**: شەڕ گەرم بوو.

**حَرَّ** الشَّيْءَ حراً: شتەکەی گەرم کرد.

**حَرَّ** الرجلُ: پیاوەکە تینووی بوو.

**حَـرَّت کَبِـدُهُ**: جـەرگی لـە تینوانـا یـا بەخەفەت وشك بوو.

**حَرَّ** العَبْـدُ حـراراً: عەبدەکە لە کۆیلایـەتی رزگاری بوو.

**أحَـرَّ**: گـەرم بـوو ◊ (أحَـرَّ الشـيْءَ) وای لێکرد گەرم بێ.

**حَـرَّرَه**: ئـازادی کـرد (حَـرَّ الولـدَ) منداڵەکـەی تایبـەت کـرد بـۆ خزمـەتکردنی مزگـەوتو خـودا پەرستی قورئـان دەفەرموێ: ﴿رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا﴾.

**حَـرَّرَ الكتـابَ وغـيره**: کتێبەکـەی نووسیەوە، رێکی خست.

**حَـرَّرَ الـوزنَ**: وردەکاری لـە کێشانەکەدا کرد.

**حَرَّرَ الرميَ**: رەمیەکەی چاك ئەنجام دا ◊ هەنگاوتی.

**إستَحَرَّ**: چاك گەرم بوو.

**إستَحَرَّ القَتْلُ**: شەڕ گەرم بوو.

**إستَحَرَّ فلانةَ**: داوای لە فلان ئافرەت کرد پارچە حەریرێکی بۆ دروست بکا، بۆ تەون بکا، ئەویش بۆی کرد.

**الاحَـرُّ**: (هـو أحَـرُّ منـه حسـناً) ئـەو لـەو قۆزترە.

**الحارّ**: گـەرم ◊ (الحـارّ مـن العمـل) کـاری قورس.

**الحـرارةُ**: گـەرمایی ◊ گـەرمایی نـاو دەم بـەهۆی خـواردنی شتێـکەوە ◊ دڵ گەرمی بەهۆی خەمو خەفەتەوە.

**الحَـراريّ**: ئـەو قالـبو شـتانەی وا دروستکراون بەرگەی گەرمی بگرن.

**الحراريات**: ئەو مەوادانەی بـەکاردێن بـۆ دروسـتکردنی ئـەو شـتانەی لـە گەرمیدا بەکاردەهێندرێنو پێویستە خۆ بۆ گەرمی زۆر رابگرن.

**الحَرُّ**: گەرمایی، (ك: حُرُور)ە.

**الحُرُّ**: شتی پاڵفتەو بێ غەڵو غەش ٥ دەگوترێ: (ذهب حُرٌّ) زێڕی پاڵفتەو ساغ بێ ئەوەی مسی تێدابێ ٥ (فَرَسٌ حُرٌّ) ئەسپی رەسەن ٥ هەروا وشەی (الحُرّ): بەمانا بەندەی ئازاد، پیاوی مەردو سەخی هاتووە ٥ بەمانا شتی باش‌و بەنرخ ٥ خواردەمەنییەك بێ كوڵاندن بخورێ ٥ بەشێك لە دەم‌و چاو ٥ قسەی چاك‌و بەنرخ دێ.

**الحرّار**: حەریر فرۆش ٥ ئەوكەسەی حەریر دروست دەكا.

**الحَرَّة**: زەوی بەردەڵان كە بەردەكانی رەش بن وەكوو ئەوەی سوتابن، (ك: حِرار) ٥ زیپكەی پچوك ٥ شوێنێكە لە دەرەوەی شاری مەدینە ٥ لەخوار (واقم)ەوەیە، شەڕی بەناوبانگی (الحرة) لەسەردەمی یەزیدی كوری معاویەدا لەوێ رویدا.

**الحُرَّةُ**: ئافرەتی ئازاد پێچەوانەی كەنیزەك.

**سحابة حُرَّةٌ**: هەورێكی باراناوی زۆر.

**الحُرِّيَّةُ**: ئازادی بۆ گەل بۆ وڵات بۆ تاك ٥ پاڵفتەو رزگاربوو لە تانەو تەشەرو رەخنەو لۆمە ٥ لە بازرگانیدا بریتییە لە رێبازێكی ئابوری داوا دەكا بازرگانی نێودەوڵەتی لە رەسم‌و بەربەستی جۆراو جۆر رزگاری بێ.

**الحَرُور**: گەرمایی خۆر ٥ گەرمایی بەردەوام ٥ گەرمایی ئاگر.

**الحَرُورِيَّة**: پێرێكن لە خەواریج نیسبەت دەدرێن بۆ ناوچەی (حَرَوَراء) لە نزیك كوفە ٥ چونكە یەكەمجار لەوێ كۆبونەوەو بڕیاری (تەحكیمیان) داو دژایەتی ئیمامی عەلییان راگەیاند ٥ ئەو خەواریجانە ئەوەندەیان زێدەڕەوی كرد لە ئاینین لێی دەرچوون.

**الحرير**: دەزوێكە كرمی (قەز) بەرهەمی دێنێ.

**الحرير الصناعي**: چەند لیفەو گلۆڵەیەكە لە هەویری دارو پاڵفتەی لۆكە بەرهەم دەهێندرێ.

**الحريرة**: پارچە حەریر ٥ ئاردێكە بەشیر یان بەرۆن دەكرێتە حەڵوا.

**الحريريّ**: ئەوكەسەی حەریر دروست دەكا یان دەیفرۆشێ.

**المِحَرُّ**: ماڵماڵ؛ ئامێرێكە دوو رەشە وڵاخ یان دوو ئێستر رای دەكێشن زەوی كێڵدراوی پێ تەخت دەكرێ، (ك: مَحَار)ە.

**المَحْرُورُ**: دزێو.

**حَرَزَ حرزاً**: پاراستی.

**حَرِز حَرَزاً**: وەرع‌و خودا پەرستی زۆر بوو.

**حَرُز حَرَازَةً**: سەرپێچی كردو خۆی خستە قەڵاو پەناگەی قایمەوە.

**أحْرَزَهُ**: بەمانا (حَرَزَهُ) دێ ٥ لەخۆی گرت‌و كردی بە ماڵی خۆی ٥ دەگوترێ: (أحْرَزَ قصَبَ السَّبْق) پێش كەسانی دی ئەو سەركەوتنەی بەدەست هێنا.

أحرَزَ مَالَهُ: ماڵەکەی پەزمەندە کرد بۆکاتی پێویستی.
أحرَزَ المكانَ المتاعَ: کاڵاکەی خستە ئەو شوێنە.
حَرُزَ الشَّيْئُ: زێدەڕۆیی کرد لە پاراستنیدا.
احْتَرَزَ منه: خۆی لێ پاراست.
تَحَرَّزَ منه: خۆی لێ پاراست.
استَحْرَزَ: کەوتە شوێنی شیاوی خۆی‌و تێیدا هەڵگیرا.
الحارِزُ: پارێزەرێکی باشەو هیچی تێدا نافەوتێ.
الحِرْزُ: صندوق‌و قاصەی قایم‌و پتەو کە شتی تێدا هەڵدەگیرێ شوێنی قایم‌و پتەو کە پەنای بۆ دەبرێ.
الحَرَزَةُ: ماڵی هەڵبژاردە.
الحريزُ: شوێنی قایم.
الحَرِيزَةُ: کاڵایەك کەلەبەر بەنرخی نەفرۆشرێ.
حَرَسَهُ حَرْساً وحِراسَةً: پاراستی.
حَرِسَ حَرَساً: تەمەنی درێژبوو (هو أحْرسُ وهي حَرْسَاءُ).
أحْرَسَ بالمكان: لەوشوێنەدا زۆر مایەوە.
احْتَرَسَ منه: خۆی لێ پاراست.
تَحَرَّسَ منه: خۆی لێ پاراست.
الإحْتِراسُ: لەزاراوەی عیلمی مەعانیدا ئەوەیە لە دەقێکدا کە پێچەوانەی مەبەست دەگەیەنێ شتێك دابنێی ئەو پێچەوانەیە لابەرێ.

الحِراسَةُ: دەس بەسەرکردن دەگوترێ: (وضع فلاناً تحت الحراسة) فلانکەسی خستە ژێر چاودێرییەوە بۆئەوەی نەتوانێ تەصەروف لە ماڵەکەیدا بکا.
الأحْرَسُ من الأبنية: بینای قایم‌و پتەو ◦ یان بینای کۆن کە رۆژگارێکی زۆری بەسەردا تێپەڕ بووبێ.
الحَرْسُ: زەمانەو رۆژگار ◦ کاتی دوروو درێژ ◦ دەگوترێ: (قضى عليه حَرْسٌ من الدهر)، (ك: أحْرُس)ە.
الحَرَسُ: پارێزیکار قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاء فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا﴾ ◦ هەروا بەو کەسانە دەگوترێ: کە موچە وەردەگرن‌و پارێزگاری بەرپرس‌و دەزگاو ماڵ‌و سامانی دەوڵەت‌و هاولاتیان دەکەن.
الحَرَسِيُّ: تاکی (حەرەسە) واتە: پۆلیس‌و سەربازێ کە موچە وەردەگرن‌و فەرمانڕەوا دەپارێزن.
الحَرِيسَةُ: پارێزراو ◦ کەڵەکە بەردێکە دەکرێتە شوراو بزن‌و مەڕی تێدەکرێ‌و تێیدا دەپارێزرێ.
المحروسة: وەصفێکە بۆ شاری قاهیرە بەکاردەهێندرێ.
حَرَشَهُ حَرْشاً: روشاندی (حَرَشَ الدابَّةَ) لە پشتی ولاغەکەیەوە ژەنی بۆئەوەی خێرا بڕوا.
حَرَشَ الصيدَ: نێچیرەکەی هەڵفراند دەرپەڕاند بۆئەوەی نێچیری بکا ◦ لە

پەندی پێشینان‌دا هاتووه (أتعلمني بضب أنا حرشته) شارەزایم دەکەی بۆ شوێنی سوسەمار لەکاتێکدا من لە هێلانەکەی دەرم پەڕاندوه ٥ بەکەسێك دەگوترێ کە ڕێنمایی کەسێکی لەخۆی زاناتر بکا.

حَرَشَ الانسانَ والحيوانَ: هەڵینا بۆ فلان شت.

حَرَشَ بين القوم: ئاژاوەی خستە نێوان قەومەکەوه.

حَرِشَ الشَّيْءُ: شتەکە زبر بوو (هو أحرش وهي حرشاء).

حَرُشَ حُروشة: زبر بوو.

أَحْرَشَ الصيدَ: بەمانا (حَرَشَهُ) دێ.

حارَشَهُ: شەڕی لەگەڵ کرد.

حَرَّشَ بينهم: بەمانا (حَرَش بينهم) دێ.

احْتَرَش الصَّيْدَ: بەمانا (حَرَشه) دێ.

احترش فلاناً: فێڵی لێ کرد.

احْتَرَش الشَّيْءَ: شتەکەی کۆکردەوه.

احترش لعياله: کاسبی بۆ ماڵو منداڵی کردو بژێوی بۆ پەیداکردن.

تَحَرَّشَ به: جولاندی هەڵی هاژاند بۆئەوەی ڕقی هەڵبسێنێ.

الحارِشُ: نەخۆشییەکە تووشی ڕەشە وڵاخ دەبێ بەتایبەتی توشی زوبانیو لاشەویلەی، بە کوردی پێی دەگوترێ: (قەڵداسو) زیپکەی ئەستورو کێماوی لێ پەیدا دەبێ.

الحَرْش: ئەسەرو شوێن دەست ٥ جێ شوێنی برین کە چاك بووبێتەوەو توکی لێ نەیەتەوه ٥ فێڵو پیلان، (ك: حِرَاش).

الحرشاء: وشتری گروێ ٥ ڕوەکێکی دەشتەکییە ئاژەڵ زۆری حەز لێ دەکا ٥ خەردەلە کێویلکە.

الحَرِيش: هەزارپێ، ڕەشە خەڵکی عەرەب پێی دەڵێن: (أم أربعة وأربعين).

الحَرِيشةُ: ئەوەی لەژێر دەستت دایە ٥ دەڵێ: (أخرجت له حريشتي).

المِحْراشُ: مەتەڵ، (ك: محاريش).

الحَرْشَفُ: پەڵە فلوسی پێستی ماسی ٥ ئەو پەڵەو گۆو شتە وردیلە زیویانەی چەکی پێ جوان دەکرێ ٥ باڵندەو پێڕۆی پچوك ٥ کوللەی کە هێشتا باڵی لێ نەڕوابێ ٥ پیاوی پیرو بێ دەسەڵات ٥ سوپای پێڕۆ ٥ ڕوەکی زبر.

حَرَصَ حِرْصاً: هەڵپەی کردو زیاد لەپێویست هەوڵی ماڵ پەیداکردنی دا.

حَرَصَ على الشَّيْءَ: زۆری حەز لێکردو هەوڵی وەدەستهێنانی دا.

حَرَصَ على الرجل: بەزەیی بە پیاوەکەدا هاتەوەو هەوڵیدا شارەزای بکا فێری بکا.

حَرَصَ الشَّيْءَ: شتەکەی دڕاند قەڵاشتی درزی پێ برد ٥ دەگوترێ: (حَرَصَت الشَّجةُ الجِلْدَ): برینەکە پێستەکەی دڕی.

حَرَصَ القصار الثَّوْبَ: جل شۆرو جل کوتەکە کراسەکەی دڕاند.

حَـرَصَ الجِلـدَ ونحـوه: پێستەکەی دادڕی هەڵدڕی ٥ دەگوترێ

حَرَصَ المطَرُ وجه الأرض: باران روی زەوی دادڕی.

حرصت الماشيةُ المرعى: ئاژەڵەکە هەموو لەوەڕی پاوانەکەی خوارد (هو حارص وهي حارصة)، (ك: حَوارص)ە.

حَرُصَهُ عليه: زۆری ئارەزو لێ بوو.

حَرَصَ الشَّيْءَ: شتەکەی روشاند.

احْتَـرَصَ الرجـلُ: پیاوەکـە زۆری هەوڵدا شتێك وەدەست بێنێ.

تَحَـرَّصَ: زۆری هەوڵدا کاتێـکی گونجاو دیـاری بکـا بـۆ وەدەسـتهێنانی ٥ دەگـوترێ: (هـو يتحـرّص غَـداءهم وعشاءهم).

الحارصة: برینێك: کەپێست ببڕێ بگاتە گۆشت یان ئێسقان.

الحَرْصَةُ: کونی کراس، دڕاوی پۆشاك.

الحِرْصـيان: ژێـر پێسـت، پەردەیـەکی تەنکـە لـەنێوان پێسـتو گۆشـتدا، دوای کەوڵ کردن دەدرێندرێ.

الحريصة: بەمانا (الحارصة) دێ.

حَرَضَ حُرَضاً: مانـدو بـوو برستی لێ بـڕا، خـەریك بـوو تێدابچـێ ٥ رەوشـتی ناشـیرین بـوو ٥ عـەقڵی تێـکچوو ٥ رێبازی ناشیرینی پەیڕەو کرد.

حَرَضَ الثوبُ حَرَضـاً: نوشتاوەی کراسـەکە رزی.

حَـرَضَ فـلان: گـەدەی تێـك چـوو ٥ غـەمو نارەحـەتی تواندییـەوە ٥ گوڵـە زەعفەرانی کۆکردنەوە.

حَرُضَ: بەمانا (حَرَضَ) دێ.

أَحْرَضَ فـلان: فلانکەس منـداڵی خراپـی بـوو (حَـرُضَ الحـب فلانـاً) دڵـداریی فلانکەسی بەدبەخت کرد.

حارَضَ على العمل: بەردەوام بوو لەسەر کارەکەی.

حَرَّضَهُ على الشَّيْءِ: هەڵینا بۆ ئەوشتە قورئـان دەفـەرموێ: ﴿يَـا أَيُّهَـا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ﴾.

حَـرَّض الثـوب: بـە رەنگـی زەرد قوماشەکەی بۆیەکرد.

تحارضـوا عليـه: هەریەکـەیان لەبـەر خۆیەوە ئەوی تری هەڵنا.

الأحْـرَضُ مـن الرجـال: ئـەو کەسـەیە برژانگی هەڵوەریبن.

الإحريض: گیاو گوڵە زەعفەران.

الإحـريض مـن الرجـال: پیـاوی پۆڵکـاوی پیرو پەککەوتە کەنەتوانێ هەڵسێ ٥ یـان ئەوکەسـەی هـیچ خێـرو بێـری تێدا نەبێ، (ك: أحاريض)ە.

الحارضـة مـن الرجـال: نەخۆشـی چـارە نەکراو.

الحُـرّاض: ئـەو کەسـەی خـەریکی چـاککردنی جـۆرە صابونێـکە ٥ کـە لەگیا ئەسپۆن دروست دەکرێ.

الحُرّاضَةُ: مێینـەی (الحـراض)ە ٥ شوێنی سـوتاندنی ئەسپۆنو بـەردە قسڵە ٥ بازاڕی ئەسپۆن فرۆشتن.

**الحَـرَضُ**: پیـاوی زۆر نـەخۆش ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿تَاللَّهِ تَفْتَأُ تَـذْكُرُ يُوسُـفَ حَتَّـى تَكُـونَ حَرَضًـا أَوْ تَكُـونَ مِـنَ الْهَـالِكِينَ﴾ پیـاوی لـەرو لاوازو بـێ نمود کە نـەتوانێ شەڕ بکا ٥ پیاوی هیچ‌و پوچ نـە خێـری لەدەست بـێ نە بتوانێ شەڕ بۆ خەڵك بنێتـەوە ٥ نە بەهومێدی خێری بە نە لەشەڕی بترسە.

**الحَرَضُ من الثوب**: داوێنـی کراس‌و شـوێنە نوشتاوەکانی، (ك: أحراض وحرضان، وحِرَضة).

**الحَرِضُ من الرجـال**: بـەمانا (الحَـرَض) دێ، (ك: أحراض)ە.

**الحُرْضُ**: ئەسپۆن ٥ خۆڵێـکە کـە سوتێنراو ئاوی لێ پرژێندرا رەق دەبێ‌و وەکوو صابوونی لێ دێ ٥ جەستـەو پۆشـاکی پێ پاك دەکرێتەوە ٥ هەروا نـاوە بـۆ بەردی جیری.

**الحِرْضَـةُ مـن الرجـال**: پیـاوی خـوێڕی‌و پڕوپوچ، (ك: حِرَض).

**الحُرْضَـةُ**: ئەوکەسـەی گۆشـت نـاکڕێ‌و نایخوا مەگەر لای خـەڵك بـەخۆڕایی دەستی بکەوێ.

**المِحْرَضَةُ**: قاڵب‌و قاپی ئەسپۆن.

**حَـرَفَ عنـه حَرْفـاً**: لێـی لای داو لاڕێ بـوو لێی.

**حَرَفَ لعياله**: لەهـەموو بوارێـکدا بـۆ مـاڵ‌و منداڵەکەی تێکۆشا.

**حَرَفَ الشَّيْءَ عن وجهه حرفـاً**: شتەکەی لـە ڕێڕەوی خۆی لاداو گۆڕی.

**حَرُفَ الشَّيْءُ حرافـةً**: شـتەکە مـزرو تـرش بوو دەم‌و زمانی گەست.

**حُرِفَ فـلان في مالـه**: هەندێـك لـە مـاڵ‌و سامانەکەی لەکیس چوو.

**أَحْرَفَ**: دوای هـەژاری دەوڵەمەنـد بـوو، بۆ خێزانەکەی خۆی ماندو کـرد ٥ پاداشـتی دایـەوە لەسـەر چـاکە یـان خراپـە ٥ حوشـترەکە یـان وڵاغەکـە کزبوو.

**حـارف الجُرْحَ**: ئەنـدازەی برینەکـەی بـە ئامێری برین پشکن ئەندازە گرت.

**حارف فلاناً**: مامەڵەی لەگەڵ کرد دەربارەی نیشەکەی ٥ پاداشتی فلانکەسـی دایـەوە ٥ شانازی بەسەردا کرد.

**حَرَّف الشَّيْءَ**: شتەکەی لـە شـوێنی خـۆی گۆڕی، لایدا.

**حـورف فـلان**: رزق‌و رۆزی فـلان کـەم کوڕی بەسەردا هات.

**حَرَّف الشَّيْءَ**: شتەکەی لـە شـوێنی خـۆی لادا.

**حرّف القَلَمَ**: لایەکی قەڵەمەکەی تاشی.

**حَـرَّفَ الكـلامَ**: قسـەکەی لەسـەر مانـای خۆی گۆڕی لایدا ٥ مانایەکی تری بۆ دیـاری کـرد ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ﴾.

**احترف**: پیشەی بۆخۆی دیاری کرد.

**احترف لأهله**: کاسبی بـۆ مـاڵ‌و منـداڵی خۆی کرد.

اِنْحَرَفَ: لايدا (انحرف مزاجه) تەبیاتی گۆڕا لەسەر شێوەی ئاسایی خۆی نەما.
اِنْحَرَفَ الی فلان: مەیلی فلانی کرد (انحرف عن فلان) روی لێ وەرگێڕا.
تَحَرَّفَ عنه: بەمانا (انحرف) دێ.
تَحَرَّفَ لعیاله: کاسبی بۆ ماڵو منداڵی کرد.
اَلْحَرَافَةُ: تیژاییو ترشییەکە لە تامدا زوبان دەسوتێنێ ٥ دەگوترێ: (فی الطعام حُرَافة) لە خۆراکەکەدا تیژایی هەیە.
الحِرّیفُ: ئەو خواردەمەنییەیە تیژایی تێدابێ ٥ دەگوترێ: (بصل حُرِّیف).
الحَـرْفُ مـن کـل شـیئ: کـەنارو قـەراخو بیجاخی ٥ دەگوترێ: (فـلان علـی حَـرْف مـن امـره) فـلان لایەنێـکی ئیشـەکەی گرتـووە ٥ یـان لەسـەر قـەراخ وەسـتاوە ٥ ئەگـەر شتێـکی بـەدڵ نـەبوو یەکسەر لە ڕێبازەکە لادەداو هەڵدەگەڕێتـەوە قورئـان دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ﴾.
الحَرْفُ من الدواب: ولاخی کزی رەقەڵە ٥ هەر بیستو هەشت پیتەکانی مەبانی کاتێك کەلیمەو کەلامیان لێ پێك نەیە ٥ واتە پیتەکانی هیجا ٥ هەروا هـەموو حەرفـەکانی مـەعانی کەوێڕای ئەوەی مانا دەگەیەنن لە غەیری خۆیانـدا رەبتـی کەلیماتیش دەکەن بۆئەوەی کەلام پێك بێ.

اَلْحُرْفُ: هـەر شتێـك گـەرماییو ترشـیو تیژی تێدا بێ.
الحِرْفَةُ: پێشە هۆکارو وەسیلەی دابین کردنی پێداویستی ژیان.
الحِرْفِیُّ: ئەو کەسەی پیشەیەك بۆخۆی بڕیـاردەداو دەیکاتـە هۆکـاری دابینکردنـی پێداویسـتییەکانی ژیـانیو بـەردەوام بـەو پیشـەوە خەریك بێ جا پیشەکە وەستایی بێ بازرگانی بێ رۆژنامە نووسی بێ....
الحَرِیفُ: کەسێك لە پیشەیەك کاربکا.
اَلْمُحَـارَفُ: بـێ بـەش هـەوڵ دەداو داوا دەکاو هیچی دەست ناکەوێ.
المِحْرَافُ: ئـەو ئـامێرەی قـوڵایی برینـی پێ ئەندازە دەگیرێ، (ك: مَحـاریف و مَحَارِف)ە.
حَرَقَ الْحَدِیدَ حرقاً: ئاسنەکەی بڕیەوە بە مشار.
حَـرَقَ أنیابَـهُ: ددانـی لێـك جیڕکـردن هەندێـسکیانی لـە هەندێـکیان خشاندن سیرە سیریان هات.
حَـرَقَ القصـارُ الثَّـوْبَ: جـل شۆرو جـل کوتەکە بە کوتکەکەی شوێنکەی لە کراسەکە کرد.
حَـرَقَ النـارُ الشَّـئَ: ئاگرەکە شـوێنی لـە شتەکە کرد.
حَـرِقَ حَرَقـاً: رەگـی تەنیشتی، ئەورەگـەی سـەری رانو کلـۆتی پێـکەوە دەبەستێتەوە پچڕا، پسا.

حَرِقَ الثَّوْبُ: كراسەكە بە كوتك لێدانی جل كوتەكە شەقی برد.
حَرِقَ الشَّعْرُ والريش: مووەكان قژەكان، پەڕو باڵەكانی قرتانو هەڵوەرین.
حَرِقَتْ اللحيةُ: مووی چەناگەی لە مووی لا رومەتی كورت تربوون.
حَرِقَ فلان: فلانكەس دەستو پەنجەی قەڵشان.
حُرِقَ حَرَقاً: شا دەماری كە كلۆتو رانی پێكەوە دەبەستێ پچڕا.
أحرقت النارُ الشَّيْئَ: ئاگرەكە شتەكەی سوتاند ٥ دەگوترێ: (أحرقه النارُ) ئاگر سوتاندی.
احْرَقَ الشَّيْئَ: فەوتاندی.
حَرَّقت النارُ الشَّيْئَ: ئاگر شتەكەی سوتاند.
احْتَرَقَ الشَّيْئُ: شتەكە سوتا.
تحرّق الشَّيْئُ: بۆ مطاوعەی (حَرَّقَهَ) دێ.
تَحَرَّق النارُ: ئاگرەكە هەڵگیرساو بڵێسەی سەند.
الحارِقُ: ددانی درندە ٥ ئاگر ٥ ئەو رەگەی كلۆتو ران پێكەوە دەبەستێتەوە ٥ دەگوترێ: (إمرأة حارقة) ئافرەتێكە زۆر جنێو بە هاوسێكانی دەدا.
الحاروق: شمشێری برندەو تیژ.
الحراق: ئامێرێكە خورمای پێ تەلقیح دەكرێ ٥ هەروا بەوشتە دەگوترێ: كە هەموو شتێك تێك بداو خراپی بكا ٥ دەگوترێ: (نار حِراق) ئاگرێكە هەموو شتێك دەكوژێنێتەوە.
رمي حراق: رەمی توندو تیژ.
الحُراقُ: ئامێرێكە خورمای پێ تەلقیح دەكرێ ٥ ئەوەی ئاگری پێ دەكەوێ لەكاتی هەڵگیرساندا لە پوشوو كەركۆڵ ٥ هەروا وشەی (الحُراق) بەو مادەیە دەگوترێ: كە هەموو شتێك لەناو دەباو تێكی دەدا ٥ ئاوێك زۆر سوێر بێ ٥ ئەسپی باز هاوێژو گورجو بەتەكان.
الحُراقةُ: ئەوەی ئاگری رێ دەكەوێ لەكاتی هەڵگیرسان دا وەكوو پوشوو كەركۆڵ.
الْحُرَاقُ: بەمانا (الحراقة) دێ ٥ ئەسپی باز هاوێژو بەتەكان.
الحَرَاقةُ: جۆرێكە لە كەشتی شەڕ، شوێنی ئەوەی تێدایە بە تۆپو هاوەن تەقە لە دوژمن بكەی ٥ هەروا ناوە بۆ كەشتی پچوك.
الْحَرْقُ: شوێنكەی سوتانی پۆشاك بە ئاگر ئەو كون تێبونو هەڵقرچانەی بەهۆی ئاگرەكەوە پەیدا دەبێ.
الْحَرَقُ: ئاگر، بڵێسەی ئاگر ٥ هەڵقرچانی پۆشاكو كون تێبوونی بەهۆی ئاگرەكەوە ٥ یان درانی پۆشاك بەهۆی شتنەوەو كوتانی پۆشاكەكە بە كوتەك.
الْحُرْقَانُ: لێك كەوتنی هەردوو ران لەكاتی رۆیشتندا.

**الحُرْقَةُ**: گەرمایی، ئەو خەمو نارەحەتیەی توشی دڵدار دەبێ بەهۆی دڵدارییەوە ٥ یان ئەو تیژیو ترشییەی لە خواردندا هەستی پێ دەکرێ.

**الْحَرْقُوَةُ**: لای ژووروی قورگ.

**الحريق**: هەڵگیرسانی ئاگرو شت سوتاندنی ٥ بڵێسەی ئاگر ٥ هەروا وشەی (الحريق) بە رەشەبای توندو بە سوتاندنو سەرما بردنی روەكو بەروبومیش دەگوترێ.

**الحَرِيقَةُ**: گەرمایی ٥ پەلو (ئاردو ئاو تێکەڵ دەکرێ دەکوڵێندرێ).

**الْحَرْقَدَةُ**: گرێی گەرو.

**الْحِرْقِدَةُ**: بنی زمان ٥ وشتری رەسەن.

**حَرْقَصَ في مشيه وكلامه**: هەنگاوی کورتی نان ٥ قسەی خێرا خێرا کردن.

**حَرْقَصَ النَّسْجَ**: تەونەکەی زۆر توند چنی هەوداکانی لێك نزیك کردنەوە.

**الحُرْقُوصُ**: دەعبایەکی پچوکە وەکوو کێچ ٥ دەنکی خورما کە بەرسیلە بێ ٥ کەناری قامچی، سەروبنی قامچی، (ك: حراقیص)ە.

**الحَرْقَفَةُ**: ئێسقانی سەری کلۆت، (ك: حراقف)ە.

**الحُرْقُوف**: چوار پێی کزو لاواز.

**حرك حَرْكاً**: سەری شانی ئازاری لێ پەیدا بوو ٥ لە مەسەلەکەدا زۆر جیرە جیری کرد ٥ ئەو مافەی لە ئەستۆی بوو نەیدا ٥ سەرشانی ئاژەڵەکە یان ئادەمیزاد هەنگێورا.

**حَرَكَ الحارِكَ**: سەر شانی بڕی.

**حرك فلاناً بالسيف**: بە شمشێر لە ملی فلانکەسی دا ٥ یان شوێنێکی جەستەی بریندار کرد.

**حَرَكَ صيد الْبَحْرِ حَرْكاً**: نێچیری دەریا کەم بوو.

**حَرِكَ حركاً**: لە بەرامبەر ئافرەتدا پیاوەتی نەما ٥ (هو حَرِيكٌ).

**حَرُكَ حركاً وحركةً**: بێدەنگی خۆی دڕیو کەوتە جمو جوڵ.

**حَرَّكه**: لە بێدەنگیو پاڵدانەوەی خۆی رایپەڕاند.

**تحرك**: بە توندی راساو بێدەنگی خۆی شڵەقاند.

**الحارِكُ**: ژورووی شان.

**الحَراك**: جمو جوڵ.

**الحَرِك**: منداڵی رۆح سووکی زیرەك.

**الحَرَكَةُ**: گواستنەوەی جەستەیە بە رۆیشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ٥ یان گواستنەوەو جمو جوڵی هەندێك لە جەستەی وەکوو جوڵانەوەی ئاش یان مەکینە ٥ لە زانیاری دەنگدا جۆنیەتیەکە بۆ دەنگ پەیدا دەبێ کە بریتییە لە (فەتحەو کەسرەو ضەممە) بەرامبەریان (سکون)ە.

**المِحْراكُ**: کوڵە وەژ ٥ مقاش.

**الْمَحْرَكُ**: ئەوپەڕی مل بەلای ژوروووەوە ٥ کۆتایی مل کە لەگەڵ سەردا بەیەك دەگەن.

الحَرْكَكَةُ: سەری کلۆت ٥ یان قەراخی کلۆت ئەوەی دەکەوێتە سەر زەوی لەکاتی دانیشتندا، (ك: حَرَاكِكُ)ە.
الحُركوك: شان ٥ شتی کەتەو بەهێز.
حَرَمَ فلاناً الشَّيْءَ حرماناً: شتەکەی لەفلان یاساغ کرد بوو.
حَرُمَ الشَّيْءُ: شتەکە حەرام بوو دەگوترێ: (حَرُمَ عليه كذا) ئەو شتەی لێ یاساغ بوو.
حَرُمَ الصلاةُ حُرْماً: نوێژکردنەکەی یاساغ بوو.
أحرم الرجلُ: پیاوەکە چووە حاڵەتی ئیحرامەوە یان چووە ناو مەککەوە، یان کەوتە ناو مانگە شەڕ تێدا قەدەغە کراوەکان ٥ یان چووە ناو پەیمانو بەڵێنەوە.
أحرم بفلان: چووە ناو حەرەمی فلانەوە خۆی خستە ژێر حیمایەی ئەوەوە.
أحرم بالصلاة: نوێژی دابەستو چووە ناو نوێژەوە.
أحرم عن الشَّيْءِ: خۆی لەو شتە گرتەوە.
أحْرَمَ بالحج أو العمرةِ: چووە ناو ئەنجامدانی کاری حەج یان عومرە بەوەش ئەو شتەی لەوەپێش بۆی حەڵاڵ بوو ئێستا لێی یاساغە.
حَرَّمَ الشَّيْءَ عليه: شتەکەی لێ یاساغ کرد، بە حەرامی دانا.
احْتَرَمَهُ: ڕێزی لێ گرت.
تحرَّم منه بحُرْمَةٍ: خۆی خستە پەنای کەسێکەوە بیپارێزێ.
تحرَّم فلان بفلان: فلانکەس لەگەڵ فلان ژیاو قسەی لەگەڵ کردو دڵنیا بوو کە ڕێزو وەفا لە نێوانیاندایە.
تَحَرَّمَ بطعامه و مُجالَسَتِهِ: بە نمەك خواردنیو دانیشتن لەگەڵیدا ئەوەی بۆی هەبوو وەری بگرێ لێی یاساغ بوو.
استَحْرَمَ الشَّيْءَ: شتەکەی بە یاساغ داناو حەرامی کرد.
الحرام: یاساغو قەدەغە ٥ (بیت الحرام) کەعبە ٥ (مسجد الحرام) ئەو مزگەوتەی کەعبەی تێدایە ٥ (البلد الحرام) شاری مەککە ٥ (الشهر الحرام): یەکێك لەو چوار مانگانەی شەڕیان تێدا قەدەغە بووە کە مانگی (ذوالقعدة)و (ذوالحجة)و (المحرم)و (رجب) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَات وَالأرض مِنْهَا أَرْبَعَةُ حُرُمٌ﴾.
حرام الله: واتە سوێند بەخوا.
الحرامي: ئەوکەسەی کاری خراپ بکا.
الحَرَمُ: بەستی مەککە ٥ (الحرمان): مەککەو مەدینە.
حرم الرجل: ئەوەی پیاو شەڕی لەسەر دەکاو دەیپارێزێ، (ك: أحْرام)ە.
الحُرْمَةُ: ئەوەی یاساغە پێ شێل بکرێ جا وادەو بەڵێن بێ یان ماف بێ یان ڕەفاقەتیو هەڤاڵیەتی بێ.
الحُرْمَةُ: ئافرەت، ژن.
حرم الرجل: خێزانی پیاو یان ئافرەتی خزمو خوێش.

الحِرْمِـيّ: ئـەوەی نیسـبەت بـە حـەرەم دەدرێ.

الحريم: ئەوەی پاساغە پـێ شێل بکرێو بەبێ ریزی سەیری بکرێ ٥ کراسی ئەوکەسـەی ئیحـرام دەبەسـتێ ٥ هەروا وشەی (الحريم) شتە پەیوەست بووەکانیش دەگرێتـەوە بـۆ نموونـە (حريم الدار) بـەو شـتانە دەگوترێ: کـە پەیوەنـدییان بـە خانوەکـەوە هـەبێ ٥ لـە حەوشـەو بـەر بـێلاّو هەیوانو بەردەرگا.

حـريم المسـجد: هەرچـی پەیوەنـدی بـە مزگەوتەوە هەبێ لە حەوشەو ژوری ئیمـامو ژوری مجـەوەرو تەعزییـە خانەو خوێندنگا.

الحَرِيـمَةُ: ئـەوەی لەناوچـووە لـە تـەماع لێکراوەکان.

المُحَـرَّمُ: ئـەوەی پاسـاغ بـێ ٥ حوشـتری چەموش کە نەتواندرێ کەس بچێتە سـەر پشـتی ٥ یەکـەم مـانگی سـاڵی قەمەری ٥ پێستی دەباغ نەکراو یان ئەوەی دەباغکردنی تـەواو نـەبووبێ هـەروەها شـورکو قامچـی کـە نـەرم نەبووبێ ٥ نەرمەی لوت.

المَحْـرَمُ: مـەحرەم ئـەو ژنو پیـاوەی بەیـەکتر بێـگانە نـەبن، حـەرام بـێ ببنـە هاوسـەری یـەکتریو عەقـدی مارەبڕین ئەنجام بدەن ٥ هەرشتێـك خودا حەرامی کردبێ.

المِحْرَمُ: پۆشاکی ئیحرام بەستن.

المَحْرَمَـةُ و الحُرْمَـةُ: ئـەو شتەی پێشێل کردنـی پاسـاغ بـێ لـە وادەو بـەڵێنو پـەیمانو ئـەو جـۆرە شـتانە ٥ ژنـی پیاو ماڵو منداڵی.

المَحْرُومُ: بەدبەختی وەها بۆ هەرشتێك بچی بە دەستییەوە نەیە.

حَرْمَدَ في الأمـر: زۆر جیڕە جیڕی کـردو لە کارەکەی کۆڵیەوە.

حَرْمَزَةٌ: نەفرەتی لێ کرد.

الحِرْماسُ: سفتو لـووس ٥ رەقو پتـەو، (ك: جراميس).

الحِـرْمِسُ: بـەمانا (الحرمـاس) دێ ٥ دەگوترێ: (سنة حرمس) ساڵێکی پـڕ تەنگژەو گرانـیو قـاتیو قـڕی بـوو، (ك: حَرامِس).

الحَرْمَـلُ: گیایـەکی کێوییـە لـە بـواری تەندروستیدا بەکاردەهێندرێ.

الحَرْمَلَةُ: پۆشاکێکی کورتو پانە لـە مـل دەپێچـرێو دەکەوێتـە سـەر شـانو بەناوقـەدی پشـتدا شۆڕ دەبێتـەوە ٥ دەق دەشـوبهێتە دەسمـاڵی ئـافرەتی کوردەواری.

حَرَنَـت الدابـةُ حِرانـاً وحرونـاً: ولاّغەکـە پاشەو پـاش کشایەوە، کاتێـك داوای لێـکرا بـەرەو پـێش بـڕوا کشـایەوە دواوە.

حَرَنَ فلان بالمكـان: فلاّنکەس لـەو شـوێنە مایەوەو تێیدا نیشتەجێبوو.

حَـرَنَ العسـلُ في الخلیـة: هەنگوینەکـە لـە خەلییەو شانە هەنگوینەکەدا نووسا

بـــه كۆڵەســـەكەوەو دەرهـــاتنی زەحمەت بوو.
حَرَنَ فلان في البيع: فلانكەس لە مامەڵەكەدا زیادو كەمی ئەنجام نەدا بە نرخی خۆی فرۆشتیەوە، (فهو وهي حرون).
المِحْرانُ من النحل: ئەو هەنگانەن كە بەدیار شانە هەنگوینەكەوە بن‌و بەجێی نەهێڵن.
حرا بە حراً: شیاوی ئەوە بوو (فهو حریٌ) ئەو پیاوە شیاوە ٥ (وهي حَرِيَة) ئەو ئافرەتە شیاوە، (ك: حرایا).
حری الشَّيْءُ حریاً: ئەو شتە كەم بوو ٥ (حری علیه): رقی لێ هەڵسا.
حری الشَّيْءَ: روی لەوشتە كرد وای بۆچوو ٥ دەگوترێ: (حری أن یكون ذلك) هیوا وایە ئەوشتە وابێ.
أحْراهُ: كەمی كردەوە.
تَحَرّی بالمكان: لەو شوێنە مایەوە ٥ (تحرّی في الأمور) لەكارەكان دا ویستی باشترەكەیان وەدەست بێنێ.
تَحَرّی الشَّيْءَ: بەمانا (حَرَاهُ) دێ ٥ (تحرّی الشَّيْءَ) زۆری لێ كۆڵیەوە ٥ زۆر بەدویدا گەڕاو ویستی بگاتە بنج‌و بناوانی.
الأحری: باشترو شیاوتر.
الحَراوة: ترش‌و تیژی خۆراك كە لەدەمدا هەستی پێ دەكرێ.
الحَروة: بەمانا (الحراوة) دێ ٥ هەروا چوزانەوەو سوتانەوەیەكە لە قورگ‌و لە سنگدا هەستی پێ دەكرێ ٥ جۆرە سەر ئێشەیەكە ٥ بۆگەنی زۆر ناخۆش.
حَزَأَ الابل ونحوها حَزْءاً: حوشترەكانی كۆكردەوەو لێی خوڕین.
إحْزَوْزَأَ: كۆبۆوە ٥ (احزوزأ الطائرُ) باڵندەكە باڵی لێك نان‌و لە هێلكەكانی دووركەوتەوە.
حَزَبَ الأمرُ حَزْباً: كارەكە توند بوو قورس بوو بە بنبەست گەیشت.
حزب الأمرُ فلاناً: كارەسات تووشی فلان بوو ٥ تەنگ‌و چەڵەمەی هاتە پێش ٥ لە حەدیثدا هاتووە ٥ (كان رَسُولُ اللّهِ صلی الله علیه وسلم اذا حَزَبَهُ أمر صلی): پێغەمبەر (د.خ) هەركاتێ كارێكی گرنگی بهاتایە پێش پەنای بۆ نوێژكردن دەبرد ٥ بەشێك لە دوعاو پاڕانەوەی پێغەمبەر ئەوەبوو دەیفەرموو: (أللهم أنت عُدّتي ان حُزِبْتُ) خودایە تۆ پشت‌و پەنامی كە توشی ناخۆشی‌و چورتم بووم (هو حازب وهي حازبة).
حازب فلاناً: یارمەتی فلانی داو پشتگیری كرد.
حَزَّبَهُمْ: كردنی بە حیزب حیزب‌و پارچە پارچە.
حَزَّبَ القرآن: قورئانی بەش بەش كرد كردی بەچەند حیزبێك.
تَحَازَبَ القوم: قەومەكە بوون بەچەند پارت‌و لایەنێك.

تحازبوا عليه: له دژی ئەو يارمەتی یەکتریان دا.
تَحَزَّبَ القومُ: بەمانا (تحازبوا) دێ.
الحِزْبُ: زەوی توندو پتەو ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزادی بە ورەو جەربەزە ٥ هەر تاقمو پێرو کۆمەڵێك بیرو بۆچونو ئامانجیان جیابێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾.
حزب الرجل: خزمو خوێشو یارمەتی دەرەکانی.
حزب الله: ئەوانەی شوێن پەیرەوو رێبازی ئایینی خودا کەوتوون ٥ ئەوەی ئادەمیزاد خووی پێوە دەگرێ لە ئەنجامدانی عیبادەتو خوێندنی قورئانو زیکرەکان.
الحِزْباءُ: زەوی توندو پتەو.
حَزْحَزَ الشَّيْءَ: شتەی جولاندو دووری خستەوە.
حَزْحَزَ القومَ: هەندێ لە قەومەکەی پێش خستو هەندێکیانی دواخست لەکاتی خۆساز دانا.
تَحَزْحَزَ عن الشَّيْءِ: لە شتەکە دوور کەوتەوە.
اَلْحَزْحَزَةُ: ئازارێکە لە دڵ پەیدا دەبێ بەهۆی نەخۆشی یان رق هەڵسان یان خەفەت یان ترس.
حَزَرَ اللَّبَنُ ونحوه حُزوراً: ترش بوو.
حَزَرَ الوجه: روخساری گرژبوو.
حَزَرَ الشَّيْءَ حَزْراً: لە گۆترە شتەکەی مەزندە کرد (هو حازِر).
الحَزْراءُ: ئەوەی بترشێ لە ماستو شتی تر.
الحَزْرةُ: (حزرة المال): مالّی باشو هەڵبژاردە دەگوترێ: (هذا حَزْرَةُ نفسي) ئەمە باشترینو بەنرخترین شتی لای منە ٥ لە حەدیثدا هاتووە دەفەرموێ: (لا تأخذوا من حَزَرات أنفس الناس شيئاً).
الحَزوُّرُ: شوێنی پتەوو قایم، رەقەلانو سەخت ٥ منداڵی پێگەیشتو چوستو چالاك کە بگاتە تەمەنی باڵغی.
الحَزْوَرَةُ: حوشتری بەستەزمانو بار خۆش ٥ تەپۆڵکەی بچوك.
الحَزَوَّرُ: گەنجی بەهێز ٥ پیاوی بەهێز.
حزيران: مانگی نۆی سورەیانیو مانگی شەشی رۆمی.
الحزيرة من المال: ماڵی باشو هەڵبژاردە، (ك: حزائر).
حَزَّهُ حزاً: شتەکەی بریەوە بەلام دوو کەرتی نەکرد ٥ دەگوترێ: (حزَّ الشَّيْءُ في صدره أو قلبه): ئەوشتە کاری لە دڵو دەروونی کرد.
أحَزَّ علی کرم فلان وشرفه: لە کەرەمو بەخششی فلانکەسی زیادکرد.
حَازَّهُ محازَّةً وحِزازاً: دووری خستەوە ٥ دەگوترێ: (بينهما شركة حِزاز) ٥ ئەو دوو پیاوە هاوبەشییەکی نالەباریان هەیە هیچیان بتمانە بەوی تریان ناکا.
حَزَّزه: زۆری لێ بری، زۆر لێ کردەوە

ﻩ دەگوترێ: (حَزَّزَ اسنانه) لە ددانەکانی زۆر تاشی ددانی پچوك کردنەوە.

احتَزَّهُ: بەمانا (حَزَّهُ) دێ ﻩ هەروا دەگوترێ: (احتَزّ السياف رأسَهُ) شمشێر بەدەستەکە سەری بڕی، سەری لێ کردەوە.

التحزيز: دەگوترێ: (في أسنانه تحزيز) ددانەکانی تیژاییەکیان هەیە وەکوو ددانی مشار وەهان.

الحزاز: ئازارێکە لە دڵدا پەیدا دەبێ بەهۆی نەخۆشییەوە یان رق هەڵسانەوە یان ترس‌و خۆف ﻩ هەروا ئازارێکە بەهۆی خواردنێکەوە کە لەگەدەی دا دەترشێ.

الحزاز من الرجال: پیاوی ئازا بۆ لێخوڕینی شت‌و بۆ شەڕکردن‌و بۆ کارکردن.

الحزازيُّ: بەمانا (الحزاز) دێ.

الحَزَز: بەهێزو توندو تۆڵ ﻩ چالاییەك لەزەوی بکەوێتە نێوان دوو پارچە زەوی توندو پتەو.

الحَزَزُ من الرجال: پیاوی قسە رەق ﻩ کات‌و ماوە.

الحَزَازُ: ئازارێکە پەیدا دەبێ لەدڵدا بەهۆی نەخۆشییەوە یان رق هەڵسانەوە یان ترسەوە.

الحُزَّةُ: پارچە لە جەرگ برابێ یان لەگۆشت برابێ.

الحُزَّةُ من السراويل: شوێنی دوخینەکەیەتی ﻩ شوێنی پشتێن.

الحزيز من الرجال: بەمانا (الحَزَازُ) دێ.

الحَزيز من الأرض: چالایی بکەوێتە نێوان دوو پارچەی رەق‌و توندەوە ﻩ شوێنێك بەردی زۆر بێ بەردەکانی تیژبن وەکوو کێرد شت ببڕن، (ك: احَزّة)ﻩ.

الْمَحَزُّ: شوێنی شت بڕین شت کەرت کردن ﻩ دەگوترێ: (تكلم فاصاب الْمَحَزُّ) واتە: قسەی کردو قسەکانی بتمانە پێکراو بوون‌و شوێنی خۆیان گرت.

الْمِحَزُّ: ئامێرێکی شت بڕینەوەو شت کەرتکردنە ﻩ ئامێری شت مەزندەکردن‌و ئەندازە گرتنە.

حَزَقَ القوم به حَزْقاً: قەومەکە لە دەوری کۆبوونەوە.

حَزَقَ الشَّيْءَ: شتەکەی گوشی‌و زەختی لێکرد.

حَزَقَ الخُفُّ رجلَه: پێڵاوەکە (خوففەکە) قاچی گوشی ﻩ تەنگاوی کرد.

حَزَقَ فلاناً: تەنگی بە فلان هەڵچنی.

حَزَقَ الأسير: پێوەندو کەلەپچەی دیلەکەی توندکرد ﻩ دەست‌و قاچی توند بەیەکەوە بەست.

أحْزَقَهُ: مەنعی کرد نەیهێشت.

تَحَزَّقَ: کۆبۆوە یەك هاتەوە.

تَحَزَّقَ فلان: فلانکەس چروك بوو، دەستی بەماڵی خۆیەوە گرت‌و لێی صەرف نەکرد.

اَلْحُلاَتَـةُ: (حُلاَتَـةُ الصّـوف) ◊ بنەشـەو پتكەپتكەی خوری.
اَلْحُلْتِيتُ: صمغێكی راتنجییە لەبواری پزیشكی دا بەكار دەهێندرێ.
اَلْحَلِيـتُ: ئـەو سیخوارەیە كـە شـەوانی سارد دەكەوێتە سەرزەوی.
حَلَـجَ السـحابُ حَلْجـاً: هەورەكـە بـارانی باراند.
حَلَجَ القُطْن حَلْباً: لۆكەكەی لـە پـرزو پـاڵو توێـكڵو خشـتو خاڵەكـەی پـاك كـردەوە ◊ لۆكەكـەی لەچـیكەنەدا، (هو محلوج وحليجٌ).
حَلَجَ الخُبْزَةَ: نانەكەی خشت كرد.
الحِلاَجَةُ: پێشەی هەلاجی كردن.
الحَلاَّجُ: كەسێـكە پێشەی حەلاجی بكا.
اَلْحَلُوجُ: هەورە تریشقە.
المِحْـلاَجُ: ئـامێری هـەلاجی ◊ تـیروك؛ دارێـكە نـانی پـێ پـان دەكرێتـەوە ◊ گوێدرێژی بچوك، (ك: مَحَالِجَ).
حَلْحَـلَ الشَـيْئَ: شـتەكەی لەشـوێنی خـۆی جوڵاندو گواستییەوە.
تَحَلْحَلَ: شتەكەی جوڵاو لەشوێنی خۆی لاچو.
اَلْحُلاَحِـلُ: تـەواو؛ دەگـوترێ: (حــول حَلاحِــلٌ) ساڵەوەختێـكی تـەواو ◊ گەورەو سەرۆك هۆزو قسە رۆیشتوو ◊ پیـاوی ئـازاو نـەترس لـە كـۆڕو كۆبونەوەكانی دا، (ك: حَلاَحِلَ).
اَلْمُحَلْحَلُ: بەمانا (الحُلاَحِلُ) دێ.

حَلَّزَ الأديمَ وغيره حَلْزاً: پێستەكەی سپی كرد.
حَلِـزَ حَلَـزاً: لەخەفـەتا دڵـی ئـازاری پـێ گەیی.
احْتَلَزَ حَقَّهُ: مافی خۆی وەرگرت.
تَحَلَّزَ الشَّيْئُ: شتەكە مایەوە.
تَحَلَّـزَ القلـب عنـد الحـزن: لـەكاتی خـەم خواردندا دڵی ئازاری پێ گـەیی دڵـی گوشرا.
تَحَلَّزَ فـلان للأمـر: فلانكەس خۆی بـۆ كارەكــە ئامــادە كــردو قــۆڵی لێ هەڵماڵین.
اَلْحَالِزُ: دەگـوترێ: (قلب حَـالِزٌ) دڵێـكی هێشاو پڕ ئازار.
اَلْحَلِـزُ: دەگـوترێ: (قلـب حَلِـزٌ) دڵێـكی برینـدار.
اَلْحِلِزُ: كوندەبەبو ◊ كورتە بالا ◊ پیـاوی رژدو چروك ◊ بەدرەوشت.
اَلْحَلَزُونُ: پێرۆیەكە لەتەویلەو پشتیرا دەژی ◊ گیاندارێكی ناوییە لەناو صەدەفەكەی خـۆیدا دەژی ◊ هەنـدێ لـەو گیاندارانـە بەكەڵكی خواردنیش دێ.
اَلْحَلَزُونـی: ئـەوەی پـاڵ دەدرێ بـۆلای حەلەزون.
حَلَسَتِ السماءُ حَلْسـاً: ئاسمـان بارانێـكی وردی بەردەوامی باراند.
حَلَسَـتِ الدابّـةُ: سـەرجلی لەپشـتی وڵاخەكە كرد.
حَلِـسَ بالمكـان وفيـه حَلَسـاً: لـەو شـوێنە مایەوە.

**حَلِسَ فلان**: لەبەرامبەر هاوشانەکەیدا خۆڕاگربوو.

**حَلِسَ بالشَّيْءَ**: شەیدای شتەکە بوو خۆی پێوەگرت ٥ (هو حَلِسٌ، وهي حَلِسَةٌ، هو أحْلَسُ وهي حَلْساء).

**أحْلَسَتِ السَّمَاءُ**: بەمانا (حَلَتَ) دێ.

**أحْلَسَت الأرض**: گژو گیاکەی راساو زەوییەکەی داپۆشی.

**أحْلَسَت الدابة**: بەمانا (حَلَسَهَا) دێ.

**أحْلَسَ فلاناً**: وادەو بەڵێنی تەواوی دایە.

**أحْلَسَ فلاناً في البيع**: زیانی لەفلانکەس دا لەمامەڵەدا.

**أحْلَسَ فلاناً على الأمر**: فلانکەسی هەڵنا بۆ ئەوکارە.

**حالَسَهُ**: پێوەی نووساو لەکۆڵی نەبووەوە ٥ دەگوترێ: (هو يجالِسُهُ ويُحَالِسُهُ).

**تَحَلَّسَ له**: دەورەی دا ٥ (تحلس بالمكان) لەو شوێنە مایەوە.

**اسْتَحْلَسَتِ الأرض**: بەمانا (أحْلَست) دێ ٥ دەگوترێ: (استحْلَسَ السنامُ): بەزی سەریەك نا.

**اسْتَحْلَسَ الليلَ بالظلام**: تاریکایی شەو پەرەی سەندو تەواو دونیا تاریك بوو.

**استحْلَسَ الشَّيْءَ فلاناً**: ئەوشتە بە فلانکەسەوە نووساو لەکۆڵی نەبووەوە ٥ دەگوترێ: (إستحْلَسَه الخوف): ترس دایگرت و لەکۆڵی نەبۆوە.

**اَلحَلْسُ**: وادەو بەڵێنی تەواو.

**اَلحِلْسُ**: هەر پارچە قوماشێك لەژێر زین و لەژێر کورتانەوە لە پشتی وڵاخ بکرێ ٥ هەروا هەرشتێك لەماڵا لەژێر فەرشی بەنرخ و ئەو جۆرە شانە رابخرێ وەکوو حەصیرو بەڕە ٥ هەروا دەگوترێ: (هو حِلْسُ بيته) واتە: بۆتە سیپاڵی ماڵەوەو دەرناکەوێ ٥ (هو أحلاس البلاد، وهو من أحلاس الخيل) وڵات بەجێ ناهێڵێ ٥ هەمیشە بەسەر ئەسپەوەیەو دانابەزێ ٥ هەروا ناوە بۆ چوارەم قوداحی قومار کە چوار بەشی هەن ٥ پەیمان و بەڵێن ٥ هەروا دەگوترێ: (هذا ليس من أحلاس فلان) ئەو هاوشانی فلان نیە ٥ (أم حِلْس) کونیەی دێڵەکەرە.

**الحُلَيْسُ**: (ام حُلَيْس) کونیەی دێڵەکەرە.

**حَلِطَ حَلْطاً**: رقی هەڵسا ٥ لەسوێند خواردن دا زێدەڕۆیی کرد ٥ (حَلَط في الأمر) پەلەی کرد.

**أحْلَطَ**: بەمانا (حَلَط) دێ.

**أحْلَطَ فلان**: فلانکەس چووە خانوێکی خەتەرناکەوە زەحمەتە بتوانێ ژیانی تێدا بەسەربەرێ.

**أحْلَطَ بالمكان**: لەو شوێنە مایەوە.

**أحْلَطَ فلانا**: رقی فلانی هەڵساند.

**إحْتَلَطَ عليه**: رقی لێ هەڵسا ٥ (احتلط منه) لێی وەڕز بوو.

**حَلَفَ حَلِفاً وحَلْفاً**: سوێندی خوارد (هو حَالِف وهي حَالفة).

**حَلُـفَ الشَّـيْئَ**: تیـژبوو ٥ برنـده بـوو ٥ دەگـوترێ: (حَلُـف السـیفُ وحَلُـفَ اللسان).

**أحْلَفَـت الأرضُ**: زەوی (حـەلف)ی روانـد؛ روەکێـکە وەکوو لق‌و پـرژی خورمـا وەهایـە لـەزەلکاوو دەم ئـاودا دەڕوێ، بەکوردی پێی دەگوترێ (قەفەزاڵ).

**أحْلَفَتْ**: قەفەزاژەکە پێگەیی.

**أحْلَفَ الشَّیْئُ**: خـەڵك لـە بارەیـەوە راوو بۆچـوونی جیاجیایـان هـەبوو بۆیـە هەرکەسـه بەجۆرێـك سـوێندی لەسەر خوارد.

**أحْلَـفَ فلانـاً**: داوای لێ کـرد سـوێندی بۆبخوا.

**حَالَفَـهُ مُحالَفَـةً وحِلافـاً**: پـەیمانی لەگـەڵ بەسـت ٥ (حَـالَفَ بینهمـا) برایـەتی خستە نێوانیانەوە.

**تحـالفوا**: یـەکیان گـرت‌و بوونـه هاوپەیمانی یەکتر.

**استَحْلَفَهُ**: سوێندی دا.

**الْحَلَـفُ**: قەفـەزاژ؛ روەکێـکە پەلکـەکانی وەکـوو پـەلکی دارخورمـا وایـە، لەزەلکاوو گەڕاودا دەڕوێ.

**اَلْحِلْفُ**: پـەیمان بەسـتن لەسـەر هاریکاری کردنی یەکتر، (ك: أحلاف).

**الْحَلْفَاءُ**: بەمانا (اَلْحَلَـف) دێ ٥ هـەروەها ناوە بۆ کەنیزەکی خراپ‌و ناشیرین، (ك: حُلْفٌ وحُلُفٌ)ە.

**اَلْمَحْلَفَةُ**: زەوییەك گیاقەفەزاژی لێ بروێ یان زۆری لێ بروێ.

**اَلْحَـلاَّفُ**: کەسێـك زۆر سـوێند بخـوا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَـا تُطِـعْ كُـلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ﴾.

**الْحَلِيفُ**: پارمەتیدەرو هەمناهەنگ، (ك: أحلاف وحُلَفاء) ٥ هـەروا بەکەسێـك دەگـوترێ: باربەشتێـکەوە بگـرێ‌و وازی لێ نەهێنێ ٥ دەگـوترێ: (فـلان حلیف الجود وحلیف الفصاحة).

**حلیف اللسان**: زمان تیژو چەقە چەناو.

**اَلْحُلْفُقُ**: ئـەملاو ئـەولای پەیـزە، شـانی پەیزە.

**حَلَقَ الضَّرْعُ حَلُوقاً**: گوانەکە لەبەر ئـەوەی شـیری کـەم تێدایـە هەڵکشاوەتەوە ٥ دەگوترێ: (حَلَقَ لبن الضـرع): شـیری گوانەکە چۆوە یان کەم بوو.

**حَلَـقَ فلانـاً حَلْقـاً**: لەگـەردنی فلانـی دا ٥ دەگـوترێ: (حَلَقَـهُ الـداءُ) دەردەکـە قوڕگی ئازاردا.

**حَلَقَ الإناء**: گۆزەکەی پڕکرد تا گەیشتە ملی.

**حَلَقَ الشَّيْئَ**: شـتەکەی سپی کـرد توێـکڵ‌و مووی لێ داماڵی.

**حَلَقَ الرأسَ**: سەری تاشی‌و مووی سـەری لێ کردنەوە.

**حلقت الماشية**: مەڕو ماڵاتەکە بەسـەر گیاو گژەکەدا هاتن هەموویان خوارد.

**حَلَـقَ القـومُ أعـداءَهُمْ**: قەومەکـە هـەموو دوژمنەکانیان لەناو بردن.

**أحْلَقَ الاناء**: بەمانا (حَلَقَهُ) دێ.

**حَلَّـقَ القَمَـرُ**: مـانگ خەرمانـەی داوە ٥

دەگوترێ: (حَلَّقَ علی اسم فلان): بازنەیەکی بەدەوری ناوی فلانکەسدا هێناو لەلیستەکە دەری کردو کۆبوونەکەی بڕی.

**حَلَّقَ الاناءُ ونحوه**: گوزەکە، جەرەکە ئەوەی تێیدا بوو تا ملی هات.

**حَلَّقَ البسرُ**: هێشوە خورماکە دوبەش لەسێ بەشی بوو بەخورمای گەیو.

**حَلَّقَ الضِرعُ**: گوانەکە پڕبوو لەشیرو هەلاوسا.

**حَلَّقَ الطائر**: باڵندەکە لەهەوادا زۆر بەرز بووەو سوڕایەوە.

**حَلَّقَ ببصره الی کذا**: چاوی گێڕاو چاوی بەرزکردەوە بۆلای.

**حَلَّقَ بالشیئ الی فلان**: شتەکەی بۆ لا فڕێ دا.

**حَلَّقَ ماء البئرِ**: ئاوی بیرەکە داکەوتو کەم بوو ڕۆچوو.

**حَلَّقَتْ عَیْنُ البَعِیرِ**: چاوی حوشترەکەی بەقوڵا چوو.

**حَلَّقَ الشَعْرَ**: زێدەرەوی کرد لەتاشینی مووی ڕیش‌و سمێڵی.

**حَلَّقَ الشَّیْئَ**: شتەکەی والێکرد بازنەیی بێ.

**حَلَّقَ الدابَّةَ**: حەیوانەکەی بەداخی کەوانەیی داخ کردو نیشانە زەدی کرد.

**احْتَلَّقَ الرجلُ**: پیاوەکە مووی خۆی تاشین.

**احْتَلَّقَ الشَّیْئَ**: بەمانا (حَلَّقَهُ) دێ.

**احتَلَّقَت السنةُ الماشیةَ**: ساڵەکە نەهاتی بوو هەموو ئاژەڵی فەوتان.

**تَحَلَّقَ القومُ**: خەلکەکە بەشێوەی بازنەیی دانیشتن.

**تَحَلَّقَ القمرُ**: مانگ خشت بوو بوو بە مانگی چواردە.

**تحلاق**: (یوم تحلاق): ئەو ڕۆژەیە کە لەشەڕی بەسوسدا بەنو تەغلەب زاڵ بوون بەسەر هۆزی بەکردا، بۆیەش بەوناوە مەشهوربوو چونکە شیعاریان سەر پەڕاندن بووە.

**اَلْحَالِقُ**: شوێنی بەرز ٥ هەوای نێوان ئاسمان‌و زەوی.

**اَلْحَالِقُ من الرجال**: ئەو پیاوەیە ببێتە هۆی نەگبەتی بۆ هۆزەکەی.

**الحالق من السیوف**: شمشێری بڕندەو تیژ.

**اَلْحَالِقَةُ**: پچڕاندنی صیلەی ڕەحم ٥ ستەمکاری ٥ قسەی خراپ‌و فیتنە جۆ ٥ ساڵی قات‌و قڕی کە هیچ نەهێڵێ ٥ مردن.

**الحالوقُ**: مردن.

**الحالوقةُ من الرجال ومن السیوف**: بەمانا (الْحَالِقُ) دێ.

**حَلاَقِ**: مردن ٥ ناوە بۆ مردن.

**الحِلاَقُ**: دوورخستنەوەی کوڵك‌و مووە لەسەر.

**الحُلاَقَةُ**: ئەو موانەی کە لەدوای تاشینی سەرو ڕیش دەکەونە سەر زەوی.

**الحِلاقَةُ**: پیشەی سەرتاشی.

**الْحَلْقُ**: گەردن ٥ گەرو، (ك: احلاق وحلوق وحُلُقٌ) ٥ (حرف الحلق) ئەو پیتانەن کە لەگەرو دێنەدەر:

حەرفی حەلقە شەش بوەد ئەی نوری عەین !
هاءو هەمزە حاءو خاءو عەین‌و غەین

حلوق الأرض والآنيةِ والحياضِ: ڕێڕەوی ئاو دۆڵو شیوو تەنگەبەرانی.

الحَلَـــقُ: حوشـــتری داخکـــراو بـــەداخی کەوانەیی ٥ گوارە.

اَلْحَلَقَـةُ: هـەر شتێـك كەوانـەیی بـێ ٥ وەکوو ئەڵقەی دەرگا ٥ ئەڵقەی زێڕو زیوو پلاتین کە لـە پەنجە دەکرێ ٥ دەگوترێ: (حَلَقَـةُ القـوم): دانیشتنی کەوانەیی قەومەکە ٥ (تلقى العِلـمَ في حَلَقَـــةِ فـــلان) لەحەلقـــەی دەرس وتنەوەی فلان زانیاری وەرگرتووە.

حَلَقَـةُ المَاشِيةِ: ئـەو داخـە کەوانەییـەی ئاژەڵی پێ نیشان دەکرێ.

حَلَقَةُ الباب: ئـەو ئەڵقـە کەوانەییـەی کە بە دەرگاوەیە بۆ لێدان ٥ (ورفيت حَلَقَهُ الْحوض): حەوزەکە نزیکە پڕبێ.

الْحَلْقَـــةُ: چـەك بەگشـتی یـان چـەکی زرێپۆش.

الْحَلاَّقُ: صیغەی موبالەغەیە ٥ یان ئـەو کەسەی پیشەی سەرتاشینە.

المِحْلاَقُ مِن الكرم: ئەو تولە میوانەن کە بـــەم لاو بـــەولای کەپرەکـــەدا هەڵدەگـــەڕێو پـــەل دەهـــاون، (ك: محاليق ومحالِقُ).

اَلْمِحْلَقُ: موس ٥ گوێزان ٥ بەرگی زبر.

اَلْمَحْلَقُ: شوێنی سەرتاشینە بـۆ ئیحـرام شکاندن، لەمینا.

اَلْمُحَلِّقُ من الشياه: مەڕو بزنی لەڕو لاواز.

حَلْقَمَ البُسْـرُ: هێشوە خورماکـە زیـاد لە دووبەش لەسێ بەشی گەیی.

حَلْقَـمَ الحيـوانَ: سـەری بـڕیو گـەروی هەڵبڕی.

الْحُلْقامَةُ: هێشوە خورمـا کـە ئـاڵو بـۆڵی تێـکەوی زیـاد لـەدوو بـەش لەسـێ بەشی گەیبێ.

الْحُلْقُومُ: گەرو، (ك: حَلاقم وحلاقيم).

حلاقيم البلاد: دەوروبەری وڵات.

حَلْقَنَ البُسْرُ: بەمانا (حَلْقَمَ) دێ.

اَلْحُلْقَانـة: بـەمانا (الْحُلْقامـــة) دێ، (ك: حُلْقانٌ)ە.

حَلَكَ حَلْكـاً وحُلْكـةً: زۆر ڕەش بـوو (هـو حَلِك وحالِكَ).

اسْتَحْلَكَ: ڕەشاییەکەی زۆر بـوو وەکوو شتی سوتاو.

اِحْلولَكَ: بەمانا (استحلك) دێ.

اَلْحَلَكُ: شتی زۆر ڕەش.

اَلْحُلْكَةُ: زۆر ڕەش.

حَلَّ الشَّيئَ حلالاً: شتەکە ڕەواو حەڵاڵ بوو.

حَلَّت المرأةُ: ئافرەتەکە بـۆ ئـەوە دەبـێ مـــارەبکرێ ٥ قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّـىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ﴾.

حَـلَّ الْمُحْـرِمُ: حـاجی ئیحرامەکـەی شکاند، ئـەو کەسـەی ئیحرامـی بەسـتبێ بـۆی ڕەوا دەبێ ئەوەی لەکاتی ئیحرامەکەدا لێـی یاساغ بـوو ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا حَلَلْـــتُمْ فَاصْـــطَادُواْ﴾ کـــە ئیحرامتـــان شـــکاند بۆتـــان ڕەوایـــە ڕاوبکەن.

**حَــلَّ الــدين حلــولاً**: قەرزەکــە وەختــی دانەوەی هاتو واجب بوو.

**حَلَّ غضب الله**: رق‌و قاری خودا نازڵ بوو.

**حَلَّ العُقْـدَةَ**: گـرێ کوێرکەکـەی کـردەوە ٥ دەگوترێ: (حَلَّ المشكلة ونحوها).

**حــل الجامِـدَ**: سـەهۆڵەکەی توانـدەوە، شـتە رەقبووەکەی شل کردەوە، تواندییەوە.

**حَلَّ الكلامَ المنظومَ**: دەقە هۆنراوەکەی کرد بە پەخشان.

**حَــلَّ المكــانَ وبــه**: لـەو شـوێنەدا مایـەوە نیشـتەجێ بـوو، دەگـوترێ: (حللـت القومَ وحللت بهم وحللت عليهم).

**حللت البيتَ**: لەو خانوەدا نیشتەجێ بوم.

**أحَــلَّ**: لـەئیحرام بەسـتن زگـاری بـوو ئێسـتا ئەوشـتانەی لـەوەپێش لێـی حەرام بووە بۆی هەیە بیانکا.

**أحَلَّ فلان**: لەناوچەی حەرەم دەرچوو ٥ خـــۆی لەپابەنـــدبوون بـــەوادەو بەڵێنەکانی رزگارکرد.

**احَلَّ فلاناً المكانَ وبه**: کابرای لـەو شـوێنە نیشتەجێ کرد.

**أحَـلَّ الشَّـيْءَ**: شـتەکەی حـەڵاڵ کـرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾.

**حَالَّــهُ**: لەگــەڵیا دابــەزی، پێــکەوە نیشتەجێ بوون.

**حَلَّلَ العُقْدَةَ**: گرێکەی کردەوە.

**حَلَّلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی گێڕایەوە بۆ حاڵی پێشـــووی ٥ بردیـــەوە ســـەر عونصورەکانی پێشوی ٥ دەگـوترێ: (حَلَّلَ الدم وحَلَّلَ البول).

**حَلَّـلَ نفسية فـلان**: دەروونـی فلاّنکەسـی شــی کــردەوە ٥ نهێنییــەکانی نــاو دەروونی کابرای ئاشکرا کردن.

**حَلَّلَ اليمينَ**: کەفارەتی سوێندەکەی دا.

**حَلَّلَ الشَّيْءَ**: شتەکەی حەڵاڵ کرد.

**احتل المكانَ وبه**: تێیدا نیشتەجێ بوو.

**احتلــت دولــةٌ بــلادَ أخــرى**: دەوڵەتێــك وڵاتێکی تری داگیرکرد.

**انْحَلَّتِ العُقْدَةُ**: گرێکە کرایەوە.

**تَحَلَّــلَ مــن يمينــه وفيهــا**: لــەگوناهی سوێندەکەی رزگاری بوو.

**اسْتَحَلَّ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەحەڵاڵ دانا.

**اِسْـتَحَلَّ فلانـاً الشَّـيْءَ**: داوای لەکابراکـە کرد ئەو شتەی بۆ حەڵاڵ بکا.

**الإحــــتلال**: داگیردنــــی وڵاتێــــك یــــان هەندێکی لەلایەن وڵاتێکی ترەوە.

**الإحليــــل**: گــوێ وانیێــکی ئــادەمیزادی نێرینــە ٥ گــوێ مــەمك شــوێنی لێ هاتنــە دەرەوەی شــیر ٥ گــوێ گــوان، (ك: أحاليل).

**التَّحِلَّةُ**: (تحِلَّةُ اليمين) کـەفارەتی سـوێند ٥ قورئان دەفـەرموێ: ﴿قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ﴾.

**التحليل**: (تحليل الجملة) شـی کردنـەوەی پێکهاتەی رستەو دیاریکردنی رۆڵی هەریەکێ لەوانە.

**التَّحْليلُ النفساني**: بەشێـکە لـە زانستی دەروونناسی.

اَلْحَلاَلُ: شتی حەلاڵ ٥ شتێك كە یاساغ نەبێ.

الحِلاَلُ: ئامێرێكە ئافرەت سواری دەبێ.

اُلْحَلَـلُ: شلیەكە لەقاچی ولاخدا پەیدا دەبێ رەگی قاچی شل دەبن.

الحِـلُّ: شـتی رەواو حـەلاڵ ٥ شوێنێـك كـە لەدەرەوەی حەرەم بێ ٥ ئـەو مەبەستەی هـەوڵی بـۆ دەدەی ٥ دەشـگوترێ: (فـلان حِـلٌّ ببلـد كـذا) فلانكەس نیشتەجێی فلان شارە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَنـتَ حِلٌّ بِهَذَا الْبَلَدِ﴾ ٥ (فلان حِلٌ مـن احرامـه) فلان لەئیحرامدا نیە.

اَلْحَلُّ: رۆنـی كونجی كە پێشی دەگـوترێ (شَيْرَج).

اَلْحُـــلاَّن: كـــارەكێوی ٥ هەرشتێـــك منداڵـدانی دایكـی هەڵبـدرێو بێتـە سەردونیا.

حَـلاَّنُ الـیمینَ: كـەفارەتی سـوێند ٥ (دَمٌ حلاَّن) خوێنی ناحەق.

اَلْحَلَّـــةُ: زەنبیلەیــــەكی گەورەیــــە خواردەمـــــەنی تــــێ دەكـــــرێ ٥ مەنجەڵێـكی مەعدەنییـە خـواردنی تێدا ئامادە دەكرێ.

اَلْحِلَّةُ: خانووی هاووڵاتیان ٥ دیوەخـانی خــــەڵك ٥ كۆمەڵێــــك خــــانووی نیشـــتەجێ بــــوون ٥ درەختێــــكە هــەركاتێ حوشـتر گەلاكـەی بخـوا بەئاسانی شیردەدا، (ك: حِلَل وأحِلَّة).

اَلْحُلَّةُ: پۆشاكی تازەو باشو ئەستور، یان تـەنك ٥ هـەروا پۆشاكێـكە نـاواخنی هــەبێ ٥ دوپارچــە پۆشــاك كەیــەك جــۆربن یــان ســێ پارچــە پۆشــاك ٥ وادەبـێ بـەكراسو دەرپـێ دەگـوترێ ٥ هەروا ناوە بۆ ئـافرەت ٥ بۆچەك، (ك: حُلَلٌ وحِلال).

اَلْحُلُـــولُ: یــــەكگرتوویی دوو قـــەبارە دوومـــــاددە بەجۆرێـــــك ئامـــــاژە بۆیەكیان بكەی بری ئاماژەكردن بـۆ ئەوی تریان بكەوێ.

مــــذهب الحُلُــــول: ئــــەو بــــیرو بــــاوەڕو بۆچــــونەیە كــــە دەڵــــێن: خــــودا لەهەموو شتێكدا هەیە.

الحُلُولِيَة: پیرێكن لە سۆفیو پێیان وایـە خودا لە هەموو شتێكدا هەیە.

اَلْحَلِیلُ: پێچەوانەی یاساغە ٥ دراوسێ ٥ (حلیل الرجل) هاسەری پیاو ٥ (حلیل المرأة) مێردی ژن.

المِحْلال: (مكان محلال): شوێنێكە خـەڵكی زۆر بۆ بچێ.

اَلْمَحَلّ: شوێنی كار ٥ ئەو شوێنەی تێیدا دادەنیشی.

مَحَل الاعـراب: لەزانستی نەحوییەكانـدا ئەو حاڵەتەیە وشەكە ئەگەر موعرەب بێ ئەو جۆرە ئیعرابە وەردەگرێ.

اَلْمَحِلُّ: ئـەو شـوێنەیە دەبێتـە شـوێنی نیشتەمەنی.

مَحِلّ الدین: كاتی دانەوەی قەرز.

مَحِـلّ الهـدي: رۆژی قوربـانی ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَلاَ تَحْلِقُـواْ رُؤُوسَـكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ﴾.

اَلْمُحَلِّلُ: شتی کەم ٥ شوێنێك خەڵکی زۆر بۆ بچی ٥ دەگوترێ: (مکـان مُحَلِّـلٌ) شوێنێکە خەڵکی زۆر تێ بچێ.

اَلْمُحَلِّـلُ: ئـەو پیاوەی ژنـی سێ بەسێ تەڵاقدراوی لێ مارە بکرێ بۆ ئـەوەی تـەڵاقی بداتـەوە ئـەمجار مێـردە کۆنەکەی مارەی بکاتـەوە، بـەکوردی (مـارە بـەجاش)ی پـێ دەگـوترێ ٥ پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمـەوێ: (لَعَنَ الله الْمُحَلِّلَ والْمُحَلَّلَ لە).

اَلْمَحَلَّـةُ: شـوێنی نیشـتەجێ بـوونی نەتەوە ٥ گەڕەك و هۆبە.

اَلْمُحِلَّـةُ: خانوێـك یـان دو خـانوو کـە بەیەکەوە بن ٥ (تاقە ماڵە یـان دوو ماڵ).

الْمُحِلاَّتُ: دیزە ٥ تاش ٥ دۆڵچە ٥ کوندە ٥ سوێنە ٥ کێرد ٥ پاچ ٥ ئاگر ٥ ئەمانـە هـەموویان پێداویسـتی ناومـاڵن و گـرنگن، هەرکەسێ ئەمانـەی هـەبن دەتوانـێ بۆخـۆی سـەربەخۆ دوور لەئاوایی ژیان بەسەر بەرێ.

حَلَمَ حُلْماً وحُلُماً: خەوی بینی ٥ منداڵەکە باڵغ بوو لەتەمەنی منداڵی تێپەڕی.

حَلَمَ بـە وعنـە: خـەوی پێوە بینـی (حَلَمَ الشَّیءَ وبە) لەخـەودا شتەکەی بینـی یان خەوی بەو شتەوە بینی.

حَلَمَ الجِلْدَ حَلْمـاً: پـرزو پـاڵ و کرمـۆڵی لـە پێستەکە داماڵی.

حَلِمَ البَعِیرُ حَلَمـاً: حوشـترەکە گەنـەی زۆر پێوە بوون.

حَلِمَ الجلـدُ: پێستەکەی کرمـی تێـکەوت و دایرزاند.

حَلُمَ حِلْماً: رقی نیشتەوەو هاتەوە سەرخۆ ٥ لێ بـوردەیی پـەیڕەوکرد ٥ عاقـل بوو.

أَحْلَمَ: منداڵی لەسەرخۆو ئاقڵی بوون.

حَلَّمَـهُ الرضـاعُ والأکـلُ: شـیرو خـۆراك قەڵەوی کرد.

حَلَّمَ القِربةَ: کوندەکەی پڕکرد لەئاو.

حَلَّـمَ فلانـاً: فلانکەسـی والێـکرد لەسەرەخۆبێ.

حَلَّـمَ الحیـوانَ: گەنـەو ئەسـپێکانی لەئاژەڵەکان کردەوە.

اِحْتَلَمَ: بەمانا (حَلَمَ) دێ ٥ هەروا بـەمانای ئەوەش دێ منداڵەکە باڵغ بوو.

تَحَالَمَ: بەرواڵـەت خـۆی بەلەسـەرەخۆ نیشان دا.

تَحَلَّمَ: بـەزۆر لەسـەرخۆیی و بـارقوڵی بەسـەر خـۆی دا هێنـا ٥ بـەدرۆ وتـی خەونم دیوە.

اَلتَّحْلَمَةُ: (شـاة تِحْلَمَـةٌ): مەڕێـکە زۆری گەنە پێوەن.

الحـالوم: لـۆرك یـان فـرۆ ٥ یـان شـیریژ (شیر خەسـت ببێ و وەکـوو پـەنیری لێبێ و پەنیریش نەبێ).

اَلْحُلاَّمُ: کاریلەو بەرخۆلە، ئـەو بێچووەی شیری دایکی بخوا.

اَلْحَلَمُ: گەنەو ئەسپێی بچوك یان گەورە.

اَلْحُلْـمُ: ئـەو شـتەیە ئـادەمیزاد لەخـەودا دەیبینێ.

**الحِلْمُ**: لەسەرخۆیی و دان بەخۆداگرتن ◊ عەقڵ و ئاوەز ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَامُهُم﴾.

**اَلْحَلَمَةُ**: گەنەی گەورە یان بچوك ◊ کرمێکە بەپێستەوە دەنووسێ دەیخوا ◊ جا کە پێستەکە دەباغ دەکرێ پێستەکە کونکون و شەقار شەقار دەبێ ◊ هەروا ناوە بۆ گۆی مەمك کە شیری لێ دێتەدەر ◊ گیا سەعدانە.

**حلا الشَّيْءَ حلاوةً**: شتەکە شیرین بوو.

**حَلَتِ الفاكِهَةُ**: میوەکە پێگەیی و خۆش بوو.

**حلا الشَّيْءَ له في عينيه**: شتەکەی بەلەزەت بوو جوان بوو.

**حلا من فلان**: فرسەتی لەفلانکەس هێنا.

**حَلَا المرأةَ حَلْواً**: خشڵی دا بەئافرەتەکە.

**حلا فلاناً الشَّيْءَ وبالشَّيْءِ حَلْواً**: شتەکەی دا بەفلانکەس.

**حَلِيَ الشَّيْءَ**: شتەکەی بەشیرین دانا.

**أَحْلَى الشَّيْءَ**: شتەکەی شیرین کرد ◊ بەشیرینی کەوتە بەردەستی.

**احلى المكانَ**: شوێنەکەی بەلاوە خۆش بوو تێیدا مایەوە.

**حالاه**: بەخۆشی حسێب کردو خاتری گرت نەگینا وانەبوو.

**حَلَّى الطعامَ**: خواردنەکەی شیرین کرد ◊ دەگوترێ: (حَلَّى الشَّيْءَ في عينيه): شتەکەی لەپێش چاو شیرین کرد.

**تَحَالَّى**: بەزۆرە ملێ ویستی خۆی بەنەجیب و شیرین زمان بخاتە بەرچاو.

**تَحَلَّى**: شیرین زوبانی لێ داو وانەبوو.

**تَحَلَّى الشَّيْءَ**: شتەکەی بەشیرین لەقەڵەمدا.

**احْلَوْلَى الشَّيْءَ**: شیرین و جوان بوو.

**احلولى فلان الجاريةَ**: کەنیزەکەی بەردڵ کەوت و پێی جوان بوو.

**اَلْحَلَى**: تێمیسك و زیبکە، کە لەدەمی منداڵ دێن.

**حلاوة القفا**: ناوەڕاستی پشتەمل.

**اَلْحَلْواءُ**: حەڵوا، (ك: حَلَاوَى).

**اَلْحَلْوَى**: هەر خواردەمەنییەك شەکر یان هەنگوینی تێکەڵ بکرێ ◊ هەروا ناوە بۆ میوەی شیرین.

**اَلْحُلْوانُ**: کرێی دەلاڵ ◊ بەرتیل.

**اَلْحُلْوَانِيّ**: حەڵوافرۆش ◊ حەڵوا دروستکەر ◊ حەڵواچی.

**اَلْحُلُوُّ**: شتی زۆر شیرین.

**اَلْحَلِيُّ**: شتی باش و زۆر شیرین.

**اَلْمَحْلَى**: شوێنێکە حەڵوای تێدا دروست دەکرێ یان لێی دەخورێ.

**حَلَى المرأةَ حَلْياً**: خشڵی بۆ ئافرەتەکە کرد.

**حَلَّى المرأةَ والسيفَ وغيرهما**: بەخشڵ رازاندییەوە.

**حَلِيَتْ الجاريةُ حَلْياً**: کەنیزەکەکە بوو بەخاوەن خشڵ ◊ یان کەنیزەکەکە خشڵی پۆشی ◊ یان سوودی لەخشڵ بینی.

**حَلِيت الشجرة**: درەختەکە گەڵای کرد، میوەی وەبەر هێنا.

حَلَّى الجارِيَةَ: خشلّى بۆ کەنیزەکەکە هێنا بۆ ئەوە بیپۆشێ ٥ خشلّى کردە بەری ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَيُحَلَّـوْنَ فِيهَـا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ﴾.

حَلَّى السَّيْفَ: شمشێرەکەی خشلّ دار کرد.

حَلَّـى فلانـاً: وەصـفى فلاّنکەسـى لـەدلّى کەسانى دیکەدا شیرین کرد.

حَلَّى الشَّيْءَ في عين فلان: شتەکەی لەپێش چاوی فلاّنکەس جوان کرد.

تَحَلَّى: بۆ موطاوەعەی (حلاّه) دێ.

تَحَلَّت الجاريةُ: کەنیزەکەکە خۆی بەخشلّ رازاندەوە.

تَحلَّى بالفضيلة: بوو بـەخاوەنی رەوشـتی جوان.

اَلْحَلَـى: تێمیسـكو زیبکـە، کـە لـەدەمی مندالّ دێن.

الحِلاَةُ (حلاة السيف): رازاندنەوەی شمشێر.

اَلْحَلْـيُ: ئەوشـتانەی دەکـرێن بەخشـلّو خـۆی پـێ دەرازێندرێتـەوە، وەکـوو متو میروو بـەردی بـەنرخو پارچـە زێـرو زیـو ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَاتَّخَـذَ قَـوْمُ مُوسَـى مِـن بَعْـدِهِ مِـنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلاً جَسَدًا لَّهُ خُوَارٌ﴾.

الحِلْيَةُ: بۆ شمشێر جوانیەکەی بـۆ پیـاو رەوشتو روخساری.

حَمَـأَ البِئـرَ حَمْئـاً: قـوڕی بنکـی بیرەکـەی دەرهێنا.

حَمِئَ الماءُ حَمَأً: ئاوەکە قوڕی زۆری تێدا بـوو ئاوەکە لێلّ بوو بۆنی ئاوەکە گۆڕا.

حَمِئَ فلان على فـلان: فلاّنکـەس رقـی لـە فلاّن هەلّسا.

أحْمَأَ البِئْرَ: بیرەکـەی قـوڕاو کـرد، قـوڕی کردە بیرەکەوە.

اَلْحَمْأَةُ: قوڕو لیتە.

اَلْحَمَـأُ: قـوڕە رەشو گـوراوو بۆگـەن ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَـدْ خَلَقْنَـا الإِنسَـانَ مِـن صَلْصَـالٍ مِّـنْ حَمَـإٍ مَّسْنُونٍ﴾.

اَلْحِمِئُ: پیاوی چاو پیس.

حَمِتَـهُ الله عليـه حمتـاً: خـودا بەسـەریا رشتو زالّی کرد.

حَمِت الجوز وغيره حَمْتاً: گوێزەکە پوچەلّ بوو تامی گۆڕا.

حَمِتَ التَّمرُ: خورماکە زۆر شیرین بوو.

حَمُتَ اليوم حموتةً: گەرماکەی تـاوی سـەندو رۆژێکی گەرم بوو.

حَمُتَ الشَّيْءُ: شـتەکەی گەییشـتە کۆتـایی‌و باش بەرهەم هات.

تَحَمَّتَ لَوْنُهُ: رەنگەکەی پالّفتە بوو.

الحَمِيتُ: زێدەڕۆو توندو تیژ لە هەموو شتێکدا.

الحميتُ: هیزە؛ رۆنی یـان هـەنگوین یـان زەیتی تێدەکرێ.

حَمْحَـمَ الفَـرَسُ والـبرذون: دەنگێـکی لێـوە هات لەخوار حیلاندنەوە بوو.

تَحَمْحَمَ: بەمانا (حَمْحَمَ) دێ.

تَحَمْحَـمَ الشَّيْءُ: شـتەکە رەش داگیرسا ٥ رەش بوو.

تاج منقوش بالفضة
حلقة أذن
حلية من فضة
حلية للرأس
سوار من فضة
عقد ذهبي مرصّع بالحجارة الكريمة
وسام
عقد
عقد
حلقة أذن
عقد
ابزيم
حلية
حلية
عقد
خاتم
خاتم
حلقة أذن
سوار
سوار من فضة
عقد

الحَمَاحِمُ: گیایەکی بۆنخۆشە.

الحُمَاحِمُ: بۆیەکی رەشە.

الحِمْحِــمُ: شـتی رەش لـە هـەموو شتێـك ٥ روەکێـــکی ســالأنەیە تــام خــۆش‌و بۆنخۆشە.

حَمِدَ حَمْداً: سوپاسی کرد.

حَمِـدَ فلانـاً: پاداشـی فلأنکەسـی دایـەوەو ئەرکی خۆی بەجی هێنا.

حَمِـدَ الشَّیئَ: لەشـتەکە رازی بـوو بـەدڵی بــوو ٥ لـەکردەوەی فـلأن رازی بـوو رێڕەوی بەپەسەند زانی.

حَمَّدَ فلاناً: چەند جارێـك‌و پـەیتا پـەیتا سوپاسی فلأنکەسی کرد.

تَحَمَّدَ: بەزۆر ملێ‌و بەتـەکلیف سوپاسی کرد.

تَحَمَّـد علـى فـلان بکـذا: منـەتی بەسـەر فلأندا کردو پیاوەتی خۆی بەسـەردا باســکرد ٥ وای نیشــاندا کــە خــۆی جێـــگای سوپاســـەو پێویســـتە سوپاسگوزاری بن.

تحامَــــدوا: قەومەکـــەی هەریەکـــەیان سوپاسگوزاری یەکتر بوون.

اِسْتَحْمَدَ الى النـاس: داوای لـە خەڵکەکـە کرد سوپاسی بکەن.

حَمَادِ: سوپاسگوزاری بۆ ئەو.

حُمادي: دەگوترێ: (حماداك أن تفعل كذا) کۆتــایی ئــەوەی لــەتۆ چــاوەڕوان دەکرێ ئەوەیە ئەو کارە بکەی.

الحمدُ: باسکردن‌و وەصف کـردن بەچاکەو لەسەر چاکە.

المحمدةُ: وەصفێـکە دەهێنـدرێ بـۆ زێـدە موبالەغە.

المَحْمَـدَةُ: ئـەو کـردارو گوفتارەیـە کـە دەبنە هۆی سوپاسگوزاری.

حَمْدَلَ: ئەلحەمدو لیلای گوت.

حَمَـرَ الشَّـیئَ حَمْـراً: شـتەکەی سـپی کـرد توێکڵەکەی لێ کردەوە.

حَمَرَ الرأسَ والشَّعْرَ والصوف: سەری تاشی ٥ مووەکەی بڕییـەوە ٥ خورییەکـەی برینگ کرد.

حَمِرَ الفـرسُ ونحـوه: بـەهۆی جۆخـواردنی زۆرەوە ئەسپەکە توشی ئینتەلا بـوو بۆنی دەمی گۆڕا (جۆگرتی).

حَمِرَت الدابَّةُ: ئاژەڵەکـە بـەهۆی قەڵـەوی زۆر گێـژ بـووە ٥ وەکـوو گوێدرێـژی لێهاتووە.

حَمِرَ فلان: فلأنکـەس رقـی هەڵساو سـوور بۆوە.

أحْمَـرَ الرجـلُ: پیاوەکـە منـداڵی سـوورە پێستی بوو.

أحْمَرَ الدَابَّةَ: ئەوەنـدەی جـۆ دەرخـواردی ئاژەڵەکە دا دەمی بۆ گەنی کرد.

حَمَّـرَ: بـەزمانی حیمیـەری ئاخـاوت ٥ سواری ئەسپی هەجین بوو.

حَمَّـرَ فلانــاً: بەفلأنکەســی گـوت ئــەی گوێدرێژ.

حَمَّرَ الشَّیئَ: شتەکەی سوورکرد بەرەنگی سور.

حَمَّـــرَ اللَّحْـــمَ: گۆشـــتەکەی بـــەڕۆن سوورکردەوە تا سوور هەڵگەڕا.

اِحْمارَّ الشَّيْءُ: شتەکە وردە وردە سور بوو.

احْمَرَّ: سوربوو.

احمرَّ البـأسُ: تونـدو تیـژیو ناخۆشـی پەرەی سەند.

الأحْمَرُ من الأشياء: ئەوەیە رەنگی سوربێ ٥ زێڕ ٥ زەعفەران.

الموت الأحمر: مردنێـك بەکوشـتن بـێ ٥ یـان مردنێـکی وا نەخۆشـەکە زۆر بەگیانەڵاوە بێ.

الأحمران: زەڕو زەعفـەران ٥ گۆشـتو عەرەق ٥ نانو گۆشت.

الأُحَيْمِرُ: چوککراوەی (الأحمر)ە ٥ رەشە بایـەکی نەگبەتـە کەشـتی لـەناو دەریادا وەردەگێڕێ.

اَلْحَامِرُ: خـاوەن گوێدرێـژ ٥ جۆرێـکە لە ماسی.

الحامِرَةُ: خاوەنی گوێدرێژ.

الحِمـارُ: گوێدرێـژ ٥ دارێـکە لـە پێشـی کـەژاوە، سـواربووەکە دەسـتی پـێ دەگـرێ ٥ یـان ئـەو بنکـە دارەیـە ئاسنی لەسەر مشتو مـاڵ دەکرێ ٥ لـــەزانیاری وەرزشـــدا بـــەوداره دەگوترێ ٥ دوو کەس هەڵی دەگرنو بازی بەسەردا دەدرێ.

حِمارُ الزرد: جۆرە کەرەکێوییەکی رەنـگ خەتخەتە.

حِمـــار قبّـــان: پێڕۆیەکـــە بچـــوکە بەزەوییـــەوە دەنووســـێ وەکـــوو قاڵۆنچـە وایـەو لـەو بچـوکترە کـە دەستی دەکەیە خۆتێك دەهاوێتەوە.

اَلْحِمَّـارَةُ: ماکـەر ٥ بـەردی گـەورە کـە دەخرێتـە قـەراخی حـەوز بـۆ ئـەوەی ئاوەکـە نـەڕوا ٥ یـان ئـەو بەردەیـە دەگرێتە کۆختەی راوکەر ٥ دارێـکە لـە پێشـی کـەژاوە دەدرێ بـۆ ئـەوەی سوارەکە دەستی پێ بگرێ ٥ لەقاچیشدا نێوان قاپە رەقەو پەنجەیە.

الحَمَارَةُ: (حَمَارَةُ الْقَيْظ) وَحَمَّارَتُهُ: تونـدی گەرما، (ك: حَمَارُ).

الحُمَـرُ: خورمـای هینـدی ٥ جۆرێـکە لـە چۆلەکە ٥ گۆڕ.

اَلحَمَرُ: گەدە تێـکچوونو ئینـتلا کردنێـکە توشـی ئـاژەڵو وڵاخ دەبـێ، بـەهۆی زۆر خواردنی جۆوە.

الحمراء: لـەبزن ئەوەیـە یـەك رەنگبـێ ٥ لـەژنیش ئـەوەی پێستی سپی بـێ ٥ رەگـەزی ناعـــەرەب کـــە بـــەزۆری رەنگیان سورو سپییە.

ابن الحمراء: ئەو کەسـەیە دایکی عـەرەب نـەبێ ٥ چـەقی گـەرمای نیـوەڕۆ ٥ ساڵی گرانیو قاتو قڕی.

حُمْـراء الشـدقين: ئـەو ئافرەتـەی لەبـەر پـــیریو کۆنەســـاڵی ددانـــەکانی کەوتبنو پوکەکانی دیاربن.

حمراء النّعم: ئاژەڵە باشـەکان ٥ حوشـترە رەسەنەکان.

حَمـراء العِجّـان: وشـەیەکە عـەرەب بـۆ زەمکردنی ناحەزیان دەیڵێن.

الحُمْرَةُ: رەنگی سور ٥ نەخۆشی سورێژە ٥ نەخۆشییەکی پێستەو دەتەنێتەوە ٥

شوێنی سورێژەکان سور دەبێتەوە ٥ تایەکی زۆر بەهێواشی لەگەڵدایە ٥ وردەی خشتی سوور.

اَلْحِمِّــرُ: لە هەموو شتێك توۆخو بەهێزەکەیەتی ٥ دەگوترێ: (رجل حِمِّرٌ): پیاوێکی شەڕانیو بەدخووە ٥ (غَيْث حِمِّرٌ) بارانێکی بەلێزمەو توند تیژە زەوی دادڕ دادڕکرد.

اَلْحَمَّــارُ: خاوەنی گوێدرێـژ ٥ یان ئەو کەسەی گوێدرێژەکان بەخێو دەکاو سەرو کاریان دەکا.

اَلْحَمَّارَةُ: ئەو ئەسپەی هەنگاوی وەکوو هەنگاوی گوێدرێژ دەهاوێ.

اَلْحُمَّرُ: جۆرێکە لە چۆلەکە، یان قومری.

اَلْحُمَيْـــراءُ: سـورکەڵە ٥ بچـووککراوەی (الحمـراء)٥ ٥ وەصفێـکیشە بۆ دایکی موسوڵمانان خاتوو عائیشە پێغەمبەر (ر.خ) فەرمووییەتی (خـذوا نصـف دینکم من هذه الحمیراء) ٥ هەروا ناوە بۆ سورێژە.

اَلْمِحْمَـــرُ: ئـەو شـتەیە توێـکڵی لێ دەکرێتەوە یان دەروێ یان دەتاشرێ بە کێردو چەقۆ ٥ بەپیاوی لەئیمو خـــوێڕیش دەگـــوترێ ٥ بــــە ئەسپێکیش دەگوترێ کەرۆیشتنی لـە رۆیشـتنی گوێدرێـژ بچێ، (ك: حَمَامِرَ ومَحَامِر).

اَلْمُحَمِّرَةُ: تاقمێکن لەخوڕەمییەکان کە ئـاڵاو دوروشمیـان سـوور بـووە، دژی ئاڵاو دروشمی رەش یان سپی بوون.

اَلْيَحْمُورُ: بەمانا (الأحمر) دێ ٥ ئاژەڵێکی شـیر دەری کاوێـژکارە لـە پێـری حەیوانە کێوییە ٥ کەرەکێوی.

اَلْحُمَارِسُ: شێر ٥ بەهێزو توانا ٥ ئازاو چاو نەترس.

حَمَزَ الشربُ حَمْزاً: شەرابەکە زۆر تیژو کەسکون بوو.

حَمَزَ اللبنُ والرمان ونحوهما: ماستەکە یان هەنارەکە ترش بوون.

حَمَزَ الهَمُّ: خەمو خەفەتەکەی زۆر توند بوون.

حَمَـزَ الفـؤادُ: دڵو دەروونـی قاییمو پتەو بوو.

حَمَزَ الشَّيْءَ: شتەکەی وەرگرتو لەخۆی گرت شاردییەوە.

حَمَزَ النَّصْلَ: تیرەکەی تیژ کرد.

حَمَـزَ الشـرابُ اللسـانَ: شەرابەکە زمانی گەست، کەسکون بوو.

حَمَزَ الكلمةُ فؤادَه: قسەکە کاری لە دڵو دەروونی کرد.

حَمَزَ الدواءُ الجرحَ: دەرمانەکە برینەکەی هێـواش کـردەوەو هاوسـاوییەکەی نەهێشت.

حَمُزَ الرجلُ حَمازةً: پیاوەکە خۆراگرو ورە بەرزبوو ٥ دەگوترێ: (حَمُزَ فؤادُهُ):

اَلْحَمْــزَةُ: شـێر لەڕوانگـەی ئازایـەتیو جەربەزەییەوە.

اَلْحَمُــوزُ: بــەو کەســە دەگــوترێ زۆر بەخەمەوە بێ بۆ ئەو کارو بارەی لێی بەرپرسیارە.

اَلْحَمِيزُ: ئەو کەسەی زۆر زیرەكو لێهاتوو بێ.

اَلْمَحْمُوزُ: بەوکەسە دەگوترێ دەستو پەنجەی بەهێزوبەتوانابن، (ك: محاميز)ە.
حَمَسَ اللَّحْمَ ونحوه حَمْساً: گۆشتەکەی سورکردەوە.
حَمَسَ فلاناً: فلاَنکەسی تەرەکرد.
حَمَسَ حَمْساً: رەق بوو پتەو بوو ٥ دەگوترێ: (حَمِسَتِ الأرضُ): زوییەکە رەق بوو توندو پتەو بوو.
حَمِسَ الشَّرُّ والوغى: شەڕو گێرەوەژەکان زۆر توند بوو.
حَمِسَ الرجل في الدين: پیاوەکە زێدەڕۆیی کرد لە بواری ئاییندا.
حَمِسَ بالشَّيْءِ: خوی بەشتەکەوە گرتو وەگری بوو ٥ (هو أحمس وهي حمساء).
حَمُسَ حَمَاسَةً: ئازابوو ٥ دەگوترێ: (هو حميس)، (ك: حُمَسَاء).
أَحْمَسَهُ: رقی هەڵسان.
حَمَّسَ الْحِمَّصَ: نۆکەکەی سورکردەوە.
حَمَّسَ الدواء: دەرمانەکەی خستە سەر ئاگر بۆ ماوەیەکی کەم.
حَمَّسَ فلاناً: رقی فلاَنکەسی هەڵساند.
اِحْتَمَسَ الديكان أو القرنان: دوو کەڵەشێرەکە یان دوو هاوشانەکە هێرشیان بۆ یەکتر هێناو پێك هەڵپرژان، شەڕیان کرد.
تحامَسَ القومُ: قەومەکە لێك تورە بون‌و قسەی ناخۆش‌و جوێنیان بەیەکتر گووت‌و بوو بەشەڕیان.
تَحَمَّسَ: بۆ موطاوعەی (حَمَّسَهُ) هاتووە ٥ لێکتر دڕ دۆم بوون ٥ بەرابەر یەك سەررەق بوون.
تَحَمَّسَ الأمر وغيره: کارەکە قورس بوو ئالۆزاو حەلکردنی زەحمەت بوو.
تَحَمَّسَ فلان: فلاَنکەس پەنای بردو داوای کۆمەکی کرد.
تَحَمَّسَ فلان للأمر: فلاَنکەس بۆکارەکە امادە باشی‌و سوربوونی خۆی هەیە بۆ ئەنجامدانی‌و حەزی لێیەو کەسانی دیکەش بانگەوازی دەکا بۆ ئەنجامدانی.
الحَمَاسُ والحماسَةُ: ئازایەتی‌و سوربوون لەسەر شت ٥ داکۆکی کردن ٥ بەرەنگاربوونەوە.
اَلْحُمْسَةُ: حەرامبوون.
الْحَمَسَةُ: گیاندارێکی ناو دەریایە لە پێری سولەحفاتەکانە.
اَلْحَمِيسُ: تەندور (ك: أحماس).
الحَمِيسَةُ: مێینەی (الْحُمَيْسُ) ٥ تاوە: کەشتی تێدا سوور دەکرێتەوە ٥ گۆشتی تازەو پێگەیشتوو.
حَمَشَ الناسَ حَمْشاً: خەڵکەکەی کۆکردەوە.
حَمَشَ فلاناً حَمْشاً وحَمْشَةً: رقی هەڵساندو تورەی کرد.
حَمَشَ القومَ: بەرق‌و تورەییەوە خەڵکەکەی پێش خۆی دان.
حَمِشَ الرجلُ حَمَشاً: پیاوەکە قاچی باریك بوون ٥ دەگوترێ: (حَمِش عظم ساقه وحَمِشَ الوتر).
حَمِشَت اُللثة: پوکەکە گۆشتن نییە ٥ یان تەنك‌و جوانە.

حَمِشَ فلان حَمَشاً: فلانكەس رقی هەڵساو تورە بوو.
حَمِشَ الشرُّ: شەڕەكە پەرەی ساندو گەرم بوو.
حَمُشَتْ قوائم الدابة: قاچی حەیوانەكە باریك بوو ٥ هەروا دەگوترێ: (حَمُشَتْ ساقه وحَمُشَ الوتر).
أحْمَشَ النارُ: ئاگرەكەی هەڵگیرساندو داری پێوەنان و خۆشی كرد.
أحْمَشَ الشحْمَ ونحوه: بەئاگر بەزەكەی تواندەوە خەریك بوو بسوتێ.
أحْمَشَ فلاناً: بەمانا (حَمَشَهُ) دێ.
أحْمَشَ الشرَّ: شەڕەكەی هەڵگیرساند.
أحْمَشَ القومَ: قەومەكەی هەڵنا بۆ شەڕكردن.
حَمَّشَ الشحم والنار: بەمانا (أحْمَشَ) دێ.
حَمَّشَ فلاناً: بەمانا (حَمَشَهُ) دێ.
حَمَّشَ الناسَ وغيرهم: بەمانا (أحْمَشَهُمْ) دێ.
تَحَمَّشَ: بۆ موطاوەعەی (حَمَشَهُ) دێ.
تَحَمَّشَ فلان: فلانكەس رقی هەڵسا.
تَحَمَّشَ بنوفلان لفلان: هۆزی فلان لەسەر فلانكەسیان كردەوە.
اسْتَحْمَشَ: رقی هەڵسا ٥ دەشگوترێ (اسْتَحْمَشَ عليه غَضباً)
حَمِصَ الوَرَمُ حمصاً وحموصاً: هاوساویەكە فش بۆوە.
حَمَصَ الجُرحُ: برینەكە هاوساوییەكەی نیشتەوە.
حَمَصَتِ الأرجُوحةُ: جۆلانەكە لەهاتوچۆ وەستایەوە.
حَمَصَ الغلامُ: منداڵەكە بۆ خۆی چووە سەر جۆلانەكەو لێ نیشت بەبێ ئەوەی كەسێك یارمەتی بدا.
حَمَصَ العرق عن الجسم: ئارەق بەجەستەیەوە نەما.
حَمَصَ الدواءُ الجُرحَ: دەرمانەكە برینەكەی ساڕێژكرد.
حَمَصَ القذاة: پوشكەكەی لەچاو دەرهێنا بەهێدی.
حَمَّصَ: لەكاتی نیوەڕۆدا ئاسكی نێچیر كرد.
حَمَّصَ الحَبَّ: دانەوێڵەكەی سور كردەوە.
إنْحَمَصَ الورَمُ: هاوساوییەكەی نیشتەوە.
انْحَمَصَ الجرحُ: برینەكە هاوساوی نەما.
انْحَمَصَ الانسان أو الحيوان: ئادەمیزادەكە یان حەیوانەكە كزبوو گۆشتی پێوەنەما.
انْحَمَصَت الجرادة: كوللە گەڵای درەختی سەلی خواردو سوور هەڵگەڕا.
تَحَمَّصَ اللَّحمُ: گۆشتەكە وشك بۆوە ئاوی پێوە نەما چرچ بوو.
اَلحِمَّصُ والحِمِّصُ: نۆك.
الحِمَّصَانِ: نۆك فرۆش.
اَلمِحْمَصَةُ: ئامێری شت سوركردنەوە.
حَمَضت الماشيةُ: ئاژەڵەكە شتی مزرو ترشی خوارد.
حَمُضَ عنه: حەزی لە خواردنی نەبوو ٥ (حَمِضَ به) حەزی لەخواردنی بوو.
حَمُضَ اللَّبَنُ والفاكهةُ حموضةً: شیرەكە یان میوەكە ترش بوو.

أَحْمَضَ المكانُ: ئەو شوێنە شتی ترش (لەوەڕی) مزرو ترشی لێبوو.
أَحْمَضَ القوم: هۆزەکە لەناو خۆیاندا قسەی خۆش‌و پێکەنین ئامێزیان بۆیەکتر کردو درێژەیان پێ دا.
أَحْمَضَ الماشية: خۆراکی ترشی دەرخواردی ئاژەڵەکان دا.
أَحْمَضَ الشَّيْءَ: شتەکەی ترش کرد.
حَمَضَ فلان في الشَّيْءَ: فلانکەس لەشتەکەی کەم کردەوە.
حَمَضَ الشَّيْءَ: واتە: (أَحْمَضَهُ).
حَمَضَ الصورة: وێنەکەی خستە ناو حەوزی ترشەڵۆکەوە، بۆ ئەوەی وێنەکە بەرونی دەرکەوێ.
تَحَمَّضَ الراعي: شوانەکە ئاژەڵەکانی لە لەوەڕگای شیرینەوە گواستەوە بۆ لەوەڕگای ترش.
تَحَمَّضَ فلان: فلانکەس لە حاڵێکەوە چووە حاڵێکی ترەوە.
اسْتَحْمَضَ اللَّبَنُ: شیرەکە درەنگ مەیی.
الحامِضُ: هەر خواردنێك تیژو ترش بێ زمان بگەزێ، وەکوو سرکەو ماستی ترش.
الحُمَاضُ: حاڵەتێکە لە جەستەدا ماددە ترشەکان زیاددەکەن‌و قەلەویات کەم دەبنەوە.
اَلْحَمْضُ: هەر روەك‌و گیاو گژێك ترش یا سوێربێ قەدی هەبێ‌و زۆر رەگی دانەکوتابێ ٥ ئەم جۆرە خۆراکە بۆ ئاژەڵ وەکوو میوە وایە بۆ ئادەمیزاد، (ك: حُمُوضُ)٥ دەگوترێ: (فؤا دحمض ونفس حمضة).
اَلْحَمْضِيُّ: ئەوەی پاڵ ترشی دەدرێ ٥ دەگوترێ: (أرض حمضية)، (معدة حمضية).
الحُمَّاض: گیاو گژی ترش تام.
اَلْحَمِيضُ: شوێنێك کە زۆر لەوەڕی ترش تامی تێدابێ بۆ ئاژەڵ ٥ (هو حميض) کۆیەکەی (حُمُضٌ)، (هي حميضة) کۆیەکەی (حمائض).
اَلْمَحْمَضُ وَالْمُحْمَضُ: لەوەرگایەك زۆری لەوەڕی ترش تێدابێ
حَمَطَ الكَرْمَ: درەختێکی لەنزیك میوەکە رواند بۆ ئەوەی سێبەر لەمێوەکە بکا.
الحَمَاطُ: درەختێکە دەشوبهێتە درەختی هەنجیر مارحەز دەکا تێیدا ژیان بەسەر بەرێ ٥ دەرەختی هەنجیرە کێویلە ٥ (شيطان الحَمَاطَ) جۆرێکە لەمار حەزی لەوەیە لە سێبەری ئەو درەختەدا بگوزەرێنێ.
الحَمَاطَةُ: تاکی (اَلْحَمَاط) ٥ چوزانەوەیەکە لە قورگدایە.
حَمِقَ فلان حَمَقاً: ریشی تەنك بوو ٥ عەقڵی سوك بوو، (هو أحمق وهي حمقاء) (ك: حُمْقٌ).
حَمُقَ حَمْقاً وحَماقَةً: عەقڵی کەم بوو ٥ کرداری ئەحمەقی ئەنجام دان.
حَمُقَ السوقُ: بازاڕ وەستاو کڕین‌و فرۆشتن کەم بوو.

أَحْمَقَ: منداڵێكی ئەحمەقی بوو.

أَحْمَقَ بِه: بەئەحمەق ناوی برد، ڕەوشتی ئەحمەقی پاڵدا.

أَحْمَقَ فلاناً: بەئەحمەق فلانكەسی هاتە بەرچاو.

حَامَقَهُ: لەئەحمەقیدا هاوبەشی كرد.

حَمَّقَهُ: نیسبەتی دا بۆ ئەحمەقو بەئەحمەقی لەقەڵەمدا ٥ وەكوو ئەحمەق مامەڵەی لەگەڵ كرد.

اِنْحَمَقَ: بەمانا (حَمُقَ) دێ ٥ بەبێ لێ ود بوونەوە ملی نا.

اِحْمَقَ الثوبُ: كراسەكەی رزی.

تَحَامَقَ: لافی ئەحمەقیی لێدا.

تَحَمَّقَ: بەزۆرە ملی ڕەوشتی ئەحمەقی بەسەر خۆیدا هێنا.

اسْتَحْمَقَ: بەمانا (حَمُقَ) دێ.

اسْتَحْمَقَ فلاناً: ئەحمەقیی فێری فلان كرد، ڕەوشتی ناپیاوانەی لەلا شیرین كرد.

الأحموقةُ: ئەو ڕەوشتانەی لەیەكێك دیاری دەدەنو بەرەوشتی ئەحمەقانە پێناسە دەكرێن.

الأحْمَقُ: ئەو كەسەیە زۆر ڕەوشتی ئەحمەقی لێ روبدەن.

الحَمَاقُ والحُمَاقُ: ئاوڵە كە لەئادەمیزاد دێو بەجەستەدا بڵاو دەبێتەوە.

الحَمْقَاءُ: مێینەی (الأحمق)ە ٥ (والبَقْلَةُ الحَمْقَاءُ): پێكوڵ.

الحَموقةُ: ئەو كەسەیە لەئەحمەقی دا گەیشتێتە ئەوپەری.

المِحْمَاقُ: ئەو ئافرەتەیە هەر منداڵی ئەحمەقی ببن، (ك: مَحَامِق)ە.

المُحمِقَات الليالي: ئەو شەوانەیە هەمیشە مانگیان تێدا هەڵبێ.

حَمَكَ الدليل حَمْكاً: بەجوانی ڕێبوارانی شارەزایی كردن.

الحَمَكُ: ئەو شارەزایانەن كە لەسارادا ڕەهنومایی خەڵكی نەشارەزا دەكەن ٥ هەروا ناوە بۆ شتی بچكۆلە لەهەر ڕەگەزێك بێ ٥ بنەمای شتو سروشتی.

حَمَلَت المرأةُ: ئافرەتەكە زارۆكی لەسكی كەوت.

حملت المرأة جنينها وبه: ئافرەتەكە حامیلە بوو ٥ دەگوترێ: (هي حامل وحاملة).

حَمَلَت الشجرةُ: درەختەكە میوەی گرت، میوەی دەركرد.

حَمَلَ عليه في الحرب: هێرشی بۆ برد.

حَمَلَ الحِمْلَ على ظهر الدابة: بارەكەی خستە سەرپشتی وڵاخەكە.

حَمَلَ الشَّيْءَ على الشَّيْءِ: شتەكەی پەیوەست كرد بەو شتەوە.

حَمَلَ فلاناً على الامر: فلانكەسی هەڵنا بۆ كردنی ئەوكارە.

حَمَلَ عليه الحِقْدَ: رقو كینەی بۆ لەدڵدا خواردەوە.

حَمَلَ الغضب: رقەكەی دەرخست.

حَمَلَ عليه ذنبه: تاوانەكەی خستە سەر.

حَمَلَ فلاناً: وڵاغێكی سواری دا بەفلان بۆ ئەوەی سواری بێ.

أحْمَلَتِ المرأةُ والناقةُ: ئافرەتەکە بۆ ئەوەی مێردی هەبێ مەمکەکانی شیریان تێهات ٥ حوشترەکە بێ ئەوە کەڵ بگرێ شیری لێ پەیدا بوو ٥ زۆری سك‌و زا کردن.

أحْمَلَ فلاناً الحِمْلَ: یارمەتی دا بۆ کوڵ هەڵگرتنەکەی.

حَمَّلَهُ الشيئ والأمر: داوای لێکرد ئەوە هەڵگرێ.

اِحْتَمَلَ الأمرُ أن يكون هكذا: پیدەچێ کارەکە ئاوابێ.

اِحْتَمَلَ ماكان منه: چاو پۆشی لێکردو لێی خۆش بوو.

احْتَمَلَ فلان الصنيعةَ: فلانکەس سوپاسگوزاری کردەوە کەی بوو.

احْتَمَلَ الغضبُ فلاناً: رق هەڵسان فلانکەسی والێکرد ئاگای لە خۆ نەمێنێ‌و نەزانێ چی بکا.

اُحْتُمِلَ: کە رقی هەڵسا سور بووە رەنگی گۆڕا.

تَحامَلَ على فلان: ستەمی لە فلانکەس کرد ٥ شتێکی وای داوا لێ کرد لە تاقەتیا نەبێ ئەنجامی بدا ٥ دەگوترێ: (تَحامَلْتُ على نفسي): ئەرکی قورسم خستە سەر نەفسم.

تَحامل الشيئَ وفيه وبه: داوای لێکرد ئەو کارە بکا وێڕای ناخۆشی‌و قورسی کارەکە.

تَحامَلَ الزمان عن فلان: رۆژگار روی لەفلان وەرگێڕا.

تَحَامَلَ الرجلان الشيئَ: دوو پیاوەکە بەنۆرە کۆڵەکەیان هەڵگرت‌و یارمەتی یەکتریان دا.

تَحَمَّلَ القومُ: هۆزەکە رەویان کرد.

تَحَمَّلَ فلان: فلانکەس خۆڕاگرو ورە بەرزو ئازا بوو.

تَحَمَّلَ الحَمالَةَ: کۆڵەکەی لەکۆڵێ دا.

تَحَمَّلَ الأمر: کارەکەی لەئەستۆگرت بەنارەحەتی چووە ژێری.

تَحَمَّلَ شهادة فلان: لەحیاتی فلانکەس شایەتی دا واتە شایەتییەکەی لێ وەرگرت‌و ئەمجار چو شایەتییەکەی دا.

اِسْتَحْمَلَ البعيرُ وغيرُهُ: حوشترەکە یان ولاخەکە توانای بار هەڵگرتنی هەیە.

استحْمَلَ فلان: فلانکەس هەڵی گرت.

استَحْمَلَ فلاناً: داوای لەفلانکەس کرد شتەکەی بۆ هەڵگرێ.

استَحْمَلَ فلاناً نَفْسَهُ: هەموو کارو بارو پێداویستی خۆی خستە ئەستۆی فلانکەس خۆی.

الحامِلةُ: مێینەی (الحَامِل) ٥ زەنبیلەو بەچنەو قەرتاڵە کە ترێی تێدا هەڵدەگیرێ ٥ مەکوکی جوڵا

حاملة الطائرات: کەشتی گەورەی زەبەللاح کە لە دەریادا فڕۆکەی لەسەر دەنیشێتەوە هەروا زرێپۆش تۆپ‌و چەکی تریش هەڵدەگرێ ٥ لەناو دەریادا دەبێتە فڕۆکەخانەو سەباز خانە، (ك: حَوَامِلَ).

الحوامِلُ: قاچ ٥ قاچەکان.

الحاملة من القدم والذراع: رەگەکانی قاچو دەستە.

الحَمَالُ: خوێنو غەرامە، کە کەسانی دیکە لەئەستۆی خۆیانی دەگرن.

الحُمَالَةُ: کرێی هەڵگرتنی کۆڵ.

الحَمالَةُ: ئەڵقەی شمشێرو شتی لەو جۆرە کە پێی هەڵدەواسرێ.

اَلْحَمْلُ: دەگوترێ: (فلان حَمْلٌ على أهله) فلانکەس بارە بەسەر خێزانەکەیەوە ئەگەر نەخۆشییەکەی کوشندە بێ ٥ زارۆك کە لەسکی دایکی دا بێ ٥ یان میوە کە بەدرەختەکەوە بێ ٥ کەژاوە ٥ ئەو حوشترەی کە کەژاوەکەی لێ بارکراوە، (ك: أحمال وحُمُول وحِمال).

الحِمْلُ: ئەوەی بەکۆڵ هەڵدەگیرێ ٥ کەژاوە ٥ ئەو حوشترەی کەژاوەکەی لێ باردەکرێ ٥ لەزاراوەی (ریاضیات)دا بریتییە لە قەبارەیەك یان قورساییەك کە هەڵدەگیرێ یان رادەکێشرێ بەهۆی ئامێرێکەوە.

اَلْحَمَلُ: بەرخۆلە، (ك: حُمْلانٌ وأحمالٌ) ٥ بورجێکە لەئاسمان لە بورجە بەهارییەکانە.

اَلْحُمْلاَن: ئەو ولاخەیە دیارییەکانی لێ دەنرێ کە دەبرێن بۆ شوێنێکی تر ٥ کرێی حەماڵ.

الحِمْلَةُ والحُمْلَةُ: گواستنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.

اَلْحَمُولُ: پیاوی لەسەرخۆو هێدیو خۆڕاگرو پشودرێژ.

اَلْحَمِيلُ: منداڵی بێ نازو فڕێدراو کە کەسانی دیکە هەڵی دەگرنەوەو بەخێوی دەکەن ٥ فڕێندراو کە لەولاتێکەوە دەبرێ بۆ ولاتێکی تر ٥ غەریبو ئاوارە ٥ ئەو کەسەی پاڵ باوکی خۆی نەدرێ نەزانرێ باوکی کێیە ٥ ئەو پڕژو پاڵەی لافاو هەڵی دەگرێ.

اَلْحَمِيلَةُ: مێینەی (الحميل) ٥ ئەڵقەی شمشێر، (ك: حَمَائِلُ) ٥ دەشگوترێ: (هو حميلة علينا) ئەو بارێکە لەسەر شانمان.

اَلْمَحْمِلُ: کەژاوە ٥ دووتای بار کە بەسەر پشتی ولاخەکەوە بێ ٥ زەنبیلەو بەرچنە کە ترێی تێ دەکرێ، (ك: محامل)٥ ٥ دەگوترێ: (ما على فلان مَحْمِلٌ) فلانکەس پشتی پێ نابەسترێ، بتمانەی لەسەر نییە.

المحمول: بەلای مەنطیقیەکانەوە جێگای خەبەری نەحوییەکان دەگرێتەوە.

حَمْلَجَ الحَبْلَ: جەبلەکەی زۆر توند بادا.

اَلْحِمْلاَجُ: حەبلی گشت بادراو ٥ موشەدەمەی مزگەرو ئاسنگەر شاخی گاو ئاسك، (ك: حماليج).

حَمْلَقَ: چاوی کردنەوە ٥ زۆر بەوردی سەیری کرد.

حِمْلاَق العين وحِمْلَقُها: ئەو شوێنانەی کل رەشی دەکا لەچاو ٥ لە دیوی پێلوەکانی چاوەوە، (ك: حَمَاليق).

حَـمَّ التنـور ونحـوه حَمّـاً: تەندورەكـەی هەڵگیرساند.
حَمَّ الماءَ ونحوه: ئاوەكەی گەرم كرد.
حَمَّ الشَحْمَ ونحوه: پیوەكەی تواندەوە.
حَمَّ الأمرُ فلاناً: كارەكە گرنگی دا بەفلان.
حَمَّ الماءُ ونحوه: ئاوەكە گەرم بوو.
حَمَّ الشَيْئ: شتەكە رەش داگیرسا.
حَمَّتْ الجرةُ: دیزەكە سوتا ٥ (هو أحَمُّ وهي حَمّاءُ).
حُمَّ حُمَاماً: تای لێ هات.
حُـمَّ الأمـر: كارەكـە جێبـەجێ بـوو (حُـمَّ الشَيْئُ) نزیك بوو.
حُمَّ لفلان: بۆ فلانكەس وامەزندە كراوە.
أحَمَّتِ الأرضُ: لەرزو تا لەو ولاتە بلاو بۆوە.
أحَـمَّ الشَـيْئُ: شـتەكە نزیـك بـوو ئامـادە بوو.
أحَمَّ الماءَ ونحوه: ئاوەكەی گەرم كرد.
أحَـمَّ الطفـلَ ونحـوه: مندالەكـەی بـەئاوی گەرم شت.
أحَـمَّ الله فلانـاً: خـودا فلانكەسـی توشـی لەرزو تاكرد.
أحَـمَّ الله كـذا: خـودا ئـەوەی بڕیـارداو ئەنجامی دا.
حَـامَّ فلانـاً: فلانكەسـی نزیـك كـردەوە ٥ داوای لێكرد.
حَمَّمَت الأرضُ: گیاو گژەكە لەسەوزاییەوە بەرەو رەشی رۆیی.
حَمَّمَ الغُلامُ: كوڕەكە ریشی هات.
حَمَّـمَ الفـرخُ: بێچـوە پەلەوەرەكـە پـەڕو باڵی لێ روان.
حَمَّمَ الماءَ ونحوه: گەرمی كرد ٥ كولاندی.
حَمَّـمَ الرجـلَ: دەمو چـاوی پیاوەكـەی بەخەلوز رەش كرد.
احْـتَمَّ: گرنگـی پـێدا ٥ (احتمـت عینـه) چاوی بەبێ ئازار فرمێسكی رشتن.
احْتَمَّ لفلان: لەبەر فلانكەس رقی هەلسا.
تَحَمَّمَ: رەش هەلگیرسا.
اسْتحِمَّ: چووە گەرماوەوە خۆی شت.
الحامَّةُ: كەسانی تایبەتی لەخزمو كەسو كارو كوڕونەوە ٥ حوشتری باش.
الحَمَامُ: كۆتر.
الحِمَامُ: قەزاو قەدەری مردن.
الحُمَـامُ: لـەرزو تـای هـەموو ئـاژەلو ولاغێك.
الحَمَامَةُ: تاكی (الحَمَام)٥ بۆ كوتری نێرو مێ بەكاردێ.
اَلْحَمَّ: بەزو پیوی تـواوە ٥ پاشمـاوەی بـەزو پیوی تواوە.
حَمُّ الظهيرة: توندی گەرمای نیوەڕۆ.
حَمُّ الشَيْ: زوربەی شت ٥ جا هەر شتێك بێ.
اَلْحُمَمُ: خەلوز ٥ خۆلەمێش ٥ هەر شتێـك بەئاگر سوتابێ ٥ تاكەكەی (حُمَمَةٌ).
اَلْحُمـىُّ: نەخۆشـییەكە جەسـتەی پـێ گـەرم دەبـێو چـەند جۆرێـكی هەیـە ٥ (تیفـو، تیفـوس، الـدق، الصفراء، القرمزية).
الحمّامُ: ئەو شوێنەی خۆی لێ دەشۆی ٥ شوێنی خۆ لێ شتن.

اَلْحَمّـامِيُّ: خـاوەنی گـەرماو ٥ نـاتری گەرماو.

اَلْحَمَّـةُ: هـەر سەرچـاوەیەك ئاوەكـەی گەرم بێ‌و لەزەوی هەڵقوڵێ، خـەڵك بە مەبەستی شیفاو چاكبوونەوە لـە نەخۆشی خـۆی لێ بشـۆن، (ك: حَـمٌّ وحِمامٌ).

اَلْحُمَّـةُ: تـا ٥ رەنگێـكە لـە نیـوان بـۆرو شیّدا.

اَلْحِمَّةُ: مردن.

اَلْحَمِيمُ: پشكۆ ئـاگر ٥ گـەرمای نیوەڕۆ ٥ بارانێـك دوای گـەرمای زۆر ببارێ ٥ نـاوی كولاّتـو ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا بَـرْدًا وَلَـا شَـرَابًا إِلَّـا حَمِيمًـا وَغَسَّـاقًا﴾ ٥ هـەروا بـە نـارەقیش دەگـوترێ ٥ خزمێـك خوشی بوێو خۆشی بوێ.

الحمـيمُ بالحاجـة: ئـەو كەسـەی كارەكـەی دەخرێتە ئەستۆ.

الحَمِيمَةُ: مێینەی (الحميم)٥، ئاوی كولاّتـو ٥ شیری گـەرم ٥ حوشـتری رەسـەن‌و چاك، (ك: حَمَائِم).

اَلْمَحَـمُّ: قاپێـكی بچـوكە لـە مـس‌و حەوجۆش‌و شتی وا دروست دەكرێ بـۆ ئاوتێـدا گـەرمكردن بـەكار دەهێندرێ.

اَلْمَحَمَّةُ: زەوییەكە لەرزو تای تێدا بلاّو بوبێتەوە.

طعام مَحَمَّةٌ: هەر كەسێك بیخوا تـای لێ دێ، (ك: مَحَامُّ).

اَلْمُسْتَحَمُّ: گەرماو.

اَلْيَحْمُـومُ: هەرشتێـك زۆر گـەرم بـێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ﴾ ٥ شتی رەش لەهـەر رەگەزو گەرایەك بێ ٥ دوكـەڵی رەش‌و گـەرم ٥ جـۆرە كۆترێـكە بـەرورگی‌و ملی‌و سەری رەشـە دەنـدەوك‌و قاچی زەرد، (ك: يحاميم).

نبـت يحمـوم: روەكێـكی تێـر ئـاوە كـە لەسەوزییا رەش هەڵگەڕابێ.

اَلْحِمْنَـانُ: مـەیمونی بچـكۆلە ٥ جۆرێـكە لەترێی طائیف رەشی مەیلەو سورە، بۆڵەكـەی گـەورەو دەنكـی نـاوی بچوك.

اَلْمَحْمَنَـةُ: زەوییەكـە مـەیمونی بچـوكی زۆربێ.

حَمَتِ الشَّمسُ أو النـارُ حُمُـواً: گەرمییەكە پەرەی سەند.

حَمَـى المـريضَ: ئـەو شـتانەی زیـانی بـۆ نەخۆشەكە هەیە لێی قەدەغە كرد.

حَمَى الشَّيْءُ فلاناً حَمْياً وحِمايةً: ئەو شـتەی لەفلاّنكـەس مـەنع كـردو لێـی دوور خستەوە.

حَمِيَتْ الشـمسُ والنّـار والحديـد حميـاً وحُمُـواً وحَمْياً: گەرم بوو.

حَمِي الوطيسُ: شەڕ گەرم بوو.

حَمِـيَ الفَـرَسُ: ئەسـپەكە لەشـی گـەرم داهات‌و عارەقی كرد.

حَمِيَ عليه: رقی لێ هەڵسا.

حَمِيَ من الشَّيْئِ حميةً: بێزی نەهات ئەو شتە ئەنجام بدا.
أَحْمَى الشَّيْئِ: شتەکەی گەرم کرد.
أَحْمَى المكان: شوێنەکەی وا لێ کرد پارێزراو بێ کەس نەتوانێ توخنی بکەوێ.
حامي عنه محاماةً وحِمَاءً: داکۆکی لێ کرد.
حـامي ضَـيْفَهُ: پێشـوازی گـەرمی لـە مێوانەکەی کرد.
احْتَمى في الحرب: لەشەڕدا خۆی پاراست ٥ خۆی پەنادا.
أَحْتمـى المـريض عمـا يضره: نەخۆشـەکە خۆی پاراست لەو شتانەی زیانی پێ دەگەیەنن.
احتمـى مـن فـلان: خـۆی لەفلانکـەس پاراست ٥ (وبِهِ) پەنای بۆ فلان برد.
تحاماه: خۆی لێ پاراست.
الحـامي مـن الابـل: ئـەو حوشـترەیە لای خاوەنەکـەی بمێنێتـەوە تـا دەجـار سك دەکا، ئیتر ئەوکاتـە حوشـترەکە مەرەخـەس دەکـەن‌و هـیچ بـارو ئـەرکی ناخەنـە سـەر، قورئـان دەفـەرموێ: ﴿مَا جَعَلَ اللَّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلاَ سَآئِبَةٍ وَلاَ وَصِيلَةٍ وَلاَ حَامٍ﴾.
الحامية: مێینەی (الحامي)يە ٥ ئەو پیاوەی لەشەڕدا پارێزگاری هاوەڵەکانی دەدا ٥ کۆمەڵێـك سـەرباز کـە پارێزگـاری نەفەرێك یان شارێك دەکەن.
حمـا المـرأةِ: بـاوکی یـان مێـردی نافرەتەکـە، هەروا خزم‌و کەس‌و کاری مێردی ژن.
حما الرجل: خەزوری پیاوەکە ٥ هەروا خزمی ژنەکە بەنیسبەت مێردەکەیەوە.
الحِمـى: پـاوان ئـەو شـوێنەی لەوەڕگایـەو تایبەتـە بـە یەکێـکەوە یـان بەبنەماڵەیەکەوە ٥ شتی پارێزراو.
اَلْحَمَاةُ: مێینەی (اَلْحَمَا)يە ٥ ماسولکەی قاچ.
اَلْحُمَةُ: ژەهری جانەوەرێکی پێوە بدا ٥ یـان بگـەزێ ٥ چـزوی دوپشـك‌و زەرگەتەو ژەنگە سورەو ئەو شتانە.
حُمَةُ البرد: جەنگەی سـەرماو سۆڵ، (ك: حُمىً وحُمَات).
حَمْوُ الشمس: گەرمی خۆر.
حَمْـــوُ المـــرأة: خزمـــی ژن بـــەهۆی مێردەکەیەوە.
حَمْـــوُ الرجـــل: خزمـــی پیـــاو بـــەهۆی ژنەکەیەوە.
حُمُوُّ الأَلَمِ: ئەو پەڕی ئازارو ئەندێشە.
اَلْحِمْيَـةُ: کـەمخۆری ٥ کەمکردنـەوە لـەو خواردنانەی کە زیانبەخشن.
الحَمِـيُّ: نـەخۆش کـە خـواردنی زیـان بەخشی لێ قەدەغە کرابێ.
حَمِيًّا: بۆ هەموو شتێـك هـەرەتی هێـزو توانـاو تونـدو تیژییـەتی بـۆ گـەنج هـەرەتی لاوەتـی هێـزو توانـای ٥ بـۆ شەراب، کاتی هەڵچون‌و کفەکردنی ٥ یان هەرناوە بۆ خودی شەرابەکە.
اَلْحَمِيَّةُ: دەمـارگیری ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿إِذْ جَعَلَ الَّـذِينَ كَفَـرُوا فِـي قُلُـوبِهِمُ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّـةَ الْجَاهِلِيَّـةِ﴾ ٥ پارێزگـاری لە ئایین‌و شەرەف‌و ناموس.

المحامي: پارێزەر کە لەدادگادا داکوکی لەیەکێ لە دوو کێشە کارەکان دەکا.
اَلمحاماة: پیشەی پارێزەریی.
اَلْمَحْمِيُّ: شیر.
تَحَمَّرَ: بەزوبانی حیمیەری قسەی کرد ٥ رەوشتی ناشیرین بوو.
حَنَأَ المكان حَنْئاً: شوێنەکە سەوز بوو گیاوو گژی وەخۆ کەوتو راساو تێك هالاّ.
حَنَّـأ لِحْيَتَـهُ أو رأسـه: ریشی یـا سـەری بەخەنەرەنگ کرد.
الحِناءُ: درەختێـکە گـەلاّو قـەدی وەکـوو هــی هەناروایــە، گولێــکی سـپی دەردەکـا لــە شـێوەی هێشـوودا لــە گەلاکــەی خەنــەی ســور بەرهــەم دەهێندرێ ٥ تاکەکەی (حِناة)ە.
حَنِـبَ الفـرسُ حَنَبـاً: قاچـی خـوار بـوون ٥ نێوان قاچەکانی پان بوو (هو أحنب وهي حَنباءُ)، (ك: حُنُبٌ).
حَنَّبَ الفرسُ: بەمانا (حَنِبَ) دێ.
حَنَّـبَ الكِـبرُ فلانـاً: پـیری فلانکەسـی چۆماندۆتەوە پشتی کۆم بۆتەوە.
تَحَنَّبَ: پشتی کـۆم بـۆوە (تَحَنَّـبَ علیـه) بەزەیی پێدا هاتەوە.
حَنْبَلَ: لوبیـای خـوارد ٥ فـەروەی کـۆن‌و رزیوی لەبەرکرد.
تَحَنْبَـلَ: سـەری تەقانـد ٥ چـووە سـەر رێبازی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.
الحُنَابِلُ: ژنی ئەستورو پتەو یان حـەبلی ئەستورو قایم.

اَلْحَنْبَلُ: کورتـە بـالاّی ورگ زل ٥ عـەباو فەروەی کۆن‌و رزیو.
اَلْحَنْبَلـيُّ: ئـەو کەسـەی شـوێن رێبـازی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەکەوێ.
الحانوت: دوکانی مەی فرۆشی ٥ دوکـانی بازرگانی، (ك: حوانیت).
اَلْحَنْتَفُ: کوللەی پاککراو بۆ چێشت لێنان.
اَلْحَنْتُــوف: ئــەو کەســەی ریشــی هەڵدەکەندرێ.
اَلْحُنْتُمُ: هەموو رەش‌و سەوزێـك ٥ سوالەتی رەش ٥ جەرڕەی سـەوز ٥ هـەوری رەش ٥ درەختی حەنظەل، (ك: حناتم)ە.
حَنَثَ في يمينه: لە سوێند خواردنەکەیدا راستی نەکرد (سوێندی بەدرۆی خوارد).
حَنَثَ: لەحەق لایداو شتی بـاطل‌و پوچـی پەیڕەو کرد.
أحْنَثَهُ: وای لێ کرد سوێندی لێ بکەوێ.
حَنَّثَهُ: سوێندی لێ خست.
تَحَنَّثَ: خـودا پەرستی کـرد ٥ کارێـکی کرد تاوانی سوێندی لێ نەکەوێ.
اَلْحِنْــثُ: تــاوان ٥ قورئــان دەفــەرموێ: ﴿وَكَــانُوا يُصِــرُّونَ عَلَــى الْحِنْــثِ الْعَظِيمِ﴾ ٥ هاوەڵدانان بۆ خودا.
اَلْحُمَانِثُ: تاوانکار ٥ شوێنی تاوان.
حَنَجَتْ له حَاجَةٌ حَنْجاً: کارێـکی بـۆ هاتـە پێشەوە.
حَنَجَ الشَّيْءَ: شتەکەی لادا لـەرێبازی خـۆی ٥ (حَـنَجَ الْحَبْـلَ) گوریسـەکەی تونـدکرد گشتی بادا بەتەواوی گرژی کرد.

حَنَجَ كلامَهُ: قسەکەی خۆی گۆڕی.

أَحْنَجَ الشَّيْءَ: شتەکەی لا دا.

أَحْنَجَ فُلان: فلانکەس سەیری دواخۆیەوە کرد سەری و سنگی وەر سوڕاند بۆ ئاوڕدانەوەکەی.

إِحْتَنَجَ الشَّيْءُ: بەمانا (أَحْنَجَ) دێ.

حَنْجَرَت عَيْنُهُ: چاوی قوڵ بون ٥ بەقولاچون.

حَنْجَرَ الحيوانَ: ئاژەڵەکەی سەربڕی.

الْحَنْجَرةُ: گەرو ٥ بۆری هەناسەدان لە ئاستی مل.

اَلْحُنجُورُ: بەمانا (الْحَنْجَرَةُ) دێ ٥ سندوقی باوە تی بچوك ٥ شوشەی عەترو شتی لەوجۆرە.

الحُنَاجِلُ: کورتە بالای تێکسمڕاو.

اَلْحِنجِلُ من النساء: ئافرەتی کەتەی ناشیرین و دەمەوەر، (ك: حَنَاجِلُ).

الحُنْدُرَةُ: گلێنەی چاو، دەگوترێ: (هو على حندرة عينيه).

اَلْحُنْدُورَةُ: بەمانا (الحُنْدُرَةُ) دێ.

تَحَنْدَسَ الرجلُ: زەعیف بوو کەوت ٥ (تحندس الليلُ) شەوەکە تاریك بوو.

الحِندِسُ: تاریکی شەو ٥ شەوی زۆر تاریك، (ك: حَنادِس)٥.

الحَنادِسُ: سێ شەوی کۆتایی مانگن (٢٨ — ٢٩ — ٣٠).

اَلْحَنْدَقُوقُ: پیاوی درێژی شل و شێواو ٥ پیاوی ئەحمەق ٥ گیاییەکە سالانەیە لەکێوو دەشت دەڕوێ و ئالفێکی باشە بۆ ولاخ و ئاژەڵ ٥ ناوێکی تری هەیە پێی دەڵێن: (الذُّرَق).

حَنَذَ الحَرُّ حَنذاً: گەرما تاوی ساند.

حَنَذَ لە: ئاوی کەم کردەوەو شەرابی زۆر کرد.

حَنَذَ العِجْلَ وغيره حَنْذاً وتَحْنَاذاً: سووری کردەوە ٥ گۆلکەڵەکەی سورکردەوە بەم جۆرە بیخاتە ناو ئاگرەوە، یان بیخاتە ناو شتێکەوە بەئاگر گەرم بوبێ.

حَنَذَ الشمسُ الشَّيْءَ: خۆر شتەکەی سوتاندو برژاند.

حَنَذَ الفَرَسَ حَنْذاً: بازی بە ئەسپەکە داو چەند مەودایەکی پێ بڕی ٥ ئەمجار لەبەر خۆرەتاو جلێکی بەئەسپەکەداداو بۆ ئەوەی عەرەق بکا.

اسْتَحْنَذَ: لەبەر خۆرەتاو راکشاو بەتانی و لێفەی بەخۆی دادا بۆ ئەوە عەرەق بکاتەوە.

حَنَاذ: ناوێکی خۆرە.

الحُنْذَةُ: گەرمایی توندو بەهێز.

الحِنْذِيان: ئادەمیزادی جنێو فرۆشی زمان پیس.

اَلْحَنِيذُ: ئاوی گەرم ٥ گۆشتی برژاو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَمَا لَبِثَ أَن جَاءَ بِعِجْلٍ حَنِيذٍ﴾.

حَنَرَ الحنيرةَ حَنْراً: تاقە کەوانەییەکەی دروست کرد ٥ قەوسی بێ ژێی دروست کرد ٥ ئامێری خاوکردنەوەی لۆکەی دروستکرد ٥ هەروا (حَنَر) ناوە بو هەرشتێك کەم بێتەوە.

حَنِسَ حَنَساً: لەناو جەنگەی گۆڕەپانی جەنگدا راوەستاو سەنگەری بەرنەدا.
الحُنُسُ: ئەوکەسانەی زۆر خۆلەماڵی حەرامو کاری نابەجێ دەپارێزن.
الحَونَسُ: کەسێك کەس نەتوانێ پڕ بەچاو سەیری بکاو کەس نەتوانێ ستەمی لێ بکا ٥ ئەگەر لەشوێنی خۆی جولا کەس نەوێرێ لەهەڵوێستی خۆیو وەیگێڕێ.
حَنَشَهُ (الحَنُشُ) حنشاً: پێوەی دا گەستی.
حَنَشَــهُ: لێی خوڕی دەری کرد ٥ دەگوترێ: (حَنَشَ الصیدَ) نێچیرەکەی راوکرد.
حَنَشَ فلاناً: فلانکەسی هەڵخەڵەتاند.
حُنِشَ: لەحەسەبو نەسەبی کەم کردەوە.
أحْنَشَهُ عن الأمر: پەلەی لێ کرد.
الحَنَشُ: ماری گەورەی رەش ٥ رەشماری گەورە کە زەهراوی نەبێ ٥ هەروا پیرۆیەك سەری لەسەری مار بچێ.
المُحْنَشُ: کەسێك زۆر کاسب بێو هەمیشە لەهەوڵی کاسبی ماڵ کۆکردنەوەدا بێ.
حَنَطَ الزرعُ حُنوطا: کشتوکاڵەکە پێگەیی.
حَنَطَ فلان: هەناسەی قوڵی هەڵکێشا.
حَنَطَ الادِيمُ: پێستەکە سور بوو (هو حانِطٌ).
حَنِطَ الرجلُ حنطا: پیاوەکە ریشی گەورە بوو پڕبوو، (هو أحنط).
أحْنَطَ الزَّرْعَ ونحوه: بەمانا (حَنَطَ) دێ.
أحْنَطَ المَيِّتَ: مردووەکەی تەحنیط کرد ٥ بۆنی خۆشی بەمردووەکە کرد.
حَنَّطَ الميتَ: بەمانا (أحنَطَهُ) دێ.
تَحَنَّطَ مِن الحِنطة: گەنمی خوارد.
اسْتَحْنَطَ فلان: فلانکەس پەلاماری مردنی داو دونیای بەلاوە هیچو پوچ بوو.
الحَانِطُ: بەروبوومی درەختی غەضا ٥ خاوەن گەنم ٥ کەسێك گەنمی زۆر هەبێ ٥ (رجل حانِط) پیاوێکە کشتوکاڵەکەی کاتی دروێنەی هاتووە ٥ (أحمر حانط) سورێکی مەیلەو رەش.
الحِناطُ: هەر بۆنێکی خۆش تێکەڵ بکرێ بۆ کفنو جەستەی مردوو وەکوو (میسكو صەندەلو عەنبەرو کافور..)
الحِنَاطَةُ: پیشەی عەلافی (گەنمو جۆ فرۆشی).
الحِنطَةُ: گەنم، (ك: حِنَطَ).
الحِنطِيُّ: ئەو کەسەی زۆر گەنم دەخوا ٥ کەسێك گەنم رەنگ بێ.
الحَنّاطُ: گەنم فرۆش ٥ ئەو کەسەی مردو تەحنیط دەکا.
الحَنُوطَ: بەمانا (الحِناطُ) دێ.
الحَنُوطِيُّ: ئەو کەسەیە کەرەسەی تەحنیط کردنی مردو دەفرۆشێ ٥ هەروا ئەو کەسەی هەڵدەستێ بەکفنو دفنکردنی مردوو.

**التَحْنيطُ**: بريتييه له هێشتنەوەی جەستەی مردوو لەسەر حاڵەتی خۆ بەوە لە مادەی نەرمو پێستو پەردەكان بپارێزرێو ناوسكی بەمادەی تایبەتی پاك بكرێتەوە.

**حَنْظَلَت الشجرةُ**: درەختەكە میوەی تاڵە وەكوو كاڵەكە مارانە.

**الحَنْظَلُ**: ڕووەكێكە بەسەر زەویدا بڵاو دەبێتەوەو پەل دەهاوێ ٥ بەرەكەی لە قەبارەی ڕەنگی پرتەقاڵ دایە، ناوكەكەی زۆر زۆر تاڵە.

**حَنَفَ عن الشَيْئَ حَنفاً**: لەشتەكە لایدا.

**حَنِفَ الرجلُ حَنَفاً**: قاچی خوار بوون رویان لەناوەوە كرد ٥ دەگوترێ: (حَنِفَتْ رِجْلُهُ) (هو اَحْنَفُ)، (يد حَنفَاءُ)، (ك: حُنفٌ).

**حَنَّفَهُ**: وای لێكرد قاچی خوارو فەیزەن بن ٥ دەگوترێ: (ضَرَبت فلاناً على رجله فحَنَّفْتُهَا)، (هو أحنف رهي حَنفَاءُ).

**تَحَنَّفَ**: وازی لەبتپەرستی هێناو موسوڵمان بوو دەستیكرد بەخودا پەرستی ٥ چووە سەر ڕێبازی ئەبو حەنیفە.

**تَحَنَّفَ الى الشَيْئِ**: مەیلی بۆ لای ئەو شتە بوو ٥ ڕووی لەو كرد.

**الحَنْفَاءُ**: كەوان ٥ موس ٥ دەعبای حیرباء ٥ ئافرەتی كەنیزەك دەمێ تەمبەڵو دەمێ بەنیشات ٥ سولەحفاتی ناو (كیسەڵی ئاوی) ٥ ماسییەكی دەریاییە ناوی (أحُوم)ە.

**الحَنَفِيُّ**: شوێنكەوتەی مەزهەبی ئەبو حەنیفە.

**اَلْحَنيفُ**: ئەو كەسەیە لەشەڕ لایدابێ بۆ كاری خێرو باش ٥ ئەو كەسەی لەسەر ئایینی ئیسلام بێو لێی لانەدا ٥ ئەو كەسەی حەجی ماڵی خودای كردبێ، (ك: حنفاء).

**الحنفاء**: پێرێكی عەرەبی پێش هاتنی ئیسلام بوون لە ناخەوە دژی بتپەرستی بوون یەكێ لەوانە (ئومەییەی كوڕی ئەبی الصلت) بووە ٥ یا ئەوانەی لەسەر ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم ماونەوە ٥ حەجیان كردووەو دابو نەرێتی خەتەنە كردنیان ئەنجام داوە بتپەرستییان نەكردووە.

**الحنيفية**: نەتەوەی ئیسلام دەگوترێ: (ملة حنيفية) ٥ جۆرێكە لە شمشێر كە نیسبەت دەدرێن بۆلای ئەحنەفی كوڕی قەیس، چونكە ئەو یەكەم كەس بووە لەناو عەرەبدا شمشێری داهێنا.

**حَنِقَ عليه حَنَقاً**: ڕقی لێ هەڵسا ٥ (هو حَنِقٌ وحنيق).

**أَحْنَقَ**: بەمانا ڕق لێبوونی بەردەوامە.

**احْنَقَ الصُلْبُ**: پشتی نووسا بەسكیەوە.

**أَحْنَقَ السنامُ**: دوگی حوشترەكە لەڕو لاواز بوو ٥ بەمانا قەڵەو بوونی دوگیش دێ واتە: دومانای دژبەیەكی هەیە.

**أَحْنَقَ الزرعُ**: كشتوكاڵەكە بڵاو بۆوە.

أحْنَقَ فلاناً: رقـي فلانكەسـی هەڵساند، (هو مُحْنَقٌ وحنيق).

اَلْحَنِقُ: قەڵەو، (ك: حُنُقٌ).

حَنَكَـت اَلأُمُّ الصَّـبِيَّ حَنْكـاً: دايكەكـە مەلاشووی منداڵەكەی هەڵدايەوە.

حَنَـكَ فـلان الدابَـةَ: فلانكـەس ولاغەكـەی لغاوكرد.

حنـك التجـارب الرجـلَ حَنْكـاً وحَنَكـاً: ئـەزمونو تەجرەبـە ئـەو پیاوەیـان قاڵ كردو لەبۆتەیان دا.

حَنَـــكَ الشَّـــيْءَ: لەشـــتەكە حـــاڵی بوو ٥ شتەكەی پتەو كرد.

أحْنَكَتْـهُ التجـارِبُ: ئـەزمونو تەجرەبـە لەبۆتەیان داوە.

احْنَــكَ فلانــاً عــن الأمــر: فلانكەســی لەكارەكە گێڕایەوە.

حَنَكَتِ الأم الصَّبِيَّ: بەمانا (حنكته) دێ.

حَنَّـكَ فـلان الدَّابَّةَ: دارێـكی خستە ژێـر مەلاشـوی سـەروی بـۆ چـارە سـەری نەخۆشیو خوێنی لێهێنا.

حَنَّكَـت السِـنُّ والتجـاربُ فلانـاً: تەمـەنو ئەزمون فلانكەسی قاڵ كرد.

إحتَنَــكَ الدابَــةَ: پــەتی لــە لغــاوی ولاخەكردو رایكێشا بە حەبلەكە.

احْتَنَكَ التجاربُ الجلَ: بەمانا(حنكَتْهُ)دی.

احتَنَكَ الرجُلُ: پیاوەكـە بـوو بەحـەكیمو داناو پیاوی خاوەن ئەزمون.

احْتَنَكَ الشَّيْءَ: شتەكەی لەبێخ دەرهێنا.

احْتَنَـكَ فلانـاً: بەسـەر فلانكەسـدا زاڵ بـوو ومدوی خۆی خست ٥ قورئان دەفەرموێ:

﴿لأحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إلاَّ قَلِيلاً﴾.

اسْــتَحْنَكَ: خــواردنی زۆر بــوو دوای ئەوەی كەمی دەخوارد.

إسْتَحْنَك الشـجرُ: دەرەختـەكـە بـەرِەگو ریشەوە هەڵكەندرا.

اَلْحانِكُ: رەش.

الحِنَـاكُ: ئـەو دەزوەی ئەوپەتـەی دەمـی ولاخی پێ دەبەسترێ.

اَلْحَنَكُ: مەلاشو ٥ دەندوكی باڵندە ٥ كۆمەڵە رێبوارێـك لا بدەنـە شارێـكو مـاوەیی تێیدا بمێننەوە، (ك: أحناك)٥.

اَلْحُنْكُ: ئەزمونو تێگەیشتن لەكاروبار.

الحُنُــكُ: پیـاوی ئـاقڵو لێـزانو خـاوەن ئەزمونو قاڵبوو.

الحُنْكَةُ: بەمانا (اَلْحُنْكُ) دێ.

اَلْحَنيـــكُ: پیرەمێـــردی خـــاوەن ئەزمون ٥ ئادەمیزادی زۆر خۆر.

اَلْمِحْنَكُ: بەمانا (اَلْحِنَاك) دێ.

حَنْكَـلَ في المشـي: لەرۆیشـتنندا تەمبـەڵی كردو هەنگاوی قورسی هاویشتن.

اَلْحُنْكُـلُ: كورتــە بــاڵا ٥ ئــادەمیزادی وشكو روگرژ ٥ پیاوی خـوێڕیو بـێ ئەمەك، (ك: حناكل)٥.

اَلْحَنْكَلَةُ من النسـاء: ئـافرەتی ناشیرینی قولەڕەش ٥ ئافرەتی وشـك تـەبیاتو مڕو مۆچ، (ك: حَناكِلُ).

حَنَّ حنيناً: ناڵاندی ٥ كوركانـدی ٥ باڕانـدی ٥ بۆڕانـدی ٥ دەگـوترێ: (حَنَّـت الناقـةُ): حوشترەكە قوڕاندی بۆ بێچووەكەی.

حَنَّت الرياحُ: رەشەباكە دەنگی لیٚ هات وەكوو دەنگی حوشتر دەرچوو.
حَنَّت القوسُ: كەوانەكە دەنگی لیٚهات لەكاتی هاویشتندا.
حَنَّ العودُ: عودو كەمانەكە بەهۆی پەنجە لیٚدانەوە دەنگی لیٚوەهات.
حَنَّ الرجلُ: پیاوەكە هاواری كرد یا لەخۆشییا یا لەتاو ئازار.
حَنَّ اليه: ئارەزوی دیداری كرد.
حَنَّ عليه: بەزەیی پیٚدا هاتەوە.
أَحَنَّ فلان القوسَ: فلاٌنكەس وای كرد كەوانەكە دەنگی لیٚبیٚ.
حَنَّنَ الشَّجرُ: درەختەكە گولوٚكی دەركرد.
تَحانَّ قوم: ئەو نەتەوە هەندیٚكیان ئارەزوی دیدەنی یەكتر دەكەن.
تَحَنَّنَ عليه: بەزەیی پیٚدا هاتەوە.
اسْتَحَنَّ الى الشَّيْءِ: حەزی لەو شتەكرد.
استحنَّ الشوقُ فلاناً: سۆزو خۆشەویستی فلاٌنكەسی خستە كەیف خۆشیو هەلیٚپەركیٚوە.
التَّحْنانُ: شەوقو ئارەزوی زۆر.
الحانَّة: حوشتر ٥ دەگوتریٚ: (ماله حانة ولا آنة) نەحوشتری هەیە نەمەڕ.
اَلْحَنانُ: دلنەرمی ٥ ڕەحمەتو بەزەیی ٥ قورئان دەفەرمویٚ: ﴿وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَاةً وَكَانَ تَقِيًّا﴾.
اَلْحَنّانُ: خاوەن ڕەحمو بەزەیی ٥ صیفەتیٚكە لە سیفەتەكانی خودا ٥ كەسیٚك چاكە لەگەلٌ كەسیٚك بكا كە ئەو ڕوی لیٚ وەرگیٚرابیٚ ٥ تیر بەناو پەنجەكانتا هەلیٚسوڕیٚنی دەنگی لیٚوەبیٚ ٥ ڕیٚگەی ڕاست.
اَلْحَنّانَةُ: ئافرەتیٚك سۆزی هەلسیٚ بۆ دیتنی مندالٌەكەی یان یادی میٚردە كۆنەكەی بكاتەوەو بۆی بكوركیٚنیٚ.
اَلْحَنَّةُ: (حَنَّة الرجل) ژنی پیاو هاوسەری پیاو ٥ (حَنَّة البعير) بۆڕەبۆڕی حوشتر.
اَلْحِنَّةُ: دلنەرمی.
اَلْحَنُونُ: ئەو بیٚوەژنەی لەبەر خاتری بەخیٚوكردنی مندالٌە وردیلەكانی شودەكا بە پیاویٚكی تر بۆ ئەوەی ژیٚواریان دابین بكا ٥ ڕەشەبایەك لورەی بیٚ وەكوو دەنگی حوشتر.
اَلْحَنِينُ: حەزو ئارەزۆ.
حَنَا عليه حُنُواً: سۆزی بۆی هەبوو ٥ (حنت المرأة على ولدها) بیٚوەژنەكە لەبەر خاتری مندالٌەكانی شوی نەكردەوەو بەبیٚوەژن كۆشی دوای مردنی میٚردەكەی مندالٌەكانی پەروەردە كردن.
حَنَا الشَّيْءَ: شتەكەی دولا هیٚنایەوە.
حَنَى العود وغَيْرَهُ حَنياً وحِنايةً: خواری كردەوە ٥ توێكلٌەكەی لیٚ كردەوە.
حَنَى يد الرجل: دەستی فلاٌنكەسی چەماندەوە.
حنى القوسَ: كەوانەكەی دروست كرد.
أحنى عليه: بەمانا (حنا) دیٚ.
الحَنِّ: كۆمایەوە.
تَحَنّىٰ: بەمانا (الحَن) هاتووە.

**تَحَنىَّ على فلان**: سۆزو خۆشەویستی بۆ فلانکەس دەرخست.

**الأحْني**: پشت کوڕ ٥ (هي حَنْواء).

**الحانـاةُ**: عەرەقخانـە ٥ شـوێنی عـەرەق خواردنەوە (باڕ).

**الحانَةُ**: بەمانا (الْحَانَاة) دێ.

**الحـانوت**: بـەمانا (الحانـاة) دێ ٥ دوكـانی مەیفرۆشی.

**الحانيـةُ**: بـەمانا (الحانـاة) دێ ٥ حوشـترو رەشـــە ولاخ كـــە ملیـــان خـــوار بكەنـــــــەوە ٥ مێینـــــــــەی (اَلْحَانی)یە ٥ عەرەق.

**الحَانِيُّ**: خاو ەنی حانوت.

**الحِنْوُ**: هەرشتێك خواربێو سوچو گۆشەی تێدابن.

**الْحَنْواءُ مـن الغـنم**: ئـەو مـەڕو بزنـەیـە ملـــی خـــوار بوبێتـــەوە ٥ هـــەروا بەحوشتری پشت کوڕ.

**الْحَنِيَّـــــةُ**: كـــــەوان ٥ كۆیەكـــــەی (حنایـــا)یـــە ٥ دەگـــوترێ: (خرجـــوا بالحنايا يبتغون الرمايا).

**الحَوَاني**: دێژترین پەراسوو.

**الْمَحْنِيَـةُ مـن الـوادي**: لێـژایی‌و چالایی دۆڵ.

**الْمُنْحَنــيَ**: لێـژایی دۆڵ یـان نزمـایی ڕێـگە.

**حَابَ حوباً**: تاوانبار بوو.

**أحْوَابَ إحْواباً**: هەڵخلیسكا بۆ ناو زلكاوی تاوان.

**حَوَّب فلان**: فلانكەس مـاڵو سامانەكەی فەوتاو دوایی دەوڵەمەند بوو.

**حَـوَّبَ بالابـل**: حوشـترەكانی راونـان بـە (حَوْبِ حَوْب).

**تَحَوَّبَ**: وازی لەتاوان هێنا ٥ دەستی كرد بەخوداپەرســـتی بـــۆ ئـــەوەی تاوانەكانی پێشوی بشواتەوە.

**تحـــوَّبَ مـــن القبـــيح**: شـــەرمی هـــات لەتاوانكردن.

**تَحوَّبَ من الشَّيْئَ**: لەو شـتە دڵـی ئـازاری پێگەیی‌و خەفەتبار بوو.

**تحـوَّبَ في دعائـه**: لـە پاڕانەوەكـەیدا زۆر لالایەوە.

**تحوَّبت الأم على ولـدها**: دایـك سـۆزی بـۆ منداڵەكەی بوو.

**اَلْحَوْبُ**: وەحشەت‌و خەفەت.

**الحُوبُ**: تاوان ٥ بەهیلاكچوون‌و فەوتان.

**الْحَوْباءُ**: نەفس.

**اَلْحَوْبَةُ**: تاوانی ئەزیەتدانی باوك‌و دایك ٥ تـاوان بەگشـتی ٥ پێداویسـتی ٥ غـەم‌و نارەحەتی.

**الحُوبـة**: تـاوان ٥ خـزم بـەهۆی دایكـەوە، ئافرەت یا پیاوی زەعیف‌و لاواز، (ك: حُوَبٌ).

**حـــات الطـــائر علـــى الشَّـــيْئ**: باڵندەكـە بەدەوری فلان شتدا سوڕایەوە.

**حَاوَتَهُ**: چاووراوی لێكردو فێڵی لێكرد.

**الْحَائِتُ**: ئەو كەسەیە زۆر لۆمەكاربێ.

**اَلْحُـــــوتُ**: ماســـی پچـــوك بـــێ بـــان

گـــەورە ٥ جـــۆرە گیانلەبەرێـــکی شیردەریشە ٥ هەروا ناوی بورجێـکە لە بورجەکانی ئاسمان.
**الْحُوتَـاءُ**: ئەوەیـە کەلەکـەی ئەسـتور بوبن‌و گۆشتەکەیان داچۆڕابێ.
**حَوْتَكَ الرجلُ**: پیاوەکە رۆیشت بەرۆیشتنی کورتــە بــاڵا، لاســایی کورتــەباڵای کردەوە.
**اَلْحَوْتَــكُ**: ئــادەمیزادی کورتــە بــاڵاو کـزو کۆڵەوار.
**أحَاكَهُ**: جولاندی‌و لێکی جیاکردەوە.
**أحـــاثَ الخَیْـــلُ الأرْضَ**: ئەســـپەکان زەوییەکەیان کوتاو گڵەکەیان وردکرد.
**أحـاثَ فـلان الأرْضَ**: فـلان گـڵ‌و خـۆڵی زەوییەکـەی سـەروناو کـردو بـەناوی دا گەڕا بزانێ چی تێدایە.
**اسْـتَحَاثَهُ**: ویسـتی دەری بێنـێ ٥ بـەناو گــڵ‌و خۆڵەکــەی دا گــەڕا بزانــێ شتەکەی لێی گوم بووە بیدۆزێتەوە.
**استحاثَ فلان الأرضَ**: فلانکەس گڵەکـەی سەروناو کرد.
**حاثِ باثِ**: پەرت‌و بڵاو.
**حَوْثُ**: بەمانا (حَیْثُ) دێ.
**اَلْحَــوْثُ**: جـەرگ‌و دەوروبــەری، ریشــەی جەرگ.
**حَوثُ بَوْثُ**: پەرت‌و بڵاو.
**الْحَوْثَاءُ**: جەرگ‌و دەوربەری.
**اَلْحَـوْكُمُ**: ئـەو گیاندارەیـە ج ئـادەمی ج گیانلەبـەری تـر درێژییەکـەی مـام ناوەندی بێ.

**حَاجَ حَوْجاً**: پێویستی هەبوو ٥ هەژار بوو.
**أحْوَجَ إحْوَاجاً**: هەژار کەوت.
**أحْـوَجَ فلانـاً الی کـذا**: وای لـە فـلان کـرد موحتاج بێ.
**اِحْتَاجَ**: پێداویستی هەبوو ٥ هەژار بوو.
**تَحَوَّجَ**: داوای پێداویستی کرد ٥ دەگـوترێ: (خَــرَجَ یَتَحَــوَّجُ) چـووە دەر بـۆ بەدەســـتهێنانی پێداویســـتییەکانی خــۆی ٥ یــەك بــەدوا یەکـدا داوای پێداویستییەکانی خۆی کرد.
**الحَائِجُ**: ئاتاج‌و هەژار.
**الحائِجَةُ**: مێینەی (الحـائج) ٥ هـەروا ئـەو شــتەیە کــە ئــادەمیزاد پێویسـتی پێبێ.
**الحَوْجُ**: پێداویستی ٥ بێوەیی‌و سەلامەتی.
**الحَوْجـاءُ**: پێداویسـتی ٥ دەگـوترێ: (کَلَّمَـهُ فمارَدَّ علیه حَوْجَاء ولا لوجاءَ) نـە بەچاك نـە بـەخراپ وڵامـی نەدایـەوە ٥ (مـا في صـدری حوجـاء ولا لوجـاء) هـیچ شك‌و گومانێك لەدڵمدا نییە.
**الْمُحَوْجَبُ**: برۆ پان‌و گەورە.
**اَلْحَوْجَلَـةُ**: گـۆزەی بنـك ئەسـتور، یـان گۆزەی بچوکی دەم بڵاو.
**حادَ عنه حَوْداً**: مەیلی کرد.
**حَاوَدَتْهُ الحُمیُ مُحاودةً**: ئاو بەناو لەرزو تای بۆ دێتەوە ٥ دەگـوترێ: (هـو یحاودنـا بالزیارة): ناوبەناو دیدەنیمان دەکا.
**حـاود في الأمـر**: لەکارەکـە بـووەو تێـی فکری.

حاذَ عليه حَوْذاً: پاراستی (حَاذَ الشَّيْئَ) شتەکەی پاراست ◦ بەسەریدا زاڵ بوو.

حاذَ الدوابَ: ئاژەڵەکەی بەتوندی لێ خوڕی.

احْوَذ: پەلەی کرد ◦ دەگوترێ: (أحْوَذَ السيرَ).

احْوَذَ الدواب: بەتوندی ئاژەڵەکەی ئاژووت.

أحْوَذَ الشَّيْئَ: شتەکەی کۆکردەوە، خستیە پەنایەك.

احوذ القصيدة: چامە شیعرەکەی جوان‌و پتەو رێك خست.

استحوذ على الشَّيْئَ: بەسەر شتەکەدا بالاّ دەست بوو.

استحوذ عليه الشيطان: شەیتان بەسەریدا زاڵ بوو.

الأحوذي: ئەو کەسەی قۆڵ بۆ کارکردن هەڵدەکا، ئیشەکە لەئەستۆی دەگرێ‌و بەجوانی ئەنجامی دەدا! یان خێرا ئەنجامی دەدا ◦ زاناو لێزان لەکاردا.

اَلْحَاذُ: پەناو پشتیوان ◦ دەگوترێ: (فلان خفيف الحاذ) فلانکەس ماڵ‌و خێزانی کەمە زۆر دەوڵەمەندو خێزاندار نیە ◦ درەختێکە لە پێڕی (الحمض) زۆر گەورە دەبێ ◦ لە دەشتایی‌و لمبەلاندا دەڕوێ حوشتر زۆر حەزی لەگەڵاکە یەتی، بەتەڕی‌و بەوشکی.

الحِواذُ: دووریی.

الحوذان: رووەکێکە لەرووەکە دوو فاقەکان، گوڵەکانی جوانن، زۆر جۆری هەیە ◦ لەبەر خاتری جوانی گوڵەکەی دەروێندرێ ◦ بۆخۆشی لەکێو دەڕوێ.

اَلْحُوذِيّ: دەرپەڕێنەر ◦ هەڵنەر بۆ رۆیشتن ◦ شۆفێری عەرەبانە.

اَلْحويذ: بەمانا (الأحوذی) دێ.

حارَ حَوْراً وحُئُوراً: گەڕایەوە.

حار الشَّيْئُ: شتەکە کەم بوو.

حار بعد ماكار: کەمی کرد دوای ئەوەی زیاد بوو.

حار الماءُ في الغدير: ئاوەکە لە زەلکاوەکەدا هاتوو چۆی کرد.

حار في أمره: لەکارەکەیدا سەری لێ شێوا.

حار الثوبَ: پۆشاکەکەی شت‌و سپی کردەوە.

حَوِرَتِ الْعَيْنُ حَوَراً: سپیایی چاوی زۆر سپی‌و رەشاییەکەی زۆر رەش ◦ بیلبیلەی چاوی کەوانەیی‌و پێڵوەکانی تەنك ◦ یان رشێنەی چاوی زۆرە وەکوو چاوی ئاسك‌و گا کێوی ◦ دەگوترێ: (حَوِرَتِ الْمَرأةُ) و (حَوِرَ الظَّبْيُ)، (هو أحور وهي حوراء).

أحارت الناقة: حوشترەکە بوو بەخاوەن بێچوو.

أحارَ الجوابَ: وڵامەکەی رەتکردەوە (دەنگەکەی دایەوە).

حاوره محاورة وحِواراً: وەلامی دایەوە ◦ گفتوگۆی لەگەڵ کرد.

حَوَّر الدَّقِيقَ أو الثوبَ: ئاردەکە یان کراسەکەی سپی کردەوە.

حَوَّر الأديمَ: چەرمەکەی بەرەنگی سور رەنگ کرد.

حَوَّر القرصَ: شتە بازنەییەکەی هەڵخولاند.

حَوَّر الدابَّةَ: ئاژەڵەکەی بەداخی کەوانەیی داخکرد.

حَوَّر الخُبزةَ: نانەکەی پانکردەوەو ئامادەی کرد بۆ ئەوەی بیخاتە سەر ئاگرەکە بۆ ئەوەی ببرژێ.

حَوَّر الشَّيْءَ: شتەکەی گێڕایەوە.

حَوَّر الله فلاناً: خودا فلانکەسی گێڕایەوە بۆ حاڵەتی دەستکورتیو بێ هێزیو کەمو کوری.

حَوَّرَ فلان الكلامَ: فلانکەس قسەکەی گۆڕی.

تحاوروا: گفتوگۆیان کرد ◊ لەنێو خۆیاندا وتو وێژیان کرد ◊ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا﴾.

اِحْوَرَّ: بۆ موطاوەعەی (حَوَّرَهُ) هاتووە ◊ یان سپیایی چاوی‌و رەشاییەکەی زیاد لە ئاساییە (چاوگەورە).

استَحَارَهُ: بەقسەی هێنا ◊ دەمی پێکردەوە.

الأحْوَرِيُّ: سپی نەرم.

الحائِرُ: سەرلێ شێواو ◊ لاوازو بێهێز.

الحائِرَةُ: بۆ مێینەی (الحائر) بەکاردێ.

الحُوارُ: بێچوی حوشتر لەو کاتەوە لەدایکی دەبێتەوە تا لەشیر دەبڕێتەوە.

الحِوارُ: گفتو گۆیەکە ئەنجام دەدرێ لەنێوان دوکەس یان زیاتر لەبواری شانۆدا.

الحَوَارِيُّ: ئەوەی پۆشاك سپی دەکاتەوە ◊ ئەوەی پاك‌و بێ خەوش‌و هەڵبژێراوە ◊ هاوەڵ‌و یارمەتیدەر، (ك: حواريون)ە.

الحواريون: یارمەتیدەرانی حەزەتی عیسا بوون.

الحُورُ: کەمی‌و فەوتان ◊ پەتاڵ‌و پوچ ◊ دارێکی سپییە دەیمەنێکی لێك چوی هەیە ◊ بۆ دروستکردنی لەوحەی خەشەبی بەکار دێ.

الْحَوَرُ: سپیاتی سپێنەی چاوو رەشایەتی رەشێنەکەی ◊ سێیەم ئەستێرەی کلکی (بنات النَّعْش)ە دەکەوێتە تەنیشت (نەعش) ◊ هەروا داوو دەرمانێکە لە رەصاصی سوتاو وەردەگیرێ ئافرەت دەموچاوی خۆی پێ میکیاج دەکا ◊ ناویشە بۆ مانگا ◊ چەرمی رەنگکراو بەسور بۆ داپۆشینی شت ◊ چەرمی سپی تەنك جانتای لێ دروست دەکرێ.

الْحَوْراءُ من النساء: ئەو ئافرەتانەی سپی پێستن مەبەست ئەوە نیە کە سپێنەی چاوی زۆر سپی بێ.

الْحُورِيَةُ: کچێکی ئەفسانەییە خەیاڵ دروستی کردووە، لە ناو دەریاو

چـــــــوّم‌و جه‌نگه‌ڵســـــــاندا ده‌بینــدرێ ○ ئــافره‌تی جـوانی زۆر ناســك‌و قــۆز ○ حه‌شــه‌ره‌و جـڕو جانه‌وه‌ر له‌دوا قۆناغی هێلکه‌یی دا.

**اَلْحُـوَارَى**: ئـاردی سپی ○ ئـادی بـێ سـۆو پـڕزو پـاڵ ○ هـه‌روا خوارده‌مه‌نییه‌کـه سپی بکرێ‌و ئاماده‌بکرێ بۆ خواردن.

**الْحَوِيرُ**: دوژمنایه‌تی ○ وه‌ڵام ○ ده‌گوترێ: (كلمته فمارد الي حويراً).

**الْمُحَارُ**: مه‌رجیع.

**الْمَحَـــارَةُ**: ئـــه‌و شـــوێنه‌ی ده‌نـــگ بداته‌وه ○ صه‌ده‌ف‌و مرواری.

**المحـــارَةُ مـــن الأذن**: دیــوی نــاوه‌وه‌ی گوێچـــــکه ○ داخــــــی حوشــــــتر داخکـردن ○ قروێلکی شـان (حه‌وشـی شان) ئه‌و قوڵکه ئێسقانه‌ی کـه سه‌ری شانی تێدا دێـوو ده‌چێ ○ حـه‌وزی ران ئـه‌و چـاڵه ئێسـقانه‌ی سـه‌ر ئێسـقانی رانـی تێدایــه ○ راڕه‌وی هه‌ناســه بــۆ نزیـك كـــه پــو ○ ئامێرێـــکه لـــه‌و ئامێرانـه‌ی دیـوارو ده‌رگـاو په‌نجـه‌ره‌ی پێ بۆیه ده‌کرێ ○ ئامێرێکه بینای پێ بۆیاخ ده‌کرێ.

**المِحْـوَرُ**: دار یـان ئاسنێـکه به‌کره‌کـه‌ی له‌ســه‌ر هه‌ڵـده‌خولێ ○ تـیرۆك یـان کۆڵه‌وه‌ژی نانه‌وا ○ وتوو ○ لـه‌زانیاری ئه‌ندازیاریـدا بریتییـه لـه هێڵێـکی راسـت کــه هــه‌ردوك لای کوره‌کـه ده‌گرێته‌وه، (ك: محاور).

**الْمَحُورةُ**: وه‌ڵام ○ ده‌گوترێ: (كلمته فما رَدَّ اليّ مَحُورَةً).

**الْمَحْوَرَةُ**: به‌مانا (المَحُورةُ) دێ.

**حـاز فـلان حَـوْزاً**: فلاَنکـه‌س به‌هێواشـی رۆیی.

**حاز الشَّيْئَ حيازةً**: ئـه‌و شـته‌ی بـۆ خـۆی هه‌ڵـــگرت پێـــی بـــڕا بـــۆ ئـــه‌و ده‌رچوو ○ ده‌گوترێ: (حازَ المالَ وحاز العِقار).

**حاز الـدوابَ حـوزاً**: ئاژه‌ڵه‌کانی له‌سه‌رخۆ لێخوڕی ○ بردنی بۆ سه‌ر ئاو بۆ ئـاو خواردنه‌وه.

**حَوَّزَ الدوابَ الى الماء**: به‌مانا (حازها) دێ.

**حَوَّزَ الأمْرَ**: کاره‌که‌ی توندو تۆڵ کرد.

**اِحْتَازَهُ**: شته‌که‌ی بۆخـۆی داناو بـه‌خۆی بـڕا ○ به‌رنـه‌و کـه‌وت ○ ده‌گـوترێ: (إحتازه إلى نفسه).

**إنْحَـازَ**: بــۆ مــوطــاوعــه‌ی (حَــزَهُ) هاتووه ○ هه‌روا بـه‌مانا پـاڵی پێوه‌دا له‌گه‌ڵی کۆ بـووه ○ ده‌گـوترێ: (إنحاز اليه) به‌لای ئه‌ودا دایتاشی.

**انحازَ القومُ**: ئه‌و هۆزه شوێنی خۆیان واز لێهێنا بۆ که‌سانی دیکه.

**انحـاز علـى الشَّيْئ**: به‌سـه‌ر ئـه‌و شته‌دا کۆمایه‌وه خۆی به‌سه‌رردادا.

**انحازَ عنه**: لێی لادا.

**تحاوزوا في الحرب**: هه‌ریه‌ك له لایه‌نه‌کانی شـه‌ڕ لـه‌وێ تـر کـه‌نارگیر بـوو لێـك دوورکه‌وتنه‌وه.

**تَحَوَّزَ**: بۆ موطاوعه‌ی (حَوَّزه) هاتووه.

**تَحَوَّزَ الرَّجُلُ:** ئەو پیاوە ویستی هەڵسێ‌و بەنارەحەتی راست بووە ٥ مایەوە ٥ خۆی هێشتەوە ٥ قۆرت‌و پێچی هێنانی‌و زاڵ بوو بەسەریدا.

**تَحوَّزَ عنه:** لێی تەکیەوە ٥ لێی دوورکەوتەوە.

**اسْتَحَازَهُ:** خستیە لای خۆی‌و بۆ خۆی داناو کردی بەهی خۆی.

**الأحوَزُ:** لێخوڕی لەسەرە خۆو هێدی.

**الأحْوَزِيُّ:** بەمانا (الأحوز) دێ ٥ رەش ٥ ئەو کەسەی بەرێک‌و پێکی کارەکانی بەڕێوە دەبا ٥ کاراما لەئیش‌و کاردا.

**الانحياز:** پاڵدان بەشتێکەوە ٥ سیاسەتی وڵاتانی (عدم الانحياز) لەسەردەمی تازەدا بریتییە لەوەی نە بەلای غەرب یان شەرقدا خۆیان ساغ بکەنەوە.

**الحَوزُ:** لەسەرە خۆیی ٥ کەم تاکورت ٥ مڵکایەتی.

**الحوزُ من الأرضِ:** ئەو پارچە زەوییەی ئادەمیزاد بۆ خۆی قۆرغی بکاو سنورەکانی دیاری بکاو خاوەنیەتی بکا ٥ سروشت بەچاک‌و خراپییەوە.

**الحَوْزَاءُ:** ناحیەو هەرێم ٥ (حوزة الرجل) ئەوەی کە دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵ‌و دەسەڵاتییەوە.

**حَوزَةُ السَّلام:** سنووری ئاشتی‌و ناوچەکانی ٥ ترییەکە دەنکەکانی گەورەنین.

**الحوزی:** ئەو کەسەیە بەتەنیا دانیشێ‌و کەس لەگەڵیا نەبێ‌و تێکەڵاوی کەس نەکا ٥ یان کەسێکە کارو بار جوان بەرێوە بەرێ.

**الحُوَيْزاء:** ئەومیە زەخیرەو بژێو لەهاوەڵەکەی پەنهان بکا.

**الحيازة:** (حيازة الرجل) ئەوەی لەژێر دەستی پیاوا بێ لەزەوی‌و ماڵ‌و سامان.

**الحَيِّزُ:** هەموو کۆمەڵە شتێک کە پێکەوە بگونجێن‌و کۆببنەوە ٥ شوێن‌و مەکان ٥ موشتەمەلاتی خانوو مەنفەعەت‌و داهاتی.

**حاس الغارةُ حَوْساً:** هەڵمەت‌و هێرشەکە بەربڵاو بوو.

**حاس الرجلُ:** پیاوەکە ئازاو بەجەرگ بوو نەترسا.

**حاس الأمر فلاناً:** شتەکە کارەکە لەسەر فڵانکەس کاریگەر بوو.

**حاس الذئب الغَنَمَ:** گورگ کەوتە ناو مەڕو بزنەکانەوەو پەرتەوازەی کردن ٥ دەگوترێ: (حمل على القوم فحاسهم) تێکەڵاوی ئەو گەلە بوو سوکایەتی پێکردن ٥ هەروا دەگوترێ: (حاسَهُمْ خَطْب كريه) بەڵاو کارەساتێکی گەورەیان توش بوو.

**حاست الفتنة فلاناً:** فیتنەو ئاشوب چووە ناو دڵی فڵانەوەو تێکی دا.

**حَوِسَ حَوَساً:** ئازابوو خۆگربوو، لە شوێنی

خۆی وەستاو سەنگەری بەرنەدا تا سەرکەوتنی بەدەست هێنا ◦ خۆراکی زۆر بوو زۆر خۆر بوو تێری نەخوارد ◦ (هو أحوس وهي حوساء)، (ك: حُوسٌ).

حاوَسَت المرأة الرجالَ: ئافرەت تێکەڵاوی پیاوان بوو چووە ناویانەوە.

تَحَوَّسَ في الكلام: خۆی ئامادەکرد بۆ قسەکردن‌و هێزو توانای دایە خۆی ◦ راوەستاو تەمبەڵی نواند.

استَحْوَسَ: خۆی خافڵاندو تەمبەڵی نواند.

الأحْوَسِيّ: بەردەوام‌و هەمیشەیی ◦ دەگوترێ: (غيث أحوسي) بارانێکی بەردەوامەو هەڵی ناپروکێنێ.

حاسَتْهُمُ الخطوبُ الحُوَّسُ: ئەو بەڵاو کارەساتانە کە توشی گەل‌و نەتەوەیەك دەبێ‌و برستیان لێ دەبڕێ ◦ پەخەی گرتن.

الحُواسةُ: خزمایەتی‌و خوێنگری ◦ هێرش‌و پەلامار ◦ دەسکەوتی شەر ◦ پێداویستی ◦ کۆمەڵێك لەخەڵکی جیا.

الحُوَاسُ: ئەو کەسەی لەشەڕا بانگی ئەمو ئەو دەکاو دەڵێ: هۆی فلان هۆی فیسار کەس ◦ ئەو کەسەی ئازاو چاو نەترسەو نازناوی کوڕی تەنگانەو کوڕی شەوی هەیە.

حَاشَ الدَّوَابُّ حَوْشاً: ئاژەڵەکانی کۆکردنەوەو لێی خوڕین.

حاشَ الْقَومُ الصَّيدَ: خەڵکەکە نێچیرەکانیان هێنان‌و بردیانن بۆ ئەوەی بیانگرن.

حاشَ اللُّصُّ ونحوه: دزەکەی گرت‌و نەیهێشت بەحەرام بگا.

أحَاشَ الصَّيْدَ: بەمانا (حَاشَهُ) دێ.

حَاوَشَهُ على الأمر: هەڵی نا بۆ کارەکە.

حاوشَ الرجلُ البرقَ أو المطرَ: پیاوەکە خۆی لە هەورە بروسکەکە یان بارانەکە کەنار گیرکرد.

حَوَّشَ المالَ ونحوه: ماڵ‌و سامانی کۆکردەوەو پەزمەندەی کرد.

احْتَوَشَ القومُ الصَّيْدَ: خەڵکەکە نێچیرەکانیان هێنان‌و بردن بۆ ئەوەی بیانگرن.

احْتَوَشَ القوم الشَّيْئَ: خەڵکەکە شتەکەیان خستە ناو خۆیانەوەو دەوریاندا.

إنْحَاشَ: بۆ موطاوعەی (حَشَهُ) دێ.

إنْحَاشَ عَنْهُ ومنه: لێی دوور کەوتەوە ◦ دەگوترێ: (فلان لاينحاش من شيئ) فلانکەس گرنگی بەهیچ نادا.

تحاوشوا الشَّيْئَ بَيْنَهُمْ: شتەکەیان خستە نێو خۆیانەوەو دەوریاندا.

تَحَوَّشَ منه: شەرمی لێکرد ◦ (تحوَّش عنه): لێی دوور کەوتەوە.

تحوَّشَتْ فلانةٌ من زوجها: فلان ئافرەت بێ مێرد بوو، بوو بە بێوەژن.

الحائش: کۆمەڵێك درەختی دار خورما یان دەرەختی تر.

اَلْحُواشَـةُ: پێداویسـتی ٥ هەرشتێـك شەرمی لێبکرێ ٥ تاوان بێ یان نا.

الحَوْشُ: حەوشەی ماڵ.

الحُوْشُ: حوشتری هارو چەموش.

الحُوشِـيُّ مـن الكـلام: قسـەو وشـەی غەریبو کەم بیستراو.

الحوشـيّ مـن الليـالي: شـەوی تاریكو نوتەك ٥ دەگوترێ: (رجل حوشـيٌّ): پیاوێـکە تێـکەڵاوی کـەس ناکـاو تەریکە.

الْمَحَاشُ: ئامێرو کەرەستەی ناو ماڵ.

الحَوْشَبُ: نـاو زەنگی وڵاخ ئەو شوێنەی سـمو ئێسـقانی قاچـی بەیـەك دەگەن ٥ یان خودی ئێسقانی قاچی کـە لەگـەڵ سمـی دا بەیـەك دەگـەن ٥ بۆشـایی سم ٥ کەروێشکی نێـر ٥ گۆلـك ٥ قـەدباریكو ورگ بچـکۆلە ٥ یـان ورگ زلو کەلەکـە هەڵاوساو ٥ کۆمەڵێك ئادەمیزاد.

اَلْحَوْشَـكَةُ: ئـەو دەنگـە دەنـگو گاڵو بوغڵییـەی لـەکۆڵان دەبیسـرێو تـۆ لەماڵەوە گوێت لێیەو تێیان ناگەی.

حَـاصَ الثـوبَ ونحـوه حَوْصـاً: کراسـەکەی دوریی بەدورین.

حـاصَ بـين الشـيئين: نێـوانی دوشـتەکەی تەسك کردەوە.

حاصَ حولَهُ: دەورەی داو پاراستی.

حَـوِصَ الرجـل يحـوصُ حوصـاً: قولنچـکی چـاوی ئـەو پیـاوە چـوك بـون هـەر دەڵـــێ قولینچـــکە چـــاوی دوراون ٥ هــەروا بــەمانا ئــەوەش دێ ٥ چاوێـکی لـەوی تـری پچـوکتر بێ ٥ (هو أحْوصُ وهي حوصـاء)، (ك: حَوِصَ).

حَاوِصَـهُ: بەقولینچـکی چـاوی سـەیری کرد تیلەی چاوی دایە.

احْتَاصَ في الأمر: لەکارەکەدا ئیحتیـاتی کرد.

الحِـواصُ: دەرزیو سـوژن یـان شتێـکی تری لەو جۆرە کەشتی پێ بدروێ.

الْحَـــــــوْصُ: هەڵوەشـــــاندنەوە، روخاندنەوە، دەگـوترێ: (لأطعـنَّ في حَوْصِـهِ) ئـەوەی کـە دوریویەتـەوە هـەڵی دەوەشـێنمەوە ئـەوەی چـاکی کردۆتەوە دەیڕوخێنمەوە.

الحَيَاصَـةُ: قەپاسـەو بەرتەنگـەی (وڵاخ ئەو حەبلـەی کورتـانو باری پـێ لـە وڵاخ قايم دەکرێ).

حَوْصَلَ الطائر: باڵندەکە چکڵدانەی پـڕ کرد لە خۆراك.

حَوْصَلَ الانسان وغيره: ئـادەمیزاد خـوار ورگی زل بوو ٥ دامێنـی ورگـی بـەرز بووە.

الحَوْصَـــــلُ للطـــــير: هەڵاوســــانی چـیکڵدانەیەتی خـواردنی تێـدا کـۆ دەبێتـەوە پـێش ئـەوەی خواردنەکـە بچێتە مەعیدەیەوە.

حَوْصَلَ الدار: کەنجینەی خانوو.

حَوْصَلَ الحوض: بنکی حـەوز کە ئـاوی تێدا راوەستێ.

**الحَوْصَلُ من الشاة**: ئەو ئاژەڵو حەیوانەیە ورگی لەژور ناوکییەوە زل بێ ٥ (ك: حواصل).

**الحَوْصَلَة**: بۆ باڵندە بەمانا (الحَوْصَل) دێ ٥ بۆ ئادەمیزاد لەخوار ناوکییەوە گەدەی زل بنوێنێ ٥ صندوقە پچکۆلەیەکە پارەو شتی وای تێدا هەڵدەگیرێ.

**حاضَ الماءَ حَوْضاً**: ئاوەکەی کۆکردەوەو دەورەی دا.

**حَوَّضَ**: حەوزی دروست کرد ٥ (حَوَّضَ الماءَ) ئاوەکەی لە حەوزەکەدا کۆکردەوە ٥ (حَوَّض حوله): بەدەوری حەوزەکەدا دیواری کرد.

**احتاضَ**: حەوزی دروست کرد.

**استحوض فلان**: بەمانا (احتاض) دێ ٥ (استحوضَ الماءُ) ئاوەکە کۆ بۆوە.

**الحَوْضُ**: شوێنی کۆبونەوەی ئاو ٥ (الحَوْضُ من الأذن): کرکراگەی گوێ ٥ پارچەیەك لەزەوی سنوردار ٥ زرعاتو باخی پەرژینکراو.

**حَوْض البحر**: ئەو وڵاتو شارانەی دەکەونە سەر لێواری دەریا.

**حَوْض النهر**: ئەو زەویو زارەی بەئاوی روبارەکە ئاو دەدرێو بەئاویا تێپەڕ دەبێ ٥ (الحوض الجاف) ئەو حەوزەیە ئاوەکەی بەتاڵ دەکرێو کەشتی تێدا چاك دەکرێتەوە، (ك: أحواض وحياض وحيضان)٥.

**المُحَوَّضُ**: ئەستێرۆکە بەدەوری بنکی دارخورماو درەختی تردا دەکرێو ئاوی تێدەکرێ بۆ ئەوەی درەختەکە تێر ئاو ببێ.

**حاط القومُ بالبلد حِيَاطَةً**: خەڵکە دەورەی شارەکەیان دا.

**حاط الصَّبِيُّ**: منداڵەکە پەتی چاوەزاری لە پشتی بەست.

**حاط الشَّيْءَ**: شتەکەی پارێزگاری کردو بەڵێنی داچی لە بەرژەوەندی شتەکەدابێ بیکاو زیانی لێ دوور بخاتەوە.

**أحَاطَ الحائطَ**: دیواری دانا، دیواری رابەست.

**أحاط القومُ بالبلد**: خەڵکەکە دەورەی شارەکەیاندا.

**أحاط بالأمر**: لەهەموو لایەکەوە گرنگی بەکارەکە داو کونترۆڵی کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ﴾.

**أحَاطَ الشَّيْءَ**: دەورەی شتەکەیدا ٥ (أحَاطَ بالقوم) خەڵکەکەی مەنع کرد.

**أُحِيطَ بِفلان**: فەوتانو تێیدا چوونی فلانکەس نزیك بووە.

**اُحِيط بالشّر**: تێداچوو فەوتا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِ﴾.

**حاوَطَهُ**: گفتوگۆی لەگەڵ کرد لەسەر کارێك بۆ ئەوەی رازی بکا.

**حَوَّطَ حائطاً**: دیواری رابەست ٥ (حَوَّط كرمَهُ) پەرژینی بۆ درەختی مێوەکەی کرد.

حَـوَّط حـول الشَّيْئَ: شـتەكەی بەچـوار دەوری شـتەكەدا كۆمـەڵ كـردو بـۆی كردە شورا.

حَـوَّطَ الشَّـيْئَ: شـتەكەی چاودێری كـردو پــەیمانی دا پارێزگـاری بكـاو چـی لەبەرژەوەندی ئەودایە ئەنجامی بدا.

إحْتَاطَ: لە كاروباری خۆی دا زۆر وردبینیو لێـكۆڵینەوەی ئەنجامـدا ٥ دەگـوترێ: (إحتاطَ لِنَفْسِهِ وللشيءِ).

تَحَوَّطَـهُ: پارێزگـاری شـتەكەی كـردو پــەیمانی دا چـی لەبەرژەوەنـدی ئەودابێ بیكا.

استحاط في الأمـر: زێـدە ڕۆیـی كـرد لـە ئیحتیاتكردندا.

التَّحْوِيطَـةُ: دەزوی دورەنـگو بـادراو (ڕەنگـی سـورو ڕەش) ٥ مـیرووی تێـدەكرێو بـۆ چـاوەزار لـە پشـت دەبەسـترێ ٥ هـەروا بـەمانا نوشـتەو جادوش دێ.

الحائِط: دیوار ٥ شورای باخ، (ك: حیطـان وحوائط).

الحُوَاطَـةُ: ژورێـك بـۆ هەڵـگرتنو پاراستنی گەنمو جۆو دانەوێڵە.

الحَـوطُ: دەزوێـكی ڕەنگاو ڕەنگـە (سـورو ڕەش) مـیروی شـینی پـێ دەهۆنـدرێتـەوە هەرشـكڵی مـانگی یەكشـەوەی لـەزیو دارێـزراوی تێـدەكرێو لـە پشـت دەبەسـترێ بـۆ دەفعی چاوەزار.

الحِوَط: تەواوكـەری مەبلـەغی پـارە لـەكاتی دابەشـكردنی مـیرات هـەركاتێ دیرهەمەكان كەمیان هێنا دەگوترێ: (هلم حِوَطَهَا) چەند دیرهەمێك بێنـە ئەندازەكە تەواو بكە.

الحَوْطَةُ: بەمانا ئیحتیات دێ.

الحَوطَـةُ: پاریـیەكـە پاریكـەرەكان تێیـدا بەدەوری یەكتردا دەخولێنەوە.

الحُـوَّاط: ڕاگـر ٥ دەگـوترێ: (حُـوَّاط الأمر): ڕاگری كارەكە.

الحَيْطَـةُ: ئیحتیـات ٥ سـۆزو بـەزەیی ٥ دەگـوترێ: (لـدی فـلان حَيْطةٌ لك).

الحَـيِّطُ: دەگـوترێ: (رجـل حَـيِّطٌ) پیاوێكە زۆر چاودێری ماڵو منداڵی خۆی دەكا.

المُحَاطُ: ئەو شوێنەی دەبێتە دەوروبەری ماڵو سامان، واتە: پەرژین.

المُحيطُ: دەریا لووش.

حَافَ فلان الشَّيْئَ حَوْفـاً: فلانكەس لەسـەر لێواری شتەكە بوو.

حَوَّفَهُ: خستیە سەر لێواری شتەكە.

حَـافَ النبـاتُ المكـانَ: ڕوەكـی لـەدەوری شوێنەكە ڕواند.

تَحَوَّف: بۆ مطاوعەی (حَوَّفَهُ) دێ.

تَحَـوَّفَ الشَّـيْئَ: فـەراغی شـتەكەی گرت ٥ یان لە فەراغەوە گرتی.

الحَافَةُ: لایەنو كـەنار (الحَافَةُ مـن الشَّـيْئَ) كـەنارو فـەراغی شـت ٥ پێداویستی ٥ دەسـتكورتیو

کەم دەرامەتی ژیان.

**اَلْحَوْفُ**: لایەنو فەراغ ٥ پۆشاکێك منداڵ لەبەری دەکا بۆ قوڵ وەکوو سوخمە، (ك: أحْواف).

**حَوفَزَ الصَبيُّ**: منداڵەکەی خستە سەر پەنجەی قاچیو بەقاچی بەرزی کردەوە.

**حاقَ البَيْتَ ونحوه حَوْقاً**: ماڵەکەی ماڵی.

**حَوَّق عليه**: قسەکانی لێ خوارو خێچو تێکەڵو پێکەڵ کردن.

**حَوَّق راسَهُ**: ناوەراستی سەری تاشیو ئەوی تری هێشتەوە.

**احتاق مالَه من ورائه**: ماڵەکەی زەوت کرد.

**الْحَوَاقَةُ**: ماڵماڵین ٥ جادە ماڵین.

**اَلْحَوَقُ**: کۆمەڵی زۆرو فەرمباڵغی.

**الْحَوْقَةُ**: بەمانا (الحَوَق) دێ.

**اَلْحُوقُ**: چوار چێوەی شت کە بەکەوانەیی دەوری شت دەدەن.

**اَلْمِحْوَقَةُ**: گەسك، (ك: محاوق)٥.

**حَوْقَلَ حَوْقَلةً وحيقالاً**: هەردوو دەستی خۆی خستنە سەر کەلەکەی، سەر سێ بەندەی ٥ بەخێرایی رۆیی خەریکبوو رۆیشتنەکەی بگاتە راکردن ٥ ماندوبوو.

**حَوْقَلَ فلان**: وتی: (لاحول ولا قوة الا بالله).

**حَوْقَلَ الشَّيْئَ أو فلاناً**: پاڵی پێوەنا ٥ هەڵی نا.

**الحَوْقَلُ**: ئادەمیزادی بەتەمەنی ماندو.

**الْحَوْقَلَةُ**: دیزەو گۆزەی مل درێژ کە ئاو فرۆش بەکاری دێنێ ٥ بەمانا (ألحولقة)ش دێ، (ك: حواقل).

**حاك الشَّيْئُ في صدره أو قلبه**: شتەکە لە مێشکی دا یان لە دڵی دا چەسپاو جێگیربوو یان بەمانا دەنەدەنەو خورانەدن دێ ٥ پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ: (الاثم ماحاك في صدرك وكرهت أن يطلع عليه الناس).

**حاك الثوبَ حياكةً**: قوماشەکەی چنی.

**حاك المطرُ الرَوْضَ**: بارانەکە گەشەی بەگوڵو رەوەکی باغەکەدا دەگوترێ: (هو حائك)، (ك: حاكة)، (وهي حائكة)، (ك: حوائك).

**أحَاكَ**: دەگوترێ: (ما أحاك سيفُهُ) شمشێرەکەی نەی بڕی ٥ (وما أحاكته اسناني) ددانم نەیبڕی.

**تَحَوَّكَ بالثوب**: پۆشاکەکەی لەسێ بەندەیەوە هێنا بۆ پێشی ئەژنۆیو لەسەر سیچکانی دانیشت، واتە خۆی کەمەندکێش کرد.

**اَلْحَوْكُ**: نموونەی وێنە ٥ دەگوترێ: (هذا على حَوْلِ ذاك) ئەوە لەسەر شێوەی ئەومیە.

**اَلْحَوَكَةُ**: دەگوترێ: (هم ناس ليس عليه حركة هؤلاء القوم) ئەوانە کەسانێکن لەو هۆزو خێڵە ناچن.

**الحِياكة**: جۆلایی.

**اَلْمُحَوكَةُ**: شەرو هەرا.

**حالَ الشَّيئُ حولاً**: ساڵێك بەسەر ئەوشتەدا تێپەری.

**حال** الحولُ: ساڵەکە تەواو بوو.

**حـال** الشَّـيْءُ: شـتەکە گـۆڕا ٥ دەگـوترێ: (حال اللونُ وحال العهدُ).

**حال** في ظهر دابته: بازی داو لەسەر پشتی وڵاغەکەی وەستا ٥ دەگـوترێ: (حـال علـى الفـرس) خـۆی هەڵدایـە سـەر پشتی وڵاغەکەی.

**حال** عن العهد: لە پەیمانی خۆی پەشیمان بۆوە.

**حال** الشـيء بين الشـيئين حـولاً وحيلولـةً: نـاوانی کـردن ٥ بـوو بـە پـەردەو حائیل لەنێوان ئەو دو شتەدا.

**حالت** النَّخْلَةُ حُئُـولاً: درەختـی خورماکە ساڵێـک بـەری گـرتو ساڵێـک بـەری نەگرت.

**حَالَتِ** الناقةُ: حوشترە مێینەکە کەڵ درا بەڵام ئاوس نەبوو.

**حَوِلَت** عينه أو طرفـه: چاوی خیـل بـوو، چاوەکەی توشی قیچی بوو.

**اَحْـــــوَلَ**: ساڵێـــــک بەســــــەری دا تێپەڕی ٥ دەگـوترێ: (أحْوَلَ الصَبيُّ): منداڵەکە ساڵێکی تەواو کرد.

**أحْوَلَـت** الـدارُ: خانومکە ڕۆژگـاری زۆری بەســـــەردا تێپــــەڕیو گۆڕانکـــاری تێـکەوت.

**أحْـوَلَ** بالمکـــان: ساڵێـــک لـــەو شـــوێنە مایەوە.

**أحْوَلت** المرأةُ أو الناقـةُ: ئافرەتەکە لـەدوا کچ کوڕی بوو ٥ یان حوشترەکە دوای بێچوی مێینە بێچوی نێری بوو.

**أحْوَلَ** عَيْنَهُ ٥ چاوی خێلکرد.

**أحَـــالَ**: ساڵێـــکی تـــەواوی بەســـەردا تێپەڕی.

**أحـــال** الـــدارُ: خانووەکـــە گۆڕانکـــاریی بەســــەردا هــــاتو ساڵانێــــکی زۆری بەسـەردا تێپـەڕی ٥ دانیشـتوانەکەی چـەند ساڵو عەیامێـکە لێـی دوور کەوتوونەوە.

**أحَالَ** الشَّيْءُ الرجلُ: شتەکە یـان پیاوەکە لەحاڵێکەوە چووە سەر حاڵێکی تر.

**أحَالَتْ** المرأةُ أو الناقـةُ: بـەمانا (أحْوَلَـت) دێ.

**أحال** بالمكان: ساڵێک لەو شوێنە مایەوە.

**أحـال** الرجـلُ: ئـەو پیـاوە حوشـترەکانی ئاوس نابنو ئـەزۆکن ٥ قسـەکانی دژ بەیـەکنو هیچـی بەسـەر هیچـەوە نیە.

**احـــالَ** عليـــه بـــالكلام: بەقسـە ڕوی تـێ کـردوو دەسـتی کـرد بـە ئاخـاوتن لەگەڵیـدا ٥ دەگـوترێ: (أحـال عليـه بالسَّوْطِ).

**أحَالَ** في ظهـر دابتـه وعليـه: بـازی دایـە سەرپشتی وڵاغەکەیو جێگیر بوو.

**أحالَ** الغريمَ: خاوەن قەرزەکەی ڕەوانەی سەریەکێکی تر کرد.

**أحَالَ** الشَّيْءَ: شتەکەی گواستەوە.

**احال** العمل الى فلان: کارەکەی بەفلان سپارد.

**أحال** القاضی القضية الى محكمـة الجنايـات: قـــازی ڕوداوو کێشـــەکەی ڕەوانـــەی داداگای تاوانەکان کرد.

أحَالَ الماءَ في الجدول: ئاوەکەی کردە ناو جۆگاکەی.
حاوَلَ الأمرَ محاولة حِوالاً: ویستی بەکارەکە بگاو تەواوی بکا.
حَـوَّلَ الشَّيْءَ: شتەکەی گۆڕی یان گواستیەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.
حَـوَّلَ فلان الشَّيْءَ الى غيرِه: فلانکەس شتەکەی نارد بۆ لای یەکێکی تر.
حَوَّلَ الأرْضَ: زەوییەکەی ساڵە ناساڵێك کێڵا بۆ ئەوەی خاکەکەی بەهێزبێ.
حَـوَّلَ الشَّيْءَ: شتەکەی لە حاڵێکەوە گۆڕی بۆ حاڵێکی تر.
احترَلَهُ القومُ: خەڵکەکە فلانیان خستە ناو خۆیانەوە.
احتالَ الشَّيْءُ: ساڵێك بەسەر ئەو شتەدا رۆیی.
احتـال فـلان: فلانکەس ویستی بەفێڵو تەڵەکەبازی فلان شتی دەست بکەوێ.
احْتَـالَ الأرْضُ: زەوییەکە بارانی لێ نەباری.
احتـال عليـه بالـدين: قەرزەکەی حەواڵەی ئەستۆی ئەو کرد.
تَحَوَّلَ: لە شوێنێکەوە گواستییەوە بۆ شوێنێکی تر ٥ یان لەحاڵو وەزعێکەوە کەوتە حاڵو وەزعێکی ترەوە.
تَحَوَّلَ عـن الشَّيْءَ: لەو شتە وازی هێنا چووە سەرکارێکی تر.
تَحَوَّلَ فلاناً بالنصيحة والوصية والموعظة: تێفکرێ بۆ ئەوەی بزانێ ئاخۆ بەچ شێوەیەك کاری تێ بکاو بیهێنێتەوە سەر رێگای راست.
اسـتَحَالَ الشَّـيْءُ: شتەکە لاچوو چووە سەر شوێنێکی تر ٥ یان شتەکە خوار بووە چەمایەوە ٥ گۆڕا.
استحال الكلامَ: کەلامەکەی لەمانای خۆی لاداو مانایەکی تری لێ هەڵهێنجا.
استحال الشَّيْءُ: شتەکە حەواڵەکرا.
الإحتيـال: هەڵخەڵەتاندن جەریمەیەکی یاساییە ٥ بریتییە لەوەی کەسێك بیەوێ بەنارەوا ماڵی کەسێکی تر بخوا.
التحاويـل: ئافرەتێکە ساڵە ناساڵێك منداڵی ببێ ٥ هەروا بەزەوییەك دەگوترێ ساڵە ناساڵێك بکێڵدرێو تۆو بکرێ.
الحائـل: ئەو شتەی گۆڕان پەیدا دەکا ٥ بێچووە مێینەی حوشتر ئەو ساتەی لەدایك دەبێ ٥ هەرمێینەیەك کە نەزۆك بێ، دەگوترێ: (أمرأة حائل، ناقـة حائـل، نخلـة حائـل)، (ك: حُـوَّل وحول وحيال).
الحالُ: ئەوکاتەی کەتێیدای.
حال الدهر: گۆڕانکاری زەمانە ٥ (حال الشَّيْ) صیفەتی شتەکە.
حـال الانسـان: هەموو کارو بارێکی تایبەتی ئادەمیزاد چ مادی چ مەعنەوی.
الحـال في الطبيعـة: چۆنیەتێکی زوو

بەسەر چووە وەکوو ترشیو وشکی ساردیو گەرمی..هتد.

**الحالُ في علم النفس**: بریتییە لەو شێوازە دەروونییەی پەیدا دەبێ پێش ئەوەی بچەسپێ.

**الحال في النحو**: حاڵ لەزاراوەی نەحوییاندا بریتییە لەزەمانی هەنووکەییو کاتی قسەکردنەکە ٥ وشەیەکە شێوەی ئەو شتەی کارەکە دەکا یان کارەکەی ئاراستە دەکرێ رون دەکاتەوە ٥ لەزاراوەی بەلاغەدا بریتییە لەو حاڵو هۆکارانەی داوا دەکا کەلامەکە بەشێوەیەکی تایبەتی دەر ببڕدرێ ٥ (ك: أحوال وأحولة)ە بە.

**الحالَةُ**: بەمانا (الحال) دێ.

**الحَوَالُ**: دەوروبەری شت، دەگوترێ: (رأيت الناس حواليه) خەڵکم بینی دەوریان دابوو.

**حَوَالُ الدهر**: گۆڕانکاری رۆژگارو بەڵاو کارەساتی.

**اَلْحَوَلَةُ**: ئەوەیە خاوەنی قەرز لەقەرزدارێکەوە بگوێزیەوە بۆ سەر قەرزدارێکی تر ٥ گواستنەوەی ئاو لە جومێکەوە بۆ روبارێکی تر ٥ شایەتیدان ٥ بەرعۆدەبوون ٥ چەکێکە یان کومپیالەیەکە پارەی پێ دەگوێزرێتەوە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.

**اَلْحَوالِيّ وَالْحُوَالي من الرجال**: ئەوکەسەیە زۆر فێڵبازو فوڵبڕبێ.

**اَلْحَوْلُ**: جمو جوڵو هاتو چۆ ٥ ساڵ، (ك: أحوال)ە ٥ ئەملاو ئەولای شت ٥ دەگوترێ: (رأيت الناس حولَهُ).

**اَلْحُوَلُ**: لەمپەرو پەردەی نێوان دوشت ٥ پیاوی فێڵبازو فوڵبڕ.

**اَلْحِوَلُ**: زیرەکیو لێهاتوویی‌و کارامایی لەئەنجامدانی کاردا ٥ ئەو کەندرو جۆگە هەڵکەندراوەیە کە بەڕیز نەمامە خورمای تێدا دەنێژرێ ٥ دەگوترێ: (هذا من حِوَلِ الدهر) ئەمە لەکارەسەیرو عەجایەبەکانی رۆژگارە.

**اَلْحَوَلُ**: پەردەو لەمپەڕ لەنێوان دوشتدا ٥ خێڵیو فیچی لە ئاڕاستەکردنی نیگای دوو چاودا.

**اَلْحِوَلاءُ**: ئەو پەردەی بێچوە حوشتر لەناو سکی دایکی دا لەناوی دایە ٥ وەکوو مەشیمە بۆ زاروك لەسکی ئافرەتدا ٥ ئەو ئاوەیە کە لەپێش سەردەرهاتنی زاروك لەسکی دایکی دەڕژێتەدەر.

**اَلْحُوَلاءُ**: (حُوَلاء الدهر) سەیرو سەمەرەی رۆژگار.

**الحولان**: بەمانا (الحُوَلاء) دێ.

**الحُوْلَةُ من الرجال**: ئەو پیاوەیە زۆر کارامابێ لە فێڵبازیو فوڵبڕی دا ٥ (الحُولَةُ من الأمور) کاری سەیرو سەمەرە ٥ دەگوترێ: (هذا من حُولَةِ الدهر) ئەمە لەشتە سەیرو سەمەرەکانی رۆژگارە.

**اَلْحُوَلَةُ من الرجال**: بەمانا (اَلْحُوْلة) دێ.

اَلْحَوْلِيُّ: هەرشتێك ساڵێكی بەسەردا تێپەڕێ گیانلەبەربێ یان ڕوەك بێ، (ك: حَوَالِيٌّ وحواليه).

الحَوَّالُ: قەناتێكی بچكۆلەیە ئاوی لێ دەگوازرێتەوە بۆ شوێنێكی تر.

اَلْحُوَّلُ: ئەو پیاوەی خێرا دەگۆڕێ‌و هەر ڕۆژەی لەسەر هەوایەكە ٥ پیاوی فێڵبازی فۆڵبڕ.

اَلْحِيَالُ: پەتێكە سەرێكی لەپەتی بەرسنگی حوشتر دەبەسترێ‌و سەرەكەی تری بەپاڵوەكەیەو قایم دەكرێ ٥ پێشی شت ٥ دەگوترێ: (قَعَدَ حِيَالَهُ) لەبەردەمی دانیشت ٥ لەبەرامبەری ڕۆنیشت.

اَلْحِيلَةُ: فێڵ‌و تەڵەكەو بەتوانایی لە بەڕێوەبردنی ئیش‌و كاردا.

اَلْحَيَّالُ: فێڵبازو سیاسەتمەدار.

اَلْحَيِّلُ: ئەو كەسەی حەوالەكەی بۆسەر دەنێردرێ ٥ ئەوكەسەی حەوالەكەی بۆ دەكرێ ٥ بەهەردووكیان دەگوترێ (اَلْحَيِّلان) وەكوو چۆن بەكڕیارو فرۆشیار دەگوترێ (البَيِّعان).

اَلْمَحَالُ: لێزان‌و بەتوانا لەسەر بەڕێوەبردنی كارو بار.

اَلْمُحَالُ: ئەوشتەی نەگونجێ ببێ ٥ وەكوو كۆبونەوەی جم‌و جۆڵ‌و ڕاوەستان لەیەك ساتدا بۆ قەبارەیەك ٥ هەروا كۆبونەوەی تاریك‌و ڕوناكایی ٥ ساردی‌و گەرمی بۆ شتێك لەیەك كاتدا.

الْمَحَالَةُ: فێڵ‌و چاوبەست لێ كردن ٥ شتێك لەشێوەی ناعوور ئاوی پێ هەڵدەهێنجندرێ.

المِحْوَالُ مِن الرجال: ئەو كەسەیە لەقسەكردندا پشت بەقسەی پێش خۆیەوە ببەستێ‌و قسەی خەڵك بجوێتەوە.

اَلْحُوَّلُ: ئامێرێكە بەرزو نزمی كارەبای پێ كۆنترۆڵ دەكرێ.

اَلْمُحِيلُ: ئەو كەسەی منداڵی نابێ (نەزۆك).

المستحيلُ: شتی بەتاڵ‌و پوچ ٥ شتێك هەبوونی یان پەیدابوونی محاڵ بێ.

حَوْلَقَ: وتی (لاحول ولا قوة الا بالله).

**حام** حول الشَّيْئ: بەدەوری شتەكەدا سوڕایەوەو دەوریدا ٥ لە حەدیثی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: (من حام حول الحمى يوشك أن يقع فيه) كەسێك لەتاوان نزیك ببێتەوە لەوانەیە تێی بكەوێ.

حام الشَّيْئَ: هەوڵی بۆ ئەو شتەداو ویستی بەدەستی بێنێ.

حام علی قرابته: سۆزی بۆ خزمەكانی نواند یارمەتی دان.

حام الحيوانُ: گیانلەبەرەكە تینووی بوو، (ك: حوائم، حُوَّم).

حَوَّمَ في الأمر: زۆر لەكارەكە ورد بووەو زۆری تێ ڕوانی.

الحَوْمُ: جەڵبە حوشتری فەرەباڵغ.

**الحُوْمُ**: شەرابی کۆن.

**اَلْحَوْمَةُ من البحر والماء والرّمل**: زۆرینەو بەشی هەرە زۆری ٥ لەشەڕو جەنگا بەشوێنی ترسناکی ناو شەڕەکە دەگوترێ.

**الحُوْمَةُ**: بلور.

**الحَوْماتة**: زەوی رەقی تەخت (ك: حَوْمان وحَوامين)ە.

**الحَوْمَلُ**: لەهەموو شتێکدا بەسەرەتاکەی دەگوترێ ٥ لافاوێك ئاوەکەی قوڕاو نەبێ ٥ هەوری رەشی باراناوی ٥ (ك: حَوامِل).

**تَحَوَّنَ**: زەلیل بوو هیلاك بوو.

**الحانةُ**: دوکانی عەرەق فرۆشتن.

**حَوى الشَّيْءَ حوايةً**: بەسەر شتەکەدا زاڵ بوو کردییە ملکی خۆی ٥ دەگوترێ: (حَوَى الحيـة) پشی پشی مارەکەی کردو خۆی بەدەستەوەدا.

**حَوِيَ الشَّيْءُ حوى وحُوَّةً**: ئەوشتە سەوزی تێکەڵ رەشاییەکەی بوو ٥ یان رەشی تێکەڵی سورییەکەی بوو.

**حَوِيتِ شفة الرجل**: لێوی پیاوەکە لە سوری دا مەیلەو رەش بوون.

**حَوِيَ النباتُ**: گژو گیاکە لەسەوزیدا خۆی بەرەش نواند ٥ (هو أحوى وهي حَوّاء) ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَجَعَلَهُ غُثَاءً أَحْوَى﴾.

**حَوَّى الشَّيْءُ**: شتەکەی وێك هاتەوە

**حَوَّى الشَّيْءَ**: شتەکەی وەرگرت.

**احتوى الشَّيْءَ وعليه**: لەخۆی گرت جێی کردەوە.

**تَحَوَّى**: خۆی کۆکردەوەو پاپۆکەی بەست ٥ دەگوترێ: (تحوّت الحيةُ)

**الحاوي**: ئەو کەسەی مار بەخێو دەکاو پشی پشییان دەکا ٥ پیاوێك کاری سەر سوڕهێنەر ئەنجام بدا.

**الحاوياء**: ریخۆڵە ٥ ناوسك.

**الحاوية**: مێینەی (الْحَوى).

**اَلْحِواءُ**: ئەو شوێنەی شتی تێ دەکرێ وەکوو گەنجینە ٥ کادێن ٥ هۆبەو مەنزڵی رشماڵ نشین واتە: خانوی لە (موو کوڵك دروست کراو) کۆمەڵە رەشماڵ نشین کە لەسەر ئاوێك کۆدەبنەوە.

**الحُوُّ**: مێروە سورە ٥ مێروی سلێمان (مێروە سلێمانە).

**حَوّاء**: دایە حەوا.

**اَلْحُوَّةُ**: رەنگێکە لەرەنگی ژەنگی ئاسن دەکا.

**حُوَّةُ الوادي**: ئەمبەرو ئەو بەری شیو.

**اَلْحَوِيُّ**: خڕی و کەوانەیی ٥ بۆ هەرشتێك بێ ٥ حەوزی بچوکی ئاو بۆ حوشتر.

**اَلْحَوِيَّةُ**: پۆشاکێکە ئاواخنی هەیە دەکرێتە سەرپشتی حوشتر ئافرەت لەسەرییەوە سوار دەبێ ٥ پەڕۆیەکە لەسەر سەر دادەنرێت کاتێ قاپێك یان شتێکی تر دەخەیتە سەر سەرت ٥ زەوی رەق و روتەن کە بە بەرد یان بەخشتی کاڵ و قوڕ شورای بۆ دەکرێ.

**حاوية البطن**: ریخۆڵەو جەرگ و سی.

**اَلْحَيَّةُ**: مار ٥ ئەمیش چەند جۆرێکی هەیە.

**المحتوي**: هۆبەو رەشماڵ نشین کە لەسەر ئاوێك كۆدەبنەوە.

**الْحَوِي**: بەمانا (المحتوي) دێ ٥ جۆرە بسمارێکیشە.

**حَيْثُ**: زەرفی مەکانەو ئیضافەدەکرێ بۆلای رستە.

**اَلْمَحْوَاةُ**: (أرضٌ مَحواةٌ) زەوی ماراوی کە زۆری مار لێبن.

**حَاجَ حَيْجاً**: هەژار کەوت.

**أحاجــت الأرضُ**: زەوییەکە روەکی (الحاج)ی رواند.

**اَلْحَاجُ**: روەکێکی چقڵاوییە سەوزییەکەی زۆر درێژە دەکێشێ و رەگەکانی زۆر بەزەویدا دەڕۆنە خوار ٥ بەعەربی دوو ناوی تری هەن (العاقول، شوك الجمال).

**حَيْجَمَ الرجل**: پیاوەکە بەسرتە قسەی کردو لەبەر خۆیەوە ورتە ورتی بوو.

**حاد عن الشَيْئِ حَيْداً وحَيَداناً**: لەشتەکەی لادا دەگوترێ: (حاد عن الطريق) لەرێگە لایدا.

**أحاده عن الشَيْئ**: لەو شتەی لاداو دوری خستەوە.

**حَايَدَهُ محايدةً وحياداً**: وازی لێ هێناو روی لێ وەرگێرا ٥ وازی لە دژایەتی ئەو هێنا.

**حَيَادِ**: دەگوترێ: (حِيدى حَيَادِ) وازی لێ بێنەو لابکەوە.

**الحِيَادُ**: ئەوەیە بێ لایەن بێ پشتگیری هیچ لایەکی کێشەکە نەکەی.

**الحِيَــاد الا يجــابي**: لەسیاسەتی نێو دەوڵەتی دا ئەوەیە وڵاتێك هاوکاری یەکێك لەو دەوڵەتە دژە بەیەکەکان نەکاو لەگەڵ باقی دەوڵەتەکانی تردا هاوکارو هاوسۆز بێ بۆ بەرقەرار بوونی ئاشتەوایی گشتی.

**اَلْحَيْدُ**: ئەوەی لە ئەملاو ئەولای شت هەڵتۆقێتەوە، دەگوترێ: (حَيْدُ الجبل و حَيْدُ الرأس) ٥ هاوتاو هاوشان ٥ پەراسوی زۆر خوار.

**اَلْحَيَدُ**: ئاخێ بوونی زارۆکە لەسکی دایکی داو بەئاسانی نەیەتە دەرەوە.

**الْحَيَدى**: رۆیشتنی بەتەکەبوورو لارو لەنجە ٥ هەروا دەگوترێ: (حمار حَيَدى) گوێدرێژێکە لە سێبەری خۆی دەسڵەمێتەوە ئەوەندە سرك و تەڕ دەماخە.

**اَلْحَيَدانُ**: ئەو بەردو زەیخەیە لەکاتی رۆیشتندا لەژێر پێی وڵاخ دەردەپەڕێ.

**الْحَيْدَةُ**: روانینی بەرق و کینەوە ٥ دەگوترێ: (مانظر اليَّ إلا نظر الحَيْدَاةِ) بەخراپە نەبێ قەت سەیری منی نەکردووە ٥ هەروا ناوە بۆ گرێی شاخی کەڵەکێوی.

**اَلْعَيِّدُ**: گوێدرێژی زۆر سرك‌و تەڕ دەماغ.
**اَلْمَحِيدُ**: ناچار ٥ دەگوترێ: (مالك محيد عن هذا) چارت ناچارەو ناتوانی خۆی لێ بپارێزی.
**حَارَ بَصَرُهُ حَيْراً وحيرةً وحيراناً**: تەماشای شتەکەی کردو چاوی نەیتوانی لێی بڕوانێ ٥ چاوی لێی هەڵبەزییەوە.
**حـار فـلان**: فلانکەس ڕێی لێ گوم بوو ٥ (حار في الأمر) لەو کارەدا سەری لێ تێکچوو.
**حار الماءُ**: ئاوەکە کۆبوەو هەڵخولا ٥ (هو حائِر وحيران وهي حَيْرى)، (ك. حيارى)٥.
**حَيَّرَهُ**: خستیە سەر لێ شێوانەوە.
**تَحَيَّرَ**: کەوتە سەر لێ شێواوییەوە.
**تَحَيَّر السحابُ**: هەورەکە لەشوێنی خۆی وەستاو بارانی باراند.
**تَحَيَّرَ الماءُ**: بەمانا (حار الماء) دێ.
**تَحيَّرَ المكان والاناء بالماء**: پڕ بوو لەئاو.
**استحار الرَّجُلُ أو الماء في المكان**: بەمانا (حارَ) دێ.
**استحير الشرابُ**: بەخۆشی شەرابەکەی بۆ قوت چوو.
**الحـائِرُ**: کەسێـك سەرگەردان بێ ٥ شوێنێك ئەملاو ئەولای بەرزبێ‌و ئاوی تێدا بووەستێ ٥ باغ‌و بێستان.
**الحارة**: بەرو بەرماڵ ٥ ناوچەیەك نزیك بێ لەماڵەوە.
**الحاري**: دەگوترێ: (لا آتيه حارِي الدهر) قەت نایەمە لای.
**الحِيَرةُ**: سەرگەردانی‌و رارایی ٥ زەوی سەوزو پڕ دانەوێڵە ٥ دەگوترێ: (أصْبحت الأرضُ حيرة): زەوی سەوز هەڵگەڕاو پۆڵکەو پاقلەی باشی تێدا هەن.
**اَلْحَيِّرُ**: هەور لەگەڵ باران پەیدا ببێ‌و نەڕەوێتەوە.
**اَلْمَحَارَةُ**: دیوی ناوەوەی مەلاشوو.
**اَلْمُسْتَحِيرُ**: ڕێگەیەك لەسارایەك دابێ‌و نیشانەی دیارنەبن‌و سەری لێ دەرنەکرێ.
**اَلْمسْتَحيرةُ**: پێڵوی چاو کە گۆشت‌و چەوری زۆربێ.
**حازَ حَيْزاً حيازةً**: بڕوانە (حَوَزَ).
**تَحَيَّزَ الرجلُ**: پیاوەکە ویستی هەڵسێ‌و زۆر بەزەحمەت بوو هەڵسانەکەی.
**تَحيَّزَ اليهم**: پاڵی بەوانەوە داو چووە سەر بیرو بڕوای ئەوان.
**حـاس الحَيْسَ حيساً**: تریتی خورماو کەشکی دروست کرد.
**حاس الشَّيْءَ بغيره**: ئەوشتەی تێکەڵاوی شتی ترکرد.
**حَيَّسَ الحَيْسَ**: تریتی خورماو کەشکی دروست کرد.
**الحَيْسُ**: خورماو کەشك‌و ڕۆن تێکەڵ بەیەك دەکرێن‌و دەکوترێن‌و دەشێلدرێن دەکرێتە قاوت.
**حـاشَ حَيْشاً**: ترسا ٥ وەکوو ترسنۆك ڕۆیشت.

**حاش الوادي**: دۆڵەکە درێژ بووە.
**حاش فلاناً**: فلانکەسی ترساند.
**تَحَيَّشَتْ نَفْسُهُ**: نەفسی لێی تۆراو پێش چاوی کەوت.
**اَلْحَيْشُ**: کۆمەڵ.
**اَلْحَيْشانُ**: پیاوی زۆر ترسنۆك.
**حاصَ عنه حيصاً وحيصاناً ومحيصاً**: لای داو لەرێگە دورکەوتەوە.
**حاصَ القومُ**: خەڵکەکە کەوتنە هاتو چۆ دەگەڕان رێگای هەڵاتن بدۆزنەوە.
**حَايَصَهُ**: چاوو راوی لێکرد ویستی بەسەریدا زاڵ بوو.
**حايَصَ الموتَ**: سوور بوو لەسەر ئەوەی خۆ لەمردن رزگار بکا.
**اِنحاصَ**: لایداو دوور کەوتەوە.
**تحايَصَ عنه**: بەمانا (انحاصَ) دێ.
**حَاصِ**: تەنگانەو نارەحەتی دەگوترێ ٥ (وقع القوم في حاصِ باصِ) خەڵکەکە کەوتە گیرو گرفتو تەنگژەوە.
**حَيصَ بَيصَ**: تەنگانەو نارەحەتی ٥ دەشگوترێ: (حِيصَ).
**الحَيُوصُ**: چەمووش ٥ دەگوترێ: (دابة حيوص) وڵاغێکی چەموشە ژێر بارنابێو بەویستی خاوەنەکەی ناکا.
**اَلْمَحِيصُ**: چارەو پەنا ٥ دەگوترێ: (ما عنه محيص): هیچ رێگا چارەیەك نییە بۆ خۆلادان لەوشتە.
**حاضت المرأةُ**: ئافرەتەکە بێ نوێژ بوو کەوتە عادەتی مانگانەیەوە ٥ (هي حائض)، (ك: حوائض وحُيَّضٌ) ٥ هەروا بەمانا ئەوەیە ئافرەتەکە گەیشتە تەمەنی باڵغیو عادەتی مانگانە.
**حاضت شجرة السُّمُر**: شتێك لە درەختی سەموورە هاتە خوارێ وەکوو خوێن سورە.
**حاض السيلُ**: لافاوەکە هەڵسا.
**حَيَّضَ الماءَ**: ئاوەکەی بەرداو وەکوو لافاوی لێکرد.
**تحيضت المرأةُ**: بەمانا (حاضت) دێ ٥ رۆژانی عادەی مانگانە ئافرەتەکە وازی لە ئەنجامدانی نوێژو رۆژو هێناو چاوەڕوانی کۆتایی هاتنی خوێنی حەیزەکەی کرد ٥ خۆی بە لەحەیزکەوتوو لەقەڵەمدا ٥ هەڵسو کەوتی وای کرد کە کەوتۆتەوە عادەی مانگانەوە.
**اُسْتُحيضَتْ المرأةُ**: ئافرەتەکە دوای تێپەڕبوونی ماوەی عادەتی مانگانەی خوێنەکەی نەوەستاو هەر بەردەوام بوو.
**الحِيَاضُ**: خوێنی حەیز.
**الحَيْضُ**: ئەو خوێنەی مانگانە چەند رۆژێکی دیاریکراو بەشێوەیەکی سروشتی لەرەحەمی ئافرەتەوە دێتە خوار.
**اَلْحِيضَةُ**: ئەو پاچە پەڕۆیەیە ئافرەت بەخۆیەوە هەڵدەگرێ بۆ ئەوەی

خوێنەکە لە جەستەیەوە نەچێ‌و بڵاو نەبێتەوە ٥ بەخودی خوێنەکەش دەگوترێ: (اَلْمَحِيضُ): بەمانا (الحيض) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذىً﴾.

حَيْعَلَ المؤذنُ: بانگدەرەکە وتی: (حيَّ على الصلاة).

**حاف** عليه حَيْفاً: ستەمی کرد.

**حاف** الأبُ: باوکەکە خۆشەویستی‌و ڕێزی بۆ منداڵێك لە منداڵەکانی لەوانی تر زیاتر دەربڕی ٥ گرنگی بە منداڵێکی زیاتر لەوانی تردا ٥ (هو حائِف)، (ك: حُوَفٌ).

تَحَيَّفَ الشَّيْئَ: وردە وردە لەقەراخ‌و بیجاخی شتەکەی گرت‌و لێی کەمکردەوە ٥ دەگوترێ: (تَحَيَّفَتهُمُ السَّنَةُ) ساڵ‌و ڕۆژگار وردە وردە لەتەمەنی کەم کردەوە.

الحائف (حائف الجبل): قەراخی کێو بنارو دامێنی کێو.

الحَافُ: ڕەگێکی سەوزە لەژێر زوبانەوەیە.

اَلْحَافَةُ من كل شيئ: لایەن‌و ئەملاو ئەولای شت.

الحَيْفُ: تیژایی بەرد، (ك: حيوف).

اَلْحيفَةُ: تیژکەرەوەیەکە سەرەتیرو سەرە ڕمی پێ تیژ دەکرێتەوە.

الحيفة من الشَّيْئ: لایەن‌و قەراخ‌و ئەملاو ئەولای شت.

**حاق** به الشَّيْئُ حَيْقاً وحيوقاً وحَيَقاناً:

**حاق** به الأمر: کارەکەی لەسەر پێویست بوو.

**حاق** فيه السيفُ: شمشێر کاری لێکرد.

**حاق** الشَّيْئَ: شتەکەی هەنوو وزۆری دەست ڕێ خست.

أحاق به الشَّيْئُ: بەمانا (حاق) دێ ٥ دەگوترێ: (أحاق الله بهم مكرهم) خودا شێوەی مەکری خۆیانی بەسەردا دان.

حَايَقَهُ: حەسوودی پێ بردو ڕقی لێ بوو.

إحْتَاقَ على الشَّيْئَ: ئیحتیاتی کرد بۆ نەوشتە.

اَلْحَاقُ حاق الجوع: برسیایەتی زۆر ٥ ئەوپەڕی برسییەتی.

اَلْحَيَقُ: ئەوەی دێتەوە ڕێی ئادەمیزاد لەخراپەکانی.

اَلْحيقُ: بەمانا (اَلْحَيَقُ) دێ.

اَلْحَيْقَرُ: لاواز یان نارەسەن‌و بنەچە خوێڕی.

حَاكَ في كذا حَيْكاً: شوێنکەی لێکرد، کاریگەریی لێ کرد ٥ دەگوترێ: (حاك السيف في فلان) شمشێرەکە کاری لەفلان کرد (حاك القول في القلب) قسەکە لەدڵدا کاری کرد ٥ دڵی بریندار کرد دڵی هێشاند ٥ دڵی خۆش کرد.

**حاك** الْمُدْيَةُ: کێردەکە بڕی.

**حاك** في مشيته حَيَكاناً: لە ڕۆیشتنەکەیدا لارو لەنجەی کرد خۆی

بـادا ٥ بەتونـدی پێـی لـەزەویداو عەرزەکەی کوتایەوە ٥ دەگوترێ: (جاء یحیك) هات لە رۆیشتندا قاچی بڵاو کردبـوون هـەنگاوی پـانی دەنـان دەتگوت شتێـکی لەناوگەڵیدایە لەبەر زۆر قەڵەوی.

حـاكَ الثـوبَ: قوماشـەکەی چنی ٥ (هـو حائك وحیاك وهـی حیاکـة وَحَیَـکی وحِیکی).

أحـاكَ فیـه السـیفُ: بـەمانا (حـاك) دێ، واتە: شمشێر کاری تێکرد.

إحْتَـاكَ بثوبِـهِ: بـە کراسـەکەی خـۆی کەمەنـدکێش کـرد واتـە: قاچـی‌و پشتی پێکەوە بەستن.

تَحَایَـكَ: بەلارو لەنجە هات.

حَالَ الماءُ حیلاً: ئاوەکە لەناو شێوەکەدا کۆ بۆوە.

تَحَایَـلَ علـى الرجـل أو الشَّیْئَ: فێڵی لـە پیاوەکە کردو بەسیاسەت لەگەڵی دا هەڵس‌و کەوتی کرد بـۆ ئـەوەی لێـی بەمراد بگا.

تَحَیَّـلَ: فـێڵ‌و فەجـەری بـەکار هێنـا بەئەنجامدانی کارەکانی.

اَلْحَیْلُ: ئاوی کـۆ بـووەوە لـەناو شێوەکەدا، (ك: أحیال وحیول).

اَلْحَیْلَـةُ: جەڵەبـە مـەڕو بـزن ٥ بـەردی بـەربۆوە لـەکێوەوە بـۆ دامێنـی‌و هێنـدە کۆببنـەوە تـا زۆر دەبـن‌و دەبێتە بەردەڵان.

حان الأمْـرُ حَیْنـاً وحَیْنونَـةً: کـاتی ئیشـەکە نزیـك بۆتـەوە ٥ دەگـوترێ: (حَـانَ وقت الصلاة) کاتی نوێژ نزیك بۆوە.

حَانَ الرَّجُلُ: پیاوەکە فەوتا.

أحانَ: زۆر مایەوە.

أحـان الشَّـیْئَ: شـتەکەی فەوتانـدو لـە ناوی برد.

أحْیَنَ القومُ: گەلەکە کاتی ئەوەی هاتووە بەمافی خۆی بگا.

أحْـیَنَ الابـلُ: حوشـترەکە کـاتی ئـەوەی هاتووە بدۆشرێ یان باری لێ بنرێ.

أحْـیَنَ بالمكـان: چـەند ماوەیـەك لـەو شوێنە مایەوە.

حَایَنَهُ محاینةً وحِیَاناً: مامەڵەی لەگەڵ کرد ساڵ لە دوای ساڵ.

حَیَّنَهُ: کاتێکی بۆ دیاری کرد.

حَـیَّن الله فلانـاً: خـودا فلانکەسـی هیدایەت دا بۆ ڕێی ڕاست.

الحائنـة: مێینـەی (الحـائن)ە ٥ بـەمانا بەڵای کوشندە دێ.

اَلْحِیْنُ: ماوەیەك لەزەمەن کەم یا زۆر.

اَلْحَـیْنُ: هـیلاك‌و تێداچـون ٥ بـەڵاو ناخۆشـی ٥ لەپەنـدی پێشـینانـدا هـاتووە ٥ (اذا حـان اَلْحَـیْنُ حـارت العینُ).

الحِینةُ: بەمانا کات دێ ٥ دەگوترێ: (ما ألقاه الا الحِینة بعد الحِینة) نـاو بـەناو نـەبێ نـایبینم ٥ هـەروا دەگـوترێ: (هو یاکل الحینـةُ: ڕۆژی یـەکجار نـان دەخوا

المِحْيانُ: (مِحْيان الشَّيْءِ) كاتى شت ٥ وەرزى شت.

حَيِيَ حياةً وحيواناً: گەشەى كرد.

حَيِيَ القومُ: قەومەكە وەزعو حاڵيان باش بوو.

حَيِيَ الطريق: ڕێگاكە ئاشكرا بوو.

حَيِيَ من القبيح حياءً: نەفسى لەشتى خراپو ناشرين هەڵە نگوتو پێى ناخۆش بوو.

حَيِيَ من الرجل: شەرمى لەپياوەكە كرد.

أحيا القومُ: زاوو زێيان زۆر بوو ٥ وەزعو حاڵى ئاژەڵەكانيان باش بوو.

أحيا الله فلاناً: خودا فلانكەسى زيندوو كرد.

أحيا الله الأرضَ: خودا ڕووەكو گژو گياى لەزەوى دەرهێنا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَلِكَ النُّشُورُ﴾.

أحيا الرائدُ الأرضَ: كابرا زەوييەكەى بينى گژو گياكەى لەوپەڕى گەشەو سەوزىدا بوو.

أحيا فلان الليلَ: فلانكەس شەو نەنوست هەر خەريكى خودا پەرستى بوو.

حَيَّاهُ الله: خودا هێشتيەوە ٥ دەگوترێ: (حياك الله وبياك) خودا بتهێڵێتەوەو لەگەشەو نەشەدابى.

حيّا الله القوم بحَيَا: خودا بەهاناى ئەو قەومەوە هاتو بارانى بۆ باراندن.

حيّا فلان فلاناً: فلانكەس دوعاى بۆ فلان كرد بەتەمەنى درێژو تەندروستى باش.

حيّا الخمسين: لەتەمەنى (٥٠) ساڵى نزيك بۆوە.

حايا القومُ بعضهم بعضاً: ئەو خەڵكە دوعايان بۆ يەكتر كرد بەتەمەنى درێژو تەندروستى.

حيّا النّارَ بالنفخ: ئاگرەكەى بەفو لێكردن هەڵگيرساندەوە.

حيّا الصَّبِيَّ: خۆراكى دا بەمنداڵەكە.

تحايا القومُ: خەڵكەكە دوعاى تەمەن درێژىو تەندروستيان بۆ يەكتر كرد.

تَحَيَّا منه: خۆى لێ شاردەوە.

استحيا الأسيرَ: ديلەكەى هێشتەوە نەيكوشت ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿يُذَبِّحُونَ أَبْنَاءكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءكُمْ وَفِي ذَلِكُم بَلاء مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾.

استحيا فلان فلاناً: فلان شەرمى لە فلان كرد ٥ دەگوترێ: (استحيا منه واستحاه).

التحية: سەلام.

الحَيا: هەرزانىو باران.

الْحَيَاءُ: شەرمو شكۆ (الحياءُ) بۆ ئاژەڵ بە (زێى) دەگوترێ.

الحياةُ: گەشە كردنو مانەوە بەزيندويى ٥ لەزاراوەى زانستى زيندەوەرزانى دا (حياة) بريتييە لە كۆمەڵێك دياردە كە لەگيانلەبەرو ڕووەكو درەختدا دەبيندرێو جيايان دەكاتەوە لە (جەمادات).

الحايي: خاوەنى مار ٥ مار بەخێوكەر.

الحَيَوانُ: زيندوويىو ژيان.

حَيَّ على كذا: حازر بەو وەرە بۆ ئەنجامدانى فلان كار ٥ وەكوو (حي على الصلاة وحي على الفلاح).

١ غوریلا ● ٢ قرد ● ٣ تبراء ● ٤ حیة ● ٥ فهد ● ٦ نمرة ● ٧ اسد ● ٨ ماعز ● ٩ نعامة ● ١٠ غزال ● ١١ صقر ●
١٢ ذلذل ● ١٣ حمار الزرد و عکای ● ١٤ زرافة ● ١٥ جاموس ● ١٦ تیس ● ١٧ کرکدن ● ١٨ نعامه ● ١٩ تمساح ●
٢٠ فرس البحر ● ٢١ سلحفاة

١ طائر الجنة ◆ ٢ تدرج ◆ ٣ طاووس ◆ ٤ نسر ◆ ٥ بوم ◆ ٦ عنز ◆ ٧ قرد رصين ◆ ٨ خنزير بري ◆ ٩ ضبع ◆ ١٠ ذئب ◆
١١ أرنب ◆ ١٢ ذئب ◆ ١٣ جمل ◆ ١٤ ثور هندي ◆ ١٥ [illegible] ◆ ١٦ قطاس ◆ ١٧ دب التبت ◆ ١٨ أيل أو وعل ◆
١٩ أروية ◆ ٢٠ حمار بري ◆ ٢١ كركدن او وحيد القرن ◆ ٢٢ ثعلب ◆ ٢٣ فيل ◆ ٢٤ نمر ◆ ٢٥ [illegible] ◆ ٢٦ [illegible] ◆
٢٧ أطوم ◆ ٢٨ [illegible]

١ فلانجر ◆ ٢ فلانجر طيّار ◆ ٣ كوالي ◆ ٤ هتار ◆ ٥ بنثا ◆ ٦ بزهر ◆ ٧ نمر ◆ ٨ قنقر الكنغر ◆ ٩ قندر ◆ ١٠ نوع من النعام ◆ ١١ خنزير بري ◆ ١٢ جاموس ◆ ١٣ عصفور من طائفة الجوارح ◆ ١٤ نوع من القنفذ ◆ ١٥ تمساح ◆ ١٦ خلد الماء

جامع قرطبة في الاندلس
محراب مسجد الاندلس في فاس
سبيل في مرّاكش
مسجد قايتباي بقرافة المماليك (القاهرة)
حنايا قرطبة
الجامع الكبير في فاس الجديد
الحمراء في غرناطة
مدخل قصر بيت الدين
مسجد الملك في اصبهان